# ٥٠ ساڵ خەبات

## کورتە مێژوویەکی
## حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

### بەرگی یەکەم

# ٥٠ ساڵ خەبات

## کورتە مێژوویەکی
## حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

بەرگی یەکەم

جەلیل گادانی






**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

*** ٥٠ ساڵ خەبات (کورتە مێژوویەکی حزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران) (بەرگی یەکەم)**

* نووسینی: جەلیل گادانی

* نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

* بەرگ: ئاسۆ مامزادە

* تایپیست: دەزگای موکریانی

* چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٨

* ژمارەی سپاردن: ٩٥٣

* تیراژ: ١٠٠٠

* نرخ: ٤٥٠٠

* چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆک)

زنجیرەی کتێب (٢٧٠)

ماڵپەر: www. mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani

# پێرست

**فەسڵی چوارەم** ........................................ 171



**فەسڵی پێنجەم** ........................................ 211



**فەسڵی شەشەم** ........................................ 309

# پێشەکی و سوپاسنامە

ئەوەی ئاشکرایە لەو زەمانەوە کە مرۆڤ گەیوەتە قۆناغێک کە بە کۆمەڵ بژی، ئەوەندەی حەزی کردووە بە ئاسوودەیی ژیان بەرێتە سەر و بەرەو پێش بچێ، ئەوەندەش هەوڵی داوە چلۆنایەتی ژیان و تێپەڕبوونی زەمانی لەبیر بمێنێ. بەر لەوەی نووسین بە شێوەی گونجاوی سەدەکانی دوای دنیای کۆن بێتە گۆڕێ، مرۆڤ بە زەحمەتی زۆر و شکڵ و عەلامەت و خەتی سەیروسەمەرە، بە هەڵقەندن لە بەرد و لە دڵی غارەکاندا ئاسەواری لە خۆی بەجێ هێشتووە.

لە دنیای پێشکەوتووتردا بەرە بەرە لە لەوحەی گڵێن و بەردینیان کەلک وەرگرتووە. دواتر مێژووی سەرەتایی نووسراوە و دەبینین لەم دەور و زەمانەشدا تاریخ بۆتە زانستێکی زۆر گرینگ و دیرۆک نووسان نەخشی گەلێک بەرچاویان نە تەنیا لە روونکردنەوەی گەلێک لە رەمز و رمووزی رۆژگاری رابردوودا هەیە، بەڵکو لە نیشاندانی رێگای دوا رۆژدا دەوری بەرچاو دەگێڕن.

دنیا گەیوەتە شوێنێک کە هەر نەتەوەیەک تەنانەت ئەوانەی وەک ئێمەی کوردی بێ کەیانیش کوێرەوەریی زۆریان بۆ پاراستنی ئاسەواری دێرین کێشاوە بە تێکڕا رێزیان بۆی هەیە و هێندێکیش عاشقانە بۆی تێدەکۆشن.

هەروەک زۆر سروشتییە نەتەوەیەک خاوەنی دیرۆکی خۆی بێ و هەوڵ بدا لەم کتێب و لەو دەفتەر سوود وەرگرێ و تاریخی خۆی لەسەر بنەڕەتێکی راست و زانستی دابڕێژێتەوە زیندووتری نیشان بدا تا کەیانی خۆی بپارێزی و سەرفراز بمێنێ حیزبێکی سیاسیش ئەو مافەی هەیە و دەبێ لە رۆژەکانی پێش لە دایک بوونی را بڕوانێتە یەک یەکی رۆژەکانی خۆش و ناخۆشی ژیانی و پەندیان لێ وەرگرێ. ئەوەش پێوەندی بە پاراستنی هەڵسوکەوتەکان و رووداو و بەسەرهاتەکانیانەوە هەیە کە بە نووسراوە نەبێ، نامێنێ.

زۆر روونە کە بەر لەوەی کورد بۆ خۆی دەست بە کاری نووسینی مێژووی خۆی بکا، زۆرتر خەڵکی دیکە هەوڵیان بۆ نووسینی تاریخەکەی داوە، بەڵام ئێستا کە بە خۆشییەوە هەل و مەرج رەخساوە، گەلێک تاریخ نووس و توێژەرەوەی خۆماڵی پەیدا بوون و بە

دڵگەرمی خەریکن لەسەر وەزعی ژیان و رابردووی نەتەوە بێ بەشەکەمان بەڵگە کۆ دەکەنەوە و دەنووسن. لەسەر حیزبی ئێمەش بە پەنجا ساڵ رابردووی پڕ لە تێکۆشان و خەباتی خوێناویی خۆیەوە، هەروا بووە. تا ئێستاش بە پەرۆشەوە دەبێ بڵێین لە ئارشیوی حیزبەکەماندا دەورەیەکی تەکمیل لە رۆژنامەکانی دەورەی یەکەم کە لە زەمانی کۆماردا زیاتر لە ۱۱۰ ژمارەی لێ چاپ کراوە وجوودی نییە، تا ئێستاش ئەو فیلمانەی کە رۆژی ئیعلامی کۆمار لە لایەن بێگانەکانەوە هەڵگیراون، نەتەنیا وەدەست حیزب نەکەوتوون، بەڵکو بە دەست کوردیشەوە نین، رەنگە هەر شرت و گومیش کرابن.

ئاخر حیزبێک کە لە هەموو کوردستان بە لەمێژینەترین و پڕ خەبات و تێکۆشانترین حیزب دەناسرێ، لە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە، لەمەڕ هەوڵدانی بێ وچان و ناڵ و گۆڕی شێوەی خەبات تایبەتمەندیی خۆی هەیە و لەم پەنجا ساڵەدا دەیان هەڵسوکەوتی دیوە و چەند مەرحەلە خەباتی چەکداری کردوە خاوەنی هەزاران شەهیدە، زۆرکەم بە شێوەی ئاشکرا تێکۆشاوە و زیاتر بە نهێنی ژیاوە و لە بەرامبەر زۆردارترین و درندەترین رژیمەکانی شوونیستی ئێرانی چەرخی بیستەمدا بەربەرەکانیی کردوە وهیچ کات کۆڵی نەداوە، جێگای خۆیەتی دیرۆکێکی باش و پڕ نیوەرۆکی لە راستییەکانی بەسەرهاتی خۆی هەبێ.

دوای کۆمارە جوانەمەرگەکەمان هێندێک کەسی بێگانە پەرتووکیان لەسەر گەلی کورد و حیزبی دێموکراتی کوردستان و کۆمارە ساواکەی نووسیوە. بەڵام قەت نەیانتوانیوە وەڵام دەرێن، چونکە هیچ کامیان نەبەو شێوەی پێویستە کوردستان گەڕاون، نە ئێران و کوردیان بە تەواوی ناسیوە و نە زۆر لە کوردستان ماونەوە و نە داب و نەریت و وەزعی کۆمەڵایەتییان زانیوە، بەڵام دیسان جێگەی رێزن و دەبێ سوپاسیان بکەین کە زۆر شتیان بە ئەمانەتەوە بۆ راگرتووین. ئەوانەی کتێبەکانی ئەوانیشیان وەرگێڕاوە، هەر خاوەن هەست بوون و شیاوی سوپاسن.

لە بیست ساڵ لەمەوبەرەوە هێندێک هەنگاو لەم بوارەوە هەڵگیراون، دوکتور قاسملوو بە نووسینی کتێبی«کوردستان و کورد» و مەحموودی مەلا عیززەت بە کەردستەی زۆر کەم و لە شاخ بە نووسینی دوو جلدکەی«کۆماری میللی مەهاباد» گەلێکیان خزمەت کردوە، ناوبراو پێرارێش بەڵگەنامەکانی کۆماری بە شێوەی ئارشولۆژیکی لە جلدێکی رێکوپێک تر لەوانی پێشوو لە دەرەوەی وڵات چاپ کردوە کە زۆر بەکەڵکە. بە تایبەتی کاک

نەوشیروان مستەفا بە کەڵک وەرگرتن لە رۆژنامەکانی دەوری یەکەمی کوردستان کە لە سەردەمی کۆماردا چاپ کراوە ، کتێبێکی بەنرخی لە ژێر سەردێڕی «حکوومەتی کوردستان»نووسیوە کە مایەی سوپاس و خۆشحاڵیی ئێمەیە. کاک دوکتۆر قاسملوو بە بۆنەی چل ساڵ خەبات لە ساڵی ٦٤ی هەتاویدا پەرتووکێکی نووسی لە ژێر سەردێڕی «چل ساڵ خەبات» کە تەنیا تا تێکچوونی کۆمارە و بە دوای ئەوەشدا بەر لە شەهیدبوونی فەسڵی سێهەمی ئەم کتێبەی نووسیوە کە لە راستیدا زیاتر تاریخی ئێران و رووداوەکانی ئێران تا ساڵی ۳۲ی هەتاوی وکوودیتای حەمە رەزا شا دژی دوکتۆر مصدقی رەوانشادە. هەروەها مامۆستا عبدالله حەسەن زادە بە بۆنەی پەنجا ساڵەی حیزب کتێبێکی بە ناوی «نیو سەدە تێکۆشان» لەو دواییانەدا چاپ و بڵاوکردۆتەوە.

خوێندنەوەی ئەم کتێب و پەرتووکانە بۆ ئێمە هاندەربوون و کەڵکی زۆریشمان لێ وەرگرتوون سوپاسی هەستی کوردایەتی و زەحمەتەکانیان دەکەین کە بە دڵسۆزییەوە بۆ حیزبی ئێمە و کوردیان کێشاوە.

لەبەر ئەوەی هیچ یەک لەم کتێبانە کە هەرکام لە هەل و مەرجێکی تایبەتدا نووسراون«جامع» نین و هەرکام لەسەر بەشێک یا برگەیەک لە ژیانی حیزبیان نووسیوە، ئێمە هاتینە سەر ئەو باوەڕەی کە سەرەڕای هەموو کەم و کوورییەکان دەبێ مێژووی پەنجا ساڵ خەباتی حیزبەکەمان بە بۆنەی پەنجا ساڵەی لە دایک بوونی کۆ کەینەوە و بیخەینە بەردەست کادر و پێشمەرگە و ئەندام و لایەنگرانی حیزب، هەروەها بیخەینە بەرچاوی خوێنەرانی کورد پەروەر و خاوەن ئەزەر، دیارە ئەم کارە بەم چاوەڕوانییەوە دەست پێ کرا کە چ پێش چاپ و چ دوای چاپی ئەم بەرهەمە یارمەتیمان بکرێ و هەڵەکانمان بۆ راست کرێتەوە.

زۆر بە پەرۆشین کە نەمانتوانی بە هۆی نەبوونی کەرەستەی چاپ و تەنانەت کاغەزیش لە کاتی خۆیدا ئامادەی کەین و لە رۆژی ۲٥ی گەلاوێژ و بەم بۆنە پیرۆزەوە بە دیاری پێشکەشی سەدان میوانی پایەبەرز و دۆستانی ئەمەگناس و دڵسۆزی حیزبەکەمانی بکەین. ئەداری لە هەر بابەت دەردێکی گەورەیە. هێندێک خاوەن توانا و دەسەڵاتیش گوێی خۆیان لێ ئاخنی و هاوکارییان نەکردین، بۆ ئەوەی لە کاتی خۆیدا دەرچێ.

بێ شک بە نەبوونی کەرەستەی پێویست ناتوانین چاوەڕوانی ئەوە بین نووسراوەکەمان کەم و کووڕیی تێدا نەبێ. سەرەڕای ئەوەش بۆ ئەوەی جەوهەری ئەو شتانەی لەسەر حیزب

خوێندوومانەوە زانیاریی ژەنگ هەڵێناوی یادی خۆشمان بۆ نەوەکانمان کۆ کردبێتەوەو بە پارێزراوی تەحویلمان دابێ، دەستمان داوەتە ئەو کارە.

لە راستیدا هەر لە کاتی دەست پێکردن، بنەڕەتی کارەکەمان لەسەر ئەو ئەساسە دانا کە بە ناوی دەستەی هاوکارەوە چاپ و بلاوبێتەوە، بەڵام هاوڕێیان لە دواییدا رەنگە زیاتریش بەمەبەستی هاندانی من بووبێ، بڕیاریان دا بە ناوی من دەرچێ.

بۆیە رەنگە هێندێک ناڵ و گۆڕ لە وشە و رستە و عیبارات و ئیشاراتدا هاتبێتە گۆڕ، ئەگەر شتی ناواتان بەر چاو کەوت کە لەگەڵ نووسینی تاکە کەسی نەهاتەوە، داوای لێبووردن دەکەم و هیچ مەبەستێکی تایبەت لە گۆڕێدا نییە و تەنیا ویستوومە لە نووسینەکەدا وەک بێ لایەنێک لەسەر ناتەبایی و ناڕێکییەکان و هەڵسەنگاندنی رووداوەکان بدوێم.

هەروەها بڕیار بوو نووسراوەکە لە یەک بەرگدا چاپ بێ، بەڵام لە لایەک لەبەر نەبوونی کەرەستە و بەرگری لە قەبەبوونی کتێبەکە و لە لایەکی دیکە بۆ پاراستنی مەسلەحەتی گەل و بەرژەوەندی خەباتە رەواکەمان کردمانە دوو بەرگ. هیواداریین بتوانین بەرگی دووهەم واتە باقی نووسراوەکەمان لەگەڵ بەڵگەیەکی زۆری حیزبی لە وەختێکی گونجاودا چاپ بکەین.

رەنگە هەر لە ئێستاوە یەکێک لە گلەییەکانیش ئەوەبێ کە بۆ باسی ئەو هەموو شەڕە قارەمانانە و ئەو هەزاران شەهیدە کە بە سەخاوەتەوە لە پلەو پایەی جۆراوجۆری حیزبیدا گیانیان لە دەست داوە، نەکراوە. ئێمە بە لەبەر چاو گرتنی قەوارەی کتێبەکە و چاپ و بلاوبوونەوەی کتێبی وێنەداری «شەهیدانی نەمری حیزب و گەل»، لە سێ ساڵ لەمەوبەر دا کە ناو و پێناسەی چوار هەزار شەهیدی تێدایە، باسی ئەو قارەمانەتییەمان کردوە سەرەڕای ئەوەش جەدوەلێکی تایبەتیی کاری پێشمەرگایەتیمان لە ئاخری کتێبەکەدا هێناوە، لە هەر ساڵێکیشدا ئیشارەمان بە چەند عەمەلیاتی گرینگ لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستاندا کردووە.

بە راشکاوی دەڵێین بەم وەزعە نالەبارەی ئەمڕۆ لە کوردستانی باشووری پڕ لە شەڕی ناڕەوا و خۆکوژی کە ئێمەی تێداین، دەریایەک گیروگرفتمان لە پێشەو کەرستەی پێویستیشمان بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکانمان لەبەر دەستدا نییە، ئەم ناتەواویانەش راستەوخۆ لەسەر چلۆنایەتی نووسین و دەرچوونی کتێبەکە شوێنەوار دادەنێن،

نووسراوەکەشمان کە ناوی«پەنجا ساڵ خەبات»ی لەسەر داندراوە، بەشێکی بەرچاوی لەم کەم و کوورِییانە بەرکەوتووە وناتەواویی خۆی هەیە.

هیواداریین خوێنەرانی بەرێز بە گشتی و هاورێیانی تێکۆشەری حیزبی بە تایبەتی بە وردبینی خۆیان کەم و کوورِییەکانمان بۆ روون کەنەوە، بروا و زانیاریی خۆیانمان لە هەر رێگایەکەوە بلوێ، بۆ بنێرن تا هەڵەکان راست کەینەوە و ئەگەر فریاکەوین ئەوەی شیاوی چاپ بن، هەر لە بەرگی دووهەمدا ئیشارەیان پێ بکەین.

بە کوردیت پێ دەڵێم لێم مەگرە ئیراد

دیاریی شوانە وێڵە، ناڵە کوکە

جێگای خۆیەتی هەر لێرەدا سوپاسی هەموو ئەو نووسەر و وەرگێرِانە بکەم کە پێشتر لەسەر حیزبی دێموکراتی کوردستان پەرتووکیان نووسیوە و ئێمەش وەک لە جێگای خۆیدا ناویان دەبەین کەڵکمان لێ وەرگرتوون.

بە دڵەوە سوپاسی هاورێیان کاک عوسمان رەحیمی و کاک هاشم رۆستەمی دەکەم کە جگە لە هاوکاریی راستەوخۆ دوو فەسڵیش لەم بەرگەیان ئامادە کردووە.

سوپاس بۆ هاورِێیان کاک هاشم کەریمی و مامۆستا بێ بەش کە بە وردی بە نووسراوەکاندا چوونەوە و بۆ باشتربوونیان پێشنیاری جوان و بەکەڵکیان داوە.

سوپاسی هەموو ئەو هاورێ و دۆستانە دەکەم کە بە ناردنی بیرەوەری لە ژیانی حیزبایەتی خۆیان بە نووسراوە، یان بە گێرِانەوە یارمەتییان داوین.

هەروەها سوپاسی تایبەتی هاورێ کاک عەلی سووسەنی دەکەم کە ئەرکی پڕ زەحمەتی تایپ و تەنزیمی وەئەستۆ گرتووە.

لەگەڵ رێزی زۆرم بۆ هەوڵ و کۆششی هاورێیانی بەشی چاپەمەنیی حیزب سەبارەت بە کار و تێکۆشانیان بۆ تەواوکردنی باقی کارەکانی ئەم کتێبە.

بەشی یەکەم

# کوردستان پێش دامەزراندنی کۆمەڵەی ژ-ک

دیارە دەبێ ئەوەمان لەبەر چاو بێ کە هەموو دیاردە و ڕووداوەکانی نێو کۆمەڵ پێوەندییان پێکەوە هەیە. ئەمانە چ بمانەوێ، چ نەمانەوێ، لانی کەم لەسەر داهاتووی ئەو کۆمەڵە شوێنەواریان دەبێ. هەروەها ئەو ڕووداوانەش بۆ خۆیان بە هۆی شوێنەواری سەرجەم دیاردە و ڕووداوی پێشتر خولقاو لەو کۆمەڵەدا و پێکهاتنی هەل و مەرجێکی لەبار بەگشتی، ڕوویان داوە. کاتێکیش کە باسی مێژوو دەکرێ، نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە مێژوو«زانستە»، مێژوو تەنیا گێڕانەوەی ڕووداوێک نییە، لە مێژوودا نە تەنیا ڕووداوێک دەگێڕدرێتەوەو نیشاندەی پێ دەکرێ، بەڵکو باسی هەل و مەرجی پێش ڕووداوەکە دەکرێ و هۆیەکانی پێکهاتنی ئەو ڕووداوە ڕوون دەکرێنەوە و بە هەڵسەنگاندنێکی وردی زانستییانە لەوانەیە ڕووداوەکانی دواتریش پێشبینی بکرێن.

لەبەر ئەوە بۆ باس کردنی مێژووی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، هەرچەند بە کورتیش بێت، پێویستە سەردەرای خستنە بەرچاوی ڕووداوە گرینگەکانی تەمەنی پەنجا ساڵەی حیزب، هێندێک لەو ناڵ و گۆڕ و ڕووداوانەی کە پێش دامەزرانی حیزب، هاتوونەتە گۆڕێ، باس بکرێن. لەم پێوەندییەدا دەبێ ئەو هەل و مەرجەی کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی تێدا پێکهاتووە و سەرجەم کردەوەکانی حیزب لە پێوەندی لە گەڵ ڕووداوەکانی پێش خۆی بەراورد بکرێن. مەبەست لەم کارەش ئەوەیە کە ئاگاداری بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی وسیاسی و فەرهەنگیی کۆمەڵەکەمان دەبینی و بە زانینی بارودۆخی جیهان بە گشتی و دراوسێکانمان و ئەو وڵاتانەی کە کوردستانیان بە سەردا دابەش کراوە، بە تایبەتی، لە لایەکەوە دەتوانین لە کاتی پێویستدا شۆڕشگێڕانە و

لێبراوانە، هەڵوێست بگرین و لە لایەکی دیکەوە روانگەکان بەرەو باشتر زانین و باشتر فێربوونی مێژوو یا کورتە مێژووی حیزبەکەمان دەڕوا و ئامادەتر دەبێت.

لە پێوەندی لەگەڵ ئەو هەل و مەرجەی کە بە هۆی دامەزرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان وەک رووداوێکی گرینگی سیاسی لە ژیانی خەڵکی کوردستانی ئێراندا، گەڕانەوە بۆ دواوەو چاوخشاندنێکی هەرچەند کورتیش بێ بەسەر چۆنیەتی دابەش بوونی خاکی کوردستان و وەزعی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیی خەڵکی کورد، شتێکی پێویستە و دەتوانێ یارمەتی دەرێکی باش بێ بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە بارودۆخی ئەو سەردەمە.

لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمەوە مێژووی کورد گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا هات. سوڵتان سەلیمی یەکەم سوڵتانی ئیمپراتۆری عوسمانی لە ساڵی ١٥١٤ لە شەڕی بەناوبانگی «چالدران»دا توانی بەسەر هێزەکانی شا ئیسماعیلی سەفەویدا سەرکەوێ. ئەنجامی ئەم شەڕە بووە هۆی ئەوەی کە بەشێکی بەرچاو لە خاکی کوردستان بکەوێتە ژێر دەستی ئیمپراتۆری عوسمانییەوە و تەنیا ناوچەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان لە ژێر دەستی ئیمپراتۆری سەفەویدا مایەوە. ئەم دابەش کردنەی کوردستان لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتە بەهێزەی ئەو کاتدا زیانێکی زۆر و بەرچاوی بە نەتەوەی کورد گەیاند، چونکە لە ماوەی نزیک بە سێ سەد ساڵی دوای ئەو شەڕە، کوردستان بۆتە مەیدانی شەڕ و پێکدادانی بێ راوەستانی ئەو دوو دەوڵەتە. ئەو ناکۆکییانەی نێوان عوسمانییەکان و سەفەویەکان دەبوونە هۆی شەڕی گەورە و خوێناوی و ئەو شەڕانە هەروەک لەسەر چارەنووسی گەلانی دیکەی ناوچەکە باش یان خراپ شوێنەواریان دانا، لەسەر چارەنووسی نەتەوەی کوردیش شوێنەواری یەکجار زیانباریان هەبوو و زیاتر لە چەند جار ناوچەکانی کوردستان ئەم دەست و ئەو دەستیان پێکرا. لە جەرەیانی ئەم شەڕە و شەڕەکانی دواتر، دەسەڵاتدارانی هەردوولا بە کەڵکی خراپ وەرگرتن لە هەستی مەزهەبیی خەڵکی کوردستان، ئاگری شەڕیان خۆش دەکرد، لە حاڵێکدا مەبەستی سەرەکیی ئەو دوو دەوڵەتە دەست بەسەر داگرتنی کوردستان بوو و هەروەها دەیانویست لەوێوە پەل بهاوێژنە ناوچە گرینگەکانی دەوروبەر. نەتەوەی کورد لەم شەڕو کێشانەدا جیا لە برسیەتی و ماڵوێرانی هیچی تری بۆ نەمایەوە و کۆسپێکی گەورەش کەوتە رێی پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی کورد. لە سەدەی نۆزدەهەمدا و لە ئەنجامی شەڕی نێوان رووسیەو تورکیە سنووری رووسیە تەواو لە سنووری کوردستان نزیک بووەوە و بەشێک لە کوردەکان بوونە ژێر دەستەی

ئیمپراتۆریی روسیە. ئەم ئاڵ و گۆڕانە لە کوردستان بەردەوام درێژەی هەبووە و زۆرجار خەڵکی کوردستان دژی ئێران و عوسمانی راپەڕیون.

ئەم بزووتنەوانەی نەتەوەی کورد بەش بەحاڵی خۆیان لەسەر لاوازبوون و بێ هێزیی دەسەڵاتی هەردوو دەوڵەت و رووخاندنیاندا دەوریان هەبووە. ئەم وەزعە تا تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهانی کە لە ساڵی ١٩١٤ تا ١٩١٨ی زایینی درێژەی کێشا بەردەوام بوو. لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی شەڕی یەکەمی جیهانیشدا کوردستان ببووە مەیدانێکی زۆر گرینگی شەڕی عوسمانی و رووسیەی تیزاری و ئاکامەکەشی زەرەروزیانێکی زۆر بوو بۆ نەتەوەکەمان. بە دوای ئەم شەڕەشدا دیسان بە هۆی دەست تێوەردانی دەوڵەتەکانی دیکە و یەک لەوان بریتانیا لە ناوچەدا بە تێکڕا و لە کوردستان بە تایبەتی، ئاڵ و گۆڕی زۆر پێکهات. دەوڵەتی بریتانیا وەک دەوڵەتێکی ئیستعمارگەر ببووە «قیم»و لە هەڵسوڕاندنی کاروباری ناوچەکەدا و هەروەها لە کوردستان دەوری دەگێڕا. لەم بەینەدا نەتەوەی کورد وەک نەتەوەیەکی بەش خوراو کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ شەڕی بەسەردا سەپابوو، لە باری فەرهەنگییەوە دواکەتوو راگیرابوو خووی بەوە گرتبوو کە دەوڵەتێک یان حکومەتێکی دیکەی جیا لە خۆی حوکمی بەسەردا بکا و حاکمیەتی بێگانەکان بۆ دەرەبەگەکان کە ئەو کات دەسەڵاتداربوون، ببووە سروشتێکی ئاسایی.

دوای ماوەیەک دوو پەیماننامەی«سێڤر»sevre[*] و «لۆزان» بە دوای یەکدا مۆر کران

(*) وەرگیراو لە: «کوردستان و کورد»، نووسینی دوکتۆر قاسملوو
پەیمانی «سێڤر» لە مانگی ئووتی ١٩٢٠دا بەسەر تورکیادا سەپێندرا. ئەو پەیمانە لە لایەک بریتانیای گەورە و فەرانسەو یونان و ئیتالیا و رۆمانی و یوگۆسلاوی و چیکۆسلواکی و لەهستان و بیلژیک و ژاپۆن و حیجاز و ئەرمەنستانی داشناک و، لە لایەکی ترەوە سوڵتانی عوسمانی مۆریان کردبوو. لەو کۆنگرەیەدا دەستەیەکی نوێنەرایەتیی کوردیش بە سەرۆکایەتی شەریف پاشا بەشدار بوو و، پەیمانەکە لە بارەی کوردستانەوە ئەم بەندانەی خوارەوەی تێدا گونجابوون:
بەشی سێهەم، بەندی ٦٢- کۆمیسیۆنی ئەستەنبوڵ لە سێ ئەندام پێک دێ کە حکوومەتەکانی بریتانیا و فەرانسە و ئیتالیا بە رەسمی دەست نیشانیان دەکەن. هەتا شەش مانگ دوای مۆرکردنی ئەو پەیمانە، ئەو کۆمیسیۆنە نەخشەیەک بۆ خودموختاری (ئوتونۆمی) مەحەللی، ئەو مەڵبەندانە پێشکەش دەکا کە زۆربەی دانیشتوانی کوردە و کەوتوونەتە رۆژهەڵاتی چۆمی فورات و باشووری ئەرمەنستان، کە دەکرێ لەمەودوا سنووریان بۆ دیاری بکرێ، یان کەوتوونەتە باکووری سنووری نێوان تورکیە و سووریە و «بین النهرین»، وەک لە فەقەرەکانی بیست و حەوت و دوو و سێ دا هاتووە. ئەگەر کۆمیسیۆنەکە لەسەر مەسەلەیەک نەیتوانی بڕیارێکی تێکرایی وەربگرێ، هەرکام لە ئەندامانی کۆمیسیۆن مەسەلەکە لەگەڵ حکوومەتی خۆی دێنێتە گۆڕێ. ئەو بەرنامە پارێزگاریی تەواوی ئاسوورییەکان و کەمایەتییە قەومی و رەگەزییەکانی دیکە لەو مەڵبەندەدا دابین دەکا و، بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجانە کۆمیسیۆنێک لە

کە جارێکی دیکە مەسەلەی کوردیان هێنایە گۆڕێ. پەیمانی«سێڤر» هیوا و هومێدی ئەوەی بەخشی کە ئەتەوەی کوردیش چارەنووسی خۆی لە بەشێک لە خاکەکەی دا دەگرێتە دەست. بەڵام پەیمانی دووهەم پیلانی زۆردار و ئیستعمارگەر بوو کە لەودا مافی رەوای کورد وەبەر چاونەگیرا و پشتگوێ خرا. لە ئاکامدا ئەتەنیا پەیمانی «سێڤر»و قەرارەکانی جێ بەجێ نەکران، بەڵکو بە دوای پەیمانی«لۆزان» باس کردن لە مەسەلەی کورد و قسەکردن بە زمانی کوردی و تێکۆشان لە بواری رزگاری کورد لە وڵاتی تورکیە بە تەواوی قەدەغە کراو سزای توندی بۆ لەبەر چاو گیرا. ئەوەش زیانێکی دیکەی قەرەبوو نەکراوبوو کە لە ئەتەوەکەمان کەوت.

بیست و پێنج ساڵ دوای شەڕی یەکەمی جیهانی کە زانست و تێکنیک لە جیهاندا بەرەو پێش رۆیشتبوو دوای سەپاندنی قەراری زاڵمانەی رێککەوتننامەی «ویرسای» versaille کە ئاڵمانییەکانی بە دوای تێکشکان لە شەڕی یەکەمی جیهانی دا بەتەواوی «تحقیر» و سووک کردبوو و هەستی تۆڵەی تێدا بەهێز کردبوون لە لایەک و لەلایەکی دیکەوە پاش گەشەسەندنی فاشیزم و بە حاکمییەت گەیشتنی نازییەکان لە ئاڵمان. شەڕی دووهەمی جیهانی لە ساڵی ۱۹۳۹ دا ساز بوو. شەڕێک کە زەرەروزیانی بۆ مرۆڤایەتی زۆر زیاتر لە شەڕی یەکەم بوو و سەرەتا وڵاتانی ئورووپایی و دوایەش بەرە بەرە وڵاتانی ئاسیایی و ئەفریقایی و سەرەنجام ئەمریکاشی تێوەگلا. ئەو شەڕە هەروەک لە رادەی جیهانیدا شوێنەواری خۆی هەبوو شەڕێکی وا بوو کە پێویستی بە تێکنیکی ئیزامی

---

نوێنەرانی بریتانیا و فەرانسە و ئیتالیا و ئێران و کوردەکان بۆ پشکنین و بڕیاردان لە سەر هەرچەشنە دەسکارییەک کە بە گوێرەی شەرتەکانی پەیمانی سنوور لە نێوان تورکیە و ئێراندا، لەسەر سنووری تورکیە ئیمکانی هەبێ، سەر لەو مەڵبەندانە دەدا.

بەندی ٦٣- حکوومەتی تورکیە لە ئێستاوە دەستەبەر دەبێ ، کە هەموو بڕیارەکانی ئەو دوو کۆمیسیۆنە کە لە بەندی ٦٢دا باس کراون، قبووڵ بکا و هەتا سێ مانگ پاش ئەوەی کە پێی راگەیەندرا، جێ بەجێیان بکا.

بەندی ٦٤- ئەگەر تا ساڵێک پاش ئیمزا کردنی ئەم پەیمانە، کوردەکانی دانیشتووی ئەو مەڵبەندەی لە بەندی ٦٢دا دیاری کراوە، بە ئەنجوومەنی کۆمەڵی ئەتەوەکانیان راگەیاند کە زۆربەی دانیشتوانی ئەو مەڵبەندە دەیانەوێ لە تورکیە جیا ببنەوە و، ئەنجوومەنیش دانی بەوەدا نا کە ئەوانە دەتوانن سەربەخۆ بژین و تەوسییەی کرد کە سەربەخۆییان بدرێتێ، تورکیە لە ئێستاوە دەستەبەر دەبێ کە ئەو تەوسییە قبووڵ بکا و لە هەموو هەقێکی خۆی لەو مەڵبەندە دەست هەڵگرێ. چۆنیەتیی دەستەبەردار بوونی تورکیە لەو مافانە بە درێژی لە پەیمانێکی تایبەتیدا باس دەکرێ. کاتێک حکوومەتی تورکیەش لەو مافانە دەستەبەردار بوو، ئەگەر کوردەکانی ویلایەتی مووسڵ بە دڵخوازی خۆیان ویستیان بچنە پاڵ ئەو حکوومەتە کوردەوە، هاوپەیمانە گەورەکان هیچ چەشنە بەرگرییەکیان ناکەن.

تایبەت بۆ بەخێرایی سازکردنی چەک و تەقەمەنیی ئەو مەیدانە پان و بەرینە دەکرد و هەر بەو پێیەش لە بوارەکانی دیکەی تیکنیکی دا گەشەکردن پەرەی دەسەند، ئەوە سەرەڕای ئەو مەسەلەیە بوو کە هەر ڕۆژەی بە دەیان کارخانەو دامەزراوی سەنعەتی بومباران دەکران و وێران دەبوون، بەڵام شتێکی زۆر سروشتی بوو کە هەرکام لە دوولایەنەکانی شەڕ، واتە وڵاتە هاوپەیمانەکان و وڵاتانی یەکگرتوو(متفقین و متحدین) دەیانویست ئیمکاناتێکی زۆرتر و هەل و مەرجێکی لە بارتر بۆ سەرکەوتن ساز بکەن. لەگەڵ ئەوشدا دەبوو کەرستەی پێویستی ژیانی خەڵکی شەڕ لێ دراوی وڵاتە پان و بەرینەکانیان و ئەو شوێنانەش کە داگیریان کردبوون، دابین بکەن، بۆ ئەم مەبەستە پێویست بە هێزێکی هەرە بنەڕەتی بوو بۆ درێژەدان بە شەڕ. ئەم کارەساتە گەیشتە ئەو رادەیە کە دەوڵەتی ئەمریکاش لەگەڵ وڵاتە هاوپەیمانەکان کەوت و شەڕی دژی فاشیزمی هیتلەری راگەیاند. هاتنی ئەمریکا بۆ گۆرەپانی شەڕ دەورێکی بەرچاوی لە هاوسەنگی هێزەکانی دوو لایەنی شەڕدا نواند، لەبەر ئەوەی کە ئەم وڵاتە وڵاتێکی گەورە و دەوڵەمەند و خاوەن سەرچاوەی ژێر زەوی زۆر بوو. شەڕی دووهەمی جیهانی گەیشتە جێگایەک کە ئەگەر بە شێوەیەک لە رێگەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە و بەتایبەت لە رێگەی ئێرانەوە دەست بەکار نەبوونایەو، لەلایەکەوە کەرەستەو ئیمکاناتی پێویستیان بۆ بەرەکانی ئورووپایی شەڕ لە رێی ناوچەی ئاسیایی یەکیەتی سۆڤیەت بەڕێ نەکردبایەو لەلایەکی دیکەوە بەشێک لە هێزەکانی بەریتانیاو سۆڤیەت بۆ پاراستنی هێندێک هاوسەنگی لە ناوچە جۆراوجۆرەکان یەک لەوان ئێران. ئەهاتبایە، ئیمکانی سەرکەوتنی هاوپەیمانەکان زەحمەت تر دەبوو و یان وەدرەنگ دەکەوت. ئەوە بوو وڵاتە هاوپەیمانەکان بڕیاریاندا کە بە داگیرکردنی ئێران دووکاری گرینگ بکەن:

١- پێشی دەست تێوەردانی ئیحتیمالیی هێندێک لە ناوچەکانی عەرەبی و بە تایبەتی تورکیە کە لە ئاڵمانی نازی زۆر زۆر نزیک کەوتبووەوە بگرن.

٢- پێشی نفووزی فاشیزم لە ئێران و ناوچەکەدا بگرن و کەرەستەو ئیمکاناتی پێویست چ نیزامی و چ ئاسایی بۆ بەرەکانی ئورووپا، بە تایبەت بۆ سۆڤیەت بنێرن.

دوو وڵاتی گەورەی هاوپەیمان واتە یەکیەتیی سۆڤیەت و بەریتانیا رۆژی ٣ی خەرمانانی ١٣٢٠ هاتنە ناو خاکی ئێرانەوە و دوای ئەوانیش ئەمریکا هێزێکی دیکەی هێنا و بە هۆی ئەم هێرشە حکوومەتی رەزاخان، کە تا ئەو دەم بڕستی لە هەموو

ئینسـانێکی ئازادیخـواز بریبـوو و هەمـوو گـەلانی ئێـران کـەوتبـوونە بەر زەبروزەنگ و سەرکوتی ڕێژیمەکەی، بەرگەی نەگرت و تێک رووخا و بە حاڵە حاڵ ڕەزاخان بە هۆی پشتیوانی ئەربابی هەرە گەورەی ئەودەم واتە بریتانیا کە لە ڕاستیدا بۆ خۆی هێنابوویە سەر کار، ڕزگاری هات و لە ڕێکەوتی ۲۵ی خەرمانان، سەرەتا بۆ دورگەی موریس و پاشان بۆ ژۆهانسبورگ لە ئەفریقای باشوور دوور خرایەوە. لەبەر ئەوەی کە تێکەڵاوی و وەک یەک چوونی بۆچوونەکانی حکومەتی ئێران لەو هەل و مەرجەدا لەگەڵ فاشیزم و شەخسی هیتلێر کەم نەبوو و لە لایەکیشەوە دەوڵەتی ئاڵمانی هیتلێری بۆ ئەوەی زانیاریی تەواو لە وەزعی سۆڤیەت و بەرەکانی شەڕ لەو ناوەدا وەربگرێ، بە دەیان و سەدان جاسووس لە لایەن ڕێژیمی ئێرانەوە ئیزن درابوون کە بە قازانجی دەوڵەتی ئاڵمان و حکومەتی نازی جاسووسی بکەن و، ئەوا بۆ خۆی مەترسییەکی گەورە بوو کە دەیتوانی زیانی زۆری ئیزامی بۆ یەکیەتیی سۆڤیەت و وڵاتانی دیکەی هاوپەیمان هەبێ.

دوای دوور خستنەوەی ڕەزاشا، بوونی هێزە هاوپەیمانەکان لەگەڵ ئەوەی کە بەشێکی زۆری ئێرانیان داگیر کردبوو، بەڵام وەکو ڕاستییەک لانی کەم لە باری ژیانی دیوکراتییانەو ئاسایی خەڵک، هێندێک قازانجیشی هەبوو. خەڵکی ئێران کە ماوەیەکی یەکجار زۆر بوو بەهۆی سەرەڕۆیی و دیکتاتۆریی ڕەزاخانی لە هەر چەشنە ئازادییەکی ئینسانی بێ بەش کرابوون، بەبوونی ئەم هێزانە، لە لایەکەوە کەوتنە ئاڵ و گۆری بیروڕا سەبارەت بە هاتنی هێزی وڵاتانی هاوپەیمان، لە نێو خۆیانداو، لە لایەکی دیکەوە هێندێک پێوەندییان لەگەڵ ئەم هێزانە گرت و دەگەڵیان ئاشنا بوون. بە تایبەت کە حەمە ڕەزا شا ئینسانێکی تازەکار بوو و سەرەتا دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەبوو، فەزایەکی تا رادەیەک ئازاد لە هەموو ئێراندا پێکهاتبوو، ئەم وەزعە بۆ گەلانی ئێران کە لە مێژ بوو ستەمیان لێ دەکرا و ئازادییەکانیان بەربەست کرابوو، دەرفەتێکی باش بوو تا ئەفسێک بە ئازادی بکێشن. وردە وردە هێندێک دەستە و ڕێکخراو و حیزب بووژانەوە. بە بوونی ئەو نیوە ئازادییە کە هەردەم رووی لە زیاد بوون بوو، لە ئێراندا بە گشتی و لە کوردستانی ئێران بە تایبەتی کە ئوردووی سوور یان ئەرتەشی سوور لە سنوورەکانی باکوور و باکووری ڕۆژئاواوە هاتبوونە ناو کوردستان دەرفەتێکی گەورە بۆ گەلی کورد ڕەخسا کە هاوکات لەگەڵ ئەفەس کێشانی ئازادانە، هێندێک کردەوەش لە خۆی نیشان بدا. یەکەم کردەوە ئەوە بوو کە خەڵک ڕژانە ناو زۆربەی پادگانەکان و دەستیان بە سەردا گرتن. بنکەو

پایگاکانی ژاندارمری لە زۆر شوێن و لە ماوەی چەند رۆژدا چەک کران. هێزی ئەو جارەی سۆڤیەت کە هاتبووە کوردستان بە پێچەوانەی هێزی سەردەمی تێزار کە کاریان کوشتن و گرتن وتالآن کردن بوو، بەوپەڕی باشییەوە لەگەڵ خەڵک هەڵسوکەوتیان دەکرد و لە راستیدا ئەم جۆرە رەفتارانە بۆ زۆر کەس کە لە سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهانیشدا ئەرتەشی رووسیەیان دیتبوو، چاوەڕوان نەدەکرا. لەگەڵ ئەوەش خەڵک لەم چەشنە هەڵسوکەوتە کەڵکی وەرگرت و هێندێک گۆڕینەوەی بیروڕا و تێکەڵاوی فیکری هاتە گۆڕێ. شایانی باسە کە ئەو کات لە کوردستاندا کەسانێک هەبوون کە وەختی خۆی لە لایەن لەشکری رووسیەوە بەدیل گیرابوون و چەند ساڵێکیان لە زیندانەکانی تیزاردا تێپەڕ کردبوو، ئەوانە تا رادەیەک لەگەڵ زمانی رووسی ئاشنا بوون. بەڵام لە راستیدا ئەم زمانە بۆ زۆربەی هەرە زۆری خەڵک زمانێکی تەواو بێگانە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا وەختێک دووکەس بیانهەوێ بە شێوەیەکی ئاشتییانە ئاڵ و گۆڕی بیروڕا بکەن، نەزانینی زمانی یەکتر، گیرو گرفتێکی گەورە نابێ، هەرچەند هێندێک لە ئەفسەرەکانی ئەرتەشی سوور کورد بوون و کوردییان دەزانی و تەنانەت هێندێک لە سەربازەکانیش کوردی کرمانج بوون کە وەختی خۆی لە تورکیە دەرکرابوون و لە ناوچەکانی ئەرمەنستان و ئازەربایجان نیشتەجێ ببوون. ئەو تێکەڵ بوون و بیروڕا گۆڕینەوە دەورێکی باشی هەبوو لە پێکهێنانی زەمینەیەکی فیکریی لەبار سەبارەت بەئازادی و مافی نەتەوایەتی لە نێو خەڵکی کوردستاندا. ئامادەبوونی زەمینەی بەرەو پێش چوون و خۆ دەرباز کردن لە ژێر سێبەری چەندین ساڵەی دیکتاتۆری سەرنجی ژمارەیەکی زۆر لە کاربەدەستانی وڵاتی سۆڤیەتی راکێشاو بەرە بەرە ئەوانی لەگەڵ ژیان و فەرهەنگ و داب و نەریتی ئەو سەردەمەی کوردەکان ئاشنا کرد.

لەو سەردەمەدا دەرەبەگایەتی لە کوردستان هەروەک باقی شوێنەکانی دیکەی ئێران سیستەمی زاڵ بەسەر کۆمەڵدا بوو و ئەگەر ئەم سیستەمە نەبووبایە بە دڵنیاییەوە دەکرێ بڵێین بە سەرنج دان بەو هەلومەرجە لەباردی کە رەخسابوو، کوردستان وەزعێکی دیکەی دەبوو، خەڵکی کوردستانی ئێران لە قۆناغێکی دیکەی ژیاندا دەبوون. بەهۆی ئەم سیستەمەوە بەشی هەرە زۆری جەماوەری خەڵک واتە جووتیاران لە لایەکەوە بە دەست زوڵم و زۆری حکوومەتەوە کە بۆخۆی نوێنەر و سەمبولی دەرەبەگایەتی بوو، دەیناڵاند و لە لایەکی دیکەشەوە بەهۆی مالیکە گەورەکان بە توندترین شێوە دەچەوسایەوە و لە

هەلومەرجێکی ئەوتۆدا کە ئینگلیزەکان لە بەشێکی باشووری کوردستان و ئەمریکاییەکان لە ئەمیر ئابادی تاران و هێندێک شوێنی دیکە و لە باکووری کوردستانیش رووسەکان دامەزرا بوون، شتێکی ئاساییە کە ئالۆزییەکی بەرچاو لە بەڕێوەچوونی کاروباری کۆمەڵدا دێتە پێشێ. چونکە کاربەدەستانی دەوڵەتی ناوەندی دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان نەمابوو و خەڵک لەبەر بێزاریی زۆر لە حکوومەت، بۆ خۆی کاروباری خۆی رادەپەڕاند. پێکهاتنی ئەو وەزعە شوێنەواری لەسەر رووناکبیران داناو ئەوان بە هەست بە بەرپرسایەتی کەوتنەخۆ. بە تایبەتی هێندێک لەو روونکبیرانەی کە زەجری زۆریان دیتبوو و بۆ ماوەی چەندین ساڵ زیندانی و دوورخراوەییان بە دەست حکوومەتی رەزاخانەوە کێشابوو، زۆر تینووی ئازادی و پێکهاتنی ژیانێکی ئینسانی بۆ گەلەکەیان بوون. گەلی کورد لە کوردستانی ئێران سەرباری ستەمی چینایەتی هەروەک باقی گەلانی دیکەی ئێران، ستەمی نەتەوایەتی و مەزهەبیشی لێ چووە. لەبەر ئەوە شتێکی نائاسایی نییە کە لە یەکەم دەرفەتدا کە وەچنگی کەوتووە، وەکو کورد خۆی بۆ مەترەح بووە و هەموو کێشەکان لەو روانگەوە هەڵدەسەنگێنی و سەرئەنجام رێکخراوێک بە ناوی ژیانەوەی کورد یان«کۆمەڵەی ژ-ک» لە کوردستانی ئێراندا پێک دێنێ.

لێرەدا پێویستە ئەوەش بگوترێ کە بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانی تێکۆشانی کورد لە بەشی رۆژهەڵاتی کوردستاندا بە شێوەی رێکخراوەیی دەستی پێکردوە. یەک لەوانە«کۆمەڵەی جیهان دانی» بە سەرۆکایەتی عبدالرزاق بەگی بەدرخان بوود کە لە ناوچەکانی باکووری کوردستانی ئێران و بە هاوکاریی سمکۆ و هێندێک تێکۆشەری دیکەی کورد پێک هاتبوو، بەڵام زۆر پەرەی نەسەندبوو. هەروەها لە دوایین ساڵی شەڕی یەکەم دا«کۆمەڵەی ئیستخلاسی کوردستان» لە لایەن سەید تەها شەمزینی[*] و بە هاوکاریی سمکۆ دامەزرابوو لە زۆر شوێن تێکۆشانیان هەبوو، بەڵام کارێکی ئەوتۆیان نەکردبوو. سەرهەڵدانەکانی سمکۆ لە بەشێک لە کوردستان و مەحموود خانی دزڵی و مەحموود خانی کانی سانان لە مەریوان، جافر سوڵتان لە هەورامان و مەلا خەلیل لە ناوچەی سەردەشت و مەهاباد لە سەردەمی رەزاخاندا، لەو کۆمەڵە راپەڕین و سەرهەڵدانانەی پێش پێکهاتنی«کۆمەڵەی ژ-ک»ن و، لە ساڵەکانی ١٣١٨و ١٣١٩

(*) مەبەست سەید تەها شەمزینی کوری شێخ عوبەیدوڵلا کوری شێخ تەها شەمزینی پیری تەریقەتە. سەید تەها لە پێوەندی لەگەڵ بزووتنەوەی سمکۆ لەلایەن رەزا شا گیرا و بردیانە تاران و لەوێ دەرمان داو کراو لە گۆڕستانی «ابن بابویە»ی تاران بە خاک ئەسپێردراوە.

حیزبی ئازادیخوازی کوردستان پێکهاتبوو که ژمارەیەکی زۆریان بۆ شارەکانی باشووری ئێران لێ دوور خرانەوە و ژمارەیەکیان گیران که یەک - دووکەسیان به ناوەکانی محەممەد مەحموودیان و حسێن لبادی خەڵکی مەهاباد، ماوەیەکی کورت دوای ئازادبوونیان جوانە مەرگ بوون. بەندییەکان و دوورخراوەکانیش که خەڵکی شوێنە جۆراوجۆرەکانی کوردستان بوون، له خەرمانانی ساڵی ۱۳۲۰ و به تێکچوونی حکوومەتی رەزاخان گەڕانەوە کوردستان، شایانی باسه که به دوای دوور خستنەوە و «تەبعید»ی رەزا شا له لایەن هاوپەیمانەکانەوە، له رێکەوتی نۆی رێبەندانی ساڵی ۱۳۲۰ی هەتاویدا کۆبوونەوەیەکی هاوبەشی باڵوێزەکانی سۆڤیەت و بریتانیا لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئێران پێکهات و پەیمانێک به ناوی «پەیمانی ئیتحاد» له نێوانیاندا مۆر کرا. بەندەکانی پێنج و شەشی ئەم پەیماننامەیه باسی ئەوە دەکەن که:

۱- چوارچێوەی خاکی ئێران بپارێزن و هیچ کارێک نەکەن به پێچەوانەی ئەوە بێ.

۲- شەش مانگ دوای کۆتایی هاتنی شەڕ، هەموو هێزەکانی ولاتانی هاوپەیمان له ئێران بکشێنەوە.

بەشی دووهەم

# دامەزراندنی کۆمەڵەی ژ- ک

لە کۆی ئەم هەلە رەخساوو بارودۆخە ئالۆز و لە باردەدابوو کە «کۆمەڵەی ژ- ک» رۆژی ٢٥ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٢١ی هەتاوی لە شاری مەهاباد پێکهات و دەستی بە تێکۆشانی یەکجار نهێنی کرد. «کۆمەڵەی ژ-ک» رێکخراوێکی بە تەواوی نهێنی بوو و بەهۆی ژمارەیەک لە رۆشنبیرانی کوردی دانیشتووی شاری مەهاباد و لەسەر بناخەی بەدەستەوە گرتنی دەسەلات و حاکمییەتی کورد بە دەستی کورد دامەزراوە. دامەزرێنەر و کارگێڕ سەرەکییەکانیشی بریتی بوون لە: مەلا عەبدوللا داودی، حسێن فروهەر، عەبدولرەحمان زەبیحی، عەبدولرەحمان ئیمامی، مەلا عەبدولقادر مودەریسی، نەجمەدین تەوحیدی، محەمەد نانەوا زادە، عەلی مەحموودی، محەمەد نەسحابی، عەبدولرەحمان کیانی، سەدیق حەیدەری، قاسم قادری، عەزیز زەندی، محەممەد یاهو، احمد عیلمی، میر حاج و مستەفا خۆشناویش بە نوێنەری حیزبی هیوای کوردستانی عێراق بەشداری کۆبوونەوەی ئەسلی بوون کە رێبەری کۆمەڵەی تێدا هەڵبژێردراوە و لە بانەمەڕی ساڵی ١٣٢٢ی هەتاویدا بەستراوە. هەرچەند زۆرتر باسی یازدە کەس دەکرێ کە پێکهێنەری کۆمەڵە بوون.

دامەزرانی «کۆمەڵەی ژ- ک»، لە لایەکەوە لەسەر کۆمەڵی تینووی ئازادیی کوردەواری کە بۆماوەیەکی دوور و درێژ چەوسابووەوە، شوێنەواری دانا و بەرەو خەبات کردن هانی دان و، لە لایەکی دیکەوە دەستی کرد بە نزیکایەتی کردن و پێکهێنانی دۆستایەتی لەگەڵ هێزەکانی دیکەی کوردستان و بە تایبەت لەو سەردەمەدا لەگەڵ حیزبی هیوا لە کوردستانی عێراق کە پێشتر بە هۆی چەند کەس وەک رەفیق حیلمی و مەحموود جەوودەت لە کوردە نیشتمانپەروەکانی کوردستانی عێراق دامەزرابوو. ئەم حیزبە بە شێوەیەکی جیدی تاوی دایە هاوکاری کردن لەگەڵ کۆمەڵە و بەشداری کردنی میر حاج و مستەفا خۆشناویش لە

کۆبوونەوەی سەرەکیی دامەزرانی کۆمەڵەدا هەر لەم پێوەندییەدا بوو. میر حاج و مستەفا خۆشناو لە ئەفسەرەکانی ئەرتەشی عێراق بوون کە دوایەش لە راپەڕینی بارزانییەکاندا بەشدارییان کرد و لە کۆماری کوردستانیشدا بەرپرسایەتییان هەبوو و دوای رووخانی کۆمار لەگەڵ سەرۆک مستەفا بارزانیدا مەهابادیان بەجێ هێشت. میر حاج دەگەڵ بارزانییەکان چووە سۆڤیەت و دوایەش لەگەڵ وان گەڕاوە، مستەفا خۆشناو گەڕاوە عێراق و لەگەڵ سێ ئەفسەری دیکە بەو ناوانە ئیعدام کران: عیزەت عەبدولعەزیز، محەممەد مەحموود قودسی و خەیروڵلا عەبدولکەریم.

کۆمەڵەی ژ-ک، رێکخراوێکی داخراو بوو، بۆ غەیرە کورد و هەر کوردێکیش کە خوازیاری چوون بۆ ناو ریزەکانی کۆمەڵە بووایە دەبوو تاقی کارییەکی دژوار تێپەڕ بکات و لە هەموو بارێکەوە جێی دڵنیایی بوایە. پاشانیش بە قورئان سوێند دەدرا. ئەم شێوە وەرگرتنەی ئەندام و لایەنگر لەلایەن کۆمەڵەوە بە سەرنجدان بە هەل و مەرجی ئەو کاتی خەبات لە پێناو وەدیهێنانی مافی نەتەوایەتییەوە، شتێکی گونجاو لەگەڵ ئەو سەردەمە بوو، سەرەڕای ئەم نهێنی کاری و بەر تەسک بوونەی ئیمکانی تێکۆشانی بەربلاو، کۆمەڵەی ژ-ک توانیویەتی لە روونکردنەوە و راپەڕاندنی خەڵکی کوردستاندا دەوری بەرچاوی هەبێ. بەم هۆیەشە کە زۆربەی هاوڕێیانی حیزبی و مێژوونووسەکان لەسەر ئەو بڕوایەن کە پایە و بناغەی حیزبی دێموکراتی کوردستان هەر«کۆمەڵەی ژ-ک»ە. رەنگە بە بۆچوونێکی ئاوا ناسیۆنالیستییەوە کۆمەڵەی ژ-ک نەیتوانیبێ زۆربەی روناکبیرانی ئەودەم بۆ لای خۆی رابکێشێ، بەڵام لە کۆمەڵی کوردەواریی ئەوکاتی کوردستانی ناوەندیدا بە تایبەت و تا رادەیەکیش لە سەقز و بانە و هەروەها لە باکووری کوردستانی ئێران پەرەی ئەستاند و توانی ببێتە هێزێکی زۆر فەعال و تێکۆشەر. کۆمەڵە هەستی کوردایەتی تا رادەیەکی زۆر لە نێو خەڵکدا زیندوو کردەوە و بە هۆی پێوەندی لەگەڵ کوردستانی عێراق و هێنانی بڵاوکراوەکانی ئەوێ، وردە وردە خەڵکی لەگەڵ ئەدەبیاتی کوردیش ئاشنا کرد. هەروەها بۆ بڵاوکردنەوەی بۆچوون و سیاسەتی کۆمەڵە، یەکەم گۆڤاری کوردی لە کوردستانی ئێران بە ناوی «نیشتمان» لە لایەن ئەم رێکخراوە چاپ و بڵاوکرایەوە. دەرکردنی ئەو گۆڤارە هەتا ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی درێژەی کێشا.

لە دوایین ساڵی تێکۆشانی کۆمەڵە و هەروەها لە کاتی دامەزرانی حیزبی دێموکراتی کوردستاندا، دوو قوتابخانەی کوردیی شەوانە، یەکیان بە ناوی«گەلاوێژ» لە گەڕەکی

قووله قەبرانی مەهاباد بە بەرپرسایەتیی مەلا عبداللە داودی کە بە مەلای حەجۆکی بەناوبانگ بوو و لە پێشدا لە ماڵی حاجی ئەحمەدی گادانی دامەزراوە و دوایەش گوێزراوەتەوە بۆ ماڵی حاجی سەید عبداللە تەها زادە هەر لەو گەڕەکەو، دووهەمیان بە ناوی«ئازادی» لە گەڕەکی ئەرمەنیان لە نزیک ماڵی حەمەدی مەولوودی، دامەزراوە. لە پێشدا هێندێک لاوی خوێندەوار لە قوتابخانەی گەلاوێژ فێری کوردی بوون، دوایەش قوتابییەکانی خاوەن هەست و رۆڵەکانی ئەندامانی جێ باوەڕی ژ-ک بە نیوە نهێنی شەوانە لە دوو قوتابخانەدا دەیانخوێند.[*]



(*) لە رۆژنامەی ژمارە ١١ی «کوردستان»دا ناوی بەشێک لە دەستەی هەوەڵ و دووهەمی قوتابییەکان هاتووە.

کۆمەڵەی ژ-ک ماوەی سێ ساڵ تێکۆشانی بەردەوام و نهێنی خۆی درێژە پێ دەدا و پێگەیەکی کۆمەڵایەتی پەیدا دەکا. بەڵام لە راستیدا لەبەر ئەوەی ئامانجەکانی خۆی بە شێوەیەکی زانستییانە نەهێنابووە گۆڕێ و باسێکی ئەوتۆیان لە دیموکراسی و خودموختاری بۆ خەڵک پێ نەبوو، نەیتوانی بە تەواوی گەشە بستێنێ. بە تایبەت لەبەر ئەوەی کە فەزای سیاسی ئێران بەرەو دیموکراتیزەبوون دەرۆیشت و لە زۆر شوێن حیزب و رێکخراوی نوێ پێکهاتبوو لە کوردستاندا کە ئەوکات بە تایبەتی دانیشتووی زۆری غەیرە کوردی وەک ئازەری ، ئەرمەنی و ئاسوری و کەلیمی لێ بوو، بۆچوونەکانی ژ-ک لە پێوەندی لەگەڵ ئەم کەمایەسییانەدا ناسیۆنالیستانە بوو، پێویست بوو کە ئاڵ و گۆڕێک لە وەزعی کۆمەڵەدا بێتە پێشی و بەرنامەیەکی نوێ بۆ کاروتێکۆشانی دوا رۆژی دیاری بکرێت. لەو ماوەدا کە کۆمەڵەی ژ-ک خەریکی تێکۆشان بوو، ژمارەیەک لە پیاوانی ناسراوی ئەو کاتە هێندێک سەفەریان بۆ دەرەوەی کوردستان کرد. دووجار هەیئەتی کورد چوونە تەورێز کە لەو سەردەمەدا فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان لەوێ تێکۆشانی زۆری هەبوو و، لەوێشەوە بۆ باکۆ دەعوەت کران. ئەو سەفەرانە دوو شوێنەواری جیاوازی لەسەر ئەفرادی هەیئەتەکان دانا، دیارە بەشی زۆری بەشدارانی ئەو هەیئەتانە لە مالیکە گەورەکان بوون و تەنیا ژمارەیەکی کەمیان رووناکبیری وەک قاضی محەممەد لەگەڵ بوو. ئەو دوو تیپە لە سەفەرەکەیاندا دوو روانگەی جۆراوجۆریان هەبوو. ئەوەی رووناکبیرێکی دیموکرات و بە بیروباوەڕ بوو، رزگاری و بەختیاریی گەلەکەی بەلاوە مەبەست بوو و ئاواتی ئەوە بوو کە رۆژێک لە رۆژان لە کوردستانیش دامەزراوی سەنعەتی گەورە و کارخانەی بە سوود دابمەزرێ و ژیانێکی پڕ لە خۆشی و کامەرانی بۆ گەلەکەی وەدی بێت و بۆ گەیشتن بەم ئامانجانەش بەرنامەی کاری خۆیان لەسەر ئەم بنچینە دابڕێژن. بەڵام بۆ مالیک و دەرەبەگەکان کە دەسەڵاتی سەرەکیی کۆمەڵیشیان لە دەست دابوو، هیواخواستن بە بوونی وەزعێکی ئەوتۆ بە مانای ئەمانی دەسەڵاتیان و لە ئاکامدا رووخانی سیستەمەکەیان بوو. هەر بۆیەش لەو سەفەرانەدا جیاوازیی بیروبۆچوون پەیدا دەبێ، روانگەی قازی محەممەد و هاوبیرەکانی لە حاست ئیسلاح و بەرەو پێش بردن و دیموکراتیزەکردنی کوردستان، دەچووە پێشێ و، روانگەی ئەوانی دیکە لە چوارچێوەیەکی وشکی کوردایەتی داو تەنیا لەبەر ئەوەی کە بارودۆخی کۆمەڵ لە چوارچێوەیەکی بەر تەسکدا رابگرێ و حاکمییەتی خۆی لە قالبی ئەم بۆچوونەدا دابین بکات. ئەو سەفەرانە و گێرانەوەی باسی چاوپێکەوتنەکان لە

راستیدا شوێنەواری زۆر بەرچاوی لەسەر کۆمەڵی رۆشنبیرانی ئەو دەمی کوردستان دا هەبوو. ئەو کەسانەی کە بە بیروباوەڕ بوون زیاتر شتەکانیان وەردەگرت و بەرەو دیموکراتیزەکردن و پەرەپێدانی ژیانی هاوبەش و پێشکەوتووانە لەگەڵ سەرجەمی دانیشتوانی کوردستان و هاوکاری کردنی گەلانی دیکەی ئێران و ئەو رێکخراو و حیزبانەی کە تازە پێکهاتبوون، هەنگاویان دەنا، وەک باس دەکرێ هێندێک لە ئەفرادی کۆمەڵە، کەسانی بەرچاو تەنگ بوون و لە چوونی کەسایەتیی وەک قازی محەممەد کە خاوەنی ئەو بیروبۆچوونە بوو و خۆشەویستیی تایبەتیشی لە نێو خەڵک دا هەبوو، دەترسان.

لە ئاخرونۆخرەکانی تێکۆشانی کۆمەڵەدا کە تارادەیەک زەمینەی فیکری لە نێو خەڵکی کوردستاندا پێکهاتبوو و رۆژنامەو گۆڤار بڵاودەبوونەوە و، بیروباوەڕی چەپ لە نێو بەشێک لە رووناکبیراندا برەوی پەیدا کردبوو، بۆچوونی دامەزرانی رێکخراوێکی نوێ و گونجاو لەگەڵ هەلومەرج دا، هاتە ئاراوە. ئەم بۆچوونە پێی وابوو دەبێ بۆ پێکهێنانی حیزبێک کە لەلایەک هەموو ویست و داخوازی خەڵکی کوردستان وەدی بێنێ و لەلایەکی دیکەوە هاوکاریی هەمەلایەنەی هەبێ لەگەڵ گەلی ئازەربایجان کە ئەوکات خەریکی تێکۆشانی زۆر بەرچاو و خەریکی پێکهێنانی کۆماری خۆیان بوون و، هەروەها بۆ هاوکاری کردنی گەلانی دیکەی ئێران بۆ وەرگرتنی دەسەڵات هەوڵ بدرێ. ئەرکێکی دیکەش کە دەکەوتە ئەستۆی ئەو شێوە بۆچوونە، پەرەپێدانی دۆستایەتی و ئاڵ و گۆڕی بیروڕا بوو لەگەڵ هێزەکانی دیکەی کوردستانی لەبەشە جیاجیاکانی کوردستاندا.

سەبارەت بە چوونی قازی محەممەد بۆ نێو ریزەکانی کۆمەڵەی ژ-ک هێندێک دەڵێن کە خۆی بەوە رازی نەدەبوو کە لەو چوارچێوە بەرتەسکەدا تێکۆشانی هەبێ. لەبەر ئەوەی کە بۆچوونی دیموکراتیکی کەم تێدا بووە. بەڵام بەهۆی پێکهاتنی ئەو زەمینەیە کە باس کرا، سەرەنجام قاضی محەممەد بڕیار دەدا کە بچێتە نێو کۆمەڵەوە.

بە دوای وەرگیرانی وەک ئەندامی کۆمەڵەی ژ-ک کە هێندێک پێیان وایە لە ماڵی مام ئەحمەدی نیلاهی و هێندێکیش دەڵێن لە ماڵی کاک دڵشادی رەسووڵی بووە. هەروەک ژمارەیەک لە ئەندامانی ناوەندی کۆمەڵەش پێشبینییان کردبوو، وەزعی کۆمەڵەی- ژ-ک بەرەو دیوکراتیزەبوون دەڕوا و باسی پەرەپێدانی دیموکراسی و پاراستنی بە توندی دێتە ئاراوە. قازی محەممەد لە کۆبوونەوەکاندا بیروبۆچوونی خۆی باس دەکا و ئەو بۆچوونانە لە سەر بەشێکی زۆر لە ئەفرادی رێبەرایەتی ژ-ک شوێنەوار دادەنێ. بە

تایبەت ئەم باسە دێتە گۆڕێ کە ئەگەر مافی ئەو خەڵکە غەیرە کوردەی کە لە کوردستان دەژین و فەرهەنگ و داب و نەریت و مافی جیاوازیان هەیە، لەبەرچاو نەگیری و بفەوتێ، ئەوکات جیاوازیمان لەگەڵ ڕێژیمی پاشایەتی چییە؟ بۆیە ئێمە نەتەنیا دەبێ وەک کورد مەسەلەکەی خۆمان لەبەر چاو بێ، بەڵکو دەبێ بۆ ڕاکێشانی ئەزەر و پشتیوانی گەلانی دیکەی ئێرانیش هەوڵ بدەین. لەم پێوەندییەدا دەبێ بۆ هاوکاری کردن لەگەڵ سەرجەم هێزە شۆڕشگێڕەکانی ئێرانی هەنگاو هەڵبێنینەوە. لە لایەکی دیکەوە دوای پێکهاتنی کۆمەڵەی ژ-ک، هێندێک لە ڕێبەرانی ئەو ڕێکخراوە لەگەڵ نوێنەرانی ئەو هێزانەی کە ئێرانیان داگیر کردبوو، وتوویژیان کردووە، تەنانەت ئەو نوێنەرانە چەند جار هاتوونەتە کوردستان و لەگەڵ ئەوەی کە قازی محەممەد ئەندامی کۆمەڵەش نەبووە، تەنیا وەک کەسایەتییەکی ناسراو و خاوەن ئەزەر چاویان پێکەوتووە و ئەزەر خوازییان لێکردووە. بۆ وێنە یەکەمین چاوپێکەوتنی پێشەوا لەگەڵ نوێنەرانی ئەمریکا و ئینگلیس ڕۆژی ٢٥ی سێپتامبری ١٩٤١ و لە مەهاباد بووە. ئەوان ئەیان دەتوانی هەروا بە سووک و ئاسانی بەوە ڕازی بن کۆمەڵەی ژ-ک بەو بۆچوونە غەیرە دیموکراتیکییەوە بمێنێ و بەنێوی کورد دەسەڵات بە دەستەوە بگرێ. لەو کاتەشدا خەبات دژی ڕێژیمی پاشایەتی بۆ سۆڤییەت گرینگ بووە و بۆ سەرجەم وڵاتانی داگیرکەری ئێرانیش لاواز ڕاگرتنی دەسەڵاتی ناوەندی، وەک مەبەستێک لە ئارادا بووە. بۆ ئەم مەبەستەش گەلی کورد، بەهۆی هێندێک تایبەتمەندی دەیتوانی دەوری بەرچاوی هەبێ. لەم پێناوەدا پێکهێنانی ئاڵ و گۆڕ لە بەرنامە و سیاسەتی ڕێکخراوی کوردیدا بە شتێکی پێویست دەژمێردرا.

بەشی سێیەم

# چۆنیەتی دامەزرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان

دوای هاتنەگۆڕی ئەو بیروبۆچوونانە لە لایەن قازی محەمەدەوە لە هاوینی ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی دا کۆبوونەوەیەکی هاوبەشی هێندێک کەسایەتی ناسراوی وەک قاضی محەمەد و بەشێک لە ئەفرادی بەناوبانگی کۆمەڵەی ژ-ک کە قەناعەتیان بە بۆچوونەکانی ناوبراو هێنابوو، پێکهات کە لەو کۆبوونەوەدا هاتنە سەر ئەو بڕوایە کە پێویستە لەسەر ئەساسی ڕێزگرتن لە دێموکراتیەت و پاراستنی مافی گەلانی دیکەی ئێران ڕێک بکەون و بناخەی حیزبی دێموکراتی کوردستان، دابڕێژن. بۆ ئەم مەبەستە تۆمارێکی گەورەی پارچەیی لە ئەندامانی کۆمەڵە کۆ دەکرێتەوە کە داوای بوونی کۆمەڵە بە حیزبی دێموکراتی کوردستان دەکەن.

### بڕوای ئێمە لەسەر ٢٥ی گەلاوێژ:

لەسەر ڕۆژی دامەزرانی حیزب، ئێمە لەسەر ئەو بڕوایەین کە کۆبوونەوەکەی مانگی گەلاوێژی ١٣٢٤ سەبارەت بەوە بووە کە کۆمەڵەی ژ-ک ببێتە حیزبی دێموکرات. زۆر وێدەچێ بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە هەر ئەو دەم لەسەر ئەو مەسەلە ساغ بووبنەوە. چونکە بە دوای ئەم کۆبوونەوەدا تۆمارێکی گەورەش ئامادە و ئیمزا کراوە. ئەندامانی «ژ-ک»یش ئیمزایان کردووە و خوازیاری ئەم ئێو گۆڕینە بوون.

زۆر وێدەچێ هەر ئەو ڕۆژەش لەسەر ئەوە ڕێک کەوتبن کە هەر لەسەر بنەمای ژ-ک دامەرزێ. بڕواشیان وابووبێ ئێستا کە هەموو کادر و ئەندامەکان دەچنە ژێر پۆششی حیزبی دیموکراتی کوردستان بۆ ڕێزگرتن لە زەحمەت و تێکۆشانیان، ڕۆژی ٢٥ی گەلاوێژ هەر ببێتە ڕۆژی دامەرزانی حیزب.

وێدەچێ هەر لە سەر ئەو ڕێککەوتنەش بێ کە ساڵێک دواتر واتە لە ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢٥ لە کۆبوونەوەیەکی ڕەسمیدا کە بۆ بەڕێوەبردنی ڕێ و ڕەسمی دامەرزانی حیزب لە ناوەندی حیزب گیراوە. سەید محەممەد تەها زادە «ئەیووبیان» وەک ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و ڕاگەیاندنی پیرۆزبایی لە بەشداران کە پێشتریش و دواتریش لە زۆر شوێن لە جیاتی پێشەوا قسەی کردووە، ڕایگەیاندوە کە ئەمڕۆ واتە ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢٥ حیزبمان دەچێتە پێنجەمین ساڵی خەباتی خۆی یا بە وتەیەکی دی چوار ساڵ لە دامەزرانی تێدەپەڕێ.

بە بڕوای ئێمە ئەگەر ڕاگەیاندنی ئەم مەسەلەیە بە شێوەی ڕەسمی لە ١/٨/ ٢٤ دا بە شێوەی ئیعلامییەی ڕەسمی لە هەشت ماددە وەک بەرنامە ڕاگەیەندراوە، بە دوو دەلیل بووە:

١- بۆ ئەوەی ڕیعایەتی دیموکراسی کرابێ و مەودای هەڵسەنگاندن و بیر لێکردنەوەو بڕیاردان لەسەر ئەم مەسەلە گرینگە بخرێتە بەر ڕاوبۆچوونی بەشداران و بە سەربەستی و مەودایەکی زیاترەوە ئەزەر بدەن و خۆیان بە تەواوی ساغ کەنەوە.
٢- هەر ئەو ئیعلامییە بۆیە ڕۆژێک پێشتر ئامادە کراوە و بڵاوبووەتەوە، تا بەشدارانی کۆنگرە، کە زۆریان لە ڕێگەی دوور ڕا هاتوون و پێشتر لە باس لەسەر ئەم مەوزووعەدا بەشدار نەبوون و لە کۆبوونەوەی مانگی گەلاوێژیشدا لەوێ نەبوون، باشتر لە بۆچوونەکانی گشتی حاڵی بن و چالاکانەتر لەم بوارە و لە دانیشتنەکانی کۆنگرەدا بەشداری بکەن.

لە کۆنگرەشدا بە تەواوی ساغ بوونەوە و بە تەواوی «ژ-ک»یان بە ڕۆژی لە دایک بوونەکەیەوە هێناوەتە سەر حیزبی دیموکراتی کوردستان.

لە ڕێکەوتی هەوەڵی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی، ڕاگەیاندراوێک بە نیمزای ٧٠تا ٨٠ کەس لە کەسانی ناسراو و جێی بڕوا بڵاودەبێتەوە کە ئامانجە سەرەکییەکانی خۆیان لە هەشت ماددە دا گونجاندووە و دامەزرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان رادەگەیەنن، ئەوەش دەقی ڕاگەیاندراوەکە:(*)

(*) لە کتێبی حکومەتی کوردستان- ئەوشیروان مستەفا ئەمین ل ٨١

## بسم الله الرحمن الرحيم

بەیاننامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان

**هاونیشتمانان، برایان!**

ئاگری شەڕی جیهانگیر کە بەهۆی دوژمنانی ئازادی و لە ژێرپێنەرانی دیموکراسی هەڵگیرسابوو، بە باسکی بەهێزی سەربازانی ئازای هاوپەیمانی گەورەی ئێمە کوژایەوە. دنیای دیموکراسی سەرکەوت و دنیای فاشیستی کە هەوڵی دەدا گەلان و نەتەوەکانی جیهان لە ژێر دەستی چەند نەفەر ملهور و سەردەڕۆدا یەخسیر بکا، بە شێوەیەکی قەتعی تێکشکا و لێک بڵاو بوو و هەروەها کە چاوەڕوان دەکرا، بۆ ئازادیی گەلان و نەتەوەکانی جیهان ڕێگا خۆش کرا. ئەمڕۆ گەلانی دنیا لە گەورە و بچووک دەیانهەوێ لەو ڕێگایەی کە بەرەو ئازادی خۆش کراوە کەڵک وەرگرن و لەو بەڵێنی یانەی کە بەهۆی مەنشووری مێژوویی ئاتلانتیکەوە دراوە سوود ببینن و هەڵسووراندنی کاروباری خۆیان بە دەستەوە بگرن و چارەنووسی خۆیان بە مەیل و ویستی خۆیان دیاری بکەن.

ئێمەی کورد کە لە ئێران دەژین، ساڵەها و بەڵکو چەندین سەد ساڵە کە لە پێناوی ماف و دەسەڵاتی نەتەوەیی و مەحەللی خەباتمان کردووەو قوربانیمان داوە.

بە داخەوە کاربەدەستانی سەرەڕۆی ئێران بە هیچ جۆرێک حازر نەبوون قسەی حیسیبیی ئێمە قبووڵ بکەن و تەنانەت نەیانهێشتووە ئێمە لەو مافەش کەڵک وەربگرین کە قانوونی ئەساسی بۆ ئەیالەتەکان و ویلایەتەکانی ئێران داینا‌وە و بەردەوام وەڵامی ئێمە گوللە و بۆمب و تۆپ و زیندان و تەبعیدو یەخسیری بووە.

بە تایبەتی لە سەردەمی بیست ساڵەی ڕەزا خاندا تەنانەت لە لەبەرکردنی جل و بەرگیش دا ئازاد نەبووین، بە زۆری سەرنێزە بە هۆی ئەفسەرانی دز و خائین و تاڵانکەرەوە هەموو دارایی و ژیانی ئێمەیان تەفروتوونا کردووەو چاویان لە ناموس و شەڕەفی ئێمەوە بووە و بۆ لە نێو بردن و خاشەبڕکردنی نەسڵی ئێمە لە هیچ نزمی و درندەییەک خۆیان نەپاراستووە. ئاخر ئێمەش ئینسانین، ئێمەش مێژوو، زمان و شوێنەواری خۆمان هەیە کە

لامان خۆشەویستن. بۆچی دەبێ مافی ئێمە لە ژێر پێ بنرێ؟ بۆچی ناتوانین لە نێو ماڵی خۆماندا نازاد و موختاربین؟ بۆچی ڕێگا نادرێ منداڵانی خۆمان بە زمانی کوردی پەروەردە بکەین؟ بۆچی ناهێڵن کوردستان ویلایەتێکی خودموختار بێ و لەلایەن ئەنجوومەنی ویلایەتییەوە ئیدارە بکرێ کە قانوونی ئەساسی دیاری کردووە؟

### هاونیشتمانانی بەرێز!

دەبێ بزانن حەق نادرێ، حەق وەردەگیرێ، ئێمە دەبێ بۆ وەرگرتنی ماف و دەسەڵاتی نەتەوەیی و مەحەللی خۆمان خەبات بکەین. ئەم خەباتەش یەکیەتی و یەکرەنگی پێویستە، ڕێکخراو و پێشەنگی پێویستە، بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزەیە حیزبی دیموکراتی کوردستان دامەزراوە و دەستی بە کار کردووە، ئێوە هاونیشتمانانی خۆشەویست، دەبێ چاو و گوێی خۆتان بکەنەوە و لە دەوری حیزبی نەتەوەی خۆتان کۆ ببنەوە و لە پێناوی وەرگرتنی مافی ڕەوای نەتەوەیی خۆتان فیداکاری بکەن.

حیزبی دیموکراتی کوردستان ڕێبەر و ڕێنوێنی ئێوەیە. تەنیا لە ژێر ئاڵای ئەوە کە نەتەوەی کورد لە مەترسی تەفروتوونابوون ڕزگار دەبێ و هەبوون و ناموس و شەرەفی نەتەوەیی خۆی دەپارێزێ و دەتوانێ لە نێو سنووری دەوڵەتی ئێراندا خودموختاریی نەتەوەیی خۆی وەدەست بێنێ.

### هاونیشتمانان!

ئێمە بێجگە لە مافی ڕەوا و ئینسانیی خۆمان هیچمان ناوێ. دروشمەکانی ئێمە لە بەندەکانی خوارەوەدا خولاسە کراون. بیان خوێننەوە و هەموو گەلی کورد فەردفەردیان تێبگەیەنن. ئەوە دروشمەکانی ئێمەن:

١- نەتەوەی کورد لە نێوخۆی ئێراندا بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری مەحەللی خۆی سەربەخۆ و نازاد بێ و لە سنووری دەوڵەتی ئێراندا خودموختاری خۆی وەدەست بێنێ.

٢- مافی خوێندنی بە زمانی زگماکی خۆی هەبێ و تەواوی کاروباری ئیدارەکان بە هۆی زمانی کوردییەوە بەڕێوە بچێ.

٣- لەسەر بناخەی قانوونی ئەساسی، ئەنجوومەنی ویلایەتی کوردستان بە زوویی هەڵبژێردرێ و بە هەموو کاروباری کۆمەڵایەتی و دەوڵەتی ڕابگا و چاودێرییان بە سەردا بکا.

٤- کاربەدەستانی دەوڵەت دەبێ بە بێ قسە لە خەڵکی ناوچەکان بن.
٥- دەبێ لەسەر ئەساسی قانوونێکی گشتی لە نێوان لادێی و خاوەن موڵکدا رێککەوتنێک پێک بهێنرێ و دوارۆژی هەردوولا دابین بکرێ.
٦- حیزبی دێموکراتی کوردستان تێدەکۆشێ کە لە خەباتدا بە تایبەتی لەگەڵ نەتەوەی ئازەربایجان و کەمایەتییەکانی تر کە لە ئازەربایجان دەژین، ئاسوورییەکان و ئەرمەنییەکان و هی دیکە، یەکیەتی و برایەتییەکی تەواو پێک بهێنێ.
٧- حیزبی دێموکرات بە ئامانجی بەرەو پێش بردنی کشتوکاڵ و بازرگانی و پەرەپێدانی فەرهەنگ و لەش ساغی و باشترکردنی ژیانی ئابووری و مەعنەویی گەلی کورد دەست دەکا بە سوود وەرگرتن لە سامانەکانی سروشتی و کانگاکانی کوردستان و لەو رێگایەدا تێدەکۆشی.
٨- ئێمە دەمانەوێ تەواوی گەلەکانی ئێران هەلی تێکۆشانی بە ئازادییان بدرێتێ بۆ بەختەوەری و پێش خستنی نیشتمانی خۆیان.

بەم شێوەیە حیزبی دێوکراتی کوردستان رەسمەن تێکۆشانی خۆی دەست پێکردووە، و بنەمای کاروتێکۆشانی بە کورتی ئەو هەشت ماددەیە بووە کە لە راگەیاندراوەکەدا هاتووە. رۆژی دوای بڵاوبوونەوەی راگەیەندراوەکە واتە دووی خەزەڵوەری ساڵی ٢٤ یەکەم کۆنگرەی حیزب بە بەشداریی بەشێکی زۆر لە کەسایەتییە ناسراوەکانی کوردستان و رێبەرایەتی و ئەندامانی کۆمەڵەی ژ-ک لە مەهاباد پێک دێ کە لەودا سەدری حیزب و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی هەڵدەبژێردرێن و مەرامنامەیەکی ٢٢ ماددەیی پەسەند دەکەن. دەقی تەواوی مەرامناکە بەم جۆرە بوو کە لە مانگی سەرماوەز دا بڵاو کراوەتەوە:

**فەصلی یەکەم:**
١- ناوی حیزب: حیزبی دێوکراتی کوردستانە.
٢- حیزب لەسەر ئەم بناغانە دامەزراوە: حەقیقەت، عەدالەت، ئەمەدوون. هەموو نیزامنامە و قانوونەکانی حیزب پاش پەسەندکران لە لایەن کۆنگرەوە جێ بەجێ ئەکرێن.
٣- قەڵەم و گوڵە گەنم بۆ عەلامەتی حیزب قبووڵ کراوە.

## فەسلی دووهەم

٤- لە قۆناغی ئێستادا گەورەترین ئامانجی حیزب بریتییە لەوەی کە لە نێو سنوورەکانی دەوڵەتی ئێراندا، پارێزگاریی مافەکانی کورد بکا و بۆ جێگیرکردنی ڕێگەی خودموختاری هەڵبژێری. لە هەموو ئەو ئەیالات و ویلایەتانەدا کە بە درێژایی مێژوو کوردیان تێدا ژیاوە و زەحمەتی کێشاوە، هەروەها لە کوردستان ئەبێ لەسەر بنچینەی دیموکراسی، قازانجەکانی کۆمەڵانی خەڵک ڕەچاو بکرێ، ئەبێ بێ گوێدانە جیاوازیی میللی و قەومی و مەزهەبی، بۆ هەڵبژاردنی نوێنەر بۆ مەجلیسی شوورای میللی مافی وەکو یەکیان هەبێ.

٥- ئامانجی حیزب بریتییە لە پەرەپێدانی دیموکراسی، لەسەر ئەو بنچینەیە تێ ئەکۆشێ بۆ خۆشیی مرۆڤایەتی.

٦- حیزب هیچ دوژمنایەتی و ناکۆکییەکی لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی نییە، بەڵام ئەیەوێ بە ڕێگای هێمنانە تێبکۆشێ بۆ گەشەپێدانی فەرهەنگ و لەش ساغی و کشتوکاڵی گەلی کورد کە لە ئەنجامی دەسەڵاتی چەوسێنەران دا بە دواکەوتوویی ماوەتەوە، بۆ ئەمەش داواکاری مافی خودموختاریی میللییە.

## فەسلی سێهەم

٧- هەموو مالیات و عەواریز بە شێوەی زەرووری کۆ ئەکرێتەوە و لەسەر بنچینەی بوودجە ڕێک ئەخرێ و دابەش ئەکرێ.

٨- یەکەمین هەنگاوی حکوومەتی میللی ئەوەیە دەس ئەکا بە ئاوادکردنەوەی وڵات و پەرەپێدانی ڕێکخراوی ئابووری و سیاسی، لەبەر ئەوە ناتوانێ زیاتر لە ٣٠٪ی مالیاتی کۆکراوە بە حکوومەتی مەرکەزی بدات.

٩- ئەبێ هەموو مەئموورانی کیشوەری و سیاسی و دائیرەکانی کشتوکاڵ کورد بن. حکوومەتی میللی هەرکاتێ بە پێویستی زانی ڕاوێژکارانی بێگانە بانگ ئەکا. هەموو کارەکانی کۆمەڵایەتی و دەوڵەتی و دادگوستەری ئەبێ بە زمانی کوردی بنووسرێن و بەڕێوە ببرێن.

١٠- حیزب تێ ئەکۆشێ بۆ گەشەپێدانی کشتوکاڵ ماشێن بکرێ و هەوڵ ئەدا ئەو بەروبوومەی جووتیاران بەرهەمی ئەهێنن، بە باشی بفرۆشرێ.

١١- حیزب تێ ئەکۆشێ بۆ ئاوەدانی و پاراستنی لەش ساغی دێهات و بۆ نەهێشتنی ئەو کۆسپانەی لە رێی هاتوچۆدایە لە دێ یەکەوە بۆ دێ یەکی تر.
١٢- حیزب بە بێ جیاوازی نەتەوایەتی و قەومی و مەزهەبی حیمایەت لە ژیانی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی و لەش ساغی هەموو زەحمەتکێشان ئەکا کە لە کوردستان ئەژین.
١٣- بە مەبەستی پەرەپێدانی زانست و شارستانیەتی لە نێو خەڵکی کوردستاندا، خوێندنی قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی ئەکرێتە ئیجباری و لە هەموو قوتابخانەکاندا ئەبێ بە زمانی کوردی دەرس بخوێنرێ.
١٤- بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانین و ژیان و شارستانیەتی خەڵک، ژمارەیەکی زۆر ناوەندی زانستی کتێبخانە، قەرائەتخانە، کلوب، تیئاتر و مەیدانی وەرزش دادەمەزرێنێ.
١٥- هەموو مەئموورانی کوردی کە لە ئەیالات و ویلایەتی تردا لە ئیدارە و ئەرتەشدا کار ئەکەن، ئەبێ بگەرێنەوە بۆ کوردستان.
١٦- حکوومەتی میللی بە لەبەر چاوگرتنی قازانجەکانی خۆی پێوەندیی فەرهەنگی و ئابووری لەگەڵ دەوڵەتانی تر، لە پلەی یەکەمدا لەگەڵ دەوڵەتی گەورەی یەکیەتی سۆڤیەت، دادەمەزرێنێ.
١٧- حکوومەتی ناوچەیی کوردستان لە هەموو کۆنفرانسە جیهانییەکاندا کە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی دەبەسترێن، بە پێی ژمارەی خۆی داوای بەشداربوون ئەکات.
١٨- حکوومەتی خودموختاری کوردستان ئەبێ دەسەلاتی هەبێ کە ئیمتیازی دەرهێنانی کانە دەرهێنراو و دەرنەهێنراوەکانی کوردستان بدات بە هەر کەس کە بیهەوێ.

**فەسلی چوارەم**

١٩- حکوومەتی میللی بۆ دابین کردنی پێویستییەکانی خەڵکی کوردستان بە رێگای هەرزان و رەحەت بە توندی دژی سەلەم و گرانفرۆشی و محتکران رادەوستێ.
٢٠- حکوومەتی میللی پەرە بە ئابووری کوردستان ئەدا، لە هەموو شارەکاندا کارگە دادەمەزرێنێ، ئەبێ دەستی گلاوی ئیستعمار لە سامانی سروشتی ئێمە ببڕێ، ئەبێ بۆ خۆمان سوود لەم سامانە وەربگرین و لە هەمان کاتدا سوود بە مرۆڤایەتییش بگەیەنین.

٢١- نەبێ لە هەموو کاروباری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیدا ژنان وەکو پیاوان مافی وەکو یەکیان هەبێ.
٢٢- نەبێ مافی کەمە نەتەوەییەکان کە لە کوردستان ئەژین، وەکو ئازەربایجانی ئەرمەنی و ئاسوری بە تەواوی دابین بکرێ.

حیزبی دیموکراتی کوردستان- سەرماوەزی ١٣٢٤

هەروەک باس کرا. لەو کۆنگرەدا وێڕای پەسەند کردنی ئەم مەرامنامە ٢٢ ماددەییە، سەدری حیزب و ئەندامانی ناوەندیی حیزبیش هەڵبژێردران کە بریتی بوون لە:
قازی محەممەد (سەدری حیزب)، حاجی بابە شێخ، محەممەد حسێن سەیفی قازی، رەحمانی زەبیحی، مەناف کەریمی، سەید محەممەد تەها زادە یان ئەیووبیان، عەبدولرەحمان ئیلخانی زادە، ئیسماعیل ئێلخانی زادە، ئەحمەد ئیلاهی، خەلیل خوسرەوی، کەریم ئەحمەدین، حاجی مستەفا داودی، محەممەد ئەمین موعینی، مەحموود وەلی زادە، محەممەد رەسووڵ دلشاد، محەممەد ئەمین شەرەفی، هەروەها ئەو کەسانەش بە پێی هێندێک بەڵگە و نووسراوە دەبێ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بووبن: سەید عبداللە گەیلانی زادە، عومەر خانی شکاک، زێرۆبەگی هەرکی و رەشید بەگی جهانگیری.
ماوەی پێکهاتنی حیزبی دیموکراتی کوردستان تا دامەزرانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد لە باری زەمانییەوە، ماوەیەکی زۆر کورت بوو لە چەند مانگ تێنەدەپەڕی. بەڵام هەلومەرجی گرینگی سیاسی ئەوکات و وریایی و لە خۆبوردوویی دامەزرێنەرانی حیزب بووە هۆی ئەوەی کە لەم ماوە کورتەدا کاری زۆر گرینگ جێ بەجێ بکرێ. رێبەرانی ئەو کاتی حیزب بە ئیمان و فیداکاری و هەوڵی بێ وچان، خۆیان بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات ئامادە دەکرد. هەرچەند لە بەشێکی زۆری ئەو کارە تەشکیلاتیەی کەپێشتر بە ناوی کۆمەڵەی«ژ-ک»ەوە کرابوو، وەک بناخەیەک بۆ حیزبی دیموکراتی کوردستان کەڵکی لێ وەرگیرا. بەڵام دەبوو بۆ پێکهێنانی پێوەندی لەگەڵ رێکخراو و حیزبەکانی دیکەی ئێرانی و کوردستانی و راکێشانی ئەزەر و پشتیوانی ئەوان و وڵاتی دراوسێ واتە یەکیەتیی سۆڤیەت و پووچەڵ کردنەوەی ئەو پیلانانەی لە لایەن ئەمریکا و بە تایبەت بریتانیا و حکوومەتی ناوەندی رێک دەخران، هەوڵێکی یەگجار زۆر بدرێ. جیا لەوەش

بافتی ئەو سەردەمەی کۆمەڵی کوردەواری بافتێکی بە تەواوی عەشیرەتی و دەرەبەگایەتی بوو، خان و ئاغا دەسەڵاتی تەواویان هەبوو و کۆسپێکی گەورە بوون کە پێویست بوو بە شێوەیەکی گونجاو هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن و زیانیان کەمتر بکرێ. یەکێک لەو دوو سەفەرانەی کە هەیئەتی کوردەکان دوای کارەساتی خەرمانانی ۱۳۲۰ بۆ باکۆ کردیان. دوای دامەزرانی حیزب و بە گوێرەی راپۆرتی هێندێک هەواڵدەر لە ۲۱ی خەرمانانی ساڵی ۱۳۲٤دا بووە. ئەم سەفەرە بایەخی تایبەتی هەبوو و قازی محەممەد کەسانێکی باشتر و بەکەڵک تری هەڵبژاردبوو. ئەندامانی هەیئەتەکە لە ماوەی زیاتر لە دە رۆژی سەفەرەکەدا چاویان بە زۆر دامەزراو و کارخانەی سەنعەتی کەوت و تارادەیەک لەگەڵ بەڕێوەچوونی کاروباری ئیداری و سیاسی ئازەربایجانی سۆڤیەت ئاشنا بوون و راستەوخۆ لەگەڵ بەرپرسانی ئەوێ سەبارەت بە مەسەلەی کورد دوان و رەسمەن داوایان کرد کە بۆ دامەزرانی حکوومەتێک لە کوردستان یارمەتیی حیزبی دیموکراتی کوردستان بدەن. ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە دەنگۆی پێکهاتنی حکوومەتێک لە ئازەربایجانی ئێران لە لایەن فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بڵاوببووەوە کاربەدەستانی ئازەربایجانی سۆڤیەت بەڵێنی هاوکاریاندا و پاش ماوەیەک هێندێک چەک و کەل و پەلی دیکە گەیشتنە کوردستان و لە مەهاباد و شارەکانی دەوروبەر بە نێو خەڵکی زەحمەتکێش و ئەندامانی حیزبدا بڵاوکرایەوە و رادیۆ و چاپخانەش بەشێک لەو یارمەتییانە بوون و شوێنەواری لەسەر بەرزبوونەوەی زیاتری وەرەی خەڵک دانا.

ئەندامانی ئەم لێژنەیە بریتی بوون لە قازی محەممەد، مناف کریمی، عەلی رێحانی، قاسم ئیلخانی زادە(مهتدی)، محەممەد حسێن سەیف قازی، عبداللە قادری، کاک هەمزەی نەڵۆس و نووری بەگی هەرکی. گوایە «عومەر عەلیار»یش وەک مونشی لەگەڵ ئەم هەیئەتە بووە.

هاتنی بارزانییەکان بۆ کوردستانی ئێران دوای راپەڕینەکەی ساڵی ۱۹٤٥، هەر لەم ماوە کورتەی نێوان پێکهاتنی حیزبی دیموکراتی کوردستان و دامەزرانی کۆماری کوردستان بوو. دوای تێک شکانی شۆڕشی بارزان بەهۆی هێرشی ئەرتەشی عێراق کە هێزی هەوایی بریتانیاش پشتیوانیی لێ دەکردن، بارزانییەکان بەرەو کوردستانی ئێران هاتن و پاش پێکهاتن لەگەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستان و هێندێک لە پیاوانی ناسراو و بەناوبانگی عەشیرەتەکانی سەر سنوور لە پاییزی ساڵی ۱۳۲٤ی هەتاویدا هاتنە کوردستانی ئێران و

له مەرگەوەر و تەرگەوەر و شنۆ و نەغەدە و پیرانشار و مەهاباد و بۆکان و دەوروبەری ئەم شارانە نیشتەجێ بوون. شایانی باسە کە شۆڕشی بارزان لەو سەردەمەدا لە لایەن حیزبی هیوا کە حیزبێکی پێشڕەوی ئەو سەردەمەی کوردستانی عێراق بوو، پشتیوانی لێدەکرا. لەم شۆڕشەدا زۆربەی گوندەکانی ناوچەی بارزان لە لایەن ئەرتەشی عێراقەوە ئاوریان تێ بەردرا و وێران کران. ژمارەی ئەو بارزانییانەی کە بەهۆی ئەم کارەساتەوە هاتنە دیوی کوردستانی ئێران، نزیک بە دە هەزار کەس بوو کە نزیکەی ١٥٠٠ کەسیان چەکداربوون. ئەم هێزە چەکدارە هێزێکی شەڕ دیتوو و کارامە و لە خۆبوردوو بوو. بە دوای نیشتەجێ بوونی بارزانییەکان لە شوێنە جۆربەجۆرەکانی کوردستاندا، خەڵک یارمەتییەکی زۆریان دان و ڕێز و حورمەتێکی زۆریان لێگرتن. هەر کاتێکیش کە سەرانی بارزانی دەچوونە مەهاباد، لە لایەن هەیئەتێکی پایە بەرزی حیزبییەوە پێشوازییان لێدەکرا. ئەم هەڵسوکەوتە شوێنەوارێکی باشی لە سەر ئەوان هەبوو بە دڵ و گیان یارمەتیی کوردی کوردستانی ئێرانیان دا.

لە مانگی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٤دا بوو فیداییەکانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان پەلاماری بنکە و بنیاتەکانی حکوومەتیان دا و ڕۆژی ٢١ی سەرماوەز کۆماری ئازەربایجان دامەزرا. لە ڕۆژی دامەزرانی ئەم کۆمارە لە تەورێز، ژمارەیەک لە کەسایەتییە ناسراوەکانی کورد و نوێنەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ڕێ و ڕەسمی دامەزرانی کۆماری ئازەربایجاندا بەشدار بوون. ئەندامانی هەیئەتەکە بریتی بوون لە: حەمە حسێن خانی سەیفی قازی، عومەر خانی شکاک، حاجی سەید عبداللە ئەفەندی(گەیلانی زادە)و چەند کەسی دیکە.

ڕۆژی ٢٦ی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی، ئاڵای سێ ڕەنگی کوردستان لەسەر بانی عیمارەتی «هەیئەتی ڕەئیسەی میللیی کوردستان» بە شکۆی تایبەت هەڵکرا و بە هاندانی هێندێک لە ڕێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان ئێوارەی ئەو ڕۆژە پاش وتارێکی کورتی عەزیز خانی کرمانج[*] لە هەیوانی خانەقای شەمزینانی مەهاباد خەڵک لەوێوە بەرەو شارەبانیی مەهاباد وەڕێ کەوتن و پاش سەعاتێک دوایین سەمبولی

---

(*) عەزیز خانی کرمانج یەکێک لە بەگزادەکانی فەیزوڵلا بەگی دەوری بۆکان و لە ئەندامانی دڵسۆزی کۆمەڵەی ژ-ک و دوایەش حیزبی دیموکراتی کوردستان بووە کە تا ئاخر کاتەکانی ژیانی لە پێناوی کورد دا خەباتی کردووە.

رواڵەتی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی بە دەست خەڵک گیرا.[1](*) هەڵکردنی ئاڵای کوردستان و گیرانی ئاخرین شوێنەواری دەسەڵاتی حکومەت لەم ڕۆژەدا، ڕووداوێکی مێژوویییە لە ژیانی سیاسی خەڵکی کوردستانی ئێراندا. ڕۆژی دوای گرتنی شارەبانی مەهاباد، دامەزرانی سوپای میللی ڕاگەیەندرا. هەروەها لە لایەن سەرۆکایەتی حیزبەوە سەید پیرەی نیزامی وەک بەرپرسی شارەوانی دیاری کرا.



بەشی هەرە زۆر و بەرچاوی کارو تێکۆشانی سیاسی و تەبلیغیی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ماوەی کورتی چەند مانگی پێش دامەزرانی کۆماری کوردستان بە داخەوە هەر لە کوردستانی ناوەندی و بەشێک لە باکووری کوردستانی ئێران بوو. بەهۆی داگیرکردنی باشووری کوردستانی ئێران لە لایەن هێزەکانی بریتانیا کە مەسەلەی نەوتی کرماشان و «نەفت شاه» لە گۆڕێدا بوو، لە لایەکەوە کەسانی خۆش ناو و ناسراو و

(*) لەم دوایانەدا هێندێک بەڵگە لە زمان قەرەنی ئاغای مامەش و ڕۆژنامەی کوهستان کە ئەوکاتە لە تاران چاپ بووە. بلاو بوونەوەکە دەڵێن چەک کردنی شارەوانی لە ڕۆژی...... دابووە.

تێکۆشەری باشووری کوردستان نەیاندەتوانی بە بەر بڵاوی هاتوچۆی ناوچەی کارو تێکۆشانی حیزب بکەن و، لە لایەکی دیکەشەوە تێکۆشەرانی حیزب بە هاسانی نەیاندەتوانی لە هەموو ئەو کۆسپانەی کە لەسەر رێیان بوو تێپەڕن و بۆ تێکۆشان بچنە ئەو ناوچەیە. بەم هۆیە بوو کە ناوچەی تێکۆشانی ئاشکرای حیزب بریتی بوو لە دەوروبەری شاری سەقز هەتا چۆمی ئاراز. لەم ناوچەدا بنکە و بنیاتەکانی حکوومەتی نەمابوون و خەڵک بۆ خۆیان کاروباری خۆیان بەرێوە دەبرد و ئەوە هەلێکی لەباری بۆ تێکۆشانی سیاسیی حیزب و بووژاندنەوەی هەستی نەتەوایەتی رەخساندبوو.

تێکۆشانی بە ئاشکرای ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردستان و خۆشەویستی کەسانی وەک قازی محەممەد و هێندێک ئەفرادی دیکە بە تایبەت لەو بنەماڵانەی وەک گەیلانی زادە کە بە درێژایی مێژوو لە پێناو کورددا خەباتیان کردووەو کەسایەتیی وەک شێخ عوبەیدوڵڵا و شێخ عەبدولقادر و سەید تەها و حاج سەید محەممەد و حاجی سەید عبدالله گەیلانی زادەیان بۆ کورد پەروەردە کردووە، دەورێکی باشی لە بەرزکردنەوەی هەستی کوردایەتی لە ناو خەڵکدا بووە.

بە گشتی دەکرێ بڵێین کە پێکهاتنی هەلومەرجی لەباری دوای داگیرکردنی ئێران لە لایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە و دامەزرانی کۆماری ئازەربایجان و هاتنی بارزانییەکان بۆ دیوی کوردستانی ئێران وەک هێزی چەکدار و فیداکار و شوێنەواری سەفەری دووهەمی هەیئەتی کوردەکان بۆ ئازەربایجانی سۆڤیەت و قەولدانی هاوکاری و دانی هێندێک کەرەستە و یارمەتی و پەرەسەندنی هەستی کوردایەتی و پشتیوانی کوردی پارچەکانی دیکەی کوردستان و پێکهاتنی هێندێک وڵاتی تازە لە ئورووپای رۆژهەڵات و گۆڕانی سیستەمەکانیان دوای شەڕی دووهەمی جیهانی، شوێنەواری راستەوخۆ و باشیان بوود بۆ دامەزرانی کۆماری کوردستان.

حیزبی دێموکراتی کوردستان لە کاتی بڵاوکردنەوەی راگەیەندراوی دامەزرانییەوە واتە لە یەکی خەزەڵوەری ١٣٢٤ی هەتاوییەوە تا دووی رێبەندانی ئەو ساڵە کە دامەزرانی کۆماری کوردستان راگەیەندرا. سێ مانگ دەرفەتی هەبوو. لەم دەرفەتە کەمەدا حیزب ئەم کارە گرینگانەی ژێرەوەی بە ئەنجام گەیاند:

١- سەفەری هەیئەتێک بۆ ئازەربایجانی باشوور و بە تایبەت ئازەربایجانی باکوور کە بووە هۆی پێوەندی راستەوخۆ لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەت.

٢- پێکهێنانی پێوەندی لەگەڵ حیزب و ڕێکخراوە ئێرانییەکان.
٣- ڕاگەیاندنی داخوازییەکانی خۆی بە حکوومەتی تاران.
٤- بە ڕۆژانە کردنی قوتابخانەکانی کوردیی و شەوانە و بەرەسمی کردنی زمانی کوردی لە قوتابخانەکانی دیکەش.
٥- دامەزراندنی چاپخانە و پێکهێنانی هەیئەتی نووسەران و هاندانی قەڵەم بەدەستان.
٦- بە هێزتر کردنی پێوەندی لەگەڵ کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستان.
٧- هەڵکردنی ئاڵای کوردستان و دەست بەسەرداگرتنی شارەبانیی مەهاباد وەک ئاخرین شوێنەواری ڕێژیم.
٨- دامەزراندنی سوپای میللی و چەکدارکردنی بەشێکی بەرچاو لە خەڵک و عەشیرەتەکان و ڕاهێنانیان لەباری ئیزامییەوە.

هەروەها ئاڵای کوردستان ڕۆژی ٢٨/ ٩/ ١٣٢٤ لە نەغەدە و ڕۆژی ٧/ ١٠ ١٣٢٤ لە بۆکان هەڵکرا.

بەشی چوارەم

# پێکهاتنی کۆماری کوردستان

لە ڕۆژەکانی ئاخری مانگی بەفرانباردا لەسەر داوای حیزب، هەزاران کەس لە خەڵکی کوردستان لە شوێنی دوور و نزیکەوە هاتنە شاری مەهاباد و لە نێو ماڵی خەڵکی شاردا دابەش کران. ئەم خەڵکە بۆ پێشوازیی دووی ڕێبەندان و بەشداربوون لەم ڕێ و ڕەسمەدا هاتبوون. ڕۆژی دووی ڕێبەندان سروشتیش یارمەتیی کردبوو و هەوایەکی ساو و خۆش بوو و سەرەتا مامە غەنی خوسرەوی شارەداری مەهاباد، وێڕای بەخێرهاتنی خەڵکەکە و پیرۆزبایی کردن، بەرنامەی ڕێ و ڕەسمەکەی ڕاگەیاند. لەم ڕێ و ڕەسمەدا ئەو کەسانەی خواردوە وتار و شیعریان پێشکەش کرد[*] بەڵام وتاری پێشەواو سەید عەزیز شەمزینی لەوانی تر زۆر ڕێکوپێک تر و پڕ نێوەرۆکتر بوون.

١- دوعای مەلا حسێن مەجدی.
٢- وتاری قازی محەممەد سەرۆک کۆماری کوردستان.
٣- وتاری حاجی بابە شێخ.
٤- وتاری محەممەد حسێن خانی سەیفی قازی.
٥- شیعری هەژار.
٦- شیعری هێمن.
٧- وتاری سەید محەممەد تەها زادە.
٨- وتاری شێخ حەسەن شەمسەدین.
٩- وتاری عومەر خان.

(*) حکومەتی کوردستان، ئەوشیروان مستەفا ئەمین ل ١٠٤- وەرگیراو لە: ڕۆژنامەکانی کوردستانی سەردەمی کۆمار.

١٠- وتاری زێرو بەگ.

١١- وتاری محەممەد ئەمین موعینی.

١٢- وتاری سەید عەبدولعەزیز شەمزینی.

١٣- وتاری ئیبراهیم ئەدهەم.

١٤- وتاری محەممەد فەیزوڵڵا بەگی.

١٥- وتاری محەممەد ئانەوازادە.

١٦- سروودی مەدرسەی کوردستان.

١٧- سروودی مەدرسەی پەروانە (کچان)

١٨- وتاری یای ویلمە سیادیان

١٩- وتاری یای خەدیجە حەیدری

٢٠- سروودی مەدرسەی گەلاوێژ.

٢١- سروودی مەدرسەی سەعادەت.

٢٢- وتاری ئەحمەد ئیلخانی زادە.

٢٣- وتاری محەممەد قادری.



لە ڕۆژی جەژنی سەربەخۆیی کوردستان لە ڕاستەوە بۆ چەپ

١- ئەفسەرێکی کوردی محەممەد فەیروزی لەکاتی سڵاوی مەلیکدا لە تەنیشت ئاڵاوە وستاوە.

٢- کەریم نازمی ئاڵای کوردستانی بەدەستەوەیە.

٣- ئەحمەد کفاشی ئەفسەرێکی کورد.

به له بەرچاو گرتنی ئەوە کە لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبدا لە بەینی دوو کاندیداتۆری سەرۆک کۆماری واتە قازی محەممەد و حاجی سەید عبداللە ئەفەندی(گەیلانی زادە)، قازی محەممەد وەک سەرۆک حیزب و سەرۆک کۆمار دیاری کرابوو، لەو رێ و رەسمەدا قازی محەممەد لە وتارێکی گەرم و گوڕدا مزگێنی گەورەی دامەزرانی کۆماری کوردستانی راگەیاند. ئەمەش دەقی وتارەکەی قازی محەممەد پێشەواو سەرۆک کۆماری کوردستان:

«کوردستان مەوقعییەتی جوغرافیاییەکی مەخصوصی هەیە کە بێ پسانەوە و بێ ئەوەی نەتەوە و میللەتێکی کە لە نێویاندا فاصیل و لێکیان بپچڕێتەوە، کورد بە سەر یەکەوە و پێکەوە سکوونەتیان تێیدا هەیە و دارای مالکییەتی میللێن و دەوێ دان.

بەسەر هات و سەوابیقی تاریخییان یەکە و عموومەن تێیدا شەریکن. خاوەنی ئاداب و عادات و رسوومی میللییەکی وان کە هیچ جۆرە صەدەمە و حەوادثێک نەیتوانیوە سستییەک لە بناغەی میللییەتی ئەوان پەیدا بکا.

کورد لە قەدیم را هەزاران پادشا و حوکمدار و تەشکیلاتیان بووە. هەر لەم کوردستانی ئازادی ئێستادا بنەماڵەی ئومەرای موکری کە سەر سیلسیلەی ئەوان ئەمیر سەیفەددین بووە تا ۱۰۲۰ی هـ بیلئیستیقلال یەک لە دوای یەک: ئەمیر سەیفەددین، صارم بەگ، شێخ حەیدەر، ئەمیر بەگ، ئەمیر پاشا تا دەگاتە قوبادخان بە دەسەڵات و قودرەتەوە حوکمیان کردووە.

میللەتی رەشید و بە غیرەتی کورد لە هەموو دەورو زەمانێکدا هەر کەس خەیاڵی ئیستیلای ئەوانی بووبێ، بەرەنگاری بوون، بەربەرەکانییان کردووەو لە هیچ فیداکارییەک دەستیان دانەنواندووە. لە پاش لە دەست چوونی سەلطەنەت حوکمدارشیان بۆ وەگیر خستنەوەی ئیستیقلال و ئازادی بە ملیۆن قوربانییان داوە و لەبەر ئەوەی کە هەمیشە لە موبارەزە و مەلەدا بوون، هیچ جۆرە ئەزییەت و ئازارێک نەماوە نەیچێژن و نەیبینن.

لەگەڵ ئەوەش هەموو کوێرەوەری و کوشتن و بڕینێکیان تەحەمول کردووەو قەت لە ئامانج و ئارەزووی خۆیان شل نەبوونەتەوەو لە رێی وەدەست خستنەوەی ئازادیدا وچانیان نەداوە، بە دڵێکی ئەوەندە بەهێز و عەزمێکی هێندە ثابیتەوە تێکۆشاون تا ئێستا هێزێکی وا پەیدا نەبووە بتوانێ تێکڕا خەفەیان بکا. میرە کوێرەیان کوشتووە بابان سەریان هەڵداوە، بابانیان بێدەنگ کردووە، ئەردەڵان بڵند بوون، ئەوانیان لە عەزری

داوه، بەدلیسی بەرز بوونەوە و هەزاری دیکەی وەک ئەوان. تا لەو دواییانەدا لە پاش شەڕی بەینەلمیلەلی پێشووەوە کە دیکاتۆری ئێران وتورکیا هاتنە سەرکار و زمان و عادات و مەزهەب و خصوصیاتی میللی کوردیان بە جارێک لاواز، کزوکەنەفت کرد، لە هیچ وەحشییەت و دڕندییەک رانەوەستان، خوێندن و نووسینی زمانی کوردی مەمنوع و پۆشینی لیباسمان قەدەغە بوو.

نەیان دەهێشت لە هیچ جۆرە مەزایا و حقووقێکی بەشەرییەت بەشمان بێ، رێگای فێربوونی عیلم و صنعەتیان لێ بڕی بووینەوە، هەر رۆژە بە بەهانەیەک و هەر دەمێ بەتەشقەڵەیەک دەستە دەستە و پۆل پۆل کوردی هەژار و بەدبەختیان حەبس و تەبعید دەکرد و دەیانکوشتن و لە بەینیان دەبردن، حاصڵ و دەسڕەنجی ئەو میللەتە بێچارەیان دەبرد بۆ خۆیان و ئەوانیشیان برسی و تینوو و رووت و قووت دەهێشتەوە.

تا لە شەهریوەری ۱۳۲۰دا فریشتەی ئازادی دەستگای دیکتاتۆری و فاشیستی رەزا خانی تێک شکاند. کورد سەری لەو هەموو فشار و ئەزێتە کەمێ فارغ بوو، فەوری ئیحساسی کرد، چۆن دەبێ لە فرصەت ئیستیفادە بکات و رێگای صەلاح و وەدەست خستنی ئازادی ئەو میللەتە چییەو چ بکا؟ پیاوانێکی بە بیروهۆش و بە شەرەف کە زۆر لە مێژ بوو خوێناوی دڵی خۆیان دەخواردەوە و بۆ زەلیلی ئەو میللەتە دووکەڵ لە دەروونیان دەهاتە دەرێ زۆر زوو تەشخیصیان دا کە وەختی کارە و لەو فرصەتە دەبێ بەهرە وەربگیرێ و ئەوە تەواو ئەو رۆژەیە کە پشتاوپشتمان چاوەڕوانی بوون. یەکجار و خێرا، بێ وچان و راوەستان، دەستیان بەکارکرد، حیزبی دێموکراتی کوردستانیان تەشکیل دا و بە دەستوبرد خەریکی کاروباری میللی بوون و بە چاوێکی ورد و بە دیقەت ئیحتیاج و پێداویستی کوردیان تەشخیص داو بەدی کرد.

لە پێش هەموو شتێکدا ئیختیلاف و دووبەرەکانی عەشایەری کە بە دەسیسە و حیلەبازی ئیستعمارچی و دیکتاتۆران بۆ ئیستیشمار و خواردن و کروساندنەوەی ئەو میللەتە بە قەولی خۆیان:«تفرقە بینداز و حکوومەت کن» دەبەینی خستبوون و تا ئەندازەیەک ئەو ئاورە بلێسەی سەندبوو، برای دایک و بابی لەیەک بەزاندبوو، لە گۆڕێ هەڵگیرا...

چەند مەدرسەی کچان و کوڕانمان کردەوە، مەدرەسەی شەوانەمان دایر کرد و کتێب بە زمانی کوردی تەرجەمە کران... کوڕ و کچ و پیاوی گەورە لە مەدارسی شەوانە و رۆژانە

به زمانی کوردی دەخوێنن لە جیاتی ئەوەی شەش حەوت ساڵ خەریکی خوێندن و فێربوونی فارسی بن لە مانگێک و دوو مانگدا دەبنە خوێندەوار و هەموو شتێک دەخوێننەوە و دەنووسن.

بۆ ناساندنی لیاقەتی میللی و دەرخستنی حەیاتی ئەدەبی و فەرهەنگی کورد و بۆ راگەیاندنی هاواری خۆمان بە گوێی دنیای بەشەرییەت و عەدالەت موحتاجی وەسیلەی چاپ و بڵاوکردنەوە بووین، چاپخانەی زۆر چاک تەئسیس کراو دانرا، لە شاری خۆماندا بە زمانی خۆمان بە چاپخانەی خۆمان گۆڤار و رۆژنامە دەردەچێ و بیرو فیکر و داخوازی ئێمە لە دنیادا بڵاودەکاتەوە.

حاصل و بەروبووی ئێمە کە میقدارێکی زۆر و زەوەند و بە قیمەت بوو بەفیرۆیی لە دەستیان دەردەهێناین و دەستی ئیستیعمار سەددێکی لە پێش ئێمە و بازاڕی دنیا دروست کردبوو، رێگای حەمڵان دییەوە و تیجارەت و ئیقتیصادی کوردستان زۆرباش تەئمین کرا.

لە زەمانی دیکتاتۆریدا کە هەموو عواریضێکیان لێ دەساندین کەم و زۆر وەسیلەی لەش ساغی و موعالەجە، ئەحەکیم ئەدەرمان و مەریضخانەیان بۆ ساز نەکردین، ئێمە بۆ خۆمان مەریضخانەی زۆرباش بەو زووانە دایر دەکەین و لەش ساغی وڵاتمان تەئمین دەبێ.

هێزێکی میللیمان تەشکیل داوە کە بە شەجاعەتێکی تەواو حاضرە دیفاع لە نیشتمان بکا.

دیارە موفەقییەتی ئێمە سەراسەر لە عەینی مەرامی دیموکراسی و لە نەتیجەی فەعالییەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان و بە پشتیوانی عالەمی دیموکراتە لەبەر ئەوە.. دەڵێین: بژی مونەسیسینی دیموکرات.

میللەتی کورد هەزاران سەدو بەرهەڵستی سەخت و سەهەندەی لە رێدا بوو دەستەو دایرەی دیکتاتۆری بێ وچان کارشکێنی ئێمەیان دەکرد و لە هیچ نامەردییەک رانەوەستاون. ئیختیلافاتی عەشایر و داخلیش ئیشکالێکی گەورە بوو بۆ ئێمە. ئەمما ئەوانە هیچ کامێکیان نەیانتوانی پێش بە ئێمە بگرن بە دڵێکی بەهێز پایەداریمان کرد و ئیدامەمان بە فەعالییەتی خۆمان دا تا ئیستقیلال و ئازادی نەتەوەی کوردمان بە دەست هێنا.

دیارە بەقایایەکی ئەو خاطەراتەش کە ماوە چە لە داخلدا و چە لە خاریج دا میللەتی

کورد موبارەزەی خۆی لەگەڵیان ئیدامە پێ دەدا و بە پشتیوانی خودا موظەفەر و مەنصور دەبێ.

ئەمڕۆ لە نوماینەدەکانی تەواوی نەواحی و نوقاطی کوردستان بێ ڕیعایەتی طەبەقات ئەعەم لە ئاغا و ڕەعییەت و گەورە و بچووک، کۆبوونەوەدو بە یەک دڵ و یەک زمان هاواری دیموکراسی دەکەن و بەرێی دیموکراتدا دەڕۆن، قودرەت و قوەتی دیموکرات نیشان دەدا». [*]



لە رۆژی جەژنی ئیعلامی کۆماری کوردستانە لە ڕاستەوە چەپ:
١- مەنافی کەریمی ئەندامی هەیئەتی ڕەئیسەی جمهوری دیموکراتی کوردستان.
٢- سەید محەممەد تەها زادە.
٣- مامە غەنی خوسرەوی لە ئیسەی بەلەدیەی سابلاخ.
٤- جەنابی قازی محەممەد سەرۆک کۆماری کوردستان.
٥- حاجی بابە شێخ سەرۆک وەزیری کۆماری کوردستان.
٦- حەمە حوسێن خانی سەیفی قازی وەزیری بەرگری کۆماری کوردستان.
٧- محەممەد ئانەوازادە بەرپرسی هێزی پێشمەرگە لەکاتی پێشکەشکردنی ڕاپۆرتی تەشریفاتی.

---

(*) حکومەتی کوردستان، ئەوشێروان مستەفا ئەمین ل ١٠٦ - وەرگیراوە لە ڕۆژنامەکانی کوردستان سەردەمی کۆمار.

**ئەمەش دەقی وتارەکەی سەید عەزیز سەید عبدالله گەیلانی زادە:**

**«براکانم گەورە و ئاغایانی کورد!»**

خـانەوادەی ئەمەری بە گـەورە و بچـووک و، ژن و پیـاوەوە،کچ و کـوریانەوە زۆر بە ئیفتیخارەوە تەبریکی ئەم جیژنە موبارەکە و موقەددەسە ئەوەلەن تەقدیمی مەقامی عالی رەئیس جمهوری موحتەرەم دەکەن کە لە رێی ئەم ئازادیەدا هیچ جۆرە قصورێکی نەکردووەو بە هیـمەت و عەزم و روحبەرزی و حیکمەت و توانای خۆی توانی موکافەحە بکاو ئەم ئازادیەمان بۆ وەگیر بخات.

دووهەم جێژنە پیرۆزە لە هەموو برا کوردێک دەکەن کە ئەوانیش لە رێی ئەم ئازادیەدا ئەبەزیون و موقابیل بەو صەدەماتە و ئەکەباتەی زەمان کە بە نیسبەت کورد هەمیشە عەکسی بووەو هەمیشە هێز و پەنجەی ئیستیعمار و جەهالەت لە کوردستاندا سەرکەوتوو بووە بە عـەزم و ثەبات وەکـو پۆلا راوەسـتـاون هەر ئەبەزیون و هەروەکـو تاریخ بۆمـان ئیسپات دەکا کە کورد لە هەموو فرسەتێکدا محاوەلەی ئازادی وەرگرتنیان کردووە، بەلام لەبەر ئەوەی پەنجەی ئیستیعمار هەمیشە لەسەر کورد غالب بووە و بە ئەنواعی وەسائیلی وەحشیـانە و بە ناوی دین و دنیا حەرەکاتی ئازادییان کوژاندۆتەوە کە کورد نەیتوانیوە ئازادی خۆی بستێنێ، بەلام لە نەتیجەی ئەو هەموو کیفاح و سەعی و هەولدانەی کورد دەولەتی شۆرەوی کە پشتیوانی میللەتانی بێ کەسە لەسەر حەقی میللەتی بێچارەی کورد بە جواب هات و مەجالی ئەدا ئەمجارەش ئیسـتـیـعـمار سەری پان بکاتەوە، ئازادی پێ بەخشین و دەبێ بشزانین کە ئەوەش لە نەتیجەی سەعی و هەولدانی رەهبەری موحتەرەم رەئیس جمهور حەضرەتی قازی محەممەد بووکە شەو و رۆژی خۆی لەو رێیە صەرف دەکرد و مەعنای ئیستراحەتی نەدەزانی کە توانی بەهۆی ئەو سەعی و محاوەلات و ئەبەزینی خۆی میللەتی کورد بە دەولەتی شۆرەوی بناسێنێ و داوای ئازادبوونی کورد بکا.

ئەی برا کوردەکانم بزانن شوهەدای خانەوادەی ئەمەری کە لە رێی ئەو ئازادیەدا خوێنی خۆیان رشتووە و شەهید کراون و صەفحەی تاریخی خۆیان بە ناوی زێڕین نووسیوە ئێستەکە لە ئێمەمانان شادتر و مەسرورترن و ئێستەکە جێژنی ئەوانە.

بەلێ جیـژنی ئەوانە چونکو زانیـان کە خـوێنی ئەوان بە خۆڕایی ئەرۆیوە و ئەتەوەی ئەوان بەو ئازادیە مـوقەددەسـە شـاد بوون، ئەوەش بزانن کە ئێسـتـەکـە رۆحی پاکی ئەو شەهیدانە لێرەدا حاضرن و بەیەک دەنگ جێژنە پیرۆزە لە هەموو برا کوردێک دەکەن و

تمواوی ئەفـرادی خـانەوادەی ئەهری بە گـەورە و بچـووکیـانەوە بە روویێکی زۆر سپی و مـوفـتـەخـیـرانەوە رجـا و تکا لە هەمـوو کـوردێک دەکـەن کـە بۆ خـاطری خـودای: مـاضی عەنعەناتی کۆن و ناکـاری سەخـیـفـانەی ئیـقطاعی و ئیـسـتـعـماری لە بیر کـەن. طوائف الملوکی و دوژمنایەتی و مەنافیعی مادی و مەعنەوی شەخصی تازە مەکەنەوە. گەورەیی و بچووکی و ئاغاییی وگەدایی لە ناو خۆتان هەڵگرن. هەروەکو برا دەست دەنە دەست یەک و بخوێنن و موتەحید و یەک دڵ و جانفیدا بن بۆ ئەوەی ئەو ئازادیەی کە لە پاش سەعی کیـفـاحی هەزاران ساڵ بە دەسـتـتـان کەوتووە لە دەسـتی نەدەین و بەر قەرار و بە هێـزتری بکەین. براکانم دەزانن کە زۆر برای دیمان هەن ئێسـتـاکەش لە ژێر زنجیری ئیسـتـیـعـمار و ئەسـارەت دەناڵێنن و بە چاوێکی زۆر برسیوە چاوەڕێی هیـمەت و پیـاوەتی ئێـوە دەکەن؟ لەبەر ئەوە نـابێ هیچ کـوردێکی بە شـەڕەف بەم ئازادیە کـەمە راضی بێ بەڵکو پێـویستـە لەسەر هەر کوردێک ماضی و رابردووی رەشی لەبیر کاو بەهۆی عەزم و برایەتی و یەکێتی و هێز و هیمەتی خۆیان لە ژێر ریاسەت و سەرپەرستی رەئیس جمهورمان قازی محەمەد ئامادە بین، ئەو برا کوردە ئەسیرانەی دیمان کە حاڵی حاضر لە ژێر ئیستعمار و ئەسارەتدا دەناڵێنن، دەربێنین و خـوێنی خـۆمـان لەو رێگـایەدا بڕێژین و بە خـۆمـان ئەڵێین ئازادین تاوەکو کـوردستـانی گـەورە بە تیشکی ئازادی روونـاک دەکـەینەوە. ئێـمەش هەر فەردێک لە خانەوادەی ئەهری حاضـر و ئامـادەین بە رۆح و گـیان و سـەرو مـاڵـمان بە رۆحێـکی زۆر پڕ ئیـخلاصـەوە لەو رێیـەدا خزمەت و فـیـداکـاری بکـەین. لە دوایەدا لە خـوای عـەزەوەجـەل دەپارێینەوە کە خوا بە گەورەیی و عـەظەمەتی خۆی عومری رەهبەر و رەئیس جمـهورمان قازی محەمەد درێژ و پایەدار کا کە بتوانێ ئەو ریـساڵە موقەدەسە گەورەیە کە دەستی پێ کـردووە تەواو و بەرقـەرار کـا و کـوردسـتـانی گـەورە ئازاد کـا و بە دەنگێکی بەرز هاوار دەکەین و دەڵێین: هەر بژی رەهبەرمان رەئیس جمهوری کورد قازی محەمەد و

هەربژی کورد و کوردستانی گەورە و

هەر بژی جەنراڵ سیموس ستالین رەهبەر و پێشەوای ئازادی گیتی!»(*)

ئەم رێ و رەسـمـە شکۆدارە لە کـاتی دەست پێکردنی تا دوایین وتار و بڵاوەلێکردنی خەڵک لە یەک دوو لاوە فیلمی لێ هەڵدەگیرا کە بەداخەوە تا ئێـسـتا لە ئارشـیـوەکانی رووس و ئینگلیس داماوەتەوە و وەدەست کورد نەکەوتووە.

(*) حکوومەتی کوردستان، ئەوشیروان مستەفا ئەمین ل۱۱۳.

بڕیارنامەی میتینگی دامەزرانی کۆماری کوردستان بە تەواوی لە رۆژنامەی ژمارە ٨ی کوردستانی زەمانی کۆماردا چاپ کراوە کە ئەوەش دەقەکەیەتی: « قەرارێک کە لە ٢ی رێبەندانی سالی ١٣٢٤دا لە لایەن ٢٠ هەزار نەفەر نومایندانی تەواوی طەبەقاتی ئەهالی کوردستانی شیمالی لە میتینگی شاری مەهابادێ دا قوبوول کراوە.

دە رابردووی نەتەوەی کوردیشدا وەک سایری نەتەوەکانی دیکەی دونیایە پادشایی و حاکمییەت و ئوصول و ئیدارە و مەدەنییەت و عادات بووە بەلام لەبەر فێل و تەلەکەی دەولەتانی مورتەجیع لەت لەت بووە و کراوەتە عەبد و دیل، وەنەبێ هەر لە حاکمیێتێ بەلکو لە تەواوی ئیختیاراتی میللی بێ بەش کرابوون.

چەندە عەصرە کە کورد گرانایی و ئەزییەتی غەیرە قابیلی تەصەووری ئەسارەتیان لە سەر خۆیان دەرک کردووە بە تایبەتی لە پاش هاتنە سەر تەختی رەزا شای خوێنخۆری مورتەجیع کوردەکان بە گرانایی ئەسارەتی زیاتر دوچار بوون و ئەو موستەبیدە لە لایەن هیتلەری مخبطەوە کوردی لە هەموو حقوقی میللی خۆی مەحروم کرد و هێندێک لە عەشایری کوردی بە تەواوی لە ریشە دەرهێناو لە نیشتمانی خۆیانی وەدەرخستن و، فارسانی مورتەجیع بە خانمان و دین و مندالانی کورد جنێوی غەیرە قابیلی شەرحیان دەداو، کوردان نەک هەر خوێندن بەلکو قسەکردن و دوانیش بە زمانی دایکی خۆیان قەدەغە کرابوو.

کوردەکانی تورکییەش خصوصەن پاش هاتنە سەرکاری مستەفا کەمال پاشای هەروا بوون ئەو دڕندەیە بۆ بێدەنگ کردنی هەرای ئازادیخواهی شێخ سەعید یەک میلیۆن و نیوی لە کوردان کوشت.

کوردەکانی عێراقیش دەردی ئەسارەتیان کەم نەکێشاوە لە لایەن کەسانێک کە دەفیکری سەعادەتی بەشەریدا نین بۆ عەبدایەتی دران بە عەرەبان دەگەل ئەو هەموو تیرۆر و تەعقیب و کوشت و کوشتار و تەلەفاتەش کورد هەرگیز دەموقابیل زالمان دا سەری دانەنواندووە و دەرێی ئیستیقلال و ئازادیدا موبارزەی خۆی دەوام دا و ئیرادەی پۆلایی فەنائاپەزیرە هەر بووەو هەر دەمێنێ. لەو سالانەی دوایەدا فرصەت و ماوەیەکی چاک هەبوو کە بە ئازادییەکی کە ئەمە ئارەزوومان بوو پێی بگەین و لە مێژ بو وەدەستمان دەکەوت بزووتباینەوە وەک بزووتنەوەی قارەمانان و مەردانی پێشومان بەدبەختی ئەوەیە کە ئێستا دەنێو کورداندا کەسانێک هەن کە وەنەبێ هەر خزمەت بەو فارسانە، کە چەن

عەصرێکە ئەمەیان دەژێر زوڵمی خۆیاندا ڕاگرتووە، بکەن، بەڵکو بە ئاشکرا میللەتی کوردی دەفرۆشن. سەودای عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد دەگەڵ ستادی ئەرتەشی ئێرانێ کە هەموو کوردی فرۆشتون لە هەموومان مەعلومە. لە خەڵکی مەعلومە مەلا عەبدولڕەحمانی سرنجداغی و محەممەد فاروقی و حەمزەی قاوەچی و غەیریهی جاسوس و میللەت فرۆشن. قەرەنی ئاغای مامەش و محەممەد عەباسی و عەلی خانی مەنگوڕ و عەبدالله ئاغای مەنگوڕ و چەن کەسی دی بە ئاشکرا بۆ ئیختیلاف و پارچە پارچەکردنی کوردان سەعی دەکەن.

عەیبە بزانن ئەی مەلعونینە!!

وەخەبەر بێن تا زۆر درەنگ نەبووە.

تەماشای دوژمنانی کە چ فیکر نەکەین دەزانین کوڕە پێشووی کورد هەرگیز میللەتی خۆیان و هومێد و ئارەزووی وانیان لەبیر نەکردووە. لاوچاکانی مە وەک رابردووان بێ موضایەقە قوەی صەرف دەکەن کە کورد خۆشبەخت و ئازاد بێ و ئەوان زانییان موفەقییەت وەختێک وەدەست دەکەوێ کە خەڵک زۆر توند پاڵ وێک دا و یەک... بێ. وەدەگەڵ برایانی ئازەربایجانی پێکەوە بزووتنەوە و پێگەیشتن ئەو حیزبە کە حیزبی دێموکرات بوو بە کۆمەک و یاری خەڵکی کوردستان داندراوە لە مودەتێکی کەمدا بە موفەقییەتی زۆر گەورە گەیشتووە، دژایەتییەکی دەنێو عەشانیراندا بوو هەڵی گرت و یەکێتییەکی قایمی دەنێو واندا پەیدا کرد و هەینەتی میللی هەڵبژارد و چاپخانەی تەئسیس کرد و ئەوە لە تاریخی کوردی ئێراندا هەوەڵ جارە بە طەوری عموم بڵاو کردنەوەی ڕۆژنامە دەس پێکراوە و مەدرەسەی میللی تەشکیل کردووە کە دەوێ دا منداڵانی کورد بە زمانی دایکی خۆیان دەخوێنن و مەسئەلەی خوێندن ئیجباری و عمومی حەل دەکات و شارەوانی و عەدلییەی داناوە و هێزی موسەللەحی میللی و... ساز کردووە.

بژی حیزبی دێموکراتی کوردستان!

بژی مونەسیس و ڕەهبەری وی جەنابی قازی محەممەد!

ئەمە دەزانین و باوەڕمان هەیە کە ئەندامەکانی کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دێوکراتی کوردستان ئەو کارە موقەدەسەی خۆیان بە موفەقییەت دەبەنە سەرێ. ئەمە نومایندانی تەواوی طەبەقات و کوردانی شیمالی کوردستان لە میتینگێک کە لە شاری مەهاباد

سازمان کردووەو ژمارەمان ۲۰ هەزار نەفەرە، ئەورۆ ئارەزووی عمومی خۆمان ئیظهار دەکەین و لە کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دیموکرات و ئەنجوومەنی خۆمان خواهیش دەکەین و ئیختیاری دەدەینێ:

١- لەو جێگایانەدا کە ئێستا کوردی تێدا دەژین بە ئیستیقلالی تەواو بگا.

٢- ئینتیخاباتی مەجلیسی شورا دەس پێ بکەن.

٣- حکوومەتی میللی کوردستان و وەزیران و ئیدارەکانی ساز بکەن.

٤- هێزی موسەللەحی میللی کورد تەشکیل بدەن.

٥- لەگەڵ دەوڵەتانی هەمسایە رابیطەی تیجارەتی و ئیقتیصادی بەرقەرار بکەن.

٦- لەگەڵ برا ئازەربایجانییەکان هەمکاری و دۆستایەتی مەحکەم بکەن.

پایەدار بێ کوردستانی ئازاد!

بژی حیزبی دیموکراتی کوردستان! بژی رەهبەری خەڵکی کوردستان جەنابی قازی محەمەد!»(*)

هەر لەم رێ و رەسمەدا هێزی سوپای میللی راهێنراو و دەوروەدیتوو بۆ یەکەم جار بە فەرماندەیی محەمەد ئانەوازادە ئامادەی خزمەت بوون و سەرۆک کۆمار لەوان و لە هەموو پیادە و سەوارە و چەکدارەکان سانی دیت.

شایانی باسە کە بۆ یەکەم جار بوو کە رێ و رەسمێکی ئاوا بە شکۆ بە بەشداریی نوێنەرانی هەموو پارچەکانی کوردستان لە کوردستان پێکدەهات و بەم هۆیەشەوە بوو کە پیر و لاو، چەکدار و بێ چەک، ژن و پیاو، کاسب و تاجر و قوتابی و مەلا و مامۆستای شار بە تەواوی غەرقی شادی بوون.

رۆژی دواتر سێی رێبەندان، پێشەوا کە بەدوای دووی رێبەندان دا ئیعلام کرا کە عینوانی سەرکۆمار، پێشەوایە، بەشێوەی رەسمی پادگانی پێشوو و وێرانکراوی مەهابادی کە تەعمیر و ئاوەدان کرابووەوە، وەک ئاوەندی هێزی کوردستان و پێشمەرگەخانە کردەوە.

بەگشتی شێوەی رێکخستنی هێزی پێشمەرگە بە شێوەی خوارەوە بوو:

لیزگە، قۆڵ، دەستە، چڵ، لک و پۆل.

رۆژی یازدەی فیورییە واتە ۲۲ی رێبەندان یەکەم هەیئەتی وەزیرانی کوردستان کە لەبەر هێندێک هۆ پێیان دەگوت «هەیئەت رەئیسەی میللیی کوردستان» ناسێندران، کە

---

(*) حکوومەتی کوردستان، نەوشیروان مستەفا ئەمین ل١٢٧

بریتی بوون لە :

| | |
|---|---|
| سەرۆک وەزیر | حاجی بابە شێخ |
| وەزیری جەنگ | محەمەد حسێن خانی سەیفی قازی |
| وەزیری کیشوەر | محەمەد ئەمین موعینی |
| وەزیری ئێقتیساد | ئەحمد ئیلاهی |
| وەزیری پۆست و تەلگراف | کەریم احمدین |
| وەزیری فەرهەنگ | مەناف کەریمی |
| وەزیری تەبلیغات | سەدیق حیدری |
| وەزیری کار | خەلیل خوسرەوی |
| وەزیری تیجارە | حاجی مستەفا داودی |
| وەزیری کشاوەرزی | مەحموود وەلی زادە |
| وەزیری ریگاوبان | ئیسماعیل ئێلخانی زادە |
| وەزیری بیهداری | سەید محەمەد ئەیووبیان |
| وەزیری موشاویر | عەبدولڕەحمان ئێلخانی زادە |
| وەزیری عەدلیە | مەلا حسێن مەجدی |





که زیاتر خۆی بە ڕەئیسی عەدلیە دەناساند.

چاپخانەی کوردستان بە شێوەی ڕسمی لە ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ۲۰/ ۱۰/ ۱۳۲٤ دەستی بەکار کرد و یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستان لە چاپ درا. بەم بۆنەوە ڕێ و ڕەسمێکی پڕ شکۆ پێکهات و سەید محەممەد تەها زادە بە نوێنەری پێشەوا لەم ڕێ و ڕەسمەدا قسەی کرد. کارگێرانی چاپخانەی کوردستان تا ئەو جێگایەی ناودکانیان دەزانین، بریتی بوون لە:

مەلا قادر مدرسی سەرپەرست

عەلی خوسرەوی مودیری نێوخویی (بۆ ماوەیەکی کورت کە دوایە بوو بە مودیری رادیۆ و سەرپەرستی یەکیەتیی لاوان)

سەید محەممەد حەمیدی سەر دەبیری ڕۆژنامەکە

موتەلیب شێخ محەممەدی بەرپرسی فەننی

سدیق عەلایی بەشی فەننی

محەممەد شاپەسندی

سەعید زەرگەیی

عەزیز ئانەوازادە

نووسەرەکانی ئەوکاتی ڕۆژنامەی کوردستان بێجگە لە هێندێک لەوانەی سەرەوە کە جاروبارە مەتلەبێکیان وەردەگێڕا، یان دەیاننووسی، بریتی بوون لە حەسەن قزلجی، هێمن و هەژار وەک شاعیر، هاشم خەلیل زادە، ڕەسووڵ میکانیلی، دلشاد ڕەسووڵی، ئیبراهیم نادری، محەممەد مەجدی، عەلی مەولەوی و عەلی خوسرەوی، هەروەها هێندێک کەسی قەڵەم بە دەستی نایبینیش. لەم چاپخانەدا بێجگە لە ڕۆژنامەی کوردستان، گۆڤاری کوردستان، هەڵاڵە و ئۆرگانی یەکیەتی لاوان واتە هاواری نیشتمانیش، چاپ دەکرا و هەروەها وەڵامدەری پێویستییەکانی ئیداریش بوو.

جێگای سەرنجە کە یەکیەتی لاوان یا دەستەی لاوان هەر لە ساڵی ١٣٢٤دا پێکهات کە تێکۆشانی بەرچاوی هەبوو. ژمارەی یەکەمی هاواری نیشتمان ئۆرگانی ئەم بەشەی سەر بە حیزب لە مانگی خاکە لێوەی ١٣٢٥دا بڵاوبۆتەوە و مودیری مەسئوولی شەهید سدیق ئەنجیری ئازەر بووە. لە ماوەی تەمەنی کورتی کۆماردا ١١٢ تا ١١٤ ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستان دەرچووە. بۆ یەکەم جار ڕۆژی ٢٥/٢/١٠ دەزگایەکی رادیۆ کە پێیان دەگوت ئیستاسیۆنی رادیۆ، لە ڕێ و ڕەسمێکی تایبەتدا دامەزرا. لەبەر ئەوەی رادیۆ لە ماڵان زۆر بەکەمی هەبوو، بەهۆی دامەزراندنی پێنج بڵیندگۆ لە شوێنە ئەسڵییەکانی شاری مەهاباددا دەنگی رادیۆ بڵاو دەکرایەوە و پێشەوا ڕۆژی ١٢/٢/ ١٣٢٥ بۆ یەکەم جار قسەی لەسەر کرد.

ئەو دەزگایەش وەک چاپخانەکە لە لایەن سۆڤیەتەوە وەک یارمەتی هاتبوو و ماشێنێکی سینەمایی گەڕۆکیشی لەگەڵ هاتبوو کە زۆرجار لە مەیدانی چوارچرای مەهاباد و شارەکانی دی فیلمی بۆ خەڵک نیشان دەدا. ئەنجوومەنی فەرهەنگیی کوردستان و سۆڤیەت و کوردستان و ئازەربایجان پێکهاتبوو. رادیۆ و ئەنجوومەنە فەرهەنگییەکان لە عیمارەتی ناوەندیی حیزب بوون کە شوێنی کاری پێشەواش بوو. هەر لە مانگی بانەمەڕدا بوو کە نزیکەی ٨٠ نەفەر لە لاوەکان بۆ خوێندن لە بەشە جۆراوجۆرەکاندا نێردرانە باکۆ. ژمارەیەکیش نێردرانە تەوریز بۆ خوێندن لە بەشی نیزامی یا سیاسیدا. زۆربەی ئەفرادی نێردراو بۆ باکۆ چەند مانگ دوای تێکچوونی کۆمار گەڕانەوە و بەشێکیشیان مانەوەو درێژەیان بە خوێندن دا، بەڵام پێوەندییەکی ئەوتۆیان بە حیزبەوە نەما و لەوێ تاق ولۆق پێوەندییان بە بەڕێز مستەفا بارزانی و هەڤاڵانییەوە هەبوو، ئەوانە بریتی بوون لە: سەید عەزیز شەمزینی و سەید کەریم ئەیووبیان، مستەفا شەلماشی، عەلی

گەلاوێژ، حامید خوسرەوی، رەحیم سەیفی قازی، رەحمان گەرمیانی و سوڵتان وەتمەیشی کە بەینێکیش لە بەغدا ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی سێهەمی حیزب بوو.(*) لە نێو ئەوانەی کە گەڕابوونەوە کوردستان، تەنیا غەنی بلوریان بەردەوام چالاکی سیاسی خۆی درێژە پێداوە. ئەوانی دی تاق ولۆق کردوویانە، بۆ هەمیشە پەیگیرییان نەکردووە.

(*) چەند کەسێک لەوانە وەک عەلی گەلاوێژ و سوڵتان وەتمەیشی لە باکۆ لەسەر رادیۆ «سرێ» قسەیان دەکردو کاک رەحیم قازی لە بەشی چاپەمەنی دا کاری کردووە، تا چەند ساڵ دواتر رۆژنامەیەکی کوردیشیان بە نێوی کوردستان چاپ کردووەو هەر لەوێ بە ژمارەیەکی کەم لە نێو خۆیاندا بلاوبۆتەوە.

## بەشی پێنجەم

# کارەکانی کۆمار

دەورەی حاکمییەتی کۆمار تەنیا یازدە مانگ بوو و لەم ماوە کورتەدا زۆر کاری گرینگ جێ بەجێ کران کە نیشانەی ئیمان وتێکۆشانی بێ وچانی کاربەدەستانی کۆمار بوو.

بەکورتی دەکرێ کارنامەی پڕ لە شانازیی یازدە مانگەی کۆماری کوردستان لە بوارە جۆراوجۆرەکانی سیاسی، ئابووری، ئیزامی، فەرهەنگی، ئاوەدان کردنەوە و دیموکراسیی نێوخۆیی بەشێوەی خوارەوە باس بکەین:

باوەڕ بە دیموکراسی لە رادەی هەموو ئێراندا و بەشداربوونی هەموو گەلان و هێزە سیاسییەکان لە کاروباری سیاسی روانگەیەکی روون و ئاشکرای دیموکراسییە کە رێبەرانی کۆمار و لە پێش هەمووەاندا پێشەوا خوازیاری بوون. هەوڵدان بۆ گەیشتن بەم مەبەستە و رێککەوتن لەگەڵ هێزە پێشکەوتنخوازەکانی ئەو سەردەمە وەک حیزبی توودە، فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و حیزبی جەنگەڵ لە بەرنامەی کاری حیزبی دیموکراتی کوردستان و کۆماردا بوو. مەبەست لە پێکهێنانی ئەم هاوپەیمانییەتییە ئەوە بوو کە ئەمان لە لایەک خەباتی خۆیان لە کوردستان درێژە پێ بدەن و لە لایەکی دیکەوە ببنە هاندەر و پشتیوانێک بۆ ئەو هێزانە تا بە هاوکاریی یەکتر بە ئامانج بگەن. کۆمار لە ماوەی کەمی تەمەنی خۆیدا توانی وەک راستییەک کورد و مەسەلەکەی بە شێوەیەکی واقیعی بە کۆمەلانی خەڵکی ئێران و رێکخراوە سیاسییەکان و حکوومەتی ناوەندی بناسێنێ. لە ئاکامی ئەو هەوڵانەدا بەرەیەک لەو رێکخراوانە پێکهات و ئەگەر فێڵ و تەڵەکەی هێزە خاریجییەکان وەک ئەمریکا و ئینگلیس لە لایەک و لە لایەکی دیکەوە فێڵبازیی (قوام السلطنة) سەرۆک وەزیری ئەو کاتی حکوومەتی تاران کە مۆرەیەکی گرینگی بریتانیا و سیاسەتمەدارێکی ناسراوی ئێران نەبا ئەو بەرەیە دەیتوانی دەورێکی باشی هەبێ لە لاوازکردنی حکوومەتی ناوەندی بۆ پێکهاتنی ئاڵ و گۆڕێکی بەرچاو و دامەزراندنی حکوومەتێکی دیموکراتی لە ئێراندا.

بەشدار بوونی سێ ئەندامی حیزبی توودە لە کابینەی (قوام السلطنة) تا رادەیەک

ئازادی چالاکی ڕێکخراوە سیاسییەکان و ئازادیی چاپەمەنی بەهۆی پێکهاتنی ئەو بەرەوە بوو.

لە بواری پەیوەندیی دەرەوەدا، پێکهێنانی پەیوەندی لەگەڵ حکوومەتی ئازەربایجان کە وەک هاوپەیمانی کۆمار حیسابی لەسەر دەکرا و پەیماننامەی ئابووری و نیزامیی لەگەڵدا مۆر کرابوو و دۆستایەتییەکی پتەویان لەگەڵدا پێک هاتبوو، لە لایەکی دیکەشەوە پێکهێنانی پێوەندیی دۆستانە لەگەڵ سۆڤیەت و دامەزرانی پێوەندیی بازرگانی و ئاڵ و گۆڕی کەل و پەلی پێویست لە کارەکانی کۆمار بوون.

لە بواری نیزامیدا، لەو ماوە کورتەدا تەشکیلاتێکی ڕێک وپێکی نیزامی دامەزرا و نزیک بە دووهەزار پێشمەرگە دەورەیان دی و بە کاری نیزامیی ڕێک و پێک ڕاهاتن.

ئەوە جیاواز بوو لەو هێزە عەشایرییەی کە لە بەرەکاندا ئامادەی بەرگری کردن لە کۆمار بوون و ژمارەیان زیاتر لە دوازدە هەزار کەس بوو. ئەم هێزە سەرەڕای پیلانی دوژمنان و کەسانی سەر بە وان توانی لە چەندین شوێن لە حاست هێزەکانی حکوومەتی ناوەندیدا ڕابوەستێ و زەبری باشیان لێ بوەشێنێ. هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە تایبەت بەشێک لە بارزانییەکان بە پێی پەیمانی هاوکاریی دوولایەنە لەگەڵ حکوومەتی ئازەربایجان بەرەنگارییەکی قارەمانانەیان لە حاست هێزەکانی حکوومەتی ناوەندیدا لە ناوچەی تیکاب کرد. لە ماوەی ئەو شەڕانە لە بەرەکاندا سێ پێشمەرگەی مێرخاس شەهید کران، کە یەکەمیان ناوی وەستا براییمی بەنەنا بوو و لەبەرەی سەردەشت شەهید کرا، دووهەم محەممەدئەمینەوا زادە کە دەرەجەی سەرهەنگ هەبوو و ماوەیەک فەرماندەری گشتیی هێز و دوایە لە کومیساریای سیاسی وەزارەتی بەرگری بوو، بووە قوربانیی پیلانێک و لە بەینی بانە و سەقز لە کارەساتی خستنە خوارەوەی تەیارە شەهید کرا، سێهەمین شەهید یەکێک لە ئەفسەرە باشەکانی کۆمار بەناوی خەلیل خۆشەوی، کە بارزانی بوو و لە بەرەی سەقز شەهید کرا.

هێزی عەشایر بریتی بوو لە:

| | |
|---|---|
| بارزانی بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا | ١٢٠٠ پیادە |
| بارزانی بە سەرکردایەتی شێخ ئەحمەد | ٩٠٠ پیادە |
| جەلالی و میلانی | ٤٠٠ سوار |
| شکاک بە سەرکردایەتی عومەر خان | ٨٠٠ سوار |
| شکاک بە سەرکردایەتی تاهیر خانی کوڕی سمکۆ | ٥٠٠ سوار |

هەرکی بە سەرکردایەتیی رەشید بەگ و بەگزادە بەسەرکرادیەتی نووری بەگ
١٠٠٠ سوار

هەرکی بە سەرکردایەتی زێرۆ بەگ ٧٠٠ پیادە

تاقمی بنەماڵەی سەید عبداللە گەیلانی زادە بە سەرکرادیەتی سەید فەهیم
٢٠٠ سوار

زەرزا بە سەرکردایەتی مووساخان ٣٠٠ سوار

قەرەپاپاخ(تورک) بە سەرکردایەتی پاشاخان و خەسرەوخان ٥٠٠ سوار

مامەش تیرەی کاک عەبدوڵڵا قادری ٤٠٠ سوار

مامەش بە سەرکردایەتی کاک هەمزە ئەلۆسی ئەمیر عەشایری ٥٠٠ سوار

پیران بە سەرکردایەتی محەممەد ئەمین ئاغا و قەرەنی ئاغا ٣٠٠ سوار

مەنگور بە سەرکردایەتی عەبدوڵڵا بایەزیدی ٣٠٠ سوار

مەنگور بە سەکردایەتی عەلی خان و ئیبراهیم سالاری ٤٠٠ سوار

گەورکی سەردەشت بە سەرکردایەتی کاکە ڵڵاغا محەممەدی ٢٠٠ سوار

گەورکی مەهاباد بە سەرکردایەتی بایزی عەزیز ئاغا ٣٠٠ سوار

گەورکی سەقز بە سەرکردایەتی عەلی جوانمردی و محەممەد ئاغا و حاجی ئیبراهیم ئاغا
٤٠٠ سوار

تێکەڵاوی خێڵەکانی سەردەشت ٥٠٠ سوار

تیرەی سوێسنی ١٠٠ سوار

دێبۆکری مەهاباد بە سەرکردایەتی جەعفەر کەریمی ٤٠٠ سوار

دێبۆکری بۆکان بە سەرکردایەتی ئاغاکانی ئیلخانی زادە ٥٠٠ سوار

فەیزوڵڵا بەگی بۆکان و سەقز ٨٠٠ سوار

بنەماڵەی بداغی سەقز ٢٠٠ سوار

تێکەڵاوی تیرەکانی مەهاباد و شاهیندژ ٣٠٠ سوار

تاقمی حەمە رەشید خانی بانە ٣٠٠ سوار

پێشمەرگەی جوانرۆ وهەورامان ١٥٠ سوار

کۆی هەموویان ١٢٧٥٠ نەفەر(*)

ئەم هێزە ئیزامییە دەیتوانی زۆر زیاتر لەوە فەعال بێت، بەڵام راگرتنیان لە بەرەکاندا

(*) حکومەتی کوردستان، نووسینی نەوشیروان مستەفا ئەمین ل١٧٤

و قـەتیس مـانەوەی چالاکـیی پێشـمـەرگـانە کـە بە گـشـتی لە سیـاسـەتی ئەو دەمی کاربەدەسـتـانی کۆمار و بە تایبەتی لە پێکهاتنی پێوەندیی نهێنی هێندێک لە سەرانی عەشیرەکـان و بەرپرسانی نیـزامی و کەین و بەینیان لەگەڵ کاربەدەسـتـانی حکوومـەتی ناوەندی سـەرچاوەی دەگـرت، دەبووە هۆی دڵسـاردیی خـەڵکی چەکـداری بەشـدار لە بەرەکاندا و هەروەها پێشمەرگەکان. ئەوە یەکێک لە لاوازییە هەرە گرینگەکانی کۆماری کوردسـتان بوو. لە حاڵێکدا ئەگەر بە شێوەیەکی باش لەم هێزە بەرینەی خەڵکی چەکدار کـەڵک وەرگـیرابا، کۆمار دەیتـوانی بە باشی لە حاست هێرشی هێزەکـانی حکوومـەتی ناوەندیدا بەربەرەکانی بکا و زەبری باشیان لێ بوەشێنێ.

شـایانی باسـە کـە سـەرەڕای زاڵ بوونی سـیـسـتـمی دەرەبەگـایەتی بە سـەر کۆمـەڵی کوردەواریی ئەوکات لە کـوردسـتانی ئێراندا، بەهۆی دڵگەرم بوونی خەڵک بە کۆمار رادەی بەرهەمی کشـتوکاڵ لە ماوەی تەمەنی کۆماردا چووە سەرێ و سیـسـتـمی بازرگـانی ئازاد مـەودای ئەوەی دابوو کـە ئاڵ و گـۆڕی بازرگـانـیی نێـوان کـۆمـاری کوردسـتـان و کـۆمـاری ئازەربایجان و یەکـیـەتی سۆڤـیـەت، پێک بێت. بەو پێـیـەش رادەی داهاتی خەڵک روو لە زیاد بوون بوو و ئەم وەزعە بە هۆی وەرگرتنی ماڵیات بە قازانجی کۆماریش بوو.

بۆ وێنە فرۆشتنی راسـتەوخۆی بەرهەمی توتنی کوردسـتان بە یەکـیەتیی سۆڤـیـەت و واریدکردنی هێندێک کەل و پەلی پێـویسـت لەوێوە بۆ کوردسـتان شوێنەواری باشی لە سەر وەزعی ئەو کاتی کوردستان دانابوو.

لەباری فەرهەنـگـیـیەوە هەرچەند هێندێک بناغە بۆ خوێندن و نووسـینی کوردی لە نێو لاوەکـان و تازە لاوەکاندا پێک هاتبـوو و ژمـارەیەکی زۆر مـامۆسـتـای شارەزا و ئەفـرادی کوردیزان لەگەڵ بارزانـییـەکاندا هاتبوونە دیوی کوردسـتـانی ئێران و لە بەر بوونی شـارەبانـیی مەهاباد کلاسـی کوردیی شەوانە بە شێوەی نیـوە نهێنی- نیـوە ئاشـکرا دامـەزرابوو، بەڵام دوای دامـەزرانی حیـزبی دێموکراتی کـوردسـتـان و دوای دامـەزرانی کـۆمـار، بۆ یەکـەم جـار خەڵک توانیان بە شێوەی ئاشکرا بە زمانی زگـماکیی خۆیان بخوێنن. لەم پێوەندییەدا جێی خۆیەتی ئیـشـارە بەوە بکرێ کە کاروتێکۆشانی بێ وچانی مامۆسـتایانی قوتابخانەی کوردی وەک محەمەد تۆفیـق وردی و عوسـمـان دانش و مامۆسـتا جەمیـل و مامۆسـتا قـانع و کەریم زەند و ... دەورێکی بەرچاوی لە بەڕێوەچوونی بەرنامـەی فـێـرکـردنی خـوێندن و نـووسین بەزمانی کوردی هەبوو. هەر لەو ماوە کەمەدا ژمـارەیەکی زۆر لە خەڵک لە قوتابخانەکاندا فێری خوێندن و نووسـینی کوردی بوون و لە کلاسـەکانی شەوانەشدا گەورە ساڵان خەریکی

خوێندن بوون. جیا لەوە زۆر ڕۆژنامە و گۆڤار بە زمانی کوردی بڵاودەبوونەوە، وەک ڕۆژنامەی کوردستان، ئۆرگانی حیزبی دێموکراتی کوردستان و گۆڤاری کوردستان و گوڵاڵە و هەڵاڵە و هاواری نیشتمان و گڕوگاڵ بۆ منداڵان. ئەم بڵاوکراوانە دەورێکی باشیان لەسەر پێکهێنانی ئاڵوگۆڕ بەسەر وەزعی فەرهەنگیی ئەو کاتدا هەبووە. یەکێکی دیکە لەو کارە گرینگانەی کۆمار لەباری فەرهەنگییەوە بریتی بوو لەوەی کە بە سەدان کەس ڕۆڵەی زەحمەتکێشان کە لەبەر نەداری و فەقیری و کاری سەخت و دژوار نیمکانی خوێندنیان نەبوو، بە سەر بنەماڵە دەوڵەمەندەکاندا دابەش کران تا لەو ڕێیەوە نیمکانی ژیانێکی بە ئاسوودەیی و خوێندنیان بۆ دابین بکرێ. زۆربەی ئەوانە دوای کۆمار درێژەیان بە خوێندن دا و پێگەیشتن. پێڕاگەیشتن و ئامادەکردنی هەلومەرجی لەبار بۆ خوێندنی ئەم کەسانە لە لایەن کۆمارەوە چاوەدێری دەکرا. هەروەها بۆ یەکەم جار تیناتر و شانۆگەری هاتە مەیدان. شانۆگەرەکان شار بەشار دەگەڕان و هونەری خۆیان دەنواند. ئەم بەشە لە هونەر دەورێکی بەرچاوی لە بردنە سەری ڕادەی فیکری و فەرهەنگیی خەڵکدا هەبوو.

کاروباری ئاوەدان کردنەوە لەو ماوە کەمەدا زیاتر لە هەموو ئەو کارانە بوو کە لە ماوەی تەمەنی حکوومەتی سەڵتەنەتی تا ئەوکات کرابوو.

دێموکراسیی نێوخۆیی بە شێوەیەکی بەربڵاو بەڕێوە دەچوو. هەموو کەس ئازاد بوو بیروبۆچوونی خۆی باس بکا و ئۆرگانی دێموکراتیکی تایبەت بۆ ئەم مەبەستە پێک بێنێ. بۆ یەکەم جار لە ڕۆژی چواری ڕەشەمەی ١٣٢٤دا یەکیەتیی ژنانی کوردستان پێکهات کە مینا خانم هاوسەری پێشەوا و هەروەها خێزانی ژێنراڵ بارزانی و باقی کادر و بەڕێوەبەرانی حیزب تێیدا بەشداربوون و بۆ یەکەم جار ژن توانی لە کوردستانی ئێراندا و لە کۆڕە گشتییەکاندا بیروڕای خۆی دەرببڕێ و لە ڕێ و ڕەسم و جێژنەکاندا بەشداری بکات. هەروەها یەکیەتیی لاوان پێکهات کە ئەو دەم دەیتوانی لە بەرەکانی شەڕدا بەشدار بێ و ئەرکی ئامووزشی بە ئەستۆ بگرێ. لەو ماوەدا نیزیکەی ٨٠ کەس لەو لاوانە بۆ خوێندن لە بەشە جۆراوجۆرەکانی سیاسی و نیزامیدا بەڕێ کران بۆ باکۆ و تەورێز.

مافی دێموکراتێک بە شێوەیەکی بەربڵاو بەڕێوە دەچوو. ژمارەیەکی کەم جوولەکە و ئەرمەنی کە لە شارەکانی ئەو دەمی کوردستانی ژێر چاودێری کۆماردا دا دەژیان بە تەواوی مانا ئازاد بوون کە قوتابخانە دابنێن، لە ڕێ و ڕەسمەکاندا ڕێزی تایبەتی خۆیان هەبوو و فەرهەنگ و کولتووری خۆیان گەشە پێ دەدا و لە بواری حیزبایەتیدا شانە و حەوزەی تایبەتی خۆیان هەبوو. هەروەها بەشێک لە ئەرمەنییەکان لەسەر داخوازی خۆیان چوونە

نەرمەنستان. بێگومان ئەوە بۆ خۆی نموونەیەکی زیندووی روانگەی بەهێزی دیموکراسییە لە رێبەرایەتیی ئەو کۆمارە و رێبەرایەتی حیزب لەو کاتەدا.

بە کورتی دەکرێ بە شێوەی خوارەوە ئیشارە بە کارەکانی حیزب و کۆمار لە ماوەی کەمی تەمەنی خۆیدا بکەین:

**یەکەم: لە بواری سیاسیدا**

١- پێوەندیی نزیکی دۆستایەتیی لەگەڵ کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەت و یەکیەتیی سۆڤیەت.

٢- هاوپەیمانی لەگەڵ کۆماری ئازەربایجان.

٣- پێکهێنانی پێوەندیی دۆستانە لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی دیکەی ئێرانی.

٤- ناساندنی کورد و حیزبی دیموکراتی کوردستان و کۆماری کوردستان بە بیرورای گشتی لە رێگەی چاپەمەنی و وتووێژی رۆژنامەیی.

٥- راکێشانی هێندێک هەواڵنێری خاریجی بۆ کوردستان.

٦- بەرزکردنەوەی ئاڵای کورد و رەسمییەت دان بە مافە رەواکانی، ساغ بوونەوە لەسەر ئارمی حیزب(دووگوڵە گەنم و قەڵەم و تیشکی رۆژ).

٧- بەرزکردنەوەی هەستی کوردایەتی بە شێوەیەکی گشتی و لەبار، بە تایبەت دوای تێکشکانی شۆڕشەکانی شێخ مەحموود، ئیحسان نووری پاشا و سمکۆ.

**دووهەم: لە بواری دیموکراسیدا**

١- بەشداری کردنی ژنان لە سیاسەتدا و پێکهێنانی یەکیەتی ژنانی کوردستان.

٢- وەبەر چاوگرتنی مافی زەحمەتکێشان.

٣- دانانی قانوون و یاسا و بەڕێوەبردنی تا ئەو رادەی گونجاوە و ئیمکانی هەبووە.

٤- بایەخدان بە مافی کەمایەتییەکان بە تایبەت لە بواری فەرهەنگیدا.

٥- بەشداری کردنی هەموو چین و توێژەکان لە کاروباری حکوومەتیدا.

**سێهەم: لە بواری فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیدا**

١- رەسمیەت پێدانی زمانی کوردی بۆ خوێندن و بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداری.

٢- یەک رەنگکردنی جل و بەرگی قوتابییان لەسەر بوودجەی کۆمار و هەڵگرتنی فەرق و جیاوازی.

٣- ئیجباری کردنی خوێندن بۆ منداڵان و لاوەکان لە شارەکاندا.

٤- پێشگیری لە بێکاری و نەخوێندەواریی گەورەساڵان.

٥- دانانی فەقیرخانە و هەتیوخانە.
٦- دامەزراندنی چاپخانە و دەرچوونی رۆژنامەی کوردستان و چەند گۆڤاری دیکە.
٧- دامەزراندنی ئەنجوومەنی فەرهەنگی لەگەڵ ئازەربایجان و یەکیەتی سۆڤیەت.
٨- دانانی بنچینەی تیناتر و سینەما لە کوردستان.
٩- ناردنی قوتابیی کورد بۆ درێژە پێدانی خوێندن بۆ باکۆ و تەورێز.



**چوارەم: لە باری ئابوورییەوە**

١- ئازاد کردنی بازرگانی و دەرخستنی لە دەست حکوومەت.
٢- هەوڵدان بۆ بەڕێوەبردنی شێوەی نوێی کشتوکاڵی و هێنانی تراکتۆر بۆ یەکەم جار بۆ کوردستان.
٣- دامەزراندن و گەشەپێدانی شیرکەتێکی گەورەی بازرگانی بە ناوی(تەردقی).
٤- دامەزراندنی پێوەندیی بازرگانی لەگەڵ ئازەربایجان و ئازەربایجانی سۆڤیەت بە تایبەت بۆ فرۆشتنی تووتن، خوری، کەتیرە و هێنانی هێندێک کەل و پەلی بە کەلک تر بۆ کوردستان.

**پێنجەم: لە بواری نیزامیدا**

١- چەکدار کردنی خەڵک بە شێوەیەکی گشتی بۆ بەرگری لە کۆمار.

٢- تەعلیم دانی نزیکەی دوو هەزار پێشمەرگەی رەسمی بە شێوەیەکی نوسوولی.

٣-دەرەجەبەندی و پێکهێنانی سیستیم.

٤- دانی یارمەتی بە وانە بە پێی دەرەجە و لێهاتوویی.

٥- پێکهێنانی سێ بەرەی شەڕ لە سەردەشت، سەقز، تکاب بە هاوبەشیی ئازەربایجان و بەرگرییەکی باش لە هاتنە پێشی دوژمن تا دوایین رۆژەکانی تەمەنی کۆمار.

بەشی شەشەم

# تێکچوونی کۆمار و هۆیەکانی

کۆماری کوردستان وەک دامەزراوێکی سیاسی دیموکراتێک لە هەلومەرجی ئەو کاتی ناوچەکەدا ببووە چقڵی چاوی وڵاتانی ئیمپریالیستی وەک ئەمریکا و بریتانیا و نۆکەرەکانیان لە ئێراندا. هەر بۆیە بە هەموو شێوەیەک هەوڵی تێکچوونی ئەم کۆمارە و کۆماری میللیی ئازەربایجانیان دەدا. بەهۆی ئەم پیلانگێڕییانەو هێندێک هۆی نێوخۆیی و دەرەوەیی دیکە بوو کە رۆژی ٢٦ی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٥ واتە ساڵێک دوای هەڵکردنی ئاڵای کوردستان و دەست بەسەرداگرتنی شارەوانیی مەهاباد، ئەرتەشی ئێران هاتەوە نێو شاری مەهاباد و بەم شێوەیە کۆتایی بەتەمەنی کۆمار هێنا. فەرماندەری هێزەکانی حکوومەتی ناوەندی سەرتیپ هومایونی بوو.

دەکرێ بە شێوەی خوارەوە ئاماژە بە هۆیەکانی تێکچوونی کۆمار بکرێ:

١- وەگەڕکەوتنەوەی خاڵەکانی ژمارە پێنج و شەشی پەیمانی ئێتحادی سێ قۆڵی نێوان ئێران، بریتانیا و یەکیەتی سۆڤیەت، لە سیاسەتی نێو نەتەوەییدا، کە بریاری چۆڵکردنی خاکی ئێران لە لایەن هاوپەیمانەکانەوە دوای شەش مانگ لە تەواوبوونی شەڕ لە کۆنفرانسی ساڵی ١٩٤٣ی تاران کە لەودا روزویلت و چرچیل و ستالین بەشداری بوون.

٢- بەرپێنگ گرتنی ئەمریکا و ئینگلیس بە یەکیەتی سۆڤیەت لەمەر بەرێوەبردنی قەراری پێشوویان لەسەر چۆڵکردنی ئێران و ئیعترازی ئەوان لە پشتیوانی کردنی سۆڤیەت لە دوو کۆماری ئازەربایجان و کوردستان و کەم دەسەڵاتیی یەکیەتیی سۆڤیەت لە باری سیاسی و ئابووری بۆ ماوەیەکی درێژ پاش شەڕی دووهەمی جیهانی.

٣- سەفەری (قوام السلطنة) سەرۆک وەزیری ئێران بۆ مسکۆ و دانی بەڵێنی مۆرکردنی

قەراردادی نەوتی شیمال.

٤- درێژەی باسەکانی خاڵی ٣ لە دانیشتنەکانی قەوام و سادچیکوف باڵوێزی یەکیەتی سۆڤیەت لە تاران و دانی قەراری هێنانە گۆڕی ئیمتیازی نەوت دوای حەوت مانگ لە دەورەی پازدەهەمی مەجلیسی شورادا.

٥- بەدەستەوە بوونی دەسەڵات لە دەست هێندێک لە ئەفرادی ناسالم و نالایقدا.

٦- ناتەبایی نێوخۆیی و سازانی هێندێک دەرەبەگ و شێخ و مەلا لە بنەوە لەگەڵ کاربەدەستانی حکوومەتی ناوەندیدا.

٧- ماندوویوونی خەڵک لە حاڵەتی وەستانی بەرەکانی شەڕ و نەدانی ئیزنی بەرەو پێش چوون و هێرش کردن بۆ سەر دوژمن.

٨- رێگەدان بۆ بردنی ئازووقە بۆ هێزی دوژمن کە لە پادگانەکانی بانە و سەردەشت تووشی برسیەتی ببوون.

٩- تێکچوونی کوت وپڕی کۆماری ئازەربایجان بەهۆی خەیانەتی دوکتۆر جاوید، وەزیری نێوخۆیی ئەم حکوومەتە هاوپەیمانەی کوردستان.

هەروەک پێشتر باسمان کرد، بارزانییەکان کە لە مەهاباد و دەوروبەری نیشتەجێ ببوون هێزێکی چەکداری کارامەیان هەبوو کە دەگەیشتە نزیک دوو هەزار کەس و سەرۆکی ئەم هێزە چەکدارە واتە مەلا مستەفا بارزانی پلەی ژێنراڵی لە لایەن کۆمارەوە پێ بەخشرا. سێ کەسی دیکە لە لایەن حکوومەتی کۆماری کوردستانەوە ئەم پلەیان پێ بەخشرا کە بریتی بوون لە: سەیفی قازی، عومەرخانی شەریفی، رەئیسی عێلی شکاک و حەمە رەشید خانی بانە.

پێشمەرگەکانی بارزانی لە بەرەکانی شەڕدا دەوری بەرچاویان هەبوو و ژێنراڵ بارزانی سەرۆکی عێلی بارزانییەکان لە لایەن کاربەدەستانی کۆمارەوە زۆر بەڕێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرا، بە شێوەیەک کە لە کاتی هاتنی بۆ شاری مەهاباد لە لایەن کۆڕی حیزب و کاربەدەستانی کۆمارەوە پێشوازیی گەرم و رەسمیی لێ کرا. دوای رووخانی کۆماری ئازەربایجان و لە کاتی پێشڕەوی ئەرتەش بەرەو کوردستان ژمارەیەک لە ئەفرادی ئیزامیی کۆماری ئازەربایجان کە لە بەرەی تیکاب بوون، پاش چوار رۆژ شەڕ و بەربەرەکانی دژی هێزەکانی حکوومەتی ناوەندی لەگەڵ هێزەکانی بارزانی کەوتن و لەوێوە بەرەو بۆکان و

(١) شایانی باسە کە سێ کەس لەوانە بریتیبوون لە سەید حسن تەفرشیان، زەربەخت، سەفەرخانی قارەمانی ئەفسەری ئازەربایجان.

پاشان بەرەو مەهاباد وەڕێ کەوتن[11]. شایانی باسە کە ڕۆژی ٢٤ی سەرماوەزی ٢٥، کۆبوونەوەیەکی ڕێبەرایەتی کۆمار پێکهات و بڕیار درا کە هێزی چەکدار بۆ بەربەرەکانی دژی هێزەکانی حکوومەتی ناوەندی ساز بدرێن، بەڵام دوا بڕیاریان دانا بۆ کۆبوونەوەی ڕۆژی دواتر کە دەبوو لە مزگەوتی عەباس ئاغا پێک بێ. لەم کۆبوونەوەدا نوێنەرانی خەڵکی مەهاباد و کاربەدەستان و وەزیرەکانی کۆماریش بەشدار بوون و لەوێ قازی محەممەد بە شێوەیەکی دیموکراتییانە پرس و ڕا بە خەڵکەکە دەکات. پێشەوا و مەلا مستەفا و سەدری قازی پێیان وابوو کە دەبێ پێشگیری لە هاتنی ئەرتەش بکرێ. بە پێچەوانە لە ناو خەڵکی شاردا ژمارەیەک پێیان وابوو کە بەرگری کردن کارێکی بە قازانج نییە. لەوانە مەلا عبداللە مدرسی و مەلا حسێن مەجدی لەسەر ئەو بۆچوونە قسەیان کرد. پێویستە بگوترێ کە سەرۆک بارزانی داوایەکی زۆر لە قازی محەممەد دەکا کە بڕیاری بەربەرەکانی بدات و ئاخر داوای ئەوە دەبێ کە قازی محەممەد خۆ نەداتە دەست هێزەکانی دەوڵەتی و بەڵێنی گوێ ڕایەڵی و بەڕێوەبردنی هەر چەشنە فەرمان و دەستوورێک بێ کە پێی دەدات، بەڵام پێشەوا قەبووڵی ناکات و دەڵێ من لێرە دەمێنمەوە تا سەر لەگەڵ خەڵکەکە دەبم. دوایی قازی محەممەد دەستوور دەدات کە بارزانییەکان هەرچییان لە چەک و ئازووقە پێویستە، بیان درێتێ. پاش ماوەیەک وتوویژ لەگەڵ کاربەدەستانی ئێران سەبارەت بە پێکهێنانی ژیانێکی بە ئاسوودەیی لە کوردستانی عێراقدا کە لە لایەن ئینگلیسەوە زەمانەت کرابێ و، سەرنەگرتنی ئەم مەسەلەیە، شێخ ئەحمەدی بارزان لەگەڵ زۆربەی بارزانییەکان لە ١٣ی ئاوریلی ١٩٤٦دا گەڕانەوە ناوچەی بارزان. شایانی باسە کە دوای چاوپێکەوتنی مەلا مستەفا بارزانی لەگەڵ سەر لەشکر هومایونی، پێی ڕاگەیاند کە ئەگەر باڵوێزی ئینگلیس حازر بە وەرگرتنی زەمانەت بۆ ژیانی بە ئاسوودەیی لە عێراق بێت، دەگەڕێتەوە ئەوێ. پاشان بارزانی لەگەڵ چەند کەسی دیکە بۆ وتوویژ لەگەڵ کاربەدەستانی ئێران و باڵوێزی بریتانیا چووە تاران و ماوەی مانگێک لەوێ مایەوە لەگەڵ شای ئێران چاوپێکەوتنی کرد و پاشان گەڕایەوە مەهاباد. لەتاران بە مەبەستی خۆ دەربازکردن بەڵێنی دا کە هەموو بارزانییەکان بچنە ناوچەی ئەلوەند لە هەمەدان. بە گەیشتنەوەی بۆ کوردستان لە لایەن هێزەکانی ئێرانەوە پەلامار دەدرێن کەپاش ئەنجامی چەند شەڕی ئازایانە، شێخ ئەحمەدی بارزان و بەشی زۆری بارزانییەکان خۆیان دەربازی ئەودیوی عێراق دەکەنەوەو مەلا مستەفا و نزیک بەپێنج سەد کەس لە ئەفرادی چەکداردەمێننەوە. تەنیا ڕێگایەک کە بۆ مەلا مستەفا مابووەوە،

پەنابردن بۆ وڵاتی سۆڤیەت بوو، چونکە نە دەوڵەتی ئێران و نەتورکیە بە هیچ چەشنێک ڕێگایان نەدەدا لەم وڵاتانەدا بمێنێتەوە ، بە دایم پیلانیان دژی دەگێڕا.

چەند مـانگ دوای ئەم وەزعـە، مـەلا مـسـتـەفـا بارزانی لەگـەڵ ئەو ژمـارەیە لە پێشمەرگەکانی دوای ڕێپێوانێکی دووروودرێژی ۳۵۰ کیلۆمەتری و لە حاڵێکدا لە لایەن ئەرتەشەکانی ئێران، عێراق و تورکیە پەلاماری دەدرا و ڕێگای لێ دەبەسترا، لە ماوەی چەند ڕۆژدا خـۆی گـەیاندە چەمی ئاراز و بە پەڕینەوەی لەم ڕووبارە چووە نێـو خـاکی یەکیەتی سۆڤیەت. پاشەکشە و دەربازبوونی بارزانییەکان و پەڕینەوەیان لە ڕووباری ئاراز سەرەڕای هێرش و کەمین دانانەوە و پیلانگێڕی ئێران و تورکیە و عێراق وەک لاپەڕەیەکی زێڕینە لە مێژووی خەباتی نەتەوەی کوردا. تاکـتیکی دەربازبوونیـان دواتر وەک دەرس لە « دانشگای جنگ» لە تاران گوتراوەتەوە.

بە دوای تێکچوونی کۆمار، بێجگە لە پێشەوا و هاوڕێکانی کە لە پادگانی مەهاباد زیندانی و موحاکەمە کران، وەزیرەکانی کۆمار و زۆربەی بەرپرسانیش گیران و زۆربەیان بۆ مـوحـاکـمـە کـردن بەرێ کـرانە شـارەکـانی ورمێ و تەورێز. دوای حـوکـم درانی پێشـەوا و یارانی، موحاکمە کردنێکی دیکە لە مەهاباد پێک نەهات و لە شوێنەکانی دیکە بەڕێوە دەبران. ئەفـرادی بەڕێوەبەری دادگای پێشـەوا و یارانی، هێندێک لە ئەفسەرانی کـۆماری ئازەربایجانیشـیـان موحاکمە و مەحکووم کرد و لە گۆڕسـتـانی مـەلا جامی تیر بارانیان کـردن. پێش گـیـران و مـوحـاکـمـە کـردنی قـازییـەکـان لەبەر ئەوەی کـە ڕێژیم هیچ چەشنە مەدرەک و بەڵگەیەکی دژی خەڵک وەدەست نەکەوێ، هەموو بەڵگە و لیسـتەکانی چەک و چۆلی کـۆمـار و دابەش کـراو بەسـەر خـەڵکدا سـووتێندران، قـازی مـحـەمـەد بەوپەڕی فیداکارییەوە لە دادگادا بەرپرسایەتیی سووتاندنی ئەو بەڵگە و لیسـتانەی بە ئەستۆ گرت.

روحیـەی بەرزی پێشەوا و هاوڕێکانی لە کـاتی موحاکەمە کردن لە بێدادگای نیزامیدا، نموونەی هەرە بەرچاوی شـۆڕشگێڕی و دڵسـۆزی و نیـشـتـمـانپـەروەریی ئەوان بە گـشـتی بوو.بەتایبەت پێشەوا لە دیفاعیاتی خۆیدا کە چەندین سەعاتی خایاند، لە ڕاستیدا لەو بێدادگایە، بەرگرییـەکی شیاوی لە مافی ڕەوای گەلەکەی کرد و حکوومەت و نیزامی زاڵ بەسەر گەلانی ئێرانی موحاکمە کرد. هەروەها قـسـەکانی پێشەوا لە کاتی لە سێداردەدانیان لە گوێی هەموو کوردێکی دڵسـۆز و نیشـتـمانپەروەردا دەزرینگێتەوە و هاندەرێکی باشە بۆ تێکۆشان و فیداکاری لە ڕێگەی وەدی هێنانی ئامانجە نەتەوەیەکانی خەڵکی کوردستاندا.

بەشـێک لەو بەرپرسـانەی کـۆماری کوردسـتـان لە سـێدارە دران و بەشـێکیـان بە زیندانی

درێژ خایمن مەحکووم کران. لە نێو وەزیرەکاندا زیاتر لە هەموویان خوالێخۆشبوو مام (ئەحمەد ئیلاهی) زیندانیی کێشا و حەوت ساڵ لە بەندیخانەدا مایەوە. کەریم نازمی برا گەورەی شەهید محەممەد نازمی لە بەندیخانەی «قصر» و هاشم هەمزەیی لە بەندیخانەی مەراغەدا کۆچی دواییان کرد. زۆر کەسیش بۆ شارەکانی وەک ئیسفەهان، کرمان، شیراز، مەشهەد و تاران دوور خرانەوە کە ئێستاش تاق و لۆق خۆیان ئەگەر مابن یان بنەماڵەکانیان هەر لەم شوێنانە نیشتەجێن. هەروەها بەشێک لە کاربەدەستانی کۆمار بەرپرسانی کوردستانی عێراق بوون کە قازی کاکە حەمەی بۆکان، حەسەن قزلجی، مامۆستا هەژار، رەحمان زەبیحی، سەیدە گوڵەی سەمەدی، سەدیق حەیدەری، سەعید حەمە قالە (مام قادر)، محەممەد شاپەسندی، ئیبراهیم نادری، حەمەدی مەولوودی و زێڕۆبەگ و زۆر کەس لە قادرییەکانی عەشیرەتی مامەش لە ریزی ئەو کەسانە بوون.

لە سەرجەمی هەڵسوکەوتی بەرپرسانی رێژیمی سەڵتەنەتی لەگەڵ هێندێک لە بەرپرسانی پایە بەرزی کۆمار و ئەمانەوەی زۆربەیان لە بەندیخانەکانی رێژیم دا، لەبەراوردی ئەوەی کە هێندێک لە بەرپرسانی رەدەی خوارتر ئیعدام کران، شک و گومانێکی زۆری لە نێو خەڵکدا بەرامبەر بە کاربەدەستانی پایە بەرزی وەک حاجی بابە شێخ و هێندێک لە وەزیرەکان و بەرپرسانی دیکە هێنایە گۆڕێ. لە ئەنجامی دادگایی کردنەکاندا قازی محەممەد و سەدری قازی ومحەممەد حسێن سەیفی قازی، بە ئیعدام مەحکووم کران و بەرەبەیانیی ١٠ی خاکە لێوەی ١٣٢٦ی هەتاوی لە مەیدانی چوار چرای شاری مەهاباد لە سێدارە دران. راست حەوتوویەک دواتر لە ١٧ی خاکە لێوە، حەمید مازووچی، عبداللە رۆشنفکر، محەممەد نازمی و رەسووڵ نەغەدەیی هەر لەچوار چرای مەهاباد لە سێدارە دران و پێشتریش عەلی بەگی شێرزاد لەسەر حەوزی بۆکان ئیعدام ولە سەقزیش ئەحمەد خانی فاروقی، محەممەد خانی دانشوەر و عبداللە خانی مەتین کە هەرسێکیان برا بوون. لەگەڵ عەلی خانی فاتح، محەممەد بەگی فەیزوڵڵا بەگی، حسن خانی فەیزوڵڵا بەگی، ئەحمەد خانی شەجیعی، شێخ سدیق ئەسعەد یازیبلاغی، شێخ ئەمین ئەسعەد یازیبلاغی، عەلی ئاغای جەوانمەردی و رەسووڵ ئاغای مەحموودی برای عەلی ئاغا، لە سێدارە دران.

بەشی حەوتەم

# ڕوانگەی چەند نووسەرێک لەسەر کۆمار

پێکهاتنی کۆماری کوردستان لەو هەل و مەرجەدا شوێنەوارێکی گرینگی لەسەر بزووتنەوەی کورد بە گشتی دانا. دەوری بەرچاوی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە دامەزراندنی ئەم کۆمارە و هەروەها قازی محەممەد وەک سەمبولی کۆمار لە لایەن زۆر مێژوونووس و کەسایەتییەوە هەڵسەنگێندراوە کە لێرەدا بیروبۆچوونی هێندێکیان دێنینەوە:

١- ئارچی روزوێلت
٢- دوکتۆر قاسملوو
٣- کریس کوچرا
٤- مەحموود مەلا عیزەت
٥- نەوشیروان مستەفا
٦- ئیگلتۆن

## ئارچی روزوێلت:(*)

«سەرەڕای هەمووی ئەو خەبات و تێکۆشانە، ئاکام و بەرهەمی کاری کۆمار، ئەگەیشتە رادەی ستانداردی دوو شوێنی تری ناوەندی کولتووری کورد، کە کوردەکان لە

(*) کۆماری کورد لە مەهاباد، لاپەڕەکانی ٣٨و ٣٩و ٤٤- ئارچی روزویلت، وەرگێڕدراوی خالید عەزیزی.

وێندەرێ لە ماوەی ٢٥ ساڵدا خوێندن و نووسینیان بە ئازادی هەبوو. بەڵام لە باری سیاسییەوە مەهاباد لانی کەم وەک نوختەیەکی لێ هاتبوو کە لە هەموو لایەکەوە چاویان تێ بڕیبوو، لە نێو کۆمەڵی رووناکبیری کورد لە بێروت و ئیستانبوڵ و بەغداوە بگرە هەتا کێوە بەرز و چرەکانی رۆژئاوای ئاسیا، هەموو لایەک بە تێکڕایی چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کە بزانن ئایا قازی محەممەد سەردەکەوێ یان تێکدەشکێ. نەک هەر لە لایەن کۆڕو و کۆمەڵی کوردی لە بەغدا، بەڵکو لە لایەن کوردەکانی سووریە و تورکیەش پێوەندی لەگەڵ قازی دەگیرا و نامە و پەیامی بۆ دەنێردرا. رووی جووڵانەوەکەی ئەو، زیاتر و زۆرتر بە تایبەتی لەو گەنجانە بوو کە پێیان وابوو حیزبەکانی پێشووی کوردی بە باشی ئەرکی خۆیان بەجێ نەگەیاندووە، بۆ وێنە لە عێراق حیزبێکی نهێنی چەپ، بە نێوی رزگاری دامەزرا کە نیشانەیەک بوو لەو چەشنە بۆچوون و بیرکردنەوەیە».

**کۆماری کورد لە مەهاباد:**

«لە کاتێکدا کە تیرۆریسم ئازەربایجانی رۆژهەڵاتی داگرتبوو شەپکەی سیاسی زۆر توند ببوو، لە کوردستاندا تەنیا چەند دانە زیندانی سیاسی هەبوون، یەک- دوو کەسیش رەنگە بەهۆی سیاسی کوژرابن. هەر چەندە کە ژمارەیەک لە کوردەکان لایەنگرییان لە کۆمار نەدەکرد، بەڵام دیسانیش توانیان رابکەن و بچن بۆ تاران. لە کۆڵان و شەقامەکانی مەهاباد دا بە ئاشکرا دەکرا گوێ بدەیتە رادیۆکانی ئیستانبوڵ و لەندەن، بەڵام لە تەورێز گوێدان بەم رادیۆیانە تاوانێکی مەزن و سەزای مەرگی بۆ داندرابوو».

«سەرجەمی بەرهەم و دەست کەوتی سەرەکیی ئەو ئازادییانە ئەوە بوو کە حکوومەتەکە لە نێو خەڵک، لانی کەم خەڵکی مەهاباد خۆشەویست و جێگای متمانە بێت. خەڵکێک کە زوڵم و زۆری دەوڵەتی ناوەندیی ئێرانیان لەسەر وەلا چووبوو و تامی ئازادی و سەربەستییان چێشتبوو».

**دوکتور قاسملوو:**(*)

«ئەو حکوومەتە نیشتمانییە کەمتر لە ساڵێک خۆی راگرت، بەڵام هەر لەو ماوە کورتەدا قازانجی زۆر بە گەلی کورد گەیاند. زمانی کوردی بۆ یەکەم جار بوو بە زمانێکی

(*) لاپەرە ٩١و ٩٢ی کوردستان و کورد- دوکتور عەبدولرەحمان قاسملوو

ڕەسمی و منداڵانی کورد بە زمانی زگماکیی خۆیان قوتابخانەیان بۆ کرایەوە و کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی بە چەشنێکی بێ وێنە بڵاوکرانەوە. بۆ یەکەم جار تیناتری کوردی دامەزرا و ژنی کورد بۆ یەکەم جارلە ژیانی سیاسی و فەرهەنگیی وڵات دا بەشدار بوو. لەبەر ئەوەی ڕاستەوخۆ پێوەندیی لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەتی دامەزرابوو بازرگانیش بە خێرایی گەشەی کرد. لەهەر شوێنێک دەرەبەگەکان رایان دەکرد، جووتیاران دەبوونە خاوەنی ڕاستەقینەی زەوییەکان. بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا تەنانەت ئەوەندەی ئازربایجانیش ئیسلاحی زەوی نەکرا. لە ئەساسدا دەرەبەگ و خاوەن مڵکەکان ئیمتیازەکانی خۆیان لە کوردستاندا پاراستبوو. مووچە خۆرانی کورد جێگای فارس و ئازەربایجانییەکانیان گرتبووەوە. لە جێگای پۆلیس و ئەرتەشی حکوومەت، هێزی سوپایی و پێشمەرگە دامەزرابوو.

گەورەترین دەسکەوتی حکوومەتی دێموکراتی کوردستان ئەوە بوو کە گەلی کورد پاش ماوەیەکی دووروودرێژ ئازادیی نەتەوایەتی وەدەست هێنابوو. لە کوردستان و ئازەربایجان چەند بنکەیەکی شۆڕشگێڕی دامەزران کە بوونە پاڵپشتی جووڵانەوەی دێموکراتی لە سەرتاسەری ئێراندا. لە ٢٣ی ئاوریلی ١٩٤٦دا پەیمانێکی هاوکاری و دۆستایەتی لە نێوان حکوومەتی دێوکراتی ئازەربایجان و حکوومەتی میلیی کوردستاندا ئیمزا کرا».

«وەک لە پێشەوە گوتمان شۆڕشی ئوکتوبر چەند جووڵانەوە و ڕاپەڕینێکی ڕێک و پێکی لە هەموو کوردستاندا بە دوادا هاتن. بەڵام جووڵانەوەی ١٩٤٥- ١٩٤٦ی مەهاباد تەنیا جووڵانەوەیەک بوو کە ببووە بەشێک لە خەباتی دژی ئیمپریالیستی و دژی فاشیستیی گەلان. بێجگە لەوەش ئەو جووڵانەوەیە نەک هەر ببووە بەشێکی گرینگ لە خەباتی دێوکراتی چینی کرێکاری ئێران، بەڵکو ببوو بە بەشێک لە جووڵانەوەی دێوکراتی نێو نەتەوایەتیی پرولیتاریاش.

لە نێو ئەو جووڵانەوەیەدا گیانێکی نێو نەتەوایەتیی بە هێز دەبینرا، لەگەڵ هەستی دۆستایەتی بەرامبەر نەتەوەکانی تر و ڕێز و خۆشەویستی بۆ دراوسێی مەزنی خۆی یەکیەتی سۆڤیەتی تێکەڵاو بوو. هەموو ئەو سروشتانە ببوونە هۆی ئەوە کە نەک هەر هێزە شۆڕشگێڕەکانی ئێران، بەڵکو هێزە نیشتمانییەکانی سەرانسەری دنیاش لە جووڵانەوەی کوردستان و ئازەربایجان دیفاع بکەن.

ئەم جووڵانەوەیە لەو بارەشەوە گرینگ بوو کە توانی بۆ یەکەم جار لە مێژووی

کوردستاندا حکوومەتێکی نیشتمانیی کوردی دابمەزرێنێ، کە لە ماوەی کورتی تەمەنی خۆیدا بە روونی بۆ گەلی کوردی ئیسپات کرد تەنیا حکوومەتێک دەتوانێ خزمەتی گەل بکا و قازانجی گەل بپارێزێ، کە لە ناو گەل هەڵقولابێ، بۆیە گەلی کورد نەک هەر لە ئێران، بەڵکو لە دەرەوەی ئێرانیش تا ئەمڕۆ زۆر بە رێزەوە یادی کۆماری مەهاباد دەکاتەوە».

## کریس کوچرا(*)

«... کۆماری مەهاباد هەرچەند ناوچەیەکی بچووک بوو و، تەمەنی حکوومەتەکەی زۆر درێژەی نەبوو، بەڵام لە راپەڕینی نەتەوایەتیی کورد لە مێژوودا جێگایەکی بەرز و بەرێزی هەیە. ئەوە یەکەم بزووتنەوەی کورد بوو کە دەدیترا «رووناکبیرەکان» ئەو راپەڕینەی بەڕێوە دەبەن. ئەگەر کۆماری مەهاباد بەردەوام بایە، کوردەکان بە دنیایان نیشان دەدا کە کورد بە راستی ملهوڕ نییە، بەڵکو توانایی ئەوەی هەیە کە خۆی بەڕێوە بەرێ».

## مەحموود مەلا عیزەت(**)

کۆمار:

١- گەورەترین گۆڕانی سیاسی و رووداوی نەتەوایەتی بوو لە مێژووی نوێی کورددا،
٢- هاندەر و بزوێنەری بووژاندنەوەی مێژوو و ئەدەب و زمان و هونەر و فەرهەنگی کورد بوو،
٣- بووژێنەرەوەی ئابووریی ولات بوو،
٤- دامەزراندنی قەوارەیەکی سیاسی و نەتەوایەتیی گەلی کورد بوو،
٥- بزوێنەری هەستی چینایەتی کۆمەلانی خەڵکی کورد بوو
٦- بووە هۆی گەشەکردنی بزووتنەوەی کوردایەتی لە سەرانسەری کوردستاندا،
٧- دامەزراندنی سوپایەکی چەکدار بەرهەمێکی گرینگی بوو،
٨- دامەزراندنی دەستگاکانی کۆمار توانای نەتەوەی کوردی ئاشکرا کرد،

---

(*) مێژووی کورد لەسەدەی ٢٠- ١٩دا، لاپەڕە ٢٨٨- کریس کوچرا (وەرگێڕاوی محەممەد ریانی)
(**) لاپەڕە ١٣٦و ١٣٧ کتێبی«کۆماری میللیی مەهاباد» لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی، بەشی دووهەم- مەحموود مەلا عیزەت.

٩- دەستپێکردنی جووڵانەوەی جەماوەریی لاوان و ئافرەتان بەرهەمێکی تر بوو،

دامەزراندنی کۆماری میللیی مەهاباد: بزووتنەوەی کوردایەتیی لەو قاوغە تەسکە دەرهێنا و گواستییەوە بۆ زەمینە و پلەیەکی نوێ، بۆ یەکەم جار فەرمانڕەواییەکی خۆماڵی لە شێوەی ئەو کۆمارەدا دامەزرا، ئەو کۆمارە نەک هەر لە کاتەکانی دەمەزراندنی دا بەڵکو لە دواییشدا بووە هۆیەکی گرنگی بزوێنەری تەوژمی کوردایەتی و سەرچاوەی دەرس و پەند بۆی، هەنگاو و دەستکەوت و ئەنجامەکانی بوونە سامانێکی مێژوویی گەورە...

**ئەوشیروان مستەفا:** (*)

«قازی محەممەد لە نێو کورددا پایەیەکی زۆر بەرزی هەبوو. هەموو شاعیرەکانی ئەو سەردەمەی کوردستانی ئێران وەکو: مەلا مەعرووفی کۆکەیی، هەژار، هێمن، خاڵەمین، حەقیقی، سەید کامیل، عەلی بەگی حەیدەری، شێواو... شیعریان لە ستایشیدا هۆنیوەتەوە. لە سەردەمی ژیانی خۆیدا شاعیر و نووسەر و سیاسی و سەرانی ئێل و مەلا و گەورە پیاوەکانی کورد هەمیشە بە رێز و ستایشەوە ناویان ئەبرد.

قازی ببوو بە رەمزی ئازادی و سەربەستی کورد. لە سێدارەدانی ویژدانی هەموو خەڵکی هەژاند. دوو کەس لە ئەدیبە هەرە بەرزەکانی ئەو سەردەمەی کوردستانی عێراق پیرەمێرد و ئیبراهیم ئەحمەد، هەریەکەیان بەم بۆنەیە شیعرێکیان داناوە کە لە ریزی شاکارەکانی ئەدەبی سیاسی کورد دائەنرێن.

پیرەمێرد شیعرەکەی خۆی بە ناوی «وەلی دیوانە» لە ژێر سەردێری«نائومێدی» دا و ئیبراهیم ئەحمەد ، کە ئەوسا هەم خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری«گەلاوێژ» و هەم بەرپرسی لقی عێراقی کۆمەڵەی ژ-ک بوو شیعرەکەی لە ژێر سەردێری«یاران»دا.

هەردوو شیعر لە گۆڤاری «گەلاوێژ» دا بڵاوکراونەتەوە».

(*) حکومەتی کوردستان، نووسینی ئەوشیروان مستەفا ئەمین ل ٢٦٩

**بەشی یەکەم**

# هەلومەرجی ئێران و
# وەزعی حیزب پاش کۆمار

دوای ڕوودانی ئەم تراژیدییە لە کوردستان بە تایبەتی بە شەهید کردنی گەورە پیاوانی کوردستان و گیرانی ژمارەیەکی زۆر لە بەرپرسانی کۆمار و، هەروەها پاش کوشت و کوشتارێکی بەربلاوی هەزاران کەس لە ئازەربایجان چ لە شەڕی خۆ بەخۆ لە ڕۆژەکانی هێرشی ئەرتەشی ئێران و هاتنەوەی دارو دەستەی شا بۆ تەورێز و باقی شارەکان، چ لە ڕێگەی ئیعدامی بەرپرسانی گیراو و تەحویل دانیان بە دادگا فەرمایشییەکانی نیزامی، بە دوای تەبعید کردنی زۆر کەس و بنەماڵە بۆ شارە گەورەکانی دوور لە ناوچەی دەسەڵاتی هەردوو کۆماری ئازەربایجان و کوردستان، وەزعێکی نائاسایی هاتە گۆڕێ.

لە هەموو شوێنێک فەرماندەرانی نیزامی دەسەڵاتیان بە دەستەوە بوو، لە زۆربەی شارەکان حکومەتی نیزامی ڕاگەیەندرابوو، هاتوچۆی شەوانە قەدەغە کرابوو، پێشگیری کردن لە کۆبوونەوە و تەنانەت دانیشتنی بە کۆمەڵ لە ماڵانیش بۆ ماوەی چەند مانگ درێژەی هەبوو.

دوژمن لە سێبەری خۆی دەردەوییەوە، نیسبەت بە هەموو کەس و هەموو شت بەدگومان بوون و ئەوە ببووە هۆی ئەوە کە لە خۆڕا بە شێوەی جۆراوجۆر خەڵکی ئاسایی بگرن و بۆ شارەوانی و دیژبانی ڕەکێشیان بکەن و بیانخەنە ژێر زەخت و فشار و زۆرجار بێ لێپرسین لێیان دەن و ئەشکەنجەیان بکەن. خەڵک بۆ ماوەیەکی چەند مانگی تاسابوون و بە دڵی پڕژان و ئێشەوە بە کەم هومێدی و سەرگەردانی دەژیان.

بە تایبەتی لەشکرکێشی و کۆکردنەوەی هێزی عەشیرەتی و پەلامار بردنی دڕندانەیان شان بە شانی ئەرتەشی زۆری ئێران بۆ سەر بارزانییەکان و ئەو کەسانەی کە لە کۆمار را

دەگەڵیان کەوتبوون و ماوەی چەند مانگ خۆیان ڕاگرت و شەڕی زۆر پیاوانەشیان کرد، چین و توێژی زەحمەتکێش و ڕۆشنبیر و کاسبی زۆر نیگەران کردبوو.

هەر لەو کاتەدا کە لە ناوچەی نەغەدە و شنۆ لە نێوان هێزی گەل و بەکرێگیراوانی ڕێژیم شەر بوو، هێندێک خەتی پێوەندی بە خاوەن هەستان و تێکۆشەرانی نەناسراوەوە هەبوو. هەر لەو کاناڵانەش را بوو کە سەرۆک بارزانی بۆ پێشەوای وڵام نارد کە ئەگەر نیزن بدا و ئامادە بێ دێتە سەر زیندانی پادگان و دەگەڵ خۆیان دەیانبەن. کە بە داخەوە ئەم جارەش وەڵامەکەی هەر مەنفی بوو.

ڕێژیم بە تایبەتی بەدوای ئەوەی دا کە وەک لە شوێنی خۆیدا باس کرا، لە ڕاپەرینی تەقە و پەڕینەوەی بارزانییەکان لە چۆمی ئاراز، چوونیان بۆ سۆڤیەت و ئەمانی چەکدار بە شێوەی ڕێکوپێک لە کوردستان دڵنیا بوو. زەختی خۆی زیاتر کرد و زۆربەی کاربەدەستە کوردەکانی قوتابخانەکانیشی گۆڕی و دەری کردن یان دووری خستنەوە و لە شوێنەکانی تری ئێران مامۆستایان دێنا و بە شێوەیەکی تەواو داگیرکەرانە دەگەڵ خەڵک هەڵسوکەوتیان دەکرد.

سەرەڕای ئەوەش لاوانی وەفاداری کوردستان و هێندێک لە پیاوانی دڵسۆز و نیشتمانپەروەری ئەندامی حیزب، لەوانەی کە ڕۆژگارانی پڕ لە خۆشی دەورەی چوار پێنج ساڵەی ئازادیی ئەمانی دەوری شایەتییان لە کوردستان بە چاوی خۆیان دیبوو، تامی ڕزگاریان چێشتبوو، بە تایبەتی یازدە مانگی دەوری کۆماریان هیچ کات لە بیر نەکردبوو، بۆ بووژانەوەی ئەم مەشخەڵە مێژووییە تێکۆشانی نهێنییان دەست پێکرد. هەر لە ساڵی ٢٦دا بە دوای لە سێدارەدانی پێشەوا و هاوڕێیانی، لە مەهاباد و هێندێک شارەکانی دی و بە تایبەت لە نێو قوتابخانەکان چەند جار شەونامەی دەستنووس بە دژایەتیی شا و کردەوەی ناجوامێرانەی پیاوەکانی لە کوردستان بڵاوکرایەوە. خەڵک وردە وردە، یەک یەک و دوو دوو لە لای یەکتر قسەیان دەکرد، ترس و لەرز و ڕەش بینی و دوودڵیان لە خۆیان دوور دەکردەوە، لە شەش مانگی هەوەڵی ساڵدا گەیشتبوونە ئەو قەناعەتە کە دەبێ ڕێکخراو ساز کەنەوە، هەستی خەڵک ببزوێنن، لە ناڕەزایی خەڵک بەرامبەر بە کردەوەکانی بە کرێگیراوانی ڕێژیم کەڵک وەرگرن، قامک لەسەر جینایەتەکانیان دابنێن و نەهێڵن جەماوەر تووشی جەوی غەفڵەت و بێ خەبەری بن.

لە تەبلیغاتی ئەو کاتدا بە لەبەر چاو گرتنی کردەوەی دەربەگەکان،هاوکاری نەکردنی

سادقانەیان دەگەڵ کۆمار و هاوکاریی بەرچاویان دەگەڵ ڕێژیم و هەڵکوتانیان بۆ سەر خۆراگران، هێندێک مایەی چینایەتیشی تێدەخرا.

ئەم شێوە تەبلیغە و جووڵاندنی هەستی نەتەوایەتی و ئەوەی کە خەڵک و بە تایبەتی لاوەکان بە چاوی خۆیان دەیاندیت چۆن مووچەخۆرانی تازە نەفەسی شا خەریکی سووک و بێ نموودکردن، لە نێوبردنی فەرهەنگی کوردی و جێگیربوونی فەرهەنگی فارسیی غاڵب لە ناویان دان، زۆر زوو تەئسیری خۆی بەخشی و سەرنجی ئەوانی ڕاکێشا.

لە نێو زەحمەتکێش و بازاڕیانیشدا پیاوی دڵسۆز کەم نەبوون. قسە و تەبلیغات دەستی پێکردبوو، بەتایبەتی ڕادیۆیەکی نهێنی کە دوایە مەعلووم بوو لە ئازەربایجانی سۆڤیەت دامەزراوە، دەستی بە قسەکردن کرد و گەلێک جار ڕووداوەکانی ڕۆژی مەهاباد و جارویار هی شارەکانی دیکەی کوردستانیشی دەگوت. پێیان دەگوت ڕادیۆی«سری». ئەو ڕادیۆیە لە هاندانی بەڕێوەبەران و ڕوون کردنەوەی جەماوەردا تەئسیری زۆرباشی هەبوو و هیوایەکی تازەی بە دڵسۆزان بەخشی.

کەم کەم شانەکانی حیزبی لە تاکەکەسی بوونە دوو کەسی و تا سێ کەسی و تەنانەت شانەی بنەماڵەییش پێکهاتن.

دیارە لەم بابەتەوە ئەزموونەکە کەم بوو، هەر دەبوو زۆریش بە تێبینییەوە ئەم کارە بکرێ و هەوڵ دەدرا ئەسڵی کەم بوون و پوخت بوون ڕەچاو بکرێ. کارگێرانی ئەم چاخە لە خەبات بە پلەی یەکەم ڕەحیم سوڵتانیان، عەزیز یوسفی و عبدالله ئیسحاقی و ڕەحیم خەرازی و سدیق خاتەمی و عوبێدوڵلا ئەیوبیان بوون. لەم سەردەمەدا زیاتر وەک بەرگەی زیندوو لە یەکەم ئیعلامیەی ٨ ماددەیی کە لە ١/٨/٢٤دا بڵاوکرابووەوە، بۆ ڕاکێشانی خەڵک بۆ لای حیزب وەک بەرنامە کەڵکیان وەردەگرت.

پێویستە ئیشارەش بەوە بکرێ کە لە سەردەمی شەڕی دووهەمی جیهانی و هاتنی ڕووسەکان بۆ کوردستان و ئەو کارە باشانەی بەرامبەر بە کوردیان کردبوو، خۆشەویستییەکی تایبەتی بۆ سۆڤیەت پێکهێنابوو، بەڵام بە دوای ئەمانی کۆمار و بێدەنگیی ئەوان ووتووێژەکانیان دەگەڵ (قوام السلطنة) لەبەر چاوی جەماوەر ڕەش بوون و هەواکە گۆڕا. هەرچەندە ئەو ڕادیۆیەی لەسەرەوە باس کرا کە دوایی دەرکەوت لە لای ئەوان دامەزراوە تا ڕادەیەک ئەمەی قەرەبوو کردەوە، بەڵام هیچ کات ئەم خۆشەویستییە نەگەڕاوە شوێنی خۆی.

هەر لەم سەروبەندەدا حیزبی توودەش کە بەهۆی دابڕانی دەستەیەکی بەرچاو بە سەرۆکایەتیی خەلیل مەلیکی و ئەنوەر خامەیی ئەو حیزبەی تووشی ئەکسەیەک کرد و بەینێکی پێچوو تا لە ڕێگەی تەبلیغاتی سۆڤیەت و تاوانبارکردنی ئەو تاقمە بە خائین وەزعەکەیان ئەهوەن بووەوە و لە بانەمەڕی ۱۳۲۷دا دووهەم کۆنگرەی خۆیان بەست، لەودا بە پێچەوانەی بێدەنگییەکەیان لە کاتی ڕمانی کۆماری ئازەربایجان و لە نێوچوونی کۆماری کوردستان جووڵانەوەکانی ئەم دوو لایەنەیان بە ڕەوا لە قەڵەم دا.

لە لایەکی دیکەشەوە ئەمریکا لە چاخی شەڕی دووهەم دا تا ڕادەیەکی باش ئێرانی ناسیبوو و ددانی تەماعی لێ تیژ کردبوو، هەرچەند لە بەرامبەر ئیمپریالیزمی کۆنەکاری بریتانیادانە نفووزێکی وای هەبوو نە دەسەڵاتێکی ئەوتۆ کە بتوانێ بە ئاشکرا لەم مەیدانەدا بەربەرەکانی دەگەڵ بکا، بەڵام ئەو ساڵانە سەرەتای ڕقەبەریی ئاشکرای دوو دەوڵەتی ئینگلیس و ئەمریکا لە ئێراندا بوو.

ئینگلیس لە کۆنەوە لە دانانی پێچ و مۆرەکانی ڕێژیمی پاشایەتیدا خاوەن دەسەڵات بوو، لە دانانی ڕەزا شا و دامەزراندنی کوڕەکەی لە جێگای ئەو، ئەخشی یەکەمی هەبوو. بەشێکی زۆر کەمی لە داهاتی زۆر و زەوەندی ئەوت دەدا بە ڕێژیم. یەک لە مەبەستەکانی ئینگلیس لە هاتنی بۆ نێو ئێران لە کاتی شەڕی دووهەمدا پاراستنی ئەو گەنجە لەبن ئەهاتووە بۆ خۆی بوو.

ئەمریکا یەکەم سفتاحی لە ئێران وەک دەست تێوەردان لە ئێراندا لە ساڵەکانی تێکلان لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا دەست پێکرد، تەنانەت ڕەزا شا بەر لە شەڕی دووهەمی جیهانی ڕەسمەن داوای کڕینی چەک و چۆلی لە ئەمریکا کرد بۆ بەهێزکردنی ئەرتەشی نوێی ئێران، بەڵام وەڵامی ڕەدیان دایەوە و پێیان ئەفرۆشت.

سۆڤیەتیش کاتی پێکهاتنی حکوومەتی شوراکان لە وڵاتی پان و بەرینی تیزار، بە دەست هەڵگرتن لە بەشێکی بەرچاو لەو ئیمتیازە زۆر گەورانەی کە رووسەکان پێشتر لە ئێرانیان وەرگرتبوو و، هەروەها بە هاتنی ئەرتەشی سوور بۆ ئێران جێگای خۆی خۆش کردبوو، تەنانەت دوای بەجێهێشتنی خاکی ئێرانیش فریوی وەعدە و وەعیدی سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتی خواردبوو، زۆری هومێد پەیدا کردبوو، چاوەڕوانی وەدەست هێنانی ئیمتیازی ئەوتی شیمال بوو کە زۆر بە گەرمی باسی لێ کرابوو و لە پارلەمانیش هاتبووە گۆڕێ. بۆ زووتر وەدەست خستنی ئەم پارووە چەورە گەلێکی یارمەتیی حیزبی توودە دەدا و

ئەوانیش بۆ ئەم ئامانجە زۆر بە توندی تێدەکۆشان.
لە وەزعێکی ئاوادا تێکۆشەران نەیاندەتوانی تەنیا بمێننەوە پێویستیان بەوە بوو بۆ وەرگــرتنی رێنوێنی و ئاڵ و گــۆڕی بیــروباوەڕ، زیاتر تێگەیشتن لە وەزع و باشــتــر بەڕێوەبردنی کاری حیزبی و ئەزموون وەرگرتن لە تەجرەبەی حیزبەکانی کورد و غەیرە کورد پێوەندی راستەوخۆ پەیدا کەن.
بەم مەبەستە لە لایەک خەریک بوون ئەگەر شتێک لە فیرقە مابێ، دەنا لەگەڵ حیزبی تودە کە ئەوکات چەپترین حیزب بوون و لە کۆنگرەی خۆشیاندا تەئییدی جووڵانەوەی کوردیان کردبوو، پێوەندیی راستەوخۆ بگرن.
لەم بوارەدا حەرەکەتی باشیان کرد و لە رێگەی کاک صارم الدین صادق وەزیری کە قازییەکی تێکۆشەر و زانای خەڵکی سنە و دانیشتووی تاران و کادرێکی بە توانای حیزبی توودە بوو، هەروەها بە هۆی کاک سدیق ئەنجیری کە هەمان تێکۆشەری بەرپرسی گۆڤاری هاواری نیشتمان ئۆرگانی یەکیەتی لاوانی دیموکراتی دەورەی کۆمار بوو و وەک مامۆستا دوور خرابووەوە و لە تاران دەژیا، ئەو کارە جێ بەجێ بوو و لە ساڵی ٢٧دا پێوەندییەکە دامەزرا و بەڵێنیان دا پشتیوانی لە حیزبی دیموکراتی کوردستان بکەن. ئەو هاوکارییە لەسەر ئەو ئەساسە دەکرا کە حیزبی دیموکرات پەیڕەوی لە رێبەری حیزبی تودە بکا، بەڵام بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستانەوە تێکۆشانیان درێژە بدەن.
ئەوان باشیان دەزانی کە هەستی نەتەوایەتی لە کوردستان ریشەی قوول و لە مێژینەی هەیە و حیزبی تودە لەوێدا ناتوانێ گەشە بکا و لە ساڵەکانی پێشێ دا ئەم تاقیکارییە کرابوو هیچ کات سەرنەکەوتبوو. بە تایبەتی لە دوای رووداوی ١٥ی رێبەندانی ١٣٢٧ کە پاشان باسی لێ دەکرێ، بە پشتیوانی لە شا حیزبی تودە تەکفیر کرا و هەڵوەشاوە راگەیەندرا.
ئەساسی ئەم هاوکارییە دوایە بە جێگایەک گەیشت کە کادریان بۆ تەعلیم و چاوەدێری دەنارده کوردستان. نزیکییەکە بە رادەیەک گەیشتبوو، ئەگەر ئەندامێکی حیزبی دیموکراتی کوردستان چووبایە تاران، یا لە شوێنێکی دیکە نیشتەجێ بیا، وەک ئەندامی حیزبی توودە چاوی لێ دەکرا و دەچووە نێو شانەکانی ئەو حیزبەوە. هەروەها ئەگەر ئەندامێکی ئەوان هاتبایە کوردستان، دەگەڵ حیزبمان پێوەندیی راستەوخۆی دەبوو و لە کۆبوونەوەکانی حیزبیدا بەشداریی دەکرد.

بێ شک ئەو پێوەندییە هەروەک دوایی باسی دەکەین، زۆر بە سوودی حیزبی دێموکراتی کوردستان بوو و لە سەقامگیربوونەوەیدا بە تایبەت لە بواری رێکخراوەیی و سیاسییەوە گەلێک بە کەڵک بوو.

لە لایەکی دیکەوە بۆ ئەوەی لە ئەزموونی حیزبە کوردستانییەکانی عێراق کەڵک وەرگرن و بتوانن پێوەندی بە هێندێک ئەندامی خۆش نێو و لێزانی حیزب کە دوای کۆمار پەنایان بۆ ئەم بەشە لە کوردستان بردبوو، بگرنەوە، هەوڵیاندا و لە ماوەیەکی کەمدا توانیان دەگەڵ بەشەکانی جۆراوجۆری چەپەکان بە تایبەتی شیوعییەکان کە ئەوکات چەند بەش بوون، پێوەندی رێک بخەن. هەروەها توانیان دەگەڵ پارتی دێموکراتی کوردستان کە لە زەمانی کۆماری کوردستاندا بە دەستووری مەلا مستەفا کە خۆی لە مەهاباد بوو بە وەکالەتی ئەو لە لایەن هەمزە عبداللە و چەند کەسی دیکە کە لە ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢٥ لە کوردستانی عێراق دامەزرابوو دوای کۆماریش تێکۆشانی هەر بەردەوام و زۆریش بە هێز بوو، پێوەندیی راستەوخۆ پەیدا بکەن.

بەرێوەبەرانی ئەو کاتی حیزب توانیان بە هاوکاری ئەو حیزب و هاونیشتمانە کوردستانییانە گۆڤارێک بە نێوی (رێگا) دەرخەن کە بۆ ماوەیەک مانگانە دەردەچوو و چەند ژمارەیەکی لێ بڵاوبووەوە و گەلێکیش بۆ فێربوونی کوردی و حاڵی بوون لە سیاسەت و دەست بەکاربوونەوەی ئەندامانی حیزب بە کەڵک بوو.

ساڵی ٢٧ بە گەشەکردنێکی بەرچاوی هێزە سیاسییەکان دەستی پێکرد. لەو ساڵەدا جگە لە تێکۆشانی جیددیی حیزبی توودە وەک هێزێکی سەرەکی، باقی ئەحزابی ئۆپۆزیسیۆنیش بە رەنگێکی ناسیۆنالیستی و ئێرانیگەریی توندەوە دەستیان بە کار کردبوو. رۆژنامە و گۆڤاری باش بڵاو دەبوونەوە، بە ئاشکرا دژی حکوومەت و بگرە هێندێک وەخت دژی شا و بنەماڵەکەشی شتیان دەنووسی.

ئاڵ و گۆڕی بەرچاو لە رقەبەریی ئەمریکا و ئینگلیس بۆ بەتاڵان بردنی زیاتری سامانی ئێران و بە تایبەت ئەوت بەرچاو دەکەوت، زۆر ئاشکرا بوو کە ئەمریکا خەریکە جێگەی ساڵەکانی پێشووی ئینگلیس بگرێتەوە و لە رێگەی مۆرەکانی سەرەوەی حکوومەتی و وەعدەو وەعید بە شا جێگە بە بریتانیا لەق کاو جاروبار باسی زیادکردنی بەشی ئێرانی لە داهاتی ئەوت و شەریکەی بە ناو ئێران و ئینگلیس دەکرد. ئەو شتانەش وەک کار و کردەوەی ئیمپریالیزم زەق دەکرانەوە و بە ئاشکرا دژی بۆچوونەکانی هەردوو

دەوڵەت لە رۆژنامەکاندا مەقالە دەنووسرا. گەلێک جار خەبەرەکانی پشتی پەردە لە قاو دەدران و بەشێک لەو رۆژنامانە بۆ کوردستانیش دەهاتن و لە هاندانی خەڵک دا بۆ تێکۆشان زۆر بەنرخ بوون. کاروباری رێکخراوی حیزبی دێموکراتی کوردستانیش هەرچەند تا رادەیەک بە نهێنی دەکرا، بەڵام زۆر چاکی پەرەسەندبوو.

هەردوو وڵاتی ئیمپریالیستی وێڕای ئەوەی لەسەر کڵاوی مەلای مرخێش مرخێشیان بوو، لەو بەرهەڵستکارییەی ئۆپۆزیسیون و بە تایبەتی لە کردەوەکانی حیزبی توودە زۆر توورە بوون کە رۆژبەرۆژ زیاتر کرێکارانی وڵات بە گشتی و کارگێرانی سەنعەتی نەوتی بە تایبەتی رێک دەخست و دەنگی دلێر ببوو، بە راشکاوی لە بەرژەوەندیی سۆڤیەت دەدوا و لە سەر پێویستیی بردنە سەری بەڵێنەکانی لەمەڕ نەوتی شیمالی ئێران کە لە لایەن (قوام السلطنة)وە درابوون دەڕۆیشت. ترسیشیان لەوە هەبوو و دەیانزانی کە حیزبی توودە هەر لە سەرەتای بیستەکانەوە دەستی خستبووە نێو ئەفسەرانی ئەرتەشەوە و بیروبۆچوونی مارکسیستی لە نێویاندا پەرە پێدەدا.

هەرکام بە چەشنێک لەسەر دارشتنی بەرنامە بۆ پێشگیری لە نفووزی سۆڤیەت و کورت کردنەوەی زمانی ئۆپۆزیسیۆن بە تایبەت حیزبی توودە سوور بوون و بۆ کوتان و نەمانیان لە هەوڵدا بوون. شاش ئەو هەوایەی پێخۆش بوو، هەردوو دەوڵەتی ناوبراو بە راشکاوی دژایەتی خۆیان بە بێدەنگی دەگەڵ ئەو بۆچوونانە لە رێگەی شا و حکوومەتەوە نیشان دەدا. ئینگلیس هەستی بەوە دەکرد کە شا خەریکە دەچێتە ژێر تەئسیری سیاسەت و ئیمکاناتی ئەمریکا. ئەو مەسەلە بۆ ئینگلیس جێگەی مەترسی بوو.

دێموکراسییەت کە خەریک بوو بە خشکە جێی خۆی دەکردەوە، بە ئاشکرایی هەڕەشەی لە بەرژەوەندیی ئەم دوو حکومەتە دەکرد، لەم پێوەندییەدا شاش دەسەڵات و دەبدەبەکەی دەچووە ژێر پرسیار، دیارە هیچ کام لەوانە ئەم وەزعەیان بۆ تەحەممول نەدەکرا.

ئینگلیس کە لە کۆنەوە دەگەڵ کاربەدەستانی پایە بەرزی ئەرتەش ئاشنا بوو، دەگەڕا بەڵکو کەسێکی ناسراوی جێی متمانە پەیدا بکا و بە شێوەیەک ئەم وەزعە کۆتایی پێ بێنن، لە هاندانی شاش بۆ ئەم مەبەستە غافڵ نەبوون.

وەک دەڵێن لە رێگەی سپەهبود رەزم ئاراوە کە بەهۆی سەرکەوتنەکانی لە کوردستان و ئازەربایجان ناو و ناوبانگی پەیدا کردبوو دوایە تا پلەی سەرۆک وەزیریش چوو، پیلانێک دارێژرا.

رۆژی پازدەی رێبەندانی ۱۳۲۷ی هەتاوی کاتێک کە شا بۆ بەڕێوەبردنی رێ و رەسمێک چووبوو بۆ زانستگەی تاران، لە لایەن کەسێک بە نێوی ناسر فەخرنارایی تەقەی لێ کراو بریندار بوو. ئەو ناسرە لە لایەک دەگەڵ رەزم ئارا پێوەندی هەبووە لە لایەکی دیکەوە دەگەڵ چەند کەس لە بەرپرسانی حیزبی توودە دۆستایەتی و هاتوچۆی هەبووە.(*)

برینداربوونی شا بیانوویەکی باش بوو هەڵکەوتبوو بۆ هەرچی توندتر کوتان و پێدادانی هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆن و لە نێو بردنی هەموو ئاسەواری دێموکراسیی ساوای وەدەست هاتوو و داکوتانەوەی تەقڵەی دیکتاتۆرییەت و سەپاندنەوەی دەسەڵاتی ئیستبدادی و تۆڵە سەندنەوەی ئەو پەندانەی بە سەر بابی هاتبوو. هەر کە بەرپرسانی حکوومەت لە بریندار بوونی شا و نەکوژرانی ئاگادار بوون، لە سەرتاسەری ئێران فەرمانیان دا خەڵک لە مزگەوتەکان کۆوەبن، بۆ دەرچوونی شا لەم پیلانە شوکری خوا بکەن و رق و تووڕەیی خۆیان دژی پیلانگێران دەربڕن!.

شا بێ راوەستان تێکۆشانی ئۆپۆزیسیونی قەدەغە کرد. بە یەک- دوو بیانوو کە هەوەڵیان تۆمەتی توودەیی بوونی ناسر فەخرنارایی، دووهەمیش بەڕێوەچوونی میتینگی حیزبی توودە لە ئیمام زادە عبداللەی نزیک تاران بوو بە بۆنەی ساڵڕۆژی شەهید بوونی دوکتۆر تەقی ئەرانی کە پیاوەکانی دەوری شا ئیدیعایان کرد کە گوایا دانی ئەم میتینگە لەم شوێنە بە مەبەستی رێکخستنی کوودیتا بووە و ئەگەر شا کوژرابا، ئەوان ئیقدامی خۆیان دەکرد، بەڵام فریشتەکانی نەجات وەک هەموو کات باڵیان بەسەردا کێشاو نەکوژرا. حیزبی توودەش لە کاری خۆیدا سەرنەکەوت! لەو کاتەدا حیزبی توودەیان هەڵوەشاوە راگەیاند.

پاش ئەم رووداوە لە زۆربەی شارەکانی ئێران دەستیان بە گرتنی خەڵک کرد، ئەو گرتنە بەشی هەموو حیزبە دێموکرات و ئاماڵ دێموکراتەکان و یەک لەوان حیزبی توودەی بە بەرفراوانی تێکەوت. جگە لەوەی بەندیخانەکان ئاخندران، زۆر کەسیش لە شوێنی ژیانی خۆیان توور هەڵدران و دوور خرانەوە.

کوردستانیش لە م هەڵمەتە بێ بەش نەبوو، پۆلێکی باش لە لاوە تێکۆشەرەکانی ئەو

(*) حسێن حەداد کە رەفیقی نزیکی ناسر بووە، بە تۆمەتی ئەو دۆستایەتییە مەحکووم بە حەپسی ئەبەد کراو چەندین ساڵ لە زینداندا بوو، ئەوەی بۆ هاوبەندییەکانی یەک لەوان بۆ من (جەلیل گادانی) باس کردبوو.

سەردەمەیان گرتن و بۆ زیندانەکانی مەهاباد و ورمێ دواتریش بۆ تەورێزیان ڕەپێچەک دان. هێندێک لەم کەسانە بریتی بوون لە: عەزیز یوسفی، قادر یوسفی، ڕەشەی قاچاقچی، سدیق خاتەمی، حەسەن موفتی، سەید عوبێدوڵلا ئەیووبیان، غەنی بلوریان کە لەمێژ ئەبوو لە باکۆ گەڕابووەوە. ئەوەش لە کوردستان تا ڕادەیەک وەک زۆر شوێنی دیکەی ئێران خەباتی دواخست.

لەم پۆلە لاوە یەک دوو کەسیان لە دادگا بەو ماوە مەحکووم کران کە کێشابوویان باقی دیکە بە چوار ساڵ بەندی مەحکووم کران کە بەشێکی زۆریان لە بەندیخانەی تەورێز تێپەڕ کرد و هەتا ساڵی ۳۱ ئازاد نەکران. دیارە هێندێک لەوان لە بەندیخانەدا کاتی خۆیان بە خۆڕایی تێپەڕ نەکردبوو بە قەولی ماکسیم گورکی لە زانستگەکەی خۆیان کەڵکی باشیان وەرگرتبوو، دوای هاتنەدەر توانیان خزمەتی باش بە زانستی لاوەکانی ڕیزی خەبات بکەن.

شا لەم سەرکوت و کوشت و بڕە سوودی وەرگرت و لە ژێر زەخت و دیکتاتورییەتی داسەپاودا کە لە لایەن ئەربابەکانی بێگانەشیەوە پشتیوانی لێ دەکرا، توانی هێندێک دەسەلاتی خۆی زیاتر بکا و مافی هەڵوەشانەوەی هەردوو مەجلیسی سەنا و شورا وەدەست بێنێ، دوای ئەوەی خاترجەم بوو کە هەرکات یەک لەم مەجلیسانە و تەنانەت هەردووکیشیان بە قسەی نەکەن و لە فەرمانی دەرچن، دەتوانێ هەڵیانوەشێنێتەوە، لە ساڵی ۱۳۲۸دا ئەمری دەرکرد کە هەڵبژاردنی دەورەی شازدەی مەجلیس دەست پێ بکا.

پێش ئەو هەڵبژاردنە هێندێک مرۆڤی تێکۆشەر و ئازا و نیشتمانپەروەری وەک دوکتۆر محەممەد موسەدیق و ئەوانەی تازە دەگەڵ ئەو لە بەرەیەکی میللی دا دەستیان بە تێکۆشان کردبوو، بۆ بەربەرەکانی دەگەڵ کردەوەی کارگێرانی وەزارەتی نێوخۆ لەمەڕ هەڵبژاردن و بەرگری کردنیان لە ئازادیی هەڵبژاردن بۆ ماوەیەک مانیان گرت.

ئەو مانگرتنە تا ڕادەیەک سەرکەوتوو بوو، بەرپرسانی کاروباری هەڵبژاردن هێندێک وەعدیان دا کە بوو بەهۆی ئاواڵە بوونی دەستی دوکتۆر موسەدیق و هاوبیرەکانی و توانیان لە تاران و یەک دوو شوێنی دیکە دەنگی زۆر بەرچاو وەرگرن و بەرەو سەرکەوتنی تەواو بڕۆن. شا لە ترسان هەڵبژاردنی لە تاران هەڵوەشاندەوە. سەیرتر ئەوەبوو، بێ ئەوەی تارانی پایتەخت نوێنەرەکانی خۆی دیاری کردبێ، لە مانگی خەزەڵوەردا شا مەجلیسی دەورەی شازدەی کردەوە.

هەڵبژاردنی تاران جارێکی دی لە ژێر زەختدا پاش چوار مانگ بەڕێوە چووە و ئەم جارەش هەر دوکتۆر موسەدیق و چەند کەسی دی لە ئەندامانی بەرەی میللی هەڵبژێران و هەر لەم مانگەشدا بوو کە بە پێی بۆچوونی دوکتۆر موسەدیق«جبهە ء ملی» یەکەم لە کەسایەتیە ناودار و نیشتمانپەروەرەکان و چەند حیزب پێکهات و بوو بە هێزێکی پان و بەرین کە کاریگەریی بەرچاوی لە ڕووداوەکانی دواڕۆژدا هەبوو.

هەر لەو کاتەوە کە جەبهەی میللی یەکەم مەوجوودییەتی خۆی ڕاگەیاند، بە تایبەتی چونکە موسەدیق هەر لە ساڵەکانی ٢٥-٢٦ دەگەڵ قەول و قەراری (قوام السلطنة) و دانی ئیمتیازی نەوتی شیمال بە سۆڤیەت و یا جنووب بە وڵاتێکی دیکە موخالیف بوو، حیزبی توودە بە زۆر بڕوبیانوو دژایەتیی دەگەڵ دەکرد و دەگەڵ بەرنامەکانی نەدەگونجا.

هەرچەند لە کاتی خۆیدا باسی دەکەین کە لە شوێنێک حیزبی توودە بەوە گەیشت کە لەسەر جەبهەی میللی و شەخسی دوکتۆر موسەدیق بە هەڵە چووە، پشتیوانیی وردە بورژووازی و بازارییان و لە زۆر شوێن جووتیاران و دێ نشینەکان لەو، نەیدەتوانی دەلیلی ئەوەی کە موسەدیق لایەنگری ئیمپریالیزمە، بەڵام زۆر درەنگ ببوو، ئەو بۆچوونە چەوتە ئەوەندەی زیان لە خەڵکی ئێران و حیزبەکان دا کە هەرگیز قەرەبوو نەکراوە.

بەکردەوەش دەرکەوت ئەو لێ بڕاوییەی جەبهەی میللی بەرامبەر بریتانیا و شەریکەی نەوت و پاوانخوازیی ئینگلیس نیشانیان دا هیچ هێزێکی دیکە نەیوێرا خۆی لێدا. سەرەڕای ئەوەش لە هیچ کارشکێنی و موخالەفەتێکیش دریخییان نەکرد.

لەو ماوەدا چەند سەرۆک وەزیران گۆڕان، هەژیر تیرۆر کرا. ساعید مەراغەیی هاتە جێگای، بە دوای ئەویشدا عەلی مەنسوور هات.

دیارە دەگەڵ ئەوەی هەرکام گیروگرفتی خۆیان هەبوو، سەرێکی گرفتارییەکان ڕیشەی لە مەسەلەی ئەوتدا بوو.

ئەوتی ئێران لە ساڵی ١٩٣٣ را تەقریبەن بە خۆڕایی درابووە دەست ئینگلیسییەکان و لە حاڵێک دا لە زۆر شوێنی خاوەن ئەوتی دنیا نرخ لە سەرتر بوو و عادلانەتر دەفرۆشرا، ئینگلیس ئامادەی گۆڕینی قەراری پێشوو نەبوو. دەستی ئەمریکاش وردە وردە بەرەو ئەو سوودە بەرچاوەی ئەوت درێژ دەبوو و خۆی ئامادە دەکرد بەشێکی بەرێ، بۆ حەللی ئەم موشکیلە کە خەریک بوو ڕەنگێکی تازەی سیاسی ئابووریی بە خۆیەوە دەگرت و لە مەجلیس چەند جار هاتبووە گۆڕێ و قسەی لەسەر کرابوو. تەنانەت لە هاوینی ٢٨دا

قـەراریکی تازەشی لەسـەر دەرچوو، بەڵام نە ئینگلیس گوێی بزووت و نە کـەسـیش لەم سەرۆک وەزیر و دەوڵەتانەی ئێران پشتی مەسەلەکەیان گرت.

ئەم جار ئینگلیس کۆنە دۆستی جێی باوەڕی خۆی سپەهبود رەزم ئارای لە پرێسکەی پڕ فرت و فـێـڵی خۆی هێنایە مەیدان و لە مـانگی پووشپـەڕی ١٣٢٩ کرا بە سـەرۆک وەزیر. گـومـان لەوەدا نیـیـە کـە مـەبەسـتـیـان ئەوە بوو وەزعـەکـە جـارێکی دیکە بەرەو دیکاتورییەتێکی توندوتیژتر بەرن و مەسەلەی نەوتیش لە بیـر خەڵک بەرنەوە یا ئەگەر ناڵ و گۆڕێک لەم بابەتە پێکهات، بەرژەوەندی بریتانیا بەرچاو بگیرێ.

رەزم ئارا دەگەڵ ئەوەی کە پیاوێکی لێهاتوو و تا رادەیەک خۆشەویست بوو، بۆ ئەوەی زیاتریش دڵی خـەڵک وەدەست بێنێ، لایحـەیەکی بردە مـەجلیس کـە بەپێی ئەو لایحـە بەشێک لەو خاڵانەی کە لە قانوونی ئەساسیدا لەسەر ئەنجوومەنی ئەیالەتی و ویلایەتی نووسرابوو، بەڵام هیچ کات و ئێستـاشی دەگـەڵ بێ، بەڕێوە نەچوو، گونجابوو. هەم دەگـەڵ ئەم لایحـە و هەم دەگـەڵ ئەو پێـشنیـارە تازانەی لەسـەر نەوت کـران، لە لایەن جەبـهـەی میللییەوە موخالەفەت کرا.

جەبهـەی مـیللی هەر لە پاییزی ١٣٢٩ ڕا مەسـەلەی مـیللی کردنی سەنعـەتی نەوتی هێنایە گۆڕێ و دوایە بوو بە دروشـمی رسـمـیی ئەو جەبهـە و دوکـتـۆر مـوسـەدیقـیش بە جیددی لە هەموو شوێن و جێگایەک پشتگری مەسەلەکەی دەکرد. ئەوان ئەو شێوەیان بە باشترین رێگە حەللی مەسەلەی نەوت و رزگار بوون لە دەست بریتانیا دەزانی.

حیـزبی تـوودەش بۆ دابین کـردنی نەزەری خۆی بە هەر شـێـوەیەک بۆی کـرابا، لەگـەڵ بۆچوونی ئەوان دژایەتیی دەکـرد و ئەو دروشـمـەی بە چارەسـازی ئەسـاسی دەزانی و لە هەڵگرتنی بەردی گەورەی«حاکم بوونی خەڵک بە سەر چارەنووسی خۆیان» دەدوا و لەبەر ئەسڵی مـەسـەلەکە هەڵدەهات و زۆرجاریش بەشتی ناڕاست و ناڕەوا هێرشی تەبلیغـاتیی دەکردە سەر جەبهەی مـیللی و بە خەڵک هەڵخەڵەتێنی و دەستکردی ئیـسـتـعـمـار و.. لە قەڵەم دەدران.

جەبهـەی میللیش بە توودەییەکانی دەگوت توودەیی ئەوتی و گوێ لە مستی سۆڤیەت و سەر لێ شێواو. بە داخەوە ئەو ململانێ ناشەریف و نابەجێیە کە لەم کاتە عاستەمەدا دەستی پێکردبوو، تا ئاخری هەر درێژەی کێشا و زیانی قەرەبوونەکراوەی لە گەلانی ئێران دا. یەک لەم زیانانە وەڕێ کەوتنی کوودیتـاکانی یەک لە دوای یەکی شـا و سەرکـەوتنی

دوایین کوودیتای له ۲۸ی گەلاوێژی ساڵی ۱۳۳۲هەتاوی بوو.

کوردستانیش بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە حیزبە تاقانەکەی حیزبی دیموکراتی کوردستان بوو، ئەویش لەگەڵ حیزبی توودە هاوکار و هاوپەیمان بوو، زۆر کات دەچووە ژێر تەئسیری ئەو بۆچوونە ناڕاستانە.

هەر لە پاییزی ساڵی ۱۳۲۹ و لە کاتی حوکمداریی ڕەزم ئارا بوو کە حیزبی توودە لە ڕێگەی ڕێکخراوی نیزامی و ئەفسەرانی خۆیەوە توانی دە کەس لە ئەندامانی ڕێبەریی خۆی کە لە بەندیخانەی قەسر بوون و بە ئیعدام و ئەبەد مەحکووم کرابوون، بە شێوەیەکی زۆر عادی و دوور لە مەترسی بە بیانووی ڕاگواستن دەرباز بکا. ئەوە ڕووداوە تاڕادەیەکی بەرچاو بۆ ڕاکێشانی خەڵک بەرەو حیزبی توودە تەئسیری کرد. لە کوردستانیش بە قازانجی حیزب تەواو بوو جگە لە ڕاکێشانی خەڵک بۆ لای حیزبی دیموکرات، دوژمنانیش تاسان و تووشی هێندێک پاشەکشە هاتن.

ئەوە بارێکی تەبلیغاتیی بەهێزی بۆ حیزبی توودە هەبوو. دوای هەڵوەشاوە ڕاگەیاندنی زەبرێکی کاریگەر بوو لە ڕێژیمی وەشان. دیارە زۆریش بە زیانی ڕەزم ئارا و دارو دەشانە دەستەکەی تەواو بوو. جەبهەی میللیشی تا ڕادەیەک تاساند. ئەو ڕووداوە نەتەنیا لە ئێران، بەڵکو لە دنیا وەک تۆپ دەنگی دایەوە.

لەم مرخێش مرخێش و بگرە و بەردەدا ناکۆکیی نێو دەزگاکانی ڕێژیم زیاتر بوو و لەم بوارەدا بوو کە ڕەزم ئارای سەرۆک وەزیر لە شازدەی ڕەشەمەی ۱۳۲۹ تیرۆر کرا و دوایین شانسی ئینگلیس بۆ سەپاندنی ئەزەری خۆی لەسەر مەسەلەی ئەوت لە دەست چوو.

بەشی دووهەم

# گەشەسەندنەوەی تێکۆشانی حیزب

دوای نەمانی رەزم ئارا، رێگە بۆ جەبهەی میللی لەسەر دروشمی میللی کردنی نەوت خۆشتر بوو. ئەم باسە زۆری برەو ئەستاند و لە راستیدا بوو بە قسەی نێو بازاڕ و کووچە و کۆڵان و لایەنگرێکی یەگجار زۆری پەیدا کرد. بە تایبەتی کە حسێنی عەلاش هاتبووە سەرکار، هەرچەند پیاوی دەربار و شاگردی کۆنی ئینگلیسییەکان بوو، بەڵام توانا و برستی پێشگرتن لەم بۆچوونە باش و داخوازە رەوایەی کۆمەڵانی خەڵکی نەبوو.

سەرەڕای ئەوەش کە تاقمێک لە نوێنەرانی مەجلیس مۆری دەربار و وڵاتانی ئیمپریالیستی ئینگلیس و ئەمریکایان پێوەبوو و دڵیان بۆ خەڵکی لێ نەدەدا و هەڵبژێردراوی جەماوەر نەبوون، لایحەی میللی کردنی سەنعەتی نەوت لە ٢٤ی رەشەمەی ١٣٢٩دا لە پێشدا لە مەجلیسی شورا و دوایەش لە مەجلیسی سەنا، سەرەڕای ئەوەی نیوەی نوێنەرەکانی شا دایدەنان، لە رۆژی ٢٩ی هەر ئەو مانگەدا پەسەند کرا.

لەو کاتەوە ئەو رۆژە بە رۆژێکی پیرۆز ناو دەبرێ و وەک جێژن حیسابی بۆ دەکرێ و لە تەقویمەکانی ئێراندا وەک رۆژێکی مێژوویی دەنووسرێ و رۆژی پشوودانیشە.

هەرچەند ئەوە سەرەتای کارێکی گرینگ و مێژوویی بوو کە لە دنیا دەنگی دایەوە، دواتریش هاندەرێکی مەزن بوو بۆ هەموو وڵاتانی جیهانی سێهەم و رۆژهەڵاتی نێوەڕاست تا هەنگاوی باش بۆ بەدەستەوە گرتنی سامانی وڵاتەکەیان هەڵگرن و دژی ئیمپریالیزم و ئیستعمارچییەکان راپەڕن.

هەروەها ئەو کارە سومعەی «جبهە ملی» و باقی ئیشتمانپەروەرانی لە روانگەی خەڵکەوە زۆر بردە سەر. جەماوەر جارێکی دی هومێدی بە خۆی پەیدا کرد و لە درێژەی

کارو بەرنامەکانیان دژی بنەماڵەی حەمە رەزا شا و وڵاتانی زۆردار بە هێزتر و پڕ هیواتر بوون.

سەرۆک وەزیری ئەوکات حسێنی عەلا لە لایەک پیاوی شا بوو و لە نێو خەڵکدا ناخۆشەویست و هەر لە بنەڕەت را پیاوێکی کەم ئیرادە و لاواز بوو، لە لایەکی دیکەوە سەر بە ئینگلیسییەکان بوو، بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی قانوونی میللی کردنی سەنعەتی نەوت بەڕێوەبەرێ و بەناکامی بگەیەنێ.

ئەم کارە کەسێکی گەرەک بوو کە ئیمانی قووڵی بە کارەکە بێ و گەلیشی لە پشت بێ تا بتوانێ دەگەڵ دەوڵەتی خاوەن دەسەلات و پاوانخوازی بریتانیا و شەریکەی خاوەن دۆلار و پاوەندی بە نێو شیرکەتی نەوتی ئێران و ئینگلیس بێتە مەیدانی ململانێ. بێگومان زانیاریی سیاسی و قانوونیشی دەویست کە وەلامدەری ئیددیعا پڕوپووچەکانی ئەوان بێ و بە توانایی تەواو لە دادگای نێو نەتەوەیی وەلامدەر بێ.

لەسەر ئەم بنەمایە بە پێچەوانەی ویستی راستەقینەی شا لە ٨ی بانەمەڕی ١٣٣٠ی هەتاوی دوکتۆر محەممەد موسەدیق کرا بە سەرۆک وەزیر. ناوبراو خاوەنی بەرنامە بوو، هەستی دەکرد کە خەڵک پشتیوانیی تەواو لە بۆچوونەکانی دەکەن و بۆیە بە پشتگەرم بوون بە رای خەڵک و هیممەت و لێزانیی خۆی و هاودەنگی و موافقەتی ئەندامانی جەبهەی میللی رۆژی ٢٩ی جۆزەردانی ١٣٣٠ شیرکەتی نەوتی خەلعی یەد کرد و رایاڵی و موهەندیس مەهدی بازرگانی بە سەرۆکایەتی هەیئەتێک بۆ ئابادان بەڕێ کرد تا بەکردەوە شیرکەتی نەوت و هەموو ئیمکانات و کەل و پەلی ئەم بونیادە ئابووری و سەنعەتییە لە ئینگلیسییەکان تەحویل وەرگرن.

کار گەیشتە جێگایەک کە ئینگلیس و تێکڕای مۆرەکان و فەرماندەرانی پایە بەرزی ئەرتەش و دەربار بە هەموو توانای خۆیانەوە دەگەڵ دوکتۆر موسەدیق دژایەتییان کرد و خەریکی پیلان دارشتن و بەربەرچ دانەوەی کار و کردەوەی ئەوبوون، موسەدیق ئاگادار بوو کە ئەم هەویرە ئاوێ زۆر دەبا و ئاوردەکە لە گۆڕی ئینگلیس هەڵدەستێ و لە کونسوولخانەکانی ئەوان را رێنوێنی دەکرێن، لەبەر ئەوەی فەرمانی دا کە لە رۆژی ٢٥ی بەفرانباری ١٣٣٠دا هەموو کونسوولخانەکانی ئینگلیس کە لە شارە گەورەکانی ئێران بوون تەعتیل کرێن.

ئەو کارانە هەم دەوڵەتی بریتانیای تووڕەتر کرد و هەم شای لە دین دەری کردبوو.

بۆیە هەرجار لە جاری پێشوو زیاتر پیلانگێرییان دەکرد و بە ئاشکرا لە رێگەی ئەو ئەندامانەی پارلەمان کە سەربەخۆیان بوون، بە ئاشکرا و نهێنی لە رێگەی دەرەبەگ و شێخ و مەلا و بە تایبەتی ئەرتەشەوە خەریکی پیلانگێری بوون.

تا ئەو کات شا فەرماندەی هەموو ئەرتەش بوو و دەیتوانی لەم رێگایەوە هەرچی دڵخوازی بێ بیکا، دوکتور موسەدیق ئەم دەسەڵاتە زۆرەی شای بە مەترسییەکی گەورە دەزانی. بۆیە لە مانگی پووشپەڕی ٣١دا بەدوو هۆ لە سەرۆک وەزیری ئیستیعفای دا.

یەکەمیان لەبەر ئەوە خۆی پیاوێکی بلیمەت و یاسازان بوو، کە زانی فراکسیونێکی بە هێزی سی چل کەسی لە مەجلیس پەیدا بووە و دژایەتیی دەکەن، دووهەم لەبەر ئەوەی دەیەویست شا لەوە زیاتر لە جیاتی سەڵتەنەت کردن حکوومەت نەکا و فەرماندەی گشتیی ئەرتەش نەبێ و خۆی بە ئەمیری ئومەرا دانەنێ و خاوەنی هەموو دەسەڵاتێک نەبێ.

دوای لە کار کشانەوەی (استعفا)ی دوکتور موسەدیق، کۆمەڵانی خەڵک بە تێکڕا رژانە نێو شەقامەکان و خوازیاری هاتنەوە سەر کاری ناوبراو بوون و ئەوەندەیان خۆڕاگری کرد و پێیان داگرت تا شا مەجبوور بوو داوا لە دوکتور موسەدیق بکا بێتەوە سەرۆک وەزیر و بۆ یەکەم جار لە دەورەی بنەماڵەی پەهلەویدا موسەدیق فەرماندەی گشتی ئەرتەشیش بێ و وەزیری بەرگریش هەر بۆ خۆی دیاریی بکا.

دیارە ئەو خۆپێشاندانانەی لە مانگی پووشپەڕدا بە قازانجی دوکتۆر موسەدیق هاتنە گۆڕێ، هەموویان لەوپەڕی یەکگرتوویی و فیداکاریدا بەڕێوە دەچوون، بەڵام خۆپیشاندانی رۆژی ٣٠ی پووشپەڕ وەک یەکێک لە بەرینترین بەرهەڵستکارییەکان لە زۆر شوێنی وڵات بەڕێوە چوون، بە تایبەتی لە تاران ئەم میتینگ و رێ پێوان و خۆپیشاندانە ئەوەندە بەهێز بوو کە هێزە چەکدارەکانی تەیاری شایان کە بە ماشێن و تانک و کەرستەی زۆرەوە بۆ سەرکوتی خەڵک هاتبوونە مەیدان، مەجبوور بە پاشەکشە کرد. خەڵکێکی زۆر لەم خۆپیشاندانەدا بە دەستی چەکدارانی شا شەهید کران کە لە گۆڕستانی ئیبن بابویەی تاران، گۆڕستانی تایبەتییان بۆ ساز کردوون.

شا ناچار بە پاشەکشە بوو. هەرچەند رۆژێک زیاتر نەبوو قوام السلطنەی وەک سەرۆک وەزیر دیاری کردبوو، وەلای نا و دوکتور موسەدیق بە دەسەڵاتێکی زۆر و تازەوە بوو بە سەرۆک وەزیر.

سەرەڕای ئەوەی کە شا هیچ رێگایەکی بۆ نەمایەوە و ناچار حوکمی سەرۆک وەزیری

دووبارەی دوکتۆر موسەدیقی نیمزا کردەوە، بەڵام لەژێرەوە هەر خەریکی فرت و فێڵ و پیلانگێران بوو. لە لایەک ئەمریکا و ئینگلیس کە لە لیبراویی موسەدیق و دژایەتی ئەو جەبهەی میللی و هەوڵی حیزبی توودە بۆ گەیشتن بە گەلاڵەکانی پێشوو زۆر توورە بوون و دەیاندی کە رۆژبەرۆژ خەڵک پشت گەرمتر دەبن و وێدەچێ بۆ هەمیشە ئەوتەکە لە دەست هەردووکیان بچێ، خەریکی فرت و فێڵ و وەلانانی دوکتۆر موسەدیق بوون، هەر بۆ ئەم مەبەستەش پێشگرییان لە کڕینی ئەوت کرد و بەم هۆیە زەختی ئابووری زۆریان خستە سەر دەوڵەتی موسەدیق.

لە لایەکی دیکەشەوە شا و داروودەستەکەی بە ئاشکرا دەستیان دابووە هەڕەشە و گورەشە، لە رێگای بەکرێگیراوانەوە. یەکێک لە باشترین دۆستەکانی موسەدیق سەرتیپ ئەفشار توس کە سەرۆکی گشتیی شارەوانی تاران بوو، رفێندرا و بەشێوەیەکی مەرمووز و زۆر ناڵەبار کوژرا.

ئەوە بوو وردە وردە سیاسەتی ئابووری بێ ئەوت لە لایەن حکوومەتی میللی تەبلیغ کراو موسەدیق لە خەڵکی داوا کرد کە دەبێ بۆ سەرکەوتنی یەکجاری و بەربەرەکانی دەگەڵ ناتەواویی ئابووری زیاتر فیداکاری بکەن و لە خۆبووردوو بن.

هەروەها گەلاڵەی قەرزەی میللی بۆ تێ هەڵێنانەوەی کەم و کووڕیی ماڵیی دەزگای دەوڵەتی هێنا گۆڕێ. ئەم گەلاڵە بریتی لەوە بوو هەر کەس پوولی زیادی هەیە، لەم بەرگانەی دەوڵەت چاپ و بڵاوی دەکاتەوە، بکڕێ و دوای باش بوونی وەزعی ئابووری و هەڵێنجانی ئەوت و فرۆشتنی لە داهاتوودا وەریگرێتەوە.

بە خۆشییەوە ئەم گەلاڵەش پەسەند کراو تا رادەیەکی بەرچاو کەڵکی لە راگرتنی وەزعەکەدا هەبوو، لە زۆر شوێن و جێگا پێشوازی گەرمی لێکرا. حیزبی توودە دژی ئەوەش وێستا و تەبلیغاتی زۆر خراپی کرد، بەڵام وەک زۆر مەسەلەی دی تێیدا سەرکەوتوو نەبوو.

شا کە دەیدی هیچ شتێکی بۆ نەماوەتەوە، دەست و پێوەندەکانی خۆی وەگەڕخست، بە ئێوی هێندێک ایەتو الله دەربارییەکان و چەقۆکێشی وەک شەعبان بێ مۆخ هاتنە شەقامەکان و بە بڵاوکردنەوەی درۆی «شا دەیەوێ بڕوا و نایێ بێڵێن» سومعەی لە دەست چوویان بۆ زیندوو دەکردەوە.

ئەم کارە لە مانگی رەشەمەی ساڵی ۳۱دا بوو. لە راستیدا زۆرتر لەوە دەچوو

پیلانێکی کوودیتایی دژی موسەدیق بێ، بەڵام خەڵک بۆ وەدرۆخستنەوەی ئەم دەنگۆیە، بە رادەیەکی بەرچاو رژانە شەقامەکان. هەرچەند جۆراوجۆری و یەک نەبوونی دروشمەکان نیشانەیەکی روونی ناتەبایی هێزەکانی دیموکرات و خەباتکاری دژی ئیمپریالیزم و شا بوو، بەڵام وەڵامێکی زۆر ددان شکێن بۆ پیلانگێران بوو.

داخەکەم ئەوانەی تینووی ئەوت بوون و ئەم شتەیان لە بەرنامەی ئابووری و سەنعەتیی خۆیان دا وەک خوێن لە بەدەنی بەنی ئادەم دا حیساب دەکرد، لە بنەوە بڕیاری خۆیان دابوو، ئەمریکا نەتەنیا چەند جار وەڵامی رەدی بە داخوازیی دوکتۆر موسەدیق لە سەر داوای یارمەتی و قەرز داوە، بەڵکو نەیهێشت بانکی جیهانیش قەرزی دەگەڵ بکا.

ئەمریکا و ئینگلیس ئەوکات کە دوکتۆر موسەدیق و دەوڵەتەکەی وەڵامی رەدیان بە چەند شەریکەی گەورە لە سەر کڕینی ئەوت داوە و شەرت و شرووتی هیچیانی قبووڵ نەکرد، بە تایبەت دوای ئەوەی گەڵاڵەی هاوبەشی چرچیل و ترومینی زاڵمانە زانی و رەتی کردەوە، بە تەواوی گڕژ بوون و بە توندی خەریکی پشتیوانی لە شا و رێکخستنی کوودیتا بوون. وەک لە دوایەدا باس دەکەین ئەو بۆچوونە پڕ لە شەرم و خیانەتە لە رۆژەکانی ٢٥ی گەلاوێژەوە بە جیددی هاتە مەیدانی کردەوە، زۆر بە داخەوە سەریش کەوتن و مەسەلەی ئەوتەکەشیان بە کەیفی خۆیان چارەسەر کرد.

شا و حکوومەتەکەی بۆ ئەم مەبەستە زۆر بە توندی لە بەهاری ساڵی ٣٢ را خەریکی کۆکردنەوەی هێز و ناڵ وگۆڕی مۆرەکانی خۆیان بوون. بە پێچەوانەی هێزە دیموکراتیکەکان کە قەت یەکگرتوو نەبوون و لەسەر پرۆژەیەکی تایبەت بۆ رزگاریی وڵات رێک نەکەوتن، دوژمنەکان کلکیان لێک گرێدا و خەریکی خۆسازدان بوون و بەو پشتیوانییە ماددییەی ئەمریکا و ئینگلیس بۆیان تەرخان کردبوون و جگە لەوە ئیمکاناتی بەربڵاوی دەرباریشیان لە دەست دابوو، لە ماوەی چەند مانگدا هێدی هێدی خۆیان رێکخست.

دیارە دوکتۆر موسەدیقیش کە لە سەر ئەو بڕوایە بوو، تا ئەو جێگایەی بۆی بلوێ، ئێران لە دەستی ئیمپریالیزم رزگار بکاو بە تەواوی ببێتە وڵاتێکی سەربەخۆی دوور لە دەسەڵاتی زاڵی ئەم دوو دەوڵەتە، بەرەبەرە لە نفووز و دەسەڵاتی شای کەم دەکردەوە، هێندێک کاری دەکرد کە لە لایەک مەوقعیەتی شا لەق کا و لە لایەکی دیکە زیاتر لە پێشوو پشتیوانی جەماوەر بۆ حکوومەتە میللییەکەی بە تایبەتی رەزامەندیی زەحمەتکێشانی شار و دێ وەدەست بێنێ.

لەم بوارەدا بوو کە لە ساڵی ۳۱دا فەرمانی دا قانوونی ۲۰٪کە بە قازانجی جووتیاران لە مەجلیس تەسویب بیوو،[*] لە هەموو دێهاتی ئێران بە تایبەتی لەو جێگایانەی کە خاوەن مڵکی گەورەی لێ بوو و ژیانی زەحمەتکێشان لە ژێر ڕکێفی گەورە ئاغاکاندا بوو، بەڕێوە بەرن.

دوایەش لە بەهاری ۱۳۳۲دا فەرمانی وەرگرتنەوەی مڵکەکانی بە مفت و زۆر وەدەست هاتووی بنەماڵەی پەهلەوی دا و لەم ڕێگایەوە زەبرێکی قورسی ماڵیی لە شادا.

ئەم وەزعە کە ڕەوتی دێموکراسیی بەهێزتر دەکرد، لەسەر کوردستانیش شوێنەواری زۆرباشی دانابوو، بەشداریی حیزبی دێموکرات لە تەواوی ئەم هەڵسوکەوتانەدا هەرچەند بەشێوەی ڕاستەوخۆ و زۆر ئاشکرا نەیدەتوانی و زیاتر بە نێوی جەماوەر دەچووە مەیدان، زۆر بەرچاو بوو.

حیزبی دێموکراتی کوردستان لە زۆربەی خۆپێشاندانەکانی ئیعترازیی ئەو سەردەم و مییللی کردنی نەوت بە پێی توانای خۆی هەوڵی دەدا و هێندێک جار لە ئەندامان و لایەنگرانی خۆی کەڵکی وەردەگرت و مانۆڕی دەدا.

لە ساڵی ۳۱دا کە بەشێک لە بەندییەکانی دەوری کۆمار و هەروەها گیراوەکانی ڕێبەندانی ساڵی ۲۷یش ئازاد بیوون، هێندێک لەو کەسانەش کە لە زەمانی کۆمار بۆ خوێندن نێردرابوونە باکۆ و تەورێز و زۆر پێشتر گەڕابوونەوە، ماوەیەکی زۆر لە ترسی ژێرچاوەدێری بوونی بەکرێگیراوانی ڕێژیم نەیانتوانیبوو لە تێکۆشانی سیاسیدا بەشداری بکەن، دەستیان بە تێکۆشان کرد.

ئەم هەوڵ و تێکۆشانە و چوونە پێشی کاری ڕێکخراوەیی و نفووزی حیزب لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا لە دوو ڕووداوی گرینگدا بە باشی ئاکامی دەرکەوت.

یەکیان بەشداربوون لە هەڵبژاردنی نوێنەری دەورەی ۱۷ی مەجلیسی شورا بوو، ئەوەی دیکەیان پشتیوانی و ڕێنوێنی و هاوکاری دەگەڵ ڕاپەڕینی جووتیارانی کوردستان لە زستانی ساڵی۳۱دا.

---

(*) قانوونی ۲۰٪ کە لە زەمانی موسەدیق پەسند کرابوو، بۆ چاوەدێریی زیاتری جووتیاران و ئاوەدان کردنەوەی زیاتر بووە. بە پێی ئەم قانوونە دوای ئەوەی مالیک بەهرەی خۆی لە جووت بەندە و وەرزێران وەردەگرت، دەبوو لەو داهاتە ۲۰٪ ڕەت کاتەوە بۆ ئەنجوومەن یان شورای گوند. لەو بیست لە سەدە کە لە ئاغا وەردەگیرا و بێگومان زیاتر مالیکە گەورەکانی دەگرتەوە، دە لە سەدی بۆ جووتیارەکان بوو کە بە شێوەیەک لە نێو خۆیاندا بەشیان دەکرد. دە لە سەدەکەی دیکەش خەرجی ئاوەدانی و تەعمیرات و کاری پێویست بۆ ئاوەدانی دەکرا.

بۆ دەورەی حەڤدەهەمی مەجلیس، هەرچەند حیزب لەبەر قانوونی نەبوونی نەیدەتوانی بە رەسمی بەشداری بکا، بەڵام بە شێوەی غەیرە رەسمی بۆ یەکەم جار کاندیداتۆری جێی بڕوای خۆی دیاری کرد، زۆر پشتی گرت و چالاکیی زۆری لە خۆی نیشاندا.

ئەم شەخسیەتە زانا و سیاسییە صارم الدین صادق وەزیری خەڵکی سنە و دانیشتووی تاران و وەکیلی پایە یەکی دادگوستەری بوو، بەهۆی پاکی و چالاکیی سیاسی لە نێو کوردەکانی دانیشتووی تاران زۆر خۆشەویست بوو، بۆ ناساندنی ئەو هەم بە وەزیری نێو خۆ و هەم بە خەڵکی مەهاباد و دەوروبەر بەشێکی زۆر لە پیاوانی دڵسۆز و خۆش ناوی دانیشتووی تاران هەوڵیان دابوو ناسنامەیەکیشیان ئیمزا و بڵاو کردبووەوە.

نێوبراو کاتێک بۆ زیاتر خۆناساندن و تێکۆشانی هەڵبژاردن هاتە مەهاباد، جەماوەرێکی زۆر بە پێشوازییەوە چوون.

لەم ماوەدا کە لە ماڵی حاجی ساڵح خەرازی میوان بوو، خەڵکی شار لە بازاڕی، زەحمەتکێش، رۆشنبیر و قوتابی و ژن و پیاوەوە دەستە دەستە دەچوون سەریان دەدا. ئەویش وێڕای سەردانی بنەماڵەی شەهیدان و پرسین لە وەزعی ژیانی خەڵک و گیروگرفتەکانیان چەند جارێک لە نێو شاردا چووە نێو خەڵک و بە کۆمەڵ دەگەڵیان دوا.

وتە و ئەخلاق و رەفتاری چەند رۆژەی نێوبراو جەماوەرێکی زۆری بۆ لای ئەو راکێشا.

زۆر ئاشکرا بوو کە لە هەموو بارەوە سەرکەوتوو دەبێ و لە هەڵبژاردنەکەدا دەیباتەوە و بە سەر دووکەسەکەی دیکە کە یەکیان دوکتور موکری خەڵکی باشووری کوردستان و ئەوی دیکەیان حەسەن ئیمامی (ئیمام جومعە)ی تاران و نێردراوی تایبەتی دەربار بوو زاڵ دەبێ.

نیشاندانی خۆشەویستی خەڵک بەرامبەر بە کاک صارم تەنسیری خراپی کردە سەر بەرپرسانی رێژیم لە شاری مەهاباد. ئەوان ئەم هاتوچۆ و تێکۆشانەی ئەندامان و لایەنگرانی حیزبیان بە چەشنێک بەرهەڵستکاری بۆ خۆیان دادەنا و چەند جار بۆ تێکدانی ئەو رەوتەی کە دڵخوازی خەڵک بوو، پیلانیان گێڕا و شەڕیان ساز کرد و تەنانەت خەریکی هێرش کردن بۆ سەر کاک صارم بوون. دەیانزانی ئەگەر بەم نەزم و هاوکارییە هەمە لایەنەی کە داندرابوو، رەوتی هەڵبژاردن ئاسایی بچێتە پێش، کەسە دیاریکراوەکەی شا دەرناچێ و ئابروویان لە مەترسی دایە.

بۆیە زۆر بە ئاشکرا دەستیان کرد بە هەڕەشە و گوڕەشە، کڕینی هێندێک دەرەبەگ و

نۆکەر لە حەوزەکانی دەرەوەی شار و لە زۆر جێگاش دەستیان لە سندووقەکان وەردا.
ئەرتەش و ژاندارم هەموو هێزی خۆیان لەم بارەوە وەگەر خستبوو.
هەرچەند زیاتر لە ٨٥٪ی کەسانی خاوەن دەنگی شاری مەهاباد دەنگیان بە کاک صارم دابوو و، لە خوێندنەوەی دەنگەکانیشدا ئەوە بە روونی دەرکەوت، بەڵام سەری نیمام جومعەی تارانیان لە سندووق دەرهێنا.
دەگەڵ ئەوەش کە ئەندامانی ناوداری جەبهەی میللی لە کۆمیسیۆنی شکایەتدا بوون و ئاگایان لەم کەڵەک بازییەی ڕێژیم بوو، بەڵام گوێیان بۆ شکایەتی خەڵک نەبزووت.
سەرەڕای ئەوەش ئەم مەسەلەی هەڵبژاردنە چەند ئاکامی باشی هەبوو، یەکیان ئەوە بوو کە خەڵک یەکگرتووتر بوون، زیاتر لە کەڵەک بازی و فرت و فێڵی ڕێژیم گەیشتن، دووهەم ئەوەی کە بە ڕێژیمیان سەلماند بەهۆی زەبروزەنگ ناتوانێ بۆ هەمیشە پێشی خەبات و بەرهەڵستکاریی خەڵک بگرێ. سێهەم ئەوە بوو کە خەڵک بەم دەنگدانە یارێکی وەفادار و دڵسۆزیان بۆ خۆیان پەیدا کردبوو، کە بە نوێنەری راستەقینەی خۆیان دەزانی و بێ ئەوەی بچێتە پارلمان، بوو بە دۆستی جێ متمانەی خەڵک، کە دوایەش بۆ حەللی زۆر لە گیروگرفتەکانیان ئامادە بوو. ناوبراو دوای کوودیتای ٢٨ی گەلاوێژ یەکێک لەو کەسانە بوو کە گیرا و دوای چەند ساڵ مانەوە لە بەندیخانەی ڕێژیمیشدا هەروا جوامێر و تێکۆشەر مایەوە.
خەڵک بە ئاگاداری لەوەی کە بەشێکی زۆر لە بەرهەمی ڕەنج و کوێرەوەرییەکەیان بە فیرۆ دەچێتە ئەنباری ئاغا و دەبێتە خەرجی کۆشک و تەلاری بەگزادەکان و خەرجی سازانی ئەوان دەگەڵ ژاندارمە و گزیر و کوێخاکان، لە پەسند کرانی قانوونی ٢٠٪ی دوکتۆر موسەدیق زۆر خۆشحاڵ بوون. هەستیان بەوە دەکرد کە بۆ دەربازبوونیان لە بێکاری، هەژاری و کوێلەتی ئەوە یەکەم هەنگاوە کە هەڵدەگیرێ و ئەگەر جێ بەجێ بکرێ، زۆر سەرکەوتنی دیکە و بگرە گۆڕانی سیستەمی دەرەبەگایەتیی بە دوادا دێ.
حیزبی دێموکراتی کوردستان روون کردنەوەی خەڵکی لەم بارەوە بە ئەرکی خۆی دەزانی و لەم پێوەندییەدا لە گوندەکانی ناوچەی موکریان زۆری هەوڵدا. ئەم یاسایە هەرئەوەندەی جێگای دڵخۆشیی جووتیاران و زەحمەتکێشانی دێهات بوو، ئەوەندەشی ئاغاکان و ژاندارم و دەست و پێوەندەکانی ئەوان تووڕە کردبوو، لە زۆر شوێن و بە زۆر بیانوو خۆیان لە دانی ٢٠٪ دەبوارد.

ناخر لە گەلێک ناوچە جووتیاران نەتەنیا خاوەنی ماڵ و مووچە و ئاژەڵی خۆیان نەبوون، بەڵکو دەسەلاتی خاوخێزانیشیان کەوتبووە ژێر دەستی ئەرباب! لە هێندێک شوێن وەک شارۆچکەی بۆکان پێوەندیی ئاغا و رەعیەت بەرادەیەک زاڵمانە بوو کە خەڵک خاوەنی مولک و دوکان و حەوش و خانووی خۆشیان نەبوون. زۆر کەس چەند ساڵ دوای کڕینی ئەو مولکانەش بۆیان تاپۆ نەدەکرا و سەنەدیان نەدەدرایە.

پەسندکردنی قانوونی ٢٠٪ نیگەرانیی زۆری بۆ مالیکەکان پێکهێنابوو. وەزع زۆر ناڵۆز بوو، لە لایەک بەکرێگیراوانی رێژیم دەگەڵ دەرەبەگەکان رێککەوتبوون و دژی زەحمەتکێشانی لادێ پیلانیان دەگێڕا. لە لایەکی دیکەوە جووتیاران لە ناوچەی موکریان دەستیان دابووە دەستی یەک و یەکیەتییەکی نهێنییان پێکهێنابوو تا بتوانن لە مافی خۆیان دیفاع بکەن.

ئەم رێککەوتنە و یەکگرتنە لە رێبەندانی ١٣٣١ لە بەرامبەر زەخت و زۆری مالیکەکاندا شێوەیەکی ئاشکرای بە خۆوە گرت و لە زۆر شوێن جووتیاران بەرهەڵستی ئاغاکانیان کرد.

حیزبی دێموکراتیش لە بەرامبەر هاوکاری رێژیم دەگەڵ دەرەبەگەکان دا بە ئەرکی پشتیوانی کردن لە جووتیارەکان هەستاو سەرەتا لە بواری تەبلیغاتی و دوایەش لە باری ماددییەوە زۆری هاوکاری کردن

بەرەنگارییەکە گەیشتە جێگایەک کە ئاغا و دەرەبەگەکان لە لایەک و زەحمەتکێشانی لادێ لە لایەکی دیکەوە، وەک دوو هێز لە بەرامبەر یەکتر راوەستان و تەقە و لێکدانیش هاتە گۆڕێ و جووتیارەکان سەرەڕای کەمبوونی ئیمکانات، نازایەتیی باشیان لە خۆیان نیشاندا.

کاربەدەستانی رێژیم کە بەشێوەی سروشتی و لەباری چینایەتییەوە، مانەوەی خۆیان لە مانەوەی دەرەبەگایەتیدا دەدی، کە هەستیان بەوە کرد ئاغاکان تینیان بۆ هاتووە، بە پێچەوانەی سیاسەتی دەوڵەتی دوکتور موسەدیق کە لایەنگری بەرێوەچوونی یاسا بوو و پشتگیری دابین کردنی مافی جووتیاران بوو، دەستیان بە خۆ تێ هەڵقوتاندن کرد.

سەرهەنگ مظفر زەنگەنە کە ئەو کات فەرماندەی تیپی مەهاباد بوو، هێزی ئامادەکرد و بە ئاشکرا بە لایەنگری لە دەرەبەگەکان هاتە مەیدان. هەر ئەوە بوو بەهۆی هەڵسانەوەی ئاغاکان و بە دوو قۆلی پەلاماری جووتیارەکانیان دا و زۆر بێ بەزەییانە دەگەڵیان

جوولانەوە. لە کوشتن، تالان کردن و بە ئاوودانی ژن و پیاو بێشکەی منداڵان و زۆرکاری درندانەی تر خۆیان نەپاراست، گەلێک لە بنەماڵەی ئەفرادی ناسراوی ئەو حەرەکەتە گیران و دەربەدەر کران.

ئەم کارە سەرەڕای ئەوەی لە چەند ناوچەیەکی بچووکدا هاتە گۆڕێ، لە بەشی زۆری ئێران دەنگی دایەوە و زۆربەی رۆژنامەکانی ئەوکات لەسەر ئەو رووداوە باسیان کرد.

لە قاودانی ئەم دەست تێوەردانە لە لایەن مظفر زەنگەنە و چەکدارەکانی، ڕیسواییەکی زۆری بۆ شا و ڕێژیمەکەی و دەرەبەگەکان پێکهێنا.

هەرچەند ئەم جوولانەوە عادلانەیە سەرکوت کرا، بەلام لە وریاکردنەوەی زەحمەتکێشانی لادێی کوردستاندا ئاسەواری خۆی دانا و ئێستاش لە بیر نەچۆتەوە.

ژمارەیەک لەو کەسانەی کە لەم حەرەکەتەدا نەقشی بەرچاویان هەبوو، دوایەش تووشی کوێرەوەری و دەربەدەری یا زیندان بوون، بریتی بوون لە حاجی قاسمی خەیات، عبداللە ئێرانی، عەلی میرەبەگ، عومەر بابامیری، محەمەد ئەفخەمی، سولتان حاجی باقر ناسراو بە سولتان ئاغا شێخ ئاغایی، برایم لیتان و کوڕەکانی، عەولا شەشەو حەمەدەمینی کوڕی، عبداللە خەزێم، مەلا رەحمان پیرەباب، مەلا عەولای گۆلێ کە دوایە چووبوو بۆ مشیرئاباد، کە زۆربەی ئەوانە تا دوا پشوو بۆ حیزب و گەل تێکۆشان.

هەرچەند حیزبی دێموکرات و جووتیارەکان لەم کارە سەرنەکەوتن، بەلام حیزب سەرنجی جووتیارانی لە زۆر شوێنی کوردستان بۆ لای خۆی راکێشاو بوو بە هۆی بەهێز بوونی رێکخراوی جووتیاران. بە تایبەتی لەبەر ئەوەی دوای شکانیشیان لە یارمەتیدان بۆ پەیدا کردنی جێگا و ڕێگا و شوێنی دامەزرانیان لە لایەن حیزبەوە هاوکاریی پێویستی مادی و مەعنەویان دەگەڵ کرا. حیزب ئیعتیبارێکی تازەی پەیدا کرد و دۆست و دوژمن حیسابێکی تازەیان بۆ کردەوە و سومعە و خۆشەویستی حیزب لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا زیاتر بوو. هەر بەو ئیسبەتەی کە هێزی کۆنەپەرستی سەر بە شا خەریک بوون مەیدان لە حیزبە پێشکەوتنخوازەکان تەنگەبەر بکەن، هێزەکان لە لایەک و بە تایبەتی دەوڵەتی دوکتور موسەدیق دوژمنانی خۆیان زیاتر دەناسی و جیددی تر دەبوون.

وەک لە پێشدا باسمان کرد حیزبی توودە قەولی دابوو بە ناردنی کادر بۆ کوردستان یارمەتیی مەعنەویش بکا، لە ساڵەکانی ٣٠ و ٣١ تەنیا دوو کەسی ناردبوو کە لەبەر نەزانینی زمانی کوردی نەیاندەتوانی خۆیان لەگەڵ خەڵک و هەلومەرجەکە رابێنن و

ونزیکەی مانگێک دەمانەوە و دەگەڕانەوە، بەڵام بەم چەند جار هەوڵدان و تێکۆشانی حیزبی دیموکرات لە کوردستان بە تایبەتی بە دوای مەسەلەی هەڵبژاردن و دیاری کردنی کاندیداتۆرێکی وەک صارم خان بۆ مەجلیسی ١٧و، کردەوەی شۆڕشگێڕانەی جووتیارەکانی ناوچەی موکریان هەموو بۆیان دەرکەوت کە کورد لەسەر داوای خۆی سوورە و وەدوای ڕێبازی حیزبی دیموکرات دەکەوێ.

بۆیە لە بەهاری ساڵی ٣٢دا حیزبی توودە چوار کادریان نارد کە دوویان کورد بوون، یەکیان کاک عەبدولرەحمان قاسملوو بوو، گەرچی بەینێکی دوور و درێژ لە هەندەران خەریکی فێربوون و خوێندن ببوو تا رادەیەک لە داب و نەریتی گەلەکەی دوور کەوتبۆوە، بەڵام بە زانایی خۆی زۆر زوو جێگای خۆی کردەوە و نیبتیکاری کارەکان و سەرۆکایەتیی گشتیی بەدەستەوە گرت. نەوی دیکەیان ناوی نهێنی بێهنام و خەڵکی مەڵبەندی باشووری کوردستان بوو، پیاوێکی زۆر بەکار و لەباری تەشکیلاتی زۆر لێوشاوە بوو، شایانی باسە کە یەکەمین کلاسی ناموزشیی کادر لە ساڵی ١٣٣٢دا پێکهات. هەر لەم ساڵەدا بوو کە بەکردەوە کاری تەشکیلاتی حیزب لە سنە کە پێشتر پێوەندییان دەگەل حیزبی توودە هەبوو، کەوتە سەر تەشکیلاتی حیزبی دیموکراتی کوردستان و تێکۆشانی گەلی کورد بەرەو باشووری کوردستان پەرەی سەند. حیزب توانیبووی لە زۆربەی شارەکانی کوردستان، سنە، سەقز، بانە، بۆکان، سەردەشت، نەغەدە، تا ورمێ و دەوروبەری نەندام و لایەنگری تێکۆشەرو لە زۆر جێگا کۆمیتەی حیزبی پێک بێنی، دەستەیەکی سەرۆکایەتیشی لەو کەسانە پێکهێنابوو: رەحیم سولتانیان، غەنی بلوریان، عەزیز یوسفی، عبدالله ئیسحاقی کریم نویسی.

جەوی کوردستان بە تێکڕا بە هۆی هەوڵدانی زۆری کادر و نەندامانی حیزبەوە بەرەو دیموکراتیزە بوون چووبوو، داروودەستەکەی مظفری فەرماندەیی تیپ بۆ ماوەیەک پاشەکشەی کردبوو، زۆرجار کارەکانی حیزبی بە شێوەی نیوە نهێنی بەڕێوە دەچوون.

ساڵی ٣٢ بۆ یەکەم جار قەرار درابوو لاوانی دیموکراتی کورد لە ڕێگەی حیزبی توودەوە لە فستیوالی جیهانیی لاواندا کە لە بوخارست دەگیرا بەشدار بن.

بۆ هەڵبژاردنی نوێنەر ڕێ و رەسمێکی زۆر بەڕێوە چوو، یەک لەو ڕۆژانە کە بەرینترین جێژنی لاوان دەگیرا، ١٥ی جۆزەردانی ١٣٣٢ بوو کە لاوانی زۆری شاری مەهاباد وهێندێک شوێنی دی لە باغی میکانیل کە هەم تا رادەیەک لە شار دوور بوو، هەم

باغـێکی خـۆش و پڕ جۆوری بوو وەک شـوێنێکی پشـوودان خـەڵکی شـار زۆرجـار چوار شەممویان و جـومعـان کـەڵکیـان لێ وەردەگـرت، کـۆبـوونەوە و خـەریکی بەڕێوەبردنی ڕێ و ڕەسـمی پـێـویست بـوون، کـە لە پڕڕا هێـزی چەکداری دیژبان و شـارەوانی بە دەسـتـووری مظفری لە چەند لاوە پەلاماریان دان و دەسـتیـان کرد بە تیـرنەندازی. لەم دەسرێژکردنەدا تازە لاوێک بە ناوی حەسەن رەحمەزانی دەکوژرێ و چەند کەسێکیش بریندار دەبن.

بەشـدارانی کـۆبوونەوە کـە هەسـتـیـان کـرد تازە نـاتوانن ڕێ و ڕەسـمـەکـە درێژە بدەن، جەنازەی رەحمزانی و بریندارەکانیان هەڵگرت و بەرەو شار وەڕێکەوتن و لە شەقامەکانی مەهاباد دەستیان کرد بە خۆپیشاندان.

هەمـوو خـەڵکی شـار بۆ نیـعـتـراز و مـەحکووم کـردنی ئەم هێـرشـە ناجوامێـرانەی کاربەدەسـتـانی ڕێژیم ڕژانە سەر شەقامەکان، شەڕی دەسـتـەویەخە دەستی پێکرد، لە زۆر شوێن ژنەکانیش پەلاماری ژاندارم و سەرباز و دیژبانیـان دەدا و تەنانەت لیـشـیـان چەک کردن. ئەم خۆپیشاندانە دوای دەوری کۆمار تا ئەو کات گەورەترین خۆپیشاندان بوو.

لە ناکامدا چل پەنجا کەس لە لاوان ، بەرپرسان و ئەندامانی حیـزب گـیران. خەڵک بریندارەکانیان بردنەوە نەخۆشخانە و مـاڵان و جەنازەی حەسەن رەحمەزانیش بە حورمەتێکی زۆرەوە تەسلیم بە خاک کـرا. بە دوای گـیـرانی ئەو بەشـە لە ئەندام و لایەنگرانی حیـزب، تاقـمێک ژن و لاو لە تەلگرافخانە «تحصن»یان کرد و مـاوەی چەند ڕۆژ لەوێ مـانەوە و دەگـەڵ بەرپرسـانی ئوسـتـان و بە تایبـەتی تاران و سـەرۆک وەزیرانی ئەو کـات دوکـتـۆر مـوسـەدیق بە تەلگراف پێـوەندییـان دەکـرد و خـوازیاری ئازاد کـردنی هەرچی زووتری بەندییـەکان و سزادانی قاتلان و هێـرشـکەران بوون. وێنەی ئەم شـتـانەش بۆ ڕۆژنامـەکان دەنێردرا تا چاپ و بڵاوی بکەنەوە. هەرواش کرا.

ئەم کـارە خـۆی بەهۆی هاتوچۆی خـەڵـک و سـەردان و دیاری هێنان بۆ ئەوانەی لە تەلگرافخانە مانیان گرتبوو، ببووە میتینگێکی ڕۆژانە کە کاربەدەستانی ڕێژیمی زۆر توورە کردبوو.

پاش چەند ڕۆژ سـەرکـەوتن وەدەست هات و دەسـتـووری ئازاد کـردنی بەندییـەکـان گـەیشت. ئەم بەندییـانەش دەگـەڵ جەماوەرێکی زۆر کە لە خەڵـک و بنەمـاڵەکـانیـان بۆ وەرگرتنەوەیان لە شارەوانی کۆببوونەوە، بە تێکڕا بە شێوەی ڕێپێوان و شوعاردان لەوێرا هاتنە تەلگرافـخـانە و گـوڵیـان پێـشـکەشی مـانگرتووەکان کـرد و جارێکی دی بە تێکڕا

ڕێپێوانیان کرد و دوایەش بڵاوەیان کرد.

ئەم ڕووداوەش بە هەموو خاڵە مەنفی و بە هێزەکانی لە مێژووی حیزبدا بە کارێکی گرینگ و ئازادیخوازانە هەڵسەنگیندرا و وەڵامێکی توند بۆ پیاو کوژانی شا بوو. ئەم سەرکەوتنەش لە دڵ و مێشکی خەڵکدا کاریگەر بوو، یارمەتیی زیاتری بە کاری ڕێکخراوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان کرد.

لە ڕۆژەکانی دواتردا چەند کەسێک وەک نوێنەری لاوەکان هەڵبژێردران کە ئەوانەی ناوەکانیان دەزانین کاک خەلیل سەدیقی، عیسمەت سەلیمی و کاک کەریم حیسامی بوون.

پاش بەینێک ئەوانە بەرێ کران بۆ تاران، تا لەوێ لە فستیوالی سەرجەم لاوانی ئێرانیدا بەشداری بکەن. دیارە لەم ڕێ و ڕەسمەی تاراندا بۆ جاری یەکەم بەرنامەی هونەری کوردیش بە بەشداریی کاک خەلیل سەدیقی بەڕێوە چوو، زۆریشی پێشوازی لێ کرابوو. لە ئاکامدا لە کوردستان تەنیا یەک کەس دیاری کرا، ئەویش کاک کەریم حیسامی بوو کە دوایە دەگەڵ جەماعەتێکی سەد کەسیی بەشەکانی دیکەی ئێران چووە بوخارستی پایتەختی ڕومانی کە فستیوالی جیهانی لاوانی لێ گیرا.

بەشی سێهەم

## کوودیتای شا لە گەلاوێژی ١٣٣٢

پێشتر باسمان کردبوو کە بەشێکی زۆر لە نوێنەرانی دەورەی حەڤدەی مەجلیسی شورای میللی هەڵبژیراوی خەڵک نەبوون و نموونەکەشی نوێنەری داسەپاوی شاری مەهاباد نیمام جومعەی تاران بوو کە بە ملهوڕیی ئەرتەش لە جێگای نوێنەری راستەقینەی مەهاباد کاک صارم الدین صادق وەزیری داندرابوو.

ئەو تەرکیبەی مەجلیسی ١٧ ببوو بە هۆی ئەوە کە کارەکان بە مەیلی حکوومەتی میللی دوکتۆر موسەدیق نەچێتە پێش و زۆر کەسی ناسالم لە ژێر پەردەی مەسوونیەتی قانوونیدا خۆیان حەشار دابوو. دوکتۆر موسەدیق دەبوو تەکلیفی ئەوانە روون کاتەوە.

لەبەر ئەوە لە رۆژەکانی هەوەڵی مانگی گەلاوێژەوە لە رێگەی رادیۆی تارانەوە گوتی: «هیچ رێگایەک نەماوە، جگە لەوەی خەڵک وەزعی ئەو پارلمانە روون کەنەوە»، بۆ ئەوەی حکوومەتیش بتوانێ ئەرکی خۆی بەڕێوە بەرێ، لە خەڵکی داواکرد دەنگ بدەن بە مانەوە یا هەڵوەشانەوەی مەجلیس. بەم شێوە ریفراندۆمێک هاتە گۆرێ و لە رۆژی ١٢ی گەلاوێژ لە تاران ، حەوتوویەک دواتر واتە رۆژی ١٩ لە شارەکانی دیکە دەنگ لە خەڵک وەرگیرا.

لەم دەنگدانەدا زۆربەی خەڵک دەنگیان بە هەڵوەشانەوەی پارلماندا، لە هێندێک لە شارەکان دەنگ بۆ مانەوەی مەجلیس لە ژمارەی قامکی دەستان تێنەدەپەری، بۆ نموونە لە بانە و مەهاباد لە یەک دوو دەنگ زیاتر لەم بابەتە نەبوو، باقی جەماوەریش لە هەموو

ئێران بە زۆربەی دەنگ لایەنگرییان لە ئەزەری دەوڵەتی موسەدیق کرد و مەجلیسیان هەڵوەشاند.

ئەو بڕیارەی گەلانی ئێران وەڵام دانەوەیەکی ئاشکرا بە شا و داروودەستەکەی بوو.

دیارە ئەم وەزعە مەترسییەکی گەلێک لە جاران زیاتری لە دڵی حەمە رەزا شادا پێکهێنا.

لە راستیدا ئەو کارە زەبرێکی زۆر کاریگەر بوو. نەتەنیا بۆ شا، بەڵکو راستەوخۆ بۆ ئەمریکا و ئینگلیس، ئەگەر بەرنامەکانی بەم هەموو هەستە خاوێنە کە لە کۆمەڵانی خەڵک و حیزبە پێشکەوتنخواز و نیشتمانپەروەرەکاندا بەدی دەکرا، بێ کەند و کۆسپ و ئاسایی چووبایە پێش، زۆری نەدەکێشا سیستمی پاشایەتی دەکەوتە خەتەری جیددی و بەرەو نەمان دەرۆیشت و ئەم دوو وڵاتەش دەستیان لە هیچ بەند نەدەبوو.

بە خۆرایی نەبوو کە دوای بێ دەسەڵات کردنی شەریکەی ئەوت لە ساڵی ۳۰دا ئەمانۆئل شین، وەزیری بەرگریی حکوومەتی کرێکاریی ئینگلیس گوتی:

«ئەگەر ئیزن بدرێ ئێران لەم بەربەرەکانییەدا سەرکەوتوو بێ، میسر و وڵاتانی دیکەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست هان دەدرێن کە دوای ئەم رووداوە بکەون، وێ دەچێ هەنگاوی دواتر میللی کردنی کەناڵی سوئیز بێ.

ئەم وەزعە لە پێشدا بۆ ئینگلیس کە بە دوای شەڕی دووهەمی جیهانیدا، دنیایەکی لە موستەعمەرەکانی خۆی لە قارەکانی جۆراوجۆر لە دەست دابوو و زۆر لەم موستەعمەرانەی وەک هیندووستانی پان و بەرین و پاکستان بە سەربەخۆیی گەیبوون، هەروەها بۆ ئەمریکاش کە ببوو بە سوڵتانی دنیای سەنعەت و دەیەویست سوڵتانی ئەوتیش بێ، قابلی تەحەممول نەبوو.

هەربۆیەش موورەکانی بێگانە و خۆیی لە پێشدا دیاری کراو بۆ بەڕێوەبردنی کوودیتای لە پێشدا گەڵاڵەکراو گورجانە دەستیان بە جم و جۆڵ کرد.

دوای سی ساڵ کە بەڵگە نهێنییەکان بەرچاو دەخرێن و بڵاو دەبنەوە، دەردەکەوێ کە ئایدین روزولت نوێنەری تایبەتی سیای ئەمریکا بۆ ئەم مەبەستە بە پارەوە هاتبووە تاران و بۆ ئەوەی نەبیندرێ و نەناسرێ، لە سەفارەتی ئەمریکاوە دەپەتوویەکەوە دەپێچرێ و لە ماشینێکدا درێژ دەکرێ و دەچێتە کۆشکی شا و بێ ئەوەی کەس بزانێ، هەر لەو ماشینەدا مولاقاتی یەکتر دەکەن و بە دوور و درێژی لەسەر پیلانەکە دەدوێن.

نیوەشەوی ٢٥ی گەلاوێژ سەرهەنگ نعمت الله نصیری فەرمانی لێ خستنی دوکتۆر موسەدیق لە لایەن شا بە ئیمکاناتی ئیزامییەوە بۆ مالی دکتور موسەدیق دەبا و پێشی رادەگەیەنێ کە سپهبد زاهیدی حوکمی سەرۆک وەزیری دراوەتێ.

ئەم هێرشە سیاسی و ئیزامییە بە دژی موسەدیق سەرنەکەوت، سەرهەنگ نەصیری دەگیرێ و دەیبەنە لەشکری دووی زریهی تاران و زاهیدیش خۆی دەشارێتەوە.

بەیانیی رۆژی ٢٥ دەنگۆی پووچەڵ بوونەوەی کوودیتاکە بلاو دەبێتەوە، شاش کە بۆ وەرگرتنی نەتیجەی کارەکە لە تاران و شەمیران دوور کەوتبووەوە و لە رامسەری باکوری ئێران چاوەڕان بوو، بە پەلە لە شکستی پلانەکە ئاگادار دەکرێ، ئەویش بێ مەحتەل بوون بە فرۆکەی تایبەتی خۆی کە لەوێ ئامادەبوو هەلات بۆ بەغدا و لەوێش را بەرەو رۆم چوو.

بە بلاوبوونەوەی هەوالی شکستی کوودیتا، سەرتاسەری ئێران خرۆشا، رۆژەکانی ٢٥ و ٢٦ لە زۆر شوێن جێژن و میتینگ رێکخرا. دروشمی کۆمار، کۆماری توودەیی، کۆماری دیوکراتی بەرزکرایەوە و لە دەرک و دیواران نووسرا.

لە مەهابادیش وەک ناوەندی سەرەکیی حیزبی دیوکراتی کوردستان رۆژی ٢٦ی گەلاوێژ گەورەترین میتینگی دوای دووی رێبەندانی ١٣٢٤ و نەورۆزی ١٣٢٥ لە مەیدانی مزگەوتی هەباس ئاغا کە دوای راپەڕینی ١٣٥٧ بە چوار رێی ئازادی ناوی دەرکرد، بە بەشداریی هەموو چین و توێژەکانی شار و دێ بەڕێوە چوو. لەم میتینگەدا زۆر کەس لە ئیشتمانپەروەران و ئەدیبان وتاریان دا.

حەسەن داودی وەکیلی دادگوستەری، دوکتۆر حسێن ئەیوبی بەرپرسی لەش ساغیی شار، سەید عەزیز ئەیوبیان خوێندکارو نوێنەری فرقەی دیوکرات بە تورکی، سدیق حەیدەری و یەک دوو خوشک لەوانە بوون کە قسەیان کرد. مامۆستا هێمنیش بە چەپکە شیعری جوانی«دەبڕۆ ئەی شاهی خائین، بەغدا ئیودی رێیەت بێ» خەلکی بە ترویکی هەست گەیاند. بە چەشنێک کە هەموو بەشدارانی میتینگەکە بە تیکڕا هاودەنگییان دەکرد و دەیانگوت: «دە برۆ ئەی شاهی خائین، بەغدا ئیودی رێیەت بێ» و بە سێ زمانی کوردی، فارسی، و تورکی دەیانگوت: «ئیمە میللەتێکی هۆشیار و وریاین و ئیتر شامان ناوێ».

لە بڕیارنامەی میتینگەکەدا جگە لە داخوازی دامەزرانی کۆماری دیوکراتیک، داوای گیرانەوەی شا و موحاکمەی هەموو تاوانبارانی بەرپرسی رێژیم و ئەندامانی بنەماڵەی

پەهلەوی‌یان دەکرد و ناوی شەقامەکانی شاریش کە وەک زۆر شوێنی ئێران پەهلەوی و شاپوور بوون، گۆڕدران و بە ۲۵ی گەلاوێژ و پێشەوا (قازی محەمەد) ناو نران. دیارە لە زۆر شوێنی دیکەی کوردستانیش میتینگ دراوە و دژایەتی دەگەڵ شا و ڕژێمەکەی کراوە، بەڵام زانیارییەکی دیار و ڕوونمان بە دەستەوە نییە تا بۆ خوێنەرانی بنووسین.

لە ژێر تەئسیری ئەم دڵخۆشییە کەم وێنەیەی کە هەموو ئێران بە تایبەتی کوردستانی داگرتبوو، لە لایەن بەرپرسانی حیزبەکانەوە لەبەر ئەوەی بە تێکڕا دڵنیا بوون تازە هەموو شت تەواو بووە و کوودیتا شکستی خواردووە، هیچ ئامۆژگارییەک بۆ پاشەڕۆژ و نهێنی هێشتنەوەی هێندێک کەس و هێندێک شت نەکرا و هەموو شت وەک سفرەی سلێمان ڕاخرا و هەموو کارەکان ئاشکرا بوون و کەم کەس مانەوە کە نەناسرێن.

بەڵام داخی‌گران ئەوە بوو کە ئەم شایی و دڵخۆشییە کە گەیشتە ئەو ڕادەی سروودی شاهەنشاهی هەڵگیرێ و هەیکەلەکانی شا و باوکی لە زۆر شوێن بخرێنە خوار، هەر سێ ڕۆژی کێشا. چونکە بە پێی گەڵاڵەی دارێژراو لە لایەن ئیمپریالیزمەوە، ئەوان لە کوودیتای شەوی ۲۵ی گەلاوێژدا هەر بەشێک لە هێزی کوودیتاچییەکانیان هێنابووە مەیدان.

باقی ئەم هێزە کە بریتی لە هێندێک چەقۆکێشی وەک شەعبان بێ موخ و ژنانی هەڵخەڵەتاو بوون، کە ڕێنوێنی هەر دوو باڵوێزخانەی بریتانیا و ئەمریکایان دەگەڵ زاهیدی و بەشی وەفادار و لایەنگرانی شایان لە نێو ڕژێمیشدا لە پشت بوو، لە ڕۆژی ۲۸ی گەلاوێژدا ڕژانە شەقامەکانی تاران و دەستیان کرد بە دروشمدان بە لایەنگری لە شا و دژی دوکتۆر موسەدیق.

لە خۆبایی بوونی هێزە دێموکراتییەکان بە سەرکەوتنی پێشوو، هەروەها کەمتەرخەمیی حکوومەت و سستی کاربەدەستانی ئینتزامی کە لە کاتی خۆیدا وەڵامی پێویستیان بەم کوودیتاچییانە نەداوە و لە بەرامبەریاندا بێ دەنگ بوون. کارێکی کرد کە ئەوانیش تا نیوەڕۆ توانیان دەزگای ڕادیۆ تاران بگرن.

هەر کە ڕادیۆ گیرا، سەرلەشکر فضل‌الله زاهیدی کە دوایە دەرکەوت لە ماڵی ئەمریکاییەکان خۆی شاردۆتەوە، لە پەناگا هاتەدەر و بە نێوی سەرۆک وەزیرانی دیاری کراو لە لایەن شاوە خۆی ناساند و وەعدەی گەڕانەوەی شاشی دا.

هاوکات لەگەڵ ئەم هەراو بەزمە، هێزێکی ئەرتەشییەکانیش پەلاماری دایە سەر ماڵی

دوکتۆر موسەدیق، کە دەگەڵ بەرەنگاریی توندی پارێزەرانی ماڵەکەی، سەرهەنگ مُمتاز و سەروان عەلی ئەکبەر شوجاعیان بەرەوروو بوون. سەرلەشکر باتمانقلیچ لە ستادی ئەرتەشەوە فەرماندەیی بە دەستەوە گرت. بە هێزی لەشکری ۲ی زرێهی تارانی ڕاگەیاند کە بێنە ناو شار و یارمەتیی سەلتەنەت خوازەکان بدەن. لە کرماشانیشەوە تەیموور بەختیار بە هێزێکی زۆرەوە خۆی گەیاندە تاران.

سەرەڕای دیفاعی باش لە ماڵی دوکتور موسەدیق، هێرش و تەوژمەکە ئەوەندە زۆر بوو، کە ناچار ماڵی خۆی جێهێشت و چووە شوێنێکی دیکە و خۆی حەشاردا، بەڵام دەنگی بە هیچ شوێنێک ڕانەدەگەیشت و هەر ئەو ڕۆژە کوودیتاچییەکان زۆر بە هاسانی سەرکەوتن و دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرت.

بەشی یەکەم

# پێکهاتنی کۆنفرانسی یەکەمی حیزب

دەستەمودستانی و بێ سەردوبەرەیی بەرەی هێزە نیشتمانییەکان و دەزگای دەوڵەتیی دوکتۆر موسەدیق لە رادە بەدەربوو. دوکتۆر موسەدیق چەند مانگ بوو خۆی سەرپەرستی نەرتەشیشی دەکرد و مۆرەگرینگەکان بۆ خۆی دانابوون، بەڵام لە کاتی پێویستدا هیچ چەشنە بڕیارێکی لیبراوانەی نەدا. بۆ خۆشی دوای چەند رۆژ گیرا و موحاکەمە کرا.

سەیرتر لەوەش ئەمەیە کە هەم هێندێک لەم ئەفسەرانەی پارێزەری ماڵی دوکتۆر مصدق بوون وەک علی اکبر شجاعیان کە کوردی کرماشان بوو، هەم هێندێک لە ئەفسەرە هێرشکەرەکانی وەک هۆشمەنگ قوربان نژاد کە فەرماندەی واحیدی زرێپۆشی موهاجم بوو و بە دەستووری باتمانقلیچ لە لەشکری ۲ی زرێپۆشی تاران را هاتبوونە نێو شار و بۆ گرتنی ماڵی مصدق نێردرا بوون. ئەندامانی بەوەجی رێکخراوی نیزامیی حیزبی توده بوون و چەند سەعات بێ ئەوەی یەکتر بناسن پێکەوە بە شەڕ هاتوون. لە هەموو ئەم ماوەیەدا خێرخوازێک پەیدا نەبوو لێکیان ئاشکرا کا و نەهێڵن ماڵی مصدق بگرن و بەرگری لە تالانکردنی بکەن.

لە شارەکانیشدا ئەرتەش پێشتر ئامادە کرابوو، زۆر بە هاسانی دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرت.

زۆر بەداخەوە ئەو هەموو زەحمەت و تێکۆشان و خەباتە، ئەم دەستکەوتە مێژوویی و بەنرخە زۆر بە هاسانی لە دەست چوو. جارێکی دیش دارودەستەی حەمە رەزا هاتنەوە گۆڕێ و بوونەوە خاوەن دەسەڵات. شا خۆشی چەند رۆژ دواتر لە رۆم را گەڕایەوە بۆ تاران و بۆ ماوەی ۲۵ساڵی دیکە سەڵتەنەتی کرد.

تێکچوونی دەوڵەتی دوکتۆر مصدق ئەوەندە بە سووک و هاسانی بۆ شاپەرستەکان و ئەربابەکانیان جێ بەجێ بوو کە بۆ خۆشیان قەت چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەکرد.

هۆی هەرە گرینگی ئەم ڕووداوە تاڵ و شکستە گەورەی حکوومەتی میللی دوکتۆر موسەدیق کە لە ڕاستیدا شکستی هەموو هێزەکانی گەلی و دیموکراتیک و وڵاتپارێز بوو، بریتی بوون لە: یەک نەبوونی هێزە خەباتکارەکان و نەبوونی هاوئاهەنگیی پێویست و بەرەیەکی هاوبەشی دژی ئیمپریالیستی، بەسیجی نهێنی وەفاداران بە شا، کارکردن هەر بەم شێوەیە لە نێو ئەرتەش، هاوکاریی ڕاستەوخۆی ئەمریکا و ئینگلیس بۆ داڕشتنی گەڵاڵەی کوودیتا و دژایەتی لێبراوانەی ئەوان بەرامبەر بە دوکتۆر مصدق و حکوومەتەکەی کە بە تەواوی غافڵگیر بوون و دژکردەوەی پێویستی نیزامییان لە خۆ نیشان نەدا.

دەگەڵ ئەوەی کە لە نیشتمانپەروەریی دوکتۆر موسەدیقدا هیچ شک نییە و هەتا دوا هەناسەش هەر بیروباوەڕی خۆی پاراست و لەسەری سوور بوو، دادگاکەشی ئەم ڕاستییەی سەلماند، بەڵام ئەو لە لایەکی هومێدی بە ئەمریکا هەر هەبوو کە ڕۆژێک هاوکاریی بکا و لە لایەکی دیکەوە دەگەڵ حیزبی توودە قەت ناویان بە جۆرەکیدا نەدەڕۆیشت و پێکەوە سەری سازانیان نەبوو. جگە لەوانەش ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەم هێندێکیان بەر لە ۲۸ی گەلاوێژ باسیان لەسەر ئیحتمالی پێکهاتنی کودیتا دەکرد و بە تایبەتی ڕۆژی ۲۸ کە کوودیتاچییەکان ڕژاونە شەقامەکان،«هشدار» بە دوکتۆر موسەدق دراوە، بەڵام بەهێندی نەگرتووە، دوایمش کار لە کار ترازاوە و هیچ کەس بە دەنگیەوە نەهاتووە.

دەکرێ بڵێین ئەگەر تەنانەت لە سەعاتەکانی ئاخریشدا بەینی دوکتۆر موسەدق و حیزبی توودە هاوئاهەنگی کرابا، حیزبی توودە بە سازمانی بەهێزی نیزامیی خۆی زۆر کاری پێ دەکرا و ناوا دەستی لەسەر دەست دانەدەنا. هەرچەند دەبوو بە بێ ئەو ڕێککەوتن و هاوئاهەنگییەش بە خاتری خزمەت بە نیشتمان ئەرکی شۆڕشگێڕیی خۆی بەڕێوە بردبا.

حیزبی توودە دوای کودیتا و گیرانی دوکتۆر مصدق و هێندێک لە ئەندامانی حکوومەتەکەی، لە ژێر زەختی هێندێک لە بەرپرسانی شۆڕشگێڕدا دەستووری دا کە ئەندام و ئۆرگانەکانی لە هەموو شوێنێک لە حالی ئامادەباش دابن و گۆیا قەراریان دابوو لە ڕۆژی ۳۰ی گەلاوێژ لە هەموو شوێنێک حەرەکەتێکی پان و بەرینی نیزامی و سیاسی دژی کودیتا بکەن. ئەو ئامادەباشە لە هەموو شوێنێک کراو ماوەیەکی دوورو درێژیش

بەشێک لە شار و بەشێک لە شاخ و گوند چاوەڕوان بوون، بەڵام هیچ کات نەتەنیا فەرمانیان نەدا، بەڵکو راشیان نەگەیاندەوە کە بڕیارەکە هەڵوەشاوەتەوە و بەڕێوە ناچێ.

بۆ پاساودانی تاوانەکانی، حیزبی توودە پەرتووکێکی نزیک بە ١٥٠ لاپەڕەیان بە نێوی ٢٨ی گەلاوێژ چاپ کردبوو، سەرتاسەری کتێبەکە بۆ تەوجیهی کەم کاری و شانە خالی کردن بوو. لەوێدا بەشێکی گەورە لە تاوانەکانیان داویشتە ئەستۆی جەبهەی میللی و خۆیان دەپەراندەوە.

لە ساڵەکانی دواتر بە تایبەتی دوای ئاشکرا بوونی رێکخراوی نیزامی حیزبی توودە، زۆر شت روون بووەوە، هەر لە پاڕانەوەی دوکتۆر بهرامی و دوکتۆر یزدی ئەندامانی هەیئەتی نیجرانی بۆ بەخشینیان لە شا، دەرکەوت کە بەشێک لە رێبەرانی حیزبی توودە هەر ئیمانیان بەم چەشنە کار و تێکۆشانە نەبووە. دیارە ئەوە بەو مانایە نییە کە پیاوی زۆر فیداکار و بە ئیمانی وەک روزبە، وارتان و سیامەک و مبشری و...یان تێدا هەڵنەکەوتووە.

لە رۆژی کودیتادا لە کوردستانیش لە سەربنەمای پێوەندیی راستەوخۆی حیزبی دێموکراتی کوردستان دەگەڵ حیزبی توودە، هیچ دژکردەوەیەک لە دژی کودیتاچییەکان کە لە تاقمی بچووک بچووک دا رژابوونە نێو شەقامی شارەکان و بە قازانجی شا دروشمیان دەدا، بەرچاونەکەوتووە. شاخوازەکان لە هەموو شوێنێک بە هاسانی و بە بێ شەڕ خۆیان سەپاندەوە.

دوای کوودیتاش لەسەر ئەو دەستوورەی حیزبی توودە دابووی، بەو تاق و لۆق چەکانەی هەبوو، چ ئەوانەی لە، شارەکان بوون و، چ ئەوانەی خۆیان دەرباز کردبوو، بە شێوەیەکی نالەبار و سەرگەردان لە دێهات دەژیان و بۆ ماوەیەکی یەک مانگی لە حالی ئامادەباش و چاوەڕوانی فەرمانی دەستپێکردنی شۆڕش و راپەڕین مانەوە، بە شێوەیەکی خۆش باوەڕانە لە زۆر شوێن و یەک لەوان لە مەهاباد، ئەفرادی بەرپرسی دوژمن و جێگا و رێگاشیان شناسایی کردبوو، بەڵام بە داخەوە ئەو فەرمانە وەک باس کرا قەت نەدرا و، کردەوەیەک لەم بابەتە نەبیندرا.

کوودیتاچییەکان کە لە سەرکەوتنی خۆیان خاترجەم بوون، لە تەواوی وڵات حکوومەتی نیزامییان دامەزراند. لە تاران فەرمانداری نیزامی کە دوایی بوو بە ساواک دامەزرا. بە دوای گەڕانەوەی شا بۆ تاران، زەختێکی زۆر و هەمە لایەنە کەوتە سەر خەڵک، لە هەموو

شوێنی ئێران، بەرپرسان و ئەندامانی ناسراوی حیزبی توودە و جەبهەی میللی گیران و لە دادگاکانی ئیزامی حوکم دران، لە زۆر شوێن ڕەشبگیریش هەبوو، زۆرجار تا کابرای گیراویان دەگەیاندە بنکەکانی حکوومەتی، کەوڵیان لە حاجەت دەخست و بە لێدان شپڕزەیان دەکرد. دوکتور فاتیمی ڕۆژنامەنووس و وەزیری دەرەوەی کابینەی دوکتور موسەدیق، هەر لەبەر شۆڕشگێڕ بوون و نووسین لەسەر بنەماڵەی شا لە ڕۆژنامەی«باختەر امروز»دا، بێ موحاکەمە ئیعدام کرا. کەریمپوور شیرازی، سەرنووسەری ڕۆژنامەی«بەسوی آیندە» لە لەشکری ٢ی زرێهی تاران بێ موحاکەمە بە دوای بێ حورمەتییەکی زۆر بە زیندوویی ناوری تێبەر درا، وارتان سالاخانیان، لە پشت ماشینی جێب خراو ئەوەندە ڕەکێش کرا تا لەت و پار بوو وگیانی دا.

لە کوردستانیش ئەم بگرە و بەردە زۆر بەربڵاو بوو، بەڵام بەشێکی بەرچاویش لە کادر و ئەندامانی حیزب لە شارەکان دەرچوون، بۆ ماوەیەکی چەند مانگی بە نهێنی لە دێهات دەژیان یا لە شاردا خۆیان حەشاردابوو. زۆر لە گیراوەکان موحاکەمە کران، یەک لەوان حسێن فروهەر بوو کە بە حەبسی ئەبەد مەحکووم کرابوو، پاش پازدە ساڵ مانەوە لە بەندیخانەکان و تەبعیدگاکانی وەک خارک و برازجان بە نەخۆشی بەریان دا و دوای بەربوونیش لەبەر ئەوەی نەخۆشیی سیلی گرتبوو، چەندساڵێک زیاتر نەژیا و فەوتی کرد. لەو چەند مانگەی دوای کوودیتادا بەندیی حیزب ئەوەندە زۆربوون کە توانای بێ ڕاگەیشتنی بنەماڵەکانیان نەبوو. لە لایەن جەلیل گادانییەوە کە دوای کوودیتا ببووە بەرپرسی ڕێکخراوی مەهاباد و رابتی شارەکانی دی، بۆ چارەسەری مەسەلەکە بە شێوەیەکی تەواو نهێنی لە حاجی سەید عبداللە ئەفەندی(گیلانی زادە) تکا کرابوو هێندێک بۆ خەڵک قسە بکاو لە بەرپرسانیش داوای ئازادیی بەندییەکان بکا. قبووڵی فەرموو، خەڵکێکی یەگجار زۆر لە ژوور و حەوشی خانەقای ئەمری و مزگەوتی عەباس ئاغا کۆبوونەوە و کارەکە ئەنجام درا و کەلکی باشی بوو.(*)

پاش چەند مانگ بە واسیتەکارییەوە بەشێکیان هاتنەوە و کاریان بە کوردایەتی و

(*) ئەم وتارەی حاجی سەید عەبدوڵلا خوێندیەوە و باقی قسەکانیشی لەم مایەدا تەنزیم کردبوو، لەسەر پێشنیاری بەرپرسی ئەو کاتی حیزب لە مەهاباد و خوالێخۆشبوو میرزا حەسەن داودی نووسیبووی. شێخ لە قسەکانیدا سەرداری ئەوەی بەرپرسانی هەرە بەرزی مەهاباد وەک سەر لەشکر موقبلی و...ی لێ بوو، ئێوی شای بە سەر زاریدا نەهات. داواکەشی بە گشتی بۆ بەردانی خەڵک لە بەرپرسان بوو، بێ ئەوەی ئێوی کەسێک بێنێ.

سیاسەت ئەما و خەریکی ژیانی خۆیان بوون. هێندێکیش بە شێوەی نهێنی درێژەیان بە تێکۆشان لە شار دایەوە. بەشێکیش لە ئاوارەکان لەسەر بڕیاری حیزب لە گوندەکان مانەوە و لە ناوچە جۆراوجۆرەکاندا دەستیان بە کاری ڕێکخراوەیی و ڕێکخستن یا ڕێکخستنەوەی جووتیاران و گوندییەکان کردەوە.(*)

لە ماوەیەکی کەمدا بە شێوەیەکی تەواو نهێنی بە وازهێنان و وەلانانی ئەفرادی بێ باوەڕ و بێ ئیمان و دانانی بەرپرسانی تازە لە ئەندامان و لاوانی تاقی کراوە، کۆمیتەی شارەکان تەرمیم کرانەوە، هەروەک پێشوو لە لایەن ناوەندی حیزبەوە کە هەر مەهاباد بوو، بە شێوەی تەواو نهێنی ڕێنوێنی دەکران.

هەرچەند ئەم کوودیتایە زیانی زۆری بۆ حیزب هەبوو و بە گشتی جووڵانەوەی دێموکراتخوازانەی لە هەموو ئێران وەدواخست، بەڵام باری ڕێکخراوەیی پاکتر و جیددی تر ساخ کردەوە. وردە وردە ئەفرادی هەڵپەرست لەبەر ترس و مەسڵەحەت پارێزی وەلا کەوتن.

لە لایەک بە پێی ئەوەی لە قەدیمەوە گوتوویانە: «کەس ڕەفیقی تێ شکاو نییە»، لە لایەکی ترەوە بە حەق و بەهۆی ئەوەی حیزبی توودە سەرەڕای هەموو توانایییەکی کە هەیبوو، لە ڕۆژی ڕەشی ۲۸ی گەلاوێژدا تەکانی نەخوارد، دوایەش بە پێچەوانەی قەول و قەراری خۆی بۆ دەست پێکردنی کاری چەکداری و کردەوەی دژی کوودیتا چکۆلەترین ئیقدامی نەکرد، بە تایبەتی لەبەر خۆ لاواز نیشاندان و تەسلیم بوون و پاڕانەوەی بەشێک لە بەرپرسانیان لە شا، بە لەبەر چاوگرتنی قەباحەتی ئەو داوایە و بڵاوبوونەوەیان لە ڕۆژنامەکاندا، سومعەی زۆر هاتبووە خوارێ، ئەندام و لایەنگرانی زۆری لێ ناڕازی کردبوون.

ئەم ناڕەزایەتییە لەسەر ئەندامانی حیزبی دێموکراتیش کاریگەر بوو، بە تایبەتی دوای ئاشکرا بوونی یەک لە دوای یەکی ئۆرگانەکانی حزبی توودە و ڕێکخراوی چەند سەد کەسیی تەواو نهێنی ئەفسەران کە لە پارێزەری تایبەتی شا سەرگورد خێرخوا و ئاجوودانی تایبەتیی شا، سەرهەنگ جاوید و فولاد دژ جێگری فەرمانداری نیزامیی تاران، سەرهەنگ فضل‌اللهی بەرپرسی دادگا و دادستانی ئەرتەشەوە بگرە هەتا هەموو

(*) لە ساڵی ۳۲دا بە دوای شکانی ڕاپەڕینی وەرزێرانی موکریان، کۆمیتەیەکی تایبەت بۆ بەڕێوەبردنی کاری جووتیاران و ڕێکخستنیان دامەزرابوو و زۆریش سەرکەوتوو بوو.

ئۆرگانەکانی نیزامی، ژاندارمری، پیادە، هێزی هەوایی، هێزی دەریایی، زانستگەی ئەفسەری و ...ی تێدابوون و ئەو ڕێکخراوە وەک بڕبڕەی پشتی حیزبی توودە بوو وجگە لە تاقمێکی کەم کە لە ئاشکرا بووندا سەربەخۆ دەرباز بوون، باقی هەموو گیران و بە قەولی هێندێک لەو ئەفسەرانە«بە باڵی بەستراو» تەحویلی شا و دارودەستەکەی دران.

بیست و حەوت کەس لە باشترینیان ئیعدام کردن و باقی ئەوانیش بە بەندیی درێژماوە مەحکووم کران و هێندێک لەوان تا کاتی ڕاپەڕینی گەلان لە ساڵی ٥٧دا هەر لە بەندیخانەدا بوون و بە سەربەرزی و ئیمانەوە دەژیان.

دوای ئەم وەزعە ناڕەزایەتییەکە زیاتر تەشەنەی کرد، پۆل پۆل ئەندامەکانیان لێ دەتەکانەوە، لە حیزبی دێموکراتیش دا مەسەلەکە زۆر بە ئاشکرایی هاتبووە بەرباس.

کۆمیتەی کاک واتە کۆمیتەی هاوکاریی ئازەربایجان و کوردستان لەگەڵ حیزبی توودە کە لە ساڵی ٣١ی هەتاوی پێکهاتبوو، کەوتە مەترسیی دەست بەسەرداگیرانی، هەر بۆیە کۆکرایەوە و هەر کەس لە ڕێکخراوی خۆیدا کاری دەکرد. پێویست بە وەبیرهێنانەوەیە کە نوێنەری کوردستان لەم کۆمیتەدا ماوەیەک کاک صارم الدین صادق وەزیری بووە، دوایش کاک ڕەحمان قاسملوو کە لەو پێوەندییەدا چۆتە تەورێز و تا ماوەیەک لەوێ تێکۆشانی هەبووە.

دوای کوودیتا هێندێک لە کادرەکانی بەڕێوەبەریی حیزب لە تەورێز مانەوە و بۆ هێندێک کاری پێویست لە چاپخانەی فیرقەی ئازەربایجان کەڵکیان وەردەگرت و تەنانەت شەش ژمارەش لە دەورەی دووهەمی ڕۆژنامەی«کوردستان» لەوێ چاپ کرا و بۆ بڵاوکردنەوە لە نێو شارەکان و بەڕێ کردن بۆ کوردستانی عێراق گەیشتە مەهاباد، کە لەو هەلومەرجە دژوارەدا زۆر بەجێ بوو و ببووە هۆی دڵگەرمیی کادر و پێشمەرگەکان. بە داخەوە دوای ئاشکرابوون و گیرانی چاپخانەکە، ئەویش وشکایی هات.

تێکۆشانی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە شار و گوندەکان درێژەی هەبوو. کاری ڕێکخراوەیی لە بەندیخانەکانی مەهاباد و ورمێشدا کە ئەندامانی حیزبی زۆر تێدا بوو، درێژەی هەبوو.

لەو سەردەمەدا کاک ڕەحمان قاسملوو و، سێ کادری حیزبی توودە کە بە خۆشییەوە هەرسێک کورد بوون، بە ناوەکانی بەهرامی(بێهنام)، شەهلایی(پیرۆت) و جەواد(حسێن) لەگەڵ جەلیل گادانی و دوایش کاک کەریم حیسامی کە بە وەزعێکی

شپرزه لەگەڵ نەفەرێکی دیکە بە ناوی عەوڵڵا بارزانی کە ئێستاش ناوی راستی بۆ نووسەری ئەم دێرانە ئاشکرا نەبوو، لە شاری مەهاباد بە دڵگەرمییەکی زۆرەوە خەریکی بەڕێوەبردنی کارەکان بوون. بۆ هەر موناسەبەتێک ئیعلامیە دەنووسراو و بڵاو دەکرایەوە.

باقی هاوڕێیانیش هەر کام لە شوێنێک هەوڵیان دەدا. گەرچی هێندێک لە بەندییەکانی دوای کوودیتا بەر بیوون، بەڵام وەزعەکە زۆر نالەبار بوو، هەر رۆژە بە بیانوویەک و لە شوێنێک خەڵکیان دەگرت. قوتابیان و لاوان زۆجار لەسەر کلاسی دەرس پەلامار دەدران و دەگیران و لە بەندیخانە دەهاوێژران و جاری وابوو بە مانگ لێیان نەدەپرسین، ئەشکەنجە و لێدانیش دەوری خۆی هەبوو. هێندێک کەس وەک خوالێخۆشبوو مەحمود خوسرەوی چەند جاریش داغ کران.

وەک لە جێگای خۆیدا باسی دەکەین، مەسەلەی نەوت بە دڵی ئەمریکا و ئینگلیس جێ بەجێ بوو، ڕێژیم داهاتێکی زۆری هەبوو، بە خۆڕایی و بە قەرز و زۆرجار یارمەتیی بەرچاویان دەکرد. بەشێک لەم ئیمکاناتە خەرجی کاری پۆلیسی و زیندانەکان دەکرا، تەنگ و چەڵەمە زۆر بیوو، هەر کەس ئاشکرا با، مانەوەی لە شار نەدەکرا، غەریب بگیریش دەستی پێ کردبوو. بۆیە تا ئاخرییەکانی ساڵی ٣٣ مەیدانی کار لە شارەکان بە تەواوی بەرتەنگ بیووەوە، ناعیلاج کادرەکان زیاتر لەوەش بڵاوبوون، کاک عەزیز یوسفی و سەید عبداللە ئیسحاقیش کە لەورمێ دەبوون، راو نران. کادرەکانی حیزبی توودەمان- بۆ ئەوەی باشتر بپارێزرێن- ناردە دێهاتیش، بەڵام نەیانتوانی بمێننەوە، هەرچەند ناوی کوردی لای خۆمانیان لێ نرابوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کوردییان باش نەدەزانی و مەترسیی گرتنیان هەبوو، خۆیان بۆ را نەگیرا و گەڕانەوە بۆ تاران.

لەو بەینەدا جەلیل گادانی دوای یەک دوو جار گیران، زۆر جار هەرە شەشی لێ دەکرا نەیتوانی لە شار بمێنێتەوە و بە دەستووری حیزب مەهابادی بەجێهێشت و بوو بە کادری تەواو وەخت و لە دێهات مایەوە. کاک کەریم حیسامی یا کەوتبووە بەندیخانە، یا بەهۆی گرفتاریی زۆری کە لە بابەت بنەماڵەیەوە بۆی هاتبووە پێش، لە مەهاباد نەمابوو. بەینێکیش لە قارنجەی چۆمی مەجیدخان دەژیا و کاریشی دەکرد. عەولا بارزانی کە پرەنسیپی حیزبی ژێر پێ نابوو، لە ترسی سزای حیزبی هەڵاتبووە تاران.

کاک غەنی بلوریان کە لە تەورێز ترازا، هاتەوە کوردستان، بۆ پێوەندی گرتن دەگەڵ حیزبەکانی کوردستانی عێراق و شەخسییەتەکان، گەرمێن و کوێستانی دەکرد و جارجار

هێندێک له تەمرەکانی ئارمی کۆماریشی لەگەڵ خۆی دەبرد و بۆ خەرجی حیزب وردی دەکردەوە. جارجاریش سەفەرێکی سەقز و سنەی دەکرد تا پێوەندییەکە نەپساوە راگرێ.

لە وەزعێکی ئاوادا کە ئاڵ و گۆڕی زۆری سیاسی لە ئێران هاتبووە گۆڕێ، وەزعی حیزب بە تایبەتی لە شارەکاندا بەهۆی گیرانی ئەندامان و بڵاوبوونی کادرەکان تووشی کەندوکۆسپ هاتبوو، چوارچێوەی کاری کادرەکان بە تەواوی روون نەبوو، کاری رێکخراوەیی دیهاتیشمان بەهۆی پەرەسەندنی کۆنەپەرستی و بووژانەوەی هێزی دەرەبەگایەتی، ئاوەڵابوونی دەستی ژاندارم کە ملوزمی گوندییان بوون لەبەر سیخوڕیی بەشێک لە ئاغا و کوێخاکان هێندێک شل و شەوێق بوو. لەوانەش گرینگتر داخوازی زۆربەی کادر و ئەندامان لەسەر پێویستی برینی هاتوچۆ دەگەڵ حیزبی توودە کە بیووە باسی رۆژانەی نێو کارگێرانی حیزب و هێندێکیش ئەو بۆچوونەیان بە تاوان دادەنا، چاپەمەنی و کەرەستەی پێویست هەر نەبوو، زۆر پێویست بوو کۆنفراس یا کۆبوونەوەیەکی بەرین بگیرێ و لەسەر ئەو مەسەلە و گیروگرفتانە بڕیار بدا.

بۆ ئەم مەبەستە، کۆکردنەوەی هاوڕێیان کە هەرکامەی لە ناوچەیەک یا لە سەفەر بوون، زۆر هاسان نەبوو، جێگایەکی ئەوتۆش کە ئەفەراتێکی زۆری لێ خڕ بێتەوە، لەو هەلومەرجە پۆلیسییەدا هاسان نەبوو. لە لایەکی دیکەشەوە دەبوو بۆ دانی بڕیار لە پێوندی لەگەڵ حیزبی توودەشدا هەوڵ بۆ کۆکردنەوەی بەڵگە و دەلیل بدرێ.

بۆ ئەم مەسەلە چەند هاوڕێ بە تایبەتی کاک عەزیز یوسفی زۆریان زەحمەت کێشاو جوزوەیەکی پڕ لە بەڵگەی باشیان بە نرخی تێکۆشانی چەند مانگە و هاتوچۆ بۆ شوێنەکانی وەک تاران و تەورێز و وەدەست هێنانی بەڵگەنامەکانی حیزبی توودە و جەبهەی میللی و رۆژنامەکانی جۆراوجۆر ئامادە کرد و خستیانە بەر ئەزەری هاوڕێیان.

بەختەوەرانە زەمینەی گرتنی ئەو کارە گرینگە رەخسا، لە هاوینی ۱۳۳٤دا، بە هاوکاریی بێ دریغی کاک سەید رەسووڵ دێهقان کە یەک دوو ساڵ پێشتر ببووە ئەندامی حیزب، لە کێوی قەڵا تەرەشی پشتی گوندی سەید ئاوای بابی گەورە لە ناوچەی پیرانشار بە بەشداریی پازدە- بیست کەس کۆنفرانسی یەکەم پێک دێ. بە پێی ئەو یاداشتە کورتەی لە شەهید سەید رەسووڵ بەجێ ماوە، لە بەشداران ئەو چەند کەسەی ژێرەوە بۆ ئەو ناسراون:

١- کاک رەحمان قاسملوو بە نێوی نهێنی حەسەن
٢- کاک ئەسعەدی خودایاری بە نێوی نهێنی مەلا عەلی
٣- سەید عبداللە اسحاقی
٤- کاک عەزیز یوسفی و...

لەم کۆنفرانسەدا کە سەید رەسووڵ بە کۆبوونەوەی نێو دەبا ، هێندێک بڕیاری گرینگ دەدرێ:

١- گەلاڵەی پێشنیاری و نوێی بەرنامەی حیزب پەسەند دەکرێ و بۆ یەکەم جار وشەی ئێران لە ناوی حیزب زیاد دەکرێ و دەبێتە حیزبی دیموکراتی کوردستان- ئێران.
٢- چەند کەس لە بەشدارانی کۆنفرانس و چەندی غایب وەک ئەندامی رێبەری دیاری دەکرێن و کارەکانی حیزبی بە نێو خۆیان و کادرەکاندا دابەش دەکەن.
٣- بڕیار درا لەو کات ڕا پێوەندیی راستەوخۆ، بە شێوەی پێشوو بە حیزبی توودەوە نەمێنێ.

- لەبەر ئەوەی جوزوەی باس کراوکە لەسەر حیزبی توودە نووسرابوو، بە دەستەوە نییە بە پێویست دەزانین هێندێک لەو خاڵە سەرەکییانەی بوون بە بەڵگە بۆ دەست هەڵگرتن لە حیزبی توودە، بۆ زانیاریی خوێنەرانی بەرێز بنووسین:

١- باس کردنی زیاتر لە پێویست لەسەر مەسەلەی نەوتی شیمال بە قازانجی سۆڤیەت و لەبیربردنەوەی مەسڵەحەتی گشتی لەم پێوەندییەدا.
٢- هاوکاری نەکردنی پێویست لەگەڵ حکوومەتی دوکتور موسەدیق و دژایەتیی کردنی زیانبار لەگەڵ ئەوان و پەشیمان بوونەوەی دوایی.
٣- ئەنجام نەدانی هیچ حەرەکەتێکی پێویست لە کاتی کوودیتای ٢٨ی گەلاوێژ بەدژی دوکتور موسەدیق و حکوومەتەکەی کە هەلێکی باش بوو بۆ گەلانی ئێران رەخسا بوو.
٤- لەگەڵ ئەوەی دەیانتوانی لە رێگەی مۆرە گرینگەکانی حیزبی بە تایبەتی ئەفسەرەکان زۆر کار بە دژی شا بکەن قەت هیچیان نەکرد.
٥- بە خاتری وەرگرتنی ئیمتیاز و بەشدارییان لە پەرلەمان و کابینەی دەورەی قەوام هیچ کارێکیان بۆ ئازەربایجان و کوردستان نەکردووە و هەستی شوونیستی بەرچاوی گرتبوون.
٦- دوای کوودیتای ٢٨ی گەلاوێژ پێشگرییان لەو کەس و ئەفسەرانە کردووە کە

ویستوویانە دەست بە کار بن و نموونەی زیندووش زۆرن.
٧- پاش دانی قەرار بۆ ئیقدام و دانی وەعدەی هەستانی ٣٠ی گەلاوێژ، زۆر کەسیشیان خڕ کردەوە، چەند رۆژیش رایانگرتن، بەڵام هەروا بێ هیچ تەوجیهێک بڵاوەیان پێ کردن.
٨- کە فولادڎژ خەبەر لە زەبوون بوونی سەروان عەباسی دەدا، هیچ ئیقدامێک ناکرێ. فولاد دژ بە بێ دەستوور لەسەر بڕوای خۆی لە فەرمانداریی ئیزامیی تارانەوە هەڵدێ و لیستەی شەبەکەی دەرەجەداراانیش کە ئێستا کەشف نەکرابوو، لەگەڵ خۆی دەبا. کە دەست دەکەن بە گرتنی ئەفسەرەکان، هێندێک دەڕۆن و دەرباز دەبن، بەڵام بەرپرسانی حیزبی توودە بە قسەی پڕوپووچ پێش لە رۆیشتنی زۆر لەوانی دیکە دەگرن.
٩- بە دوای دەستگیرکرانی ئەفراد دوای ٢٨ی گەلاوێژ دەستوور بە ئەندامان و لایەنگرانیان دەدەن بۆ دەرچوون لە بەندیخانە، تۆبە بکەن و پەشیمان نامە بنووسن، کە هەمووی ئەوانە لە رۆژنامەکانی ئیتلاعات و کەیهانیش چاپ کران. ئەو کارە گەیشتە جێگایەک کە ئەندامانی هەرە بەرزی رێبەرایەتی وەک دوکتۆر بەهرامی و دوکتۆر یەزدی و شاندرمنی داوای لێبووردن دەکەن. یا لە لایەن قورەیشییەوە کتێبی«سیر کمونیزم در ایران» بۆ تیمسار تەیموری بەختیار دەنووسرێ.
لە گەلاڵەی پەسەند کراوی بەرنامەی حیزبدا، ڕەنگدانەوەی بۆچوونی دژی ئیمپریالیستی لە بواری سیاسەتی جیهانی، دژایەتیی دەگەڵ رێژیمی شایەتی بەزەقی هەروەها دژایەتی دەگەڵ دەرەبەگایەتی وەک پشتیوانی رێژیمی سەڵتەنەتی باس کرابوو، لە مافی چەوساوە و زەحمەتکێشانی شار و دێ بەگشتی و ستەمی ئاغاکان لە جووتیاران دوابوو. سیستەمی کۆماری بۆ وڵات داوا کرابوو، ئیشارە بەوەش کرابوو کە یەکێک لە جێگرەکانی سەرکۆمار دەبێ کورد بێ.
پێویستیی هاوکاری لەگەڵ گەلانی دیکەی ئێران و هەروەها پشتیوانی لە مافی کورد لە بەشەکانی دیکەی کوردستان هاتبووە گۆڕێ.
ئەندامانی رێبەرایەتی کاتیی دیاری کراو، کاک رەحمان قاسملوو، کاک غەنی بلووریان، کاک عەزیز یوسفی، کاک رەحمەتوڵڵا شەریعەتی خەڵکی سنە و سەید عبدالله اسحاقی بوون. دوکتۆر عەلی مەولەویش وەک مشاور هەڵبژێردرا بوو.
کارەکانیش بەم چەشنە بەش کرابوون:

١- کاک رەحمان بەرپرسی گشتی و پێوەندیی نێوخۆ و دەرەوە
٢- کاک غەنی بۆ ناوچەی جنووب بە تایبەتی سنە
٣- کاک عەزیز بۆ ناوچەی ورمێ و شیمال و کاری چاپەمەنی
٤- کاک رەحمەت بۆ جنووب و سنە دەگەڵ کاک غەنی
٥- سەید عبدالله اسحاقی بۆ مەهاباد و دەوروبەر
٦- دوکتۆر مەولەوی لە پێشدا بۆ سەقز و دوایە بۆ تاران

بە لەبەرچاو گرتنی گرینگیی کاری تەشکیلاتی کە بە تایبەتی لە هەلومەرجی سەخت و نهێنیی دا زۆری تەئکید لەسەر کرابوو، باقی کادرەکانیش لە شوێنەکانی دیکەی شار و دێهات بە چەشنی خوارەوە کاریان پێ ئەسپێردرا بوو.

کاک سلێمان موعینی کە بەینێک لە قزل قەڵا گیراو دوایە بەربوو، لەگەڵ کاک هاشم حسێن زادە و یوسف ریزوانی، هەروەها کاک کەریم حیسامی دوای ئازاد بوونی لە بەندیخانە لە مەهاباد تێدەکۆشان.

جەلیل گادانی، ئەسعەد خودایاری، هاشم (اقل الطلاب) ناسراو بە قادر شەریف، حەمەدەمین راتبی بە شێوەی سەییار لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی دێهات دەبوون و جارجار ناڵ و گۆڕیش دەکران. بە پێی ئەم بەرنامە کارەکان بە باشی دەچوونە پێش، رێکخراوی شارەکان بووژێندرانەوە، لە ماوەی یەک- دوو ساڵدا کۆمیتەی کارامەش بۆ ناوچەکان پێک هاتبوو.

کۆمیتەیەکی زۆر بەرین لە ناوچەکانی پیرانشار و مەنگوڕایەتی بە تێکڕا و بەشێک لە دێهاتی دەوروبەری نەغەدە و مەهاباد بە نێوی«بلباس» پێک هاتبوو کە زۆر بە هەڵسوور بوون و تێکۆشانی بەرچاویان هەبوو. ئەو کۆمیتە لە هێندێک لە کادرەکان و چەند ئەندامی دڵسۆز و ئەمەگناسی حیزبی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کۆمیتەی بلباس پێک هاتبوو.

یەک- دوو ساڵ دواتر چەند کەسێکی دیکەش وەک محەممەد بەحرولعلوم، قاسم سوڵتانیان هاشم جەلالی و ئیسماعیل قاسملوو کە لە شوێنی تایبەتیدا نێوی دێتەوە گۆڕێ، هاتنە ریزی کادرایەتی و زۆریش زەحمەتکێش بوون.

گومان لەوەدا نییە کە دوای ئەو کۆنفرانسە و بەڕێوەچوونی بڕیارەکان بۆ ماوەیەک کارەکان بە باشی و رێک و پێکی چوونە پێش و پێوەندییەکی نیسبیی باش لە بەینی

ئۆرگانەکان و کادرەکان و ناوچەکان پەیدا بوو. بەڵام رێژیمیش کە لە هەموو شوێنێک بە تایبەتی لە تاران و شارە گەورەکان، بەندیخانەکانی بە مانای راستەقینەی وشە لە ئازادیخوازان و نیشتمانپەروەران ئاخنیبوو، رۆژ لەگەڵ رۆژ هارتر دەجووڵاوە و جێ پێی خۆی قایمتر دەکرد. هەر بەم پێوەندە لە کوردستانیش بوونی تێکۆشان و هەوڵدانی چالاکانەی حیزبی بۆ تەحەممول نەدەکرا.

## بەشی دووهەم

# پەلاماری سلواک بۆ سەر تەشکیلاتی حیزب

لەم چەند ساڵەدا هێندێک رووداوی گرینگ لە نێو رێژیم و لە پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی خاوەن دەسەڵات و ناڵ و گۆڕی نێو خۆیی روویان داوە کە پێویستە بە کورتی نیشارەیان پێ بکرێ:

ئەمریکا کە دیتی حکوومەتیی دوکتور موسەدیق بەم هاسانییە و بە کوودیتایەکی کارتۆنی رووخا و شا بە دەسەڵاتی تەواوەوە هاتەوە سەر حوکم، بە پێچەوانەی داخستنی هەموو دەرگایەکی یارمەتی لە حکوومەتی میللی دوکتور موسەدیق دەستی بە یارمەتی کردن بە حکوومەتی زاهیدی کرد، بێجگە لە یارمەتیی راستەوخۆی ئەمریکا کە جارێکیان ۲۳/٤۰۰/۰۰۰ دۆلار بەناو یارمەتیی فەننی لە سێی سیپتامبری ۱۹٥٤ و رۆژی دواتر بە ئەمری ایزنهاور ٤٥ میلیۆن دۆلاریان بە خۆڕایی دا بە رێژیمی کوودیتا. دووجاریش لە بانکی جیهانی قەرزی بۆ شا وەرگرت، جاری یەکەم مەبلەغی ۷۲ میلیۆن و جاری دووهەم ٤۲ میلیون دۆلار.

شا مەسەلەی نەوتەکەی لە قەرارداتێکدا بە نێوی کۆنسێرسیۆم حەل کرد. دوای رێککەوتن لەگەڵ نەربابەکانی، رۆژی ۱۳۳۲/۷/٥ لایحەی کۆنسێرسیۆم بە پەسەندکردنی رواڵەتی لە لایەن دوکتور ئەمینی وەزیری دارایی برایە مەجلیس.

لەم گەلاڵەدا پێنج شەریکەی گەورەی ئەمریکایی ٤۰٪، شەریکەی کۆنی نەوتی ئیران و ئینگلیس ٤۰٪، شەریکەی داچ شل ۱٤٪ و شەریکەی نەوتی فەرانسە ٦٪یان پێ دەبڕا.

ئەو غەرامەتەی ئێران دەبوو بە شەریکەی نەوتی بێ دەسەڵات کراوی پێشووی بدا،

١٤٧ میلیۆن لیرەی ئینگلیس بووە. جگە لەوە، ٦٠٠ میلیۆن دۆلاریشی لە لایەن کۆنسێرسیۆمەوە پێ دەدرا.

هەروەک دوکتۆر موسەدیق لە بەندیخانەدا نووسی، ئەم قەرارە بە پێچەوانەی هەموو ماددە قانوونییەکانی پێشتری میللیکردنی نەوت بوو و سەربەخۆیی ئێرانی دەخستە ژێر پرسیارەوە.

زۆر لە هێزەکانیش بە دەم و بە نووسین دەنگی ناڕەزایی خۆیان دەربڕی، بەڵام هەزار هاوار بە پووڵێک بوو. لە ڕێژیمی کوودیتادا کەس گوێی بەم قسانە نەدەبزووت.

شاش هەروەک بۆخۆی نووسیویەتی پێی وابوو شاکاری کردووە، ایزنهاوری سەرۆک کۆماری ئەمریکا و چرچیلیش دوای تەواو بوونی مەسەلەکە بە سوودی خۆیان بۆ ئەم شاکارە سوپاسیان لێکردووە.

زاهیدیش لە کۆبوونەوەی هاوبەشی مەجلیسەکانی شۆرا و سەنادا گوتبووی: «ئێمە بە بەستنی ئەم قەراردادە کلاومان لەسەر ئەمریکا و ئینگلیس داناوە، چونکە تا حەوت هەشت ساڵی دیکە هێزی ئەتۆم جێگای نەوت و باقی سووتەمەنییەکان دەگرێتەوە و نەوت هیچ بایەخی نامێنێ. دوای دە ساڵ هەرچی لە کۆنسێرسیۆمی وەرگرین وەک دیتنەوە وایە!!»

ئەم قەراردادە بێ وەبەرچاوگرتنی هات و هاواری زۆر حیزب و ڕێکخراو لە ڕۆژی ٧/٢٩ لە شۆرا و ڕۆژی ٨/٦ لە سەنا پەسەند کرا. بە حەل بوونی مەسەلەی نەوت بەم شێوە و دڵنیایی زیاتری ئینگلیس و بە تایبەت ئەمریکا، ڕژانی چەک و کەرەستەی نیزامی هەر لە فڕۆکەوە بگرە، تا ئەنواعی چەکی مودێرن و قورس و سووک، بە کڕین و نرخی گران و جارجاریش بۆ شاردنەوەی هێندێک شت بە خۆڕایی دەستی پێکرد.

سپەهبود زاهیدی کە بەسەر خستنی گەلاڵەی کوودیتای ٢٨ی گەلاوێژ و گێڕانەوەی شا بە هاوکاریی ئەمریکا و ئینگلیس ناوی دەرکردبوو، لەم ماوەشدا کە سەرۆک وەزیر بوو، بایەخێکی زیاتر لە جارانی بە ژیانی ئەرتەشییەکان و کارگێڕانی ئەرتەشی شاهەنشاهی دابوو، تارادەیەک لە نێویاندا خۆشەویستی وەدەست هێنابوو و، لە چەسپاندنی قەراردادی کۆنسێرسیۆم و حەل کردنەکەی بە کەیفی ئەمریکا و دوان لەسەر لایحەکەی نەوت لە مەجلیسدا قسەی سەیری کردبوو، وەجێکی باشی لە ڕوانگەی ئەوانیشەوە پەیدا کردبوو.

بۆیەش شا بە توندی لێی دڕدۆنگ ببوو، لە بەهاری ١٣٣٤دا لە سەرۆک وەزیریی لابرد و حسێن عەلای بێ دەسەلات و پیاوی لەمێژینەی دەرباری لە جێگە دانا. هەر لەو ساڵەدا ئێران چووە نێو پەیمانی بەغداوە[*] کە بەشێک لە پەیماننامەکە راستەوخۆ وەک پەیمانی سەعد ئاباد دژی کورد و بۆ پێشگیری لە سەرهەڵدانی خەبات بوو. رێژیمی شاش کە هەڵوێستێکی وای گرتبوو، دەبوو سەرنجی زیاتر بۆ نەهێشتنی کاروتێکۆشان لە کوردستان بدا. هەروەها شا سەفەری یەکەمی خۆی بۆ مۆسکۆ کرد، لەوێ زۆری قەدر گیرا، لە سەر داوای ئەوان لە درێژەدانی ئێعدامی ئەفسەرە گیراوەکانی حیزبی توودە خۆی پاراست. لە بەرامبەردا یازدە تۆن زێری ئێرانی کە لە مێژ بوو، راگیرابوو و چەند جار دوکتۆر موسەدیق داوای کرد نەیانداوە، دراوە بە شا.

ئەو سەفەرەی شا بوو کە بناغەی کاری دیپلوماسی و بازرگانیی داهاتووی لەگەڵ سۆڤیەت دامەزراند و بۆ دواڕۆژی شا سەبارەت بە دامەزرانی کارخانەی توانەوەی ئاسن لە ئیسفەهان و... وەزعی شای لەبارتر کرد و و یارمەتیی باشی بە درێژ بوونەوەی تەمەنی رێژیمەکەی کرد، بەڵام لەگەڵ قازانجی ئەمریکا و نێوەڕۆکی پەیمانی بەغدا یەکتریان نەدەگرتەوە.

پێوەندیی رێژیم لەگەڵ تورکیەش باش ببووەوە، جەلال بایاری سەرکۆماریش سەفەری ئێرانی کرد و چەند قەراردادێکیان مۆر کرد.

لە دەورەی سەرۆک وەزیری حسێن عەلادا، رێکخراوی بن ئاژۆی«اخوان المسلمین» و ئەم شێوازە بۆچوونە پەرەی ساندبوو کە بڕواشیان بە تیرۆر هەبوو.

هەر ئەوانە لە مزگەوتی شای تاران تیرئەندازییان لە حسێن عەلا کرد. لەسەر ئەو رووداوە هێندێک لە رێبەرانیان گیران. نواب صفوی و سێ کەس لە هاوبیرانی ئیعدام کران.

پاش دوو ساڵ حسێن عەلاش لەبەر چاوی شا رەش بوو، لە خاکەلێوەی ١٣٣٦ دوکتور منوچهراقبال لە جێگای ئەو کرا بە سەرۆک وەزیر. ئیقبال خۆی زۆرجار گوتبووی کە ناویش بێ ئیزنی شا ناخواتەوە.

لەم دەورەدا بوو کە ترسناکترین دەزگای سەرکوتی ئێران بە درێژایی تەمەنی بنەماڵەی پەهلەوی، واتە«ساواک» یا بە رواڵەت «سازمان امنیت و اطلاعات کشور» بە هاوکاریی

---

(*) پەیمانی بەغدا لە ساڵی ١٩٥٥ لە نێوان تورکیە، عێراق، بریتانیا، ئێران و پاکستان بەسترا. دوایە ئەمریکاش وەک چاودێر هاتە نێوی.

ئەمریکا و ئیسرائیل و بەرپرسایەتیی تەیموری بەختیار دامەزرا. ئەم بنکە سەیر و سەممەرەیە کە لە هەشت بەش پێکهاتبوو، هەر بەشەش کاری خۆی و تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، زۆر زوو شکڵی گرت و لە تەواوی ئێران لقی کردەوە. ساواک بە کارە پڕ لە شەرم و شوورەییەکانی و کارنامە رەش و پڕ لە جینایەتەکەیەوە هەرگیز لە بیر خەڵک ناچێتەوە.

لە زەمانی سەرۆک وەزیریی دوکتۆر ئیقبال دا زۆر کاری دیکە کراون کە رەنگە مەجال هەبێ لە شوێنێکی دیکە بیهێنینەوە بەرباس.

هەمووی ئەو زەخت و فشار و کوشت و برە، نەیتوانی خەڵک و هێزە وڵاتپارێزەکان بۆ هەمیشە بێ دەنگ و سەرکوت کا.

حیزبی توودە لەگەڵ هەموو ئەو زەبرانەی وێی کەوتبوو، هێندێک گۆڤار و چاپەمەنی هەر دەردەچوو، جاروبار بە دەست کادر و ئەندامەکانی حیزبی ئێمەش دەگەیشت.

«نهضت مقاومت ملی» یا بەرخۆدانی نەتەوەیی لە رۆژی دوای کوودیتای ۲۸ی گەلاوێژ را تا ساڵی ۱۳۳۷ تێکۆشانی هەر بەردەوام بوو. هەوڵیان دەدا و لە ژێر ئەو دوو سێ دروشمەدا خەباتیان دەکرد:

١- خەبات دژی هەر چەشنە ئیستعمارێکی بێگانە چ سوور، چ رەش.

٢- خەبات و دژایەتی لەگەڵ دەوڵەتەکانی دەستکردی بێگانە

٣- درێژەدانی بەرخودان و گێرانەوەی سەربەخۆیی نەتەوەیی.

ئەو هێزە لەم حیزبانە پێکهاتبوو: «حیزبی ئێران، حیزبی مەردومی ئێران، حیزبی میللەتی ئێران، حیزبی زەحمەتکێشانی میللەتی ئێران، نیرووی سێهەم و نوێنەرانی بازاڕ و زانستگای تاران».

بەڵام سێ هۆ وەک پێشوو لە گۆڕێ دا بوون کە پێشی یەکیەتی و یەکبوونی ئەو هێزانەی دەگرت و نەیدەهێشت بێتە بەرە:

١- ناتەبایی نێوخۆیی هێزە سیاسییەکان

٢- لاوازبوونی رێبەری

٣- هەست نەکردن بە بەرپرسایەتی کە لە هێژمۆنی خوازیی رێکخراوەییدا خۆی دەنواند.

ئەم سێ شتە هەموو کات گەورەترین زیانی بە یەکیەتی و یەکبوون گەیاندووە و کۆسپی هەرە گەورەی رێگەی سەرکەوتن بوون و بە داخەوە بۆتە نەخۆشییەکی«مزمن» کە ئێستاش لە نێو هێزەکاندا هەر هەیە.

ئەم کۆبوونەوەی کە لە خەرمانانی ٣٢دا حیزبەکانی ناوبراوی سەرەوە کردیان گەلێک بە کەڵک بوون، توانیان بەرنامە داڕێژن و بەیەکەوە زۆر کاری باش بۆ بەرهەڵستکاری دژی ڕێژیم بکەن و تەنانەت کاندیداتۆریی هەڵبژاردنیش کە دوازدە کەس بوون و لە بەندیخانەشدا بوون، بە خەڵک بناسێنن و، بە ئاشکرا دژایەتی لەگەڵ بەستنی قەراردادی کۆنسێرسیۆم و بەشێکی زۆر لە کارەکانی ڕێژیم بکەن.

با بێینەوە سەر وەزعی خۆمان لە کوردستان. وتمان دوای کۆنفرانس هەر کەس کاری خۆی بۆ دیاری کراو لە قەدەر خۆیان خەریک بوون، بەڵام مەیدانەکە بەرتەنگتر دەبوو. ساواکیش ملوزمێکی تازە بوو، وەک داڵ بە دوای ڕاوکردن و لە داوخستنی هاوڕێیاندا دەگەڕا.

کاک غەنی کە لە سنە و خەتی جنووب کاری دەکرد، ساڵی تێپەڕ نەکرد و لە ساڵی ٣٥دا لە شاری سنە بە ناوی نهێنی پرتەوی گیرا، پاش بەینێک لە بەندیخانە ئاشکرا بوو بردیانە ژێر موحاکەمە و بە سێ ساڵ زیندان مەحکووم کرا کە ئەوەدەم دەبوو زۆریش شوکرانە بژێر بێ! لەسەر ئەو حوکمە تا ئاخرییەکانی ساڵی ٣٧ لە بەندیخانەدا مایەوە.

بە دوای ئەودا کاک ڕەحمەتی شەریعەتیش بۆ ئەوەی خۆی پاراستبێ، جێگەی کارە دەوڵەتییەکەی گواستەوە و خۆی ئەقلی تاران کرد. بە خۆشییەوە کارەکان هەر کرابوون. هەم لە نێو خەڵکدا و هەم لە ریزەکانی ئەرتەش دا پیاوی زۆر باش و خاوەن هەست هەبوون و هەولی زۆریان دابوو.

کاک ڕەحمان قاسملوو، ساڵی ٣٥ دەبوو بچێتە دەرەوە، هەم کاری دیپلۆماتیک بکا، هەم سەری خێزان و منداڵەکانی بدا، کە بە خەتی کوردستانی عێراقدا پێشتر بە نهێنی بەڕێ کرابوونەوە چێکوسلواکی. لە لایەکی دیکەوە نوێنەرایەتی درابوویە تا لە فستیوالی لاوان کە لە مۆسکو دەگیرا، وەک نوێنەری حیزب بەشداری بکا.

کە دەچێتە تاران، بە پێچەوانەی بڕیاری حیزب، بۆ هێندێک ڕاوێژ دەچێتە لای بەرپرسانی حیزبی توودە کە لە شیمالی تاران بە نهێنی دەژیان و ئەرکی حیزبیی خۆشیان بەڕێوە بردووە. ئامۆزایەکی خۆشی بە نێوی سمایل قاسملوو کە لە زانستگەی تاران خوێندکاری زانکۆی فەننی بووە، لەگەڵ خۆی دەبا.

لەبەر ئەوەی دوژمن دەستی دەنێو حیزبی توودە خستبوو، هەر کە کاک ڕەحمان و سمایل دێنە دەر، دەیانگرن و ڕاست دەیانبەنە فەرمانداریی نیزامی، بەڵام سەیر ئەوەیە

دەگەڵ هەموو فێڵ بازیی تەیووری بەختیار کە ئەو دەم بەرپرسی ئەم دەزگایە بووە، پاش ٤٨ سەعات بەردەدرێن.

ئەم مەسەلەیە دردونگییەکی زۆری بەرامبەر کاک رەحمان پێکهێنا. لە لایەک بڕیاری حیزبی شکاندبوو، لە لایەکی دیکە دەربازبوونی کاک رەحمان کە بێ گومان دیار بوو لەو دراوە کە گیراوە و وەک کەسێکی نەناسراو نەگیرابوو، جێگەی پرسیار بوو.

دوایە چۆتە چیکوسلواکی، لەوێش هەر لەگەڵ برادەرە قەدیمییەکانی خۆی و بەرپرسانی حیزبی توودە پێوەندی بەرقەرار کردووە.

هاورێیان کە ئەوە دەزانن‌ەوە، ناوبراو بۆ چوونی مۆسکو لە نوێنەرایەتی دەخەن و لە کوردستان را سەید عبداللە اسحاقی دیاری کراوە و نێردراوە، بەڵام پاش چەند مانگ مەحتەلی لە چیکوسلواکی، ئەویش نەیتوانی بچێ بۆ مۆسکۆ.

دوای گەڕانەوەی بۆ تاران، زۆر لە کاک رەحمان تووڕە بووە و گومانی وابووە کە توودەییەکان و کاک رەحمان کارەکەیان لێ تێک داوە و نەیان هێشتووە بچێتە فستیوالی لاوان لە مۆسکۆ.

ئەوە هەمان فستیوال بووە کە هەژاریش پارچە هەڵبەستێکی زۆر بەهێزی بۆ هۆنیبووەوە لە ژێر سەردێڕی«کوردێکم دەوێ». بەم شیعرە دەست پێ دەکا:

کوردێکم دەوێ چابوک و پتەو      سەفەرێک هەیە بۆم بکا بە شەو

بەم دوو شیعرەش کۆتایی دێ:

کوردم بە ناوبانگ، ئازا و بەکارم      یەک بەم غەنیمی هەزار بەدکارم
دڵدانەوەیەکم ئێوە بۆ بنێرن      مەرگی ئیستیعمار بە خۆم بسپێرن

کادرەکانیش بە پێی توانا لە ناوچەکان درێژە بە تێکۆشان دەدەن. ساڵی دواتر واتە ٣٦، کاک ئەسعەد خودایاری و کاک سلێمان موعینی جیا جیا دەگیرێن، ئەسعەد لە میاندواو لە لایەن یەک دوو ساواکیی تازەکار کە پێشتر خۆیان خزاندبووە ریزی حیزبەوە، بە گرت دەدرێ. کاک سلێمانیش لە تاران. هەردووکیان تا ئاخرییەکانی ساڵی ٣٧ هەر لە بەندیخانەدا دەبن.

هاورێیان فێر ببوون، جارجار بۆ گۆڕینی ئاو و هەواش با، بە کەڵک وەرگرتن لە

دۆستایەتیی دۆستانی حیزب لە دیوی گەرمێن، سەری کوردستانی عێراقیان دەدا.
سەید عبدالله اسحاقی و هاشم (اقل الطلاب) زۆرتر لەوێ دەمانەوە.
رووداوی چاوەڕوان نەکراوی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ی زایینی لە عێراق، کردەوەی دلێرانەی عبدالکریم قاسم و دۆستانی و ، تێک رووخانی رێژیمی پاشایەتی لەم وڵاتە بوو بە هۆی ئاڵ و گۆڕێکی زۆر بەرچاو.
دەرچوونی عێراق لە پەیمانی بەغدا وەک یەکەم هەنگاوی گرینگی پێشکەوتن خوازانەی سیاسی حکوومەتی شۆڕش، بانگکردنەوەی سەرۆک بارزانی و کوردە ئاوارەکان لە سۆڤیەت، کردنەوەی هێندێک دەرک و دەروازەی سیاسی بۆ کوردەکانی ئەم بەشە لە کوردستان و دروشمی کورد و عەرەب برانە و عێراق هی دوو گەلی کورد و عەرەبە کە ئەوەیان دوایی رەسمیەتی قانوونیشیی پەیدا کرد، هیوا و هومێدێکی زۆری بە گەلی کورد لە کوردستانی رۆژهەلات بەخشی. خەڵکی راچلەکاند، هەستی نیشتمانپەروەریی بەهێزتر کرد و گڕوتینی تازەی دا بە دەوری کار و تێکۆشانی حیزب.
ئەو چەند کادرەی کە لە ناوچەکان مابوون، بە هەڵسەنگاندنی خۆیان لەم ئاڵ و گۆڕە، بەرنامەی تێکۆشانیان بەهێزتر کرد و دەکرێ بڵێین وەک هەلووک هەڵدەسووڕان و ئەم سەرو ئەوسەری کوردستانیان دەکرد.
گەڕانەوەی مەلا مستەفاش، پاش چەند ساڵ دەربەدەری بۆ بەغدا، چاوپێکەوتنی ئەو لەگەڵ بەرپرسانی دەوڵەتی چیکوسلواکی، هەروەها دیتنی جەمال عەبدوناسر لە قاهیرە لە کاتی گەڕانەوە بۆ بەغدا، خەڵکی لە رادەبەدەر خۆشحاڵ کرد و بە قەد شۆڕشی تەمووز لەسەر کوردستان تەئسیری بوو.
پێکهاتنی ئەم وەزعە چەند لایەنی بە سوود و لایەنێکی زیانباری بۆ حیزب تێدا بوو. یەکەم ئەوەی کە ریزەکانی خەبات لە کوردستانی ئێرانیش زۆر بە تین و تەوژم تر ببوو و دڵگەرمییەکی لە رادەبەدەری بۆ خەڵک بەدیاری هێنابوو. لە یەک ساڵدا رادەی ئەندام و لایەنگران چەند بەرامبەر بوو. دووهەم ئەوە بووکە دوژمن ترس و خۆفێکی زۆری لێ نیشتبوو، شا ئەوەندەی هەست بە مەترسی دەکرد کە تا چەند مانگ کاخی سەعدئاباد بە تانگ دەپارێزرا. مەجبوور ببوون سەبارەت بە کوردستان سیاسەتێکی دوو لایەنە بگرنە پێش، لە لایەک تا رادەیەک وازیان لە هێرش و فشار و گرتن هێنابوو، دەیانەویست سەرنجی خەڵک بۆ لای خۆیان راکێشن و بۆ ئەم مەبەستە کە بەشی هەرە زۆری خورانان

بووه، بۆ یەکەم جار رۆژنامەیەکی کوردییان بە ناوی کوردستان لە ژێر چاوەدێریی راستەوخۆی ساواک دا بە کوردی چاپ کرد، بەڵام زیاتر لە پارچەکانی دیکە و وڵاتانی دەرەوە تەنیا بۆ تەبلیغ بڵاویان دەکردەوە و خەڵک زۆر بە دەگمەن دەستیان دەکەوت، هەروەها بەپەلە بوودجەیەکیان تەرخان کرد و دەستیان بە ئاوەدان کردنەوە و بە قەولی خۆیان نوێ سازیی شارەکانی کوردستان بە تایبەتی مەهاباد کرد.

لە لایەکی دیکەوە زۆر جار مانۆڕی نیزامییان وەڕێ دەخست و زۆربەی رۆژەکان ئەو فڕۆکانەی ئەمریکا دابوویە، لە ئاسمانی کوردستان مانۆڕیان دەدا و سەوتیان دەشکاند و دووکەڵیان لە دوای خۆیان دەردەدا. ئەرتەشیش لە حاڵی ئامادە باشی تەواودا بوو.

بە داخەوە زۆر لە کادرەکان لێیان گۆڕابوو، لە جیاتی بێنەوە کوردستانی ئێران و ئەرکی خۆیان بەڕێوەبەرن، زیاتر لە عێراق و هێندێک جار بۆ ماوەیەکی زۆر لە بەغدا دەمانەوە. بەتایبەتی کاک سەید عبداللە ئیسحاقی کە دوای گیرانی کاک عەزیز یوسفی لە ساڵی ٣٧دا لەبەینی ورمێ و مەهاباد، تەنیا ئەندامی رێبەری بوو کە دەبوو لە کوردستان با، ئەو کات و هەتا ئاخریش لە گەرمیان بە ئەحمەد تۆفیق دەناسراو هەروەها کاک هاشم فەقێ ساڵح، کە ببوو بە قادر شەریف، تا جارێک لە نێوخۆدا خۆیان نیشانی کادرەکانی تاق و لوق ماوەدەدا چاویان خێل دەکردن.

هەوای سیاسیی کوردستانی گەرمیان ئەوەندە خۆش بوو کە خەڵک لە هەموو لایەکەوە خۆیان بۆ دەکوتا. بۆ نموونە لە گەلاوێژی ساڵی ٣٧دا دوو کادری لێوەشاوەی مەهاباد کاک کەریم حیسامی و، کاک عەزیز فەلاحی کە گۆیا ساواک داوایان لێ دەکا لە رۆژی ٢٨ی گەلاوێژدا دژی حیزب و بە سوودی شا قسە بکەن، بە پرتاو بۆ ئەوەی تووشی ئەم هەڵە نەبن، لە شار دەردەچن، بەڵام سەردڕای ئەوەی بە چەند شوێندا تێپەڕیوون کە هاوڕێیانی کادر هاتوچۆیان دەکرد، بێ چاوپێکەوتن و پرس ورا لە جیاتی ئەوەی لە کوردستانی ئێران بمێننەوە و بەو شاردزاییەی کە هەیانبوو، درێژە بە خەبات بدەن، بێ راوەستان یەکسەر گەیشتنە کوردستانی گەرمیان.

سمایلی قاسملوو کە کاتی خۆی کادرێکی زۆر تێکۆشەر و خوێندەوار بوو، وەک لە پێشەوە باسمان کرد، دوای گیرانە ٤٨ سەعاتییەکەی لە تاران کە لەگەڵ کاک رەحمان قاسملوو تووشی هاتبوون و، بەرپرسانی حیزبی قەولیان پێ دابوو پاش ماوەیەک بۆ تەواو کردنی خوێندنەکەی بینێرنە یەکێک لە وڵاتانی رۆژهەڵات. بەڵام سێ ساڵ لە دێهات

مایەوە، بەڵێنی هاوڕێیان نەچووە سەر، ئەویش بەینێک چووبووە کوردستانی عێراق.

لە مانگی ڕەشەمەی ١٣٣٧ سمایل قاسملوو لە ڕێگەی بانەوە دەگەڕێتەوە بۆ کوردستانی ڕۆژهەلات، لە نزیک شاری بانە لە گیر ئەفسەرێک و چەند مەئموور دەکەوێ و دەیگرن. هاوڕێیانی بانە زۆریان هەوڵ لەگەڵ دابوو و ڕێگەی دەربازبوونیان بۆ دۆزیبۆوە، بەڵام ئامادە نەبیوو. پاش چەند ڕۆژ بۆ مەهاباد رادەگوێزرێ.

هەرچەند هاوڕێیانی تاران و لە زەمان وان را قادر شەریف و هێندێک کەسی دی لە خۆڕا و بێ ئاگاداری بە قارەمانیان دەناساند و هەمووشیان شانازییان پێوە دەکرد و حەزمان دەکرد هەرواش با، بەڵام زۆر بە داخەوە بە کردەوە دەرکەوت کە خۆشی حەزی لەم گرتنە کردووە، هەر لە مەهاباد بێ ئەوەی کەمترین نارەحەتیی بۆ پێک بێنن یا ئەشکەنجەی بدەن، تووشی خیانەت بووە، هەر زانیارییەکی هەیبووە، داویە بە بەرپرسانی ڕێژیم. ئەم ئیتلاعاتە و ئەم خیانەتە چەند مانگ سەرپۆش کرا و بێدەنگەی لێ کرا. ئەو کادرانەی مابووشنەوە، زۆر درەنگ تەنیا لە گرتنەکەی ئاگادار بوون و هیچی دی، دوایە دەرکەوت پیاوەکانی ڕێژیم ئەو ماوە زۆرتر خەریکی شناسایی ئەفەرەکان و جێگا و ڕێگایان بوون.

بە وتەی خۆی کە دوایە لێی بیستراوە، ویستوویەتی تۆڵەی پەککەوتنی خوێندنەکەی و نەناردنی بۆ دەرەوە لە کاک ڕەحمان و سەید عبدالله وەرگرێتەوە!!(*)

لە هاوینی ١٣٣٨دا تەنیا دوو کادر لە دێهاتی کوردستان مابوونەوە کە بریتی بوون لە

---

(*) وتەی جەلیل گادانی لەم بابەتەوە:

ئێمە و باقی هەواڵان بەر لەوەی لە قزل قەڵا را بە ماشێن بمانگوێزنەوە بۆ فرۆکەخانەی نیزامی دۆشان تەپە و لەوێرا بە تەیارەی نیزامی بمانبەن بۆ تەورێز، پێشتر هیچ مەجالێکمان نەبوو بە دانیشتن و قسەکردن سمایل قاسملوو ببینین، چەند دەقیقە بەرەڕووکردنیش بۆ ناساندنەوەی من نە هیچ ئاکامی بوو، نە جگە لە یەکترمۆربوونەوە چی تێدا دەکرا.

لەو ماوەش کە من لە قزل قەڵا بووم، جگە لە حەوتوویەک مانەوە لە ژێر بورجێکی ناخۆشی گەرمی پڕ لە مشک، دوایەش ١١ ڕۆژی ژێر ئەشکەنجەی دووبارە کە هەموو جارێ بە ئامبولانس دەیانبردمە شار بۆ شوعبەی ساواک لە شەقامی سپەند و یەکسەر دەیانبردمە ژێرزەمین و وەرم دەگەڕانێ، باقییەکەی لە بەندیخانەی گشتی لە لای کاک عەزیز یوسفی و باقی بەندییەکانی غەیرە کورد بووم.

سمایلیش لە تەواوی ئەو ماوەدا مەگەر بۆ ڕووبەڕووکردن، دەنا بە کەس نیشان نەدراوە و لە بەندی ئینفرادی دابووە. کاک عەزیز کە چەند مانگ پێش ئێمە لە قزل قەڵا بووە، جگە لە جارێک نەیدیبوو. ئەویش مەجالی قسە دەگەڵ کردنی نەبووە.

لە تەیارەی بەینی تاران و تەورێزیشدا پیاو چاکمان! زۆر لەگەڵ بوو، نەدەکرا لەسەر شتی

جەلیل گادانی و هاشم جەلالی. کار ئەوەندە زۆر و کادریش ئەوەندە کەم بووە و کەسیش بۆ هاوکارییان نایەتەوە.

لە مانگی جۆزەردانی ٣٨دا لەسەر پێشنیاری جەلیل گادانی، بەشێکی بەرچاو لە ئەندامە تێکۆشەر و بەرپرسەکانی ئەغەدە و لاجان، پیران و مەنگور وەک کاک محەممەد قادری، مەلا رەحمان لاهیجانی، سەید ئەحمەد زیدان، ئەحمەد ئاهەنگەری، سەید حاجی، عبداللە مەلا عوسمانی و چەند کەسی دیکە بە بەشداریی ناوبراو لە گوندی سەروکانی کۆدەبنەوە، پاش باس لەسەر وەزعەکە و هەست نەکردن بە بەرپرسایەتی هاورێیانی بەرپرس و مانەوەیان لە کوردستانی عێراق، بڕیار دەدەن نامەیەکی تایبەتی بۆ مەلا مستەفا بارزانی بنووسن و لە سکالای خۆیان ئاگاداری کەن، بەڵکو رێگا چارەیەک بۆ حەللی ئەم موشکیلە و ناردنەوەی هاورێیانی حیزبمان بدۆزێتەوە و بیاننێرێتەوە تا لە کوردستانی رۆژهەلات ئەرکی خۆیان بەرێوەبەرن.

هێشتا وەلام و ئاکامی ئەم نامەی بۆ مەلا مستەفا نێردرابوو، ئەمهاتبووەوە کە جەلیل گادانی لە ٢٧ی گەلاوێژی ٣٨ لە ناوچەی بۆکان و هاشم جەلالیش پاش ماوەیەکی دە رۆژی

---

جیددی باس بکەین کە گەیشتینە تەورێز و بردیانین بۆ بەندیخانەی ساواک، دەرکەوت بەپێچەوانەینەوەی لە ئاسمانی تەورێز و رەنگە پێشتریش پێیان راگەیاندبن، شەش هۆدەی تاکە کەسیمان بۆ چۆڵ کەن و هەر کاممان بەرنە جێگایەک، کاردکە جێ بەجێ نەکرابوو. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە هێشتا برایانی ئازەریی لێ مابوون کە کاریان ناتەواو بووە و بۆ تاران بەرێ نەکراون.

سەیر ئەوە بوو کە ویستیان بمانبەنە بەندەکان، دەرکەوت دوو سلول زیاتر نییە کاک عەزیز لە پێشەوە بوو، سمایل لە نێوەڕاست و منیش لە دواوە. بە کاک عەزیزم گوت بەڵکو وا بڕۆین هەرسێکمان پێکەوە بکەوینە سلوولێک، بە پێی تەجرەبە دەشمانزانی کە رەنگە هەر ئەو ئێوارە جێگاکانمان جیاکەنەوە. بە رێکەوت راست وا دامەزراین و ئەو سێ کەسمان کەوتینە سللوولێک.

لەوێ لە جیاتی لێک توورە بوون لەگەڵ سمایل بە نەرمی جوولاینەوە و گوتمان کاردکە کراوە و نەدەبوو وا بکەی، بەلام ئێستاش ئەگەر لە وتەکان و ئەو هەموو شتەی گوتووتە، پەشیمان بیەوە، بۆ ئێمە زۆر باش دەبێ و حوکمی خۆشت سووکتر دەکەی. لە وەلامدا زۆر ئاسایی و لەسەرخۆ گوتی:

«پێم سەیرە ئێوە داوای ئاوا لە من دەکەن و دەوێرن شتی ئاوا بێننە گۆڕێ، من لە رۆژی هەوەڵ را بۆ خۆم بە مەیلی خۆم بێ ئەوەی پتەیەکم لێدەن، هەموو شتم گوتووە. پێم وایە خزمەتم کردووە، ئەو خەڵکە لەبەر چنگی کەسانی وەک رەحمان و عەبدوڵلا ئەجات دەدەم. ئەوانە خیانەت بە خەڵک دەکەن و بە منیشیان خیانەت کرد و قەولیان پێ دابووم بۆ خوێندن بمنێرنە دەرەوە، ئەو کاردیان نەکرد. منیش بەم تەرزە تۆڵەم لێ کردنەوە».

هەرچی باسمان بۆ کرد و ویستمان قانعی بکەین، بەداخەوە رازی نەبوو. دوایەش جێگا خالی بوو، لێکیان جیا کردینەوە و هەر کام لەیەک سللوول دا بووین. رەنگە ئەو شتانەی لەسەر تۆڵە ئەستاندنەوە لە رەحمان و عەبدوڵلای لە زۆر جێگای دیکە باس کردبێ.

له ناوچەی فەیزوڵلا بەگی و هەوشار بە دوای ئاگر تێبەردانی ماشێنی ئەرباێک لە گوندی قەدیم لە مانگی پووشپەڕدا دەگیرێن.

دوای راگرتنیان بۆ ماوەی بیست رۆژێک لە بەندیخانەی پادگانی مەهاباد، کە زانیان چیان لێ هەڵناوەرێ، رەوانەی تاران کران.

جەلیل ماوەی ۱۸ رۆژ وەک کوردێکی نەخوێندەواری خەڵکی لادێ بە ناوی نهێنی عەبدولکەریم لە ژێر پرسیاردا مایەوە. تا دوو جاسووس و خۆفرۆش بە ناوەکانی رەحمان مودەڕریسی و رەحمان شەمس بورهان بردرانە ناوەندی ستادی سوپا و ناسیانەوە و بە بەرپرسی ئەو کاتی لێ پرسینەکە سەرهەنگ مودەڕریسی ناوزڕاویان ناساند. جا ئەوەدەم گوتبووی ئەو ماوە لە تاران بووم و هاتووم خۆم تەحویل دەمەوە.

هاشم جەلالیش دە پازدە رۆژ هەتا قزل قەلاش هەر بە ناوی نهێنی محەمەد مایەوە کە لەوێ سمایل راستی لێ گوت و سەلماندی کە ئەوە هاشم جەلالی کادری حیزبە. جا ئەویش دەستی پێکرد. هاشم کارێکی وای کرد، جگە لەوەی کاتی گرتنە بە کۆمەڵەکەی خەڵک دەگەڵ سمایل بردبوویانە مەهاباد، دوایەش بە دەستووری تەیموور بەختیار لە بەندیخانەی قزل قەلاوە بەڕێ کرا بۆ کوردستانی عێراق.

دوو کادری ناوبراو لەو ماوەدا کە لە بەندیخانەی پادگانی مەهاباد راگیرابوون، کارێکی وایان نەکرد هەست بەوە بکرێ ئەو دوانە کادری حیزبن و یەکتر دەناسن. لە عەینی کاتدا لە بەندیخانە را پێوەندیشیان بە بەرپرسانی حیزبییەوە لە شاری مەهاباد گرتبوو. قەولیش درابوو جەلیل دەرباز کەن، بەلام هەر قەول بوو، بە کردەوە نەکرا.

لە ئاکامی خیانەتی سمایل قاسملوو و، ئاشکرا کردنی پێ و شوێن و جێگای کادر و ئەندامانی تێکۆشەر و دڵسۆزی حیزبی لە زۆربەی شارو ناوچەکان و تەنانەت هی تارانیش هەروەها، وەزعی بەشی هەرە زۆری ئۆرگانەکانی حیزبی بۆ رێژیم روون ببووە و ماوەیەکی دوورو درێژی چەند مانگەش بە مەبەستی شناسایی وردتر، لە گرتنی ئەفراد خۆیان پاراست.

سەرەڕای ئەوەی ماوەی یەک دوو مانگیش ئەو دوو کادرەی حیزب واتە جەلیل گادانی و هاشم جەلالی، هەروەها کاک رەحمەت شەریعەتی و دوکتور مەولەوی و کاک عەزیز یوسفی، کە سێ ئەندامی رێبەریی حیزب بوون، لە بەندیخانەی قزل قەلا راگیرابوون، باسێک لە گرتن و پەلاماردان بۆ سەر خەڵک نەبوو، لە راستیدا وێ دەچوو جارێ نەیانەوێ کوردستانەکە کە تێکەڵاوییەکی زۆری لەگەڵ کوردستانی عێراق پەیدا کردبوو، بشێوێنن.

دوور نەبوو، ئەگەر هەلومەرجی سیاسیی گشتی لە ئێران و بە تایبەتی پێوەندیی رێژیم

بە عێراق و سۆڤیەتەوە نەگۆڕابا، جارێ ئەو گرتنەیان بۆ هەلومەرجێکی دیکە ڕاگرتبا. بەڵام لە ساڵی ٣٨دا ئاڵ و گۆڕێکی سەیر هاتبووە گۆڕێ.

ئەمریکاییەکان لەسەر چوونی شا بۆ سۆڤیەت، لێی ناڕازی بوون و ماوەیەک زۆری لەگەڵ سارد بوون و هەستیان دەکرد نزیکی شا لەگەڵ سۆڤیەت بۆ ئەمریکا زیانبارە، لە نێوخۆشدا جگە لەوەی پاشماوەی حیزبی توودە کەم و زۆر تێکۆشانیان هەر هەبوو، «نهضت مقاومت ملی» بە پێی ئیمکان وردە تێکۆشانی خۆیان دەکرد. لەگەڵ ئەوەش کە فشاریان بۆ دێنان، لە قسان ڕانەدەوەستان، فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان ژیابووەوە، هێندێک دەستەی دیکە لە تاران و شارەکانی وەک مەشهەد، ئیسفەهان و شیراز دوای ئەوەی کە زۆربەیان لە حیزبی توودە تۆرابوون، بە ناوی جۆراجۆر و بە پێی بۆچوونی خۆیان تێدەکۆشان. ئەم حاڵە ئەمریکای هێندەی دیکە دەردونگ کرد و فشاری زۆری بۆ ئێران هێنا و، لەوە ئیگەران بوو ئێران بەرەوسۆڤیەت و چەپ بڕوا.

ئێرانیش هەم نەیدەوێرا خۆ لە گێژاوی سۆڤیەت باوێ، هەم پێشی وابوو کە بۆ چاک کردنەوەی دڵی ئەمریکا دەبێ هێندێک حەرەکەتی سیاسی و تەبلیغی بکا. شا دەیزانی بەبێ ئەمریکا ناتوانێ درێژە بە دەسەڵاتی خۆی بدا. لەبارەی مالیشەوە سەرەڕای داهاتی زۆری نەوت و وەرگرتنی قەرز و قۆڵە لەم لا و ئەولا هەر چاو لە دەستی ئەمریکا بوو.

بۆیە شا لەسەر بنەڕەتی ویستی ئەمریکا و جیاوازیی بۆچوونەکانی ئێران و سۆڤیەت لە هاوینی ٣٨دا شەڕێکی درێژخایەنی تەبلیغاتیی زۆر توندی لەگەڵ سۆڤیەت دەست پێکرد.

پێوەندی خۆی لەسەر مەسڵەحەتی ئەمریکا و ئینگلیس و ئیسرائیل لەگەڵ میسر بڕی. دالس وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکای بۆ ئێران بانگ کرد. ڕێژیم لەم سەردانە زۆری کەڵک وەرگرت، یەک لە ئاکامەکانی بەستنی قەراردادی بەرگریی دوو لایەنەی ئێران و ئەمریکا بوو کە لە سەفەری سێهەمی شا بۆ ئەمریکا بەسترا.

شا بۆ ئەوەی ئەربابی خۆی بە تەواوی لەوە خاترجەم کا کە هەر نۆکەرەکەی پێشووە و دژی سۆڤیەتە، لە لایەک ئیزنی بە ئەمریکادا چەندین سەکۆ و دەزگا و دووربینی جاسووسی و وێنەهەڵگر لە ناوچە سنوورییەکانی نێوان سۆڤیەت و ئێران دابمەزرێنێ.

لە لایەکی دیکەشەوە پێویست بوو هێندێک کردەوەش بەرامبەر بەهێزە سیاسییەکان نیشاندا و زاڵ بوونی خۆی دوای کوودتیای ٢٨ی گەلاوێژ جارێکی دی بسەلمێنێ.

بۆیە لە هاوینی ١٣٣٨ ڕا دەستیان بە گرتنی ئەندامانی بە هەڵسووری ڕێکخراوە چکۆلە و گەورەکان لە تاران و ئیسفەهان و شیراز کرد. دوایە گەیشتە سەر فیرقەی دیموکراتی

ئازەربایجان. دوای ئەوانیش نۆبەی کوردستان هات.

لە حەوتوویی هەوڵی گەلاڕێزانی ١٣٣٨دا ئەو شەش حەوت کەسەی لە بەرپرسانی حیزب لە قزل قەلای تاران راگیرابوون، بە فڕۆکەی نیزامی و زۆر بە بێدەنگی بەرێ کران بۆ بەندیخانەی ساواکی تەورێز. هەرچەند هێشتا بە کرێگیراوانی شا لە لێدان و کوتان و پەروەندەساز کردن بۆ ئازەربایجانییەکان تەواو نەببوون.

چەند رۆژ دواتر ساواکییەکان بەپێی بەرنامەی داڕێژراوی خۆیان سمایل قاسملوو و هاشم جەلالیشیان لەگەڵ خۆیان بردبوو و، بەرەو کوردستان وەرێ کەوتبوون.

ناوەندی لێ پرسین و لێدان و کوتانی کورد و ئازەرییەکان تەورێز دیاری کرابوو، ناوەندی هێرش بۆ گرتنیش لە کوردستان شاری مەهاباد بوو، کە هەموو شتیان لەوێ را دەست پێکردبوو.

لە شەوی یازدەی گەلاڕێزان لە هەموو ئەو شار و گوندانەی مەبەستیان بوو، ئامادە بوون و پەلامارێکی هەمەلایەنە درایە سەر خەڵک. لەو پەلامارەدا ساواک و ئەرتەش و ژاندارمری و شارەوانی بە ماشێن و کەرەستەی خۆیانەوە هاوبەش بوون.

جاری یەکەم جەماعەتێکی زۆر گیران، یەک دوو جاری دیکەش لە شارەکان و گوندەکان خەڵکیان گرتبوو کە سەرجەم دەگەیشتە ١٥٠ کەس. لەوانە ١٢٠ کەس دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر لە تەوریز و تاران و مانەوەی چەند مانگ لە بەندیخانەی قزل قەلا بەدوو دەستە دابەش کران بۆ بەندیخانەکانی دژبانیی تاران و قەسری قاجار بەرێ کران و دوایەش لە چوار تاقم دا تەحویلی دادگای نیزامی دران و بە شێوەی خوارەوە حوکمیان دان:

٧ کەس ئیعدام - ٥٤ کەس ئەبەد - ٢٩ کەس پازدە ساڵ - ٢٣ کەس ١٠ ساڵ و چەند کەسیش بە ٥ ساڵ و سێ ساڵ.

لە نێو ئەو گیراوانەدا کەسی وا هەبوو کە ئاگای لە سیاسەت و لە حیزب و کوردایەتی نەبوو، شەوی پەلامارەکە بەرێکەوت لە شوێنێک میوان بووە، خاوەن ماڵ دەرباز بووە، میوانیان لە جیاتی خانەخوێ گرتووە، دوای ئەشکەنجەی زۆر حوکمیش دراوە!

با وەبیر خوێنەرانی بەڕێز بێنینەوە، دوای ئەم کارەسات و گرتنانە و دڵنیابوونی ئەمریکا لە وەفاداریی شا، پرێزیدێنت آیزنهاوری سەرکۆمار لە سەرماوەزی هەمان ساڵدا سەردانی شای کرد و دڵی لەگەڵ چاک کردەوە. لە مانەوەی شەش سەعاتەی خۆیدا هێندێک قسەشی لەسەر عەدالەت و ئازادی و... کرد.

بێ گومان ناوی ئەو هەموو خەڵکە لە بیر نامێنێ و حیزبیش ئارشیوێکی وا رێکوپێکی نییە کە ئەم شتانەی هەموو تێدا راگیرابێ، بەڵام بە هاوبیریی هاورێیانی حیزبی و لە هەر

شار و ناوچەیەک لەم گیراوانە بۆ نموونە چەند کەس ناو دەبەین.

لە تاران دوکتۆر مەولەوی و رەحمەتوڵلا شەریعەتی، لە سنە هاشم شێخانی، باقر خۆشبین، سەید عەتا یونسی، رەجەبی(*)، رەحیم بەغدادی، لە سەقز قادر دەباغی، لە بانە محەممەد کەریمی، خەلیل دەوڵەتی، مەلا محەممەد ئیمامی، حسێن بەدیعی، لە بۆکان حسێن فاتحی، مەلا قادر خورسەندی، لە مەهاباد کە لە هەموو شوێنێک زۆرتری لێ گیرابوو،، عەزیز یوسفی، غەنی بلوریان، حەسەن رەستگار، فەتاح کاویان، خەلیل گادانی، قاسم ئەحمدی، لە دەوری میاندواو رەحیم جوانمەردی قازی، لە ئەغەدە ئەحمەد ناهەنگەری، سەدیق عەلائی، لە پیرانشار محەممەد قادری، مەلا رەحمان لاهیجانی، سەید رەسول دهقان، لە شنۆ کاک خدر خانلری، وەستا ئەحمەد گەزۆی نەجار لە ورمێ ئەحمەد و محەممەد ئەعزەت زادە، عەبدالله عەبدولاهی، محەممەد داستان پور، مام رەحمان تەشی(**) و سلێمان ئازەر، لە شاهیندژ ئیبراهیم مەولایی، رەزا ئەکبەری و....، لەسەر دەشت غەفوور ئیبراهیمی، یوسف سنەیی، محەممەد ئەمین حەسەن پور، ئیسماعیل ئیسماعیل زادە، لە دەوروبەری سەردەشتیش دوو کوردی دڵسۆزی بە تەمەن بە ناوەکانی کوێخا ئەمەری قەڵەڕەشی ناسراو بە «ئەمەر پاشا» و مام رۆستەمی بێوران و کوڕەکەی خدر محەممەد پوور، لە ناوچەی رەبەت، مەلا خدر عەباسی و حەسەن دەشتی.

دەبێ بڵێین بە خۆشییەوە لە یەکساڵی دوای موحاکەمەدا زۆر ناڵ و گوڕ هاتنە پێش. لە دەرەوە هەوڵی زۆر بۆ کوردەکان درا، لە کوردستانی عێراق بۆ ئیعتراز بەم حوکمانە خۆپیشاندان کرا و، لە زۆر شوێن دەنگی ئیعتراز بەرز بووەوە.

جگە لەوانەی گیران و حوکم دران، کاتی پەلاماردانەکە سەدان کەس لە شارەکان و گوندەکان توانیان خۆ دەرباز کەن و بچنە کوردستانی باشوور و لە شارەکانی سنوور و سلێمانی جێگیر بوون. لەبەر ئەوەی بەرپرسانی ئەو کاتی حیزب لە کوردستانی عێراق سەرمەستی دەستکەوتی کوردەکانی ئەودیو بوون لە کاتی خۆیدا بە ئاوارەکان رانەگەیشتن، بۆیە بەشێکیان دڵسارد بوون و پاش بەینێک گەڕانەوە.

---

(*) داستوار، رەجەبی لە دژبانیی تاران یا لە قزل قەلا لە ژێر ئەشکەنجەدا شێت بوو، بە دەرمان خۆی کوشت.

(**) مام رەحمان تەشی لە بەندیخانەی قەسر پاش دوو ساڵ زیندان تووشی نەخۆشیی دڵ هات، لەبەر بێ دەرمانی و پیرانەگەیشتن هەر لەوێ فەوتی کرد.

# ناکۆکیی نێو ریزەکانی حیزب و گرتنی کۆنگرەی دووهەم

کاک ئەحمەد تۆفیق بەهۆی نزیکییەکی زۆری کە لەگەڵ بارزانی نەمر پەیدای کردبوو، نیبتکاری هەموو کارەکانی بە دەستەوە گرتبوو، هەوڵیشی دابوو تا ئەو جێگایەی دەگونجێ، جێگاو رێگایەکیان بۆ پەیدا کا، بەلام بەهۆی ناتەواویی وەزعی ژیان، گیروگرفت زۆر بووە. زۆرجار هاورێ رەشەی قاچاغچی(رەشید فەلاحی) چۆتە بازاڕ کاسبی کردووە، تا برایانی دیکە بتوانن نانێک بخۆن.

کاک رەحمان قاسملووش لە دەردەوە گەڕابووەوە، بەلام بە هۆی ناکۆکییەکی بەرچاوی کە لەگەڵ کاک ئەحمەد هەیانبووە و دوایەش مەسەلەی لایەنگریی هەر کام لەوان لە باڵی راست و چەپی پارتی دیموکرات و جیاوازیی فکرییان(*) ئەم ناکۆکییە زیاتر بووە، ئەم بۆچوونانەش زیاتر لە پێشوو تەنسیری مەنفی لە ریزی کادرەکانی حیزب کردووە. ئەو دوو بەرپرسە سەرەکییەش قەت ناویان بە جۆگەیەک دا نەڕۆیشتووە. هەتا هەبوون، ئیختلافیان هەر بووە.

مەسەلەیەکی کە نابێ لە بیرمان بچێتەوە، هاوکاریی پارتی و حیزبی شیوعی لەگەڵ هاورێیانمان لەم وەزعە بۆحرانییەدا بووە. دیارە لە ساڵەکانی پێشتریش پێوەندیی دۆستانە لە شوێنە سنوورییەکان و لەگەڵ ئەو کەسانەی پێشتر هاتبوونە کوردستانی عێراق هەر هەبووە.

زۆر بەجێیە بۆ قەدر گرتن و میوانداریی ئەو چەند ساڵە سیاسی دۆستانی حیزب لە

---

(*) کاک ئەحمەد هاتبووە سەر ئەو بڕوایە لە رێگەی ئەمریکاوە خەریکی رزگاریی کوردستان بن. زۆر لە هاورێیانی موخالیفی ئەو بۆچوونە بوون. کاک ئەحمەد لە کاک رەحمان زۆر دردۆنگ ببوو، دەیگوت قەولی داوە لەگەڵ بەختیار هاوکاری بکا. لە هەمان کاتدا توودەییشە و لەگەڵ حیزبی توودەیە.

کوردستانی عێراق، بە تایبەتی سویاسی بنەماڵەکانی شێخ مەحموود، شێخ علاءالدینی زێنوی، شێخ عوبێدوڵلا و دۆستانی قەڵادزێ بکەین.

جێگەی داخە کە وەزعی هاوڕێیانی زیندانیش لە هاوڕێیانی پەناهەندەی ئەودیو باشتر نەبووە. هەتا برایانی مەهابادی کە ماوەیەکی چەند مانگی و دوایی هاتنی موحاکمەمە لە دیژبان بوون، باقی بەندییەکان کە نزیکەی هەشتا کەس و لە زیندانی قەسر بوون، هیچ ناتەبایی و ناکۆکییەکی ئەوتۆیان نەبوو، زۆرتر نیگەرانی چارەنووسی هاوسەنگەرانی خۆیان بوون کە لێیان دوور بوون. ژیانێکی هاوبەش و برایانەیان هەبوو، ئەگەر خەبەرێک، پارەیەک یا تەنانەت لە ماوەی یەک ساڵ ونیو نەبوونی مولاقات رۆژنامەیەکیان دەست دەکەوت، بە تێکڕا کەڵکیان لێ وەردەگرت.

بە داخەوە دوای ئەوەی هاوڕێیانی مەهاباد کە هەرچەند زۆریشیان بەرپرس و رۆشنبیر و شارستانی بوون، چوونە قەسر، ناکۆکیی پایەداڕێژراوی بەندیخانەی دیژبانیان لەگەڵ خۆیان بۆ بە دیاری بردبوون. ئەو ناتەباییە جەوێکی ناسالم و خراپی پێکهێنابوو.[*]

ئەم ناتەباییە لە بەینی دوو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی (کاک غەنی بلوریان و کاک عەزیز یوسفی) لە لایەک و دوکتۆر عەلی مەولەوی ئەندامی مشاوری کۆمیتەی ناوەندی لە لایەکی دیکەوە بوو.

هۆیەکانیشی ئەوانە بوون: دەرک نەکردنی یەکتر، بەرچاونەخستنی هەل ومەرجی عاستەمی بەندیخانەو وەزعی گشتیمان، چەپڕەوی و چوونە ژێر تەنسیری جەوی چەپی زیندان، لە زیندان نەکەوتنی پێشتری دوکتور عەلی و، راست نازۆیی ئەو، لە ملدانی نادروستی زۆر کەس هەرجارە بۆ لایەکیان.

پێشتر حیسابێکی باش بۆ کوردەکان دەکرا، بە دوای سەرهەڵدانی ناتەبایی سومعەیان هاتە خوار. بەو روحە برایەتییەی بەگشتی لە نێو بەندییەکاندا هەبوو کە لە هەموو حیزب و رێکخراوە و تیرە و گەلێکی پێکهاتبوون، ئەگەر ئەم وەزعە خراپە نەهاتبایە پێش، دەیان قاتی ئەوەی لەم کاتە زۆرە ئیستفادەیان کردووە، کەڵکیان لە ماوەی دەورەی زیندان وەردەگرت. کەچی وانەکرا و زۆریشی وا رەش بین کردن کە دوای ئازادبوون لە زیندان وەدوای سیاسەت و حیزبایەتی نەکەون.

---

(*) ئەو بەشە کە جەلیل گادانی باسی دەکا، وەک خوێنەران ئاگادارن، خۆی مەهابادییە، بەڵام تەنیا مەهابادییەک بوو کە لەگەڵ ئەو هەشتا کەسە نێردرابووە قەسر و لە مەهابادییەکانیان دابڕیبوو.

بێ گومان بەشێک لەم ناکۆکی و بۆچوونە ناڕاستانە بوو بەهۆی ئەوە کە لە پاییزی ساڵی ١٩٤١دا سێ کەس لەم هاوڕێیانە غەنی بلوریان، عەزیز یوسفی و جەلیل گادانی لە بەندیخانەی قەسر را بۆ قەڵای بورازجان هەڵکەوتوو لە جنووبی ئێران بگوێزرێنەوەو ماوەی چەند ساڵ لە تەمەنیان لەم بەندیخانە گەرمەدا تێپەڕکەن کە هاوینان دەرەجەکەی لە پەنجاش تێدەپەڕێ.

لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست زۆر ناڵ و گۆڕ لە پێش بوون. دەرچوونی عێراق لە پەیمانی بەغدا، حەساسیەتێکی زیاتری لە لایەن ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی پێکهێناو وردە وردە ڕێگای سۆڤیەت بۆ عێراق کرایەوە و لە مارسی ١٩٥٩ دا یەکەم قەراردادی سیاسی - ئابووریيان پێکەوە ئیمزا کرد. بە دوای ئەوەدا سۆڤیەت لەگەڵ وڵاتی میسریش قەراردادی گەورەی وەک هەڵبەستنی سەدی ئەسوانی بەستبوو. سۆڤیەت هەم لە کەنداوی فارس نزیک ببووەوە، هەم لە ڕێگەی کەناڵی سوئیزەوە وەزعێکی باشی ستراتیژیکیی پەیدا دەکرد.

شۆڕشی کووباش کە هەر لە ساڵی ١٩٥٩دا لە بن لووتی ئەمریکا سەرکەوتبوو، هێندێک کێشەی گەورەی نزیک لە سازبوونی شەڕی سێهەمی جیهانی لێکەوتەوە.

لە ژانوییەی ساڵی ١٩٦١ واتە لە بەفرانباری ١٣٣٩ جان اف کندی لە هەڵبژاردنی سەرۆک کۆماری ڕەقیبەکەی خۆی ریچارد نیکسۆنی کە دۆستی شای ئێرانیش بوو، بۆڕدا.

پرێزیدێنتی تازە کە ئاگای لە وەزعی ئێران بوو، خوازیاری ئیسلاحاتێکی بەرچاو لەو وڵاتەدا بوو. دەیزانی داهاتی ئێران لە ٣٤ میلیون دۆلار راکە لە ئاخری ساڵی ٣٣ نیشانی دەدا، لە ساڵەکانی دواتردا زۆر لەوە زیاتر ببوو و لە ساڵی ٣٩ را گەیشتبووە ٣٥٨ میلیۆن دۆلار[*]. جگە لەوەش ٥٦٧ میلیون دۆلار یارمەتیی ئابووری و ٤٥٤ میلیۆن دۆلار یارمەتیی ئیزامیی ئەمریکاشی لە بەرچاو بوو، بەڵام خەڵک هەر برسی و تینوو و بێکار بوون. ئەم وەزعە خۆی خەڵکی زیاتر لە ئەمریکا و شا بێزار دەکرد و بە بڕوای ئەوان لە چوون بەرەو چەپ و کۆمۆنیزمی نزیک دەکردنەوە. فەسادیش هەموو دام و دەزگای دەوڵەتیی داگرتبوو، وەزعی ئابووری تووشی پەریشانییەکی زۆر و قەیرانێکی سەخت هاتبوو.

بۆ بەستنی چاوی ئەمریکاش بایە، دەبوو ئاڵوگۆڕێک بکرێ و خەریکی هێندێک

(*) راپۆرتی دەرچووی بانکی پەرەپێدانی سەنعەت ئەم ئامارەی لە ساڵی ٥٧ نیشان داوە.

ریفۆرم بن. بە تایبەتی کە خۆپیشاندان لە نێو خوێندکار و قوتابیان دەستی پێکردبوو، لە نێو کووچە و کۆلانان خۆپیشاندانی«موضع»ی وەک ساڵەکانی ۳۱ و ۳۲ هاتبووە گۆڕێ و دەنگی گلەیی و گازندەی خەڵک ئاشکرا ببوو.

بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو وەزعە نالەبارەی لە گۆڕێدا بوو، شا لە ساڵی ۱۳۳۹دا دوکتۆر ئیقبالی لێ خست و جەعفەر شەریف ئیمامی لە جێگەی دانا.

هەر لە کۆنەوە لە ئێراندا وابووە، ئەگەر یەک رۆیشت و ئەوی دیکە هاتە جێگای،، شتەکانی پێشتر زۆربەیان وەلا دەکەون. وێ دەچێ ئەوە ئەخۆشیی هەموو ولاتانی جیهانی سێهەم بێ و بێ گومان یەکێک لە دەلیلەکانی دواکەوتن لە ژیان و دواکەوتنیان لە تێکنیکە. ئاڵ و گۆڕەکانی ئەو سەفەرە بەشی زۆریان راسپاردەی ئەمریکا بۆ شابوون کە دەبوو جێ بەجێیان کا. ئەویش «دستور العمل»ێک بوو کە لە ۱٤ ماددەدا لە رەشەمەی ساڵی ۳۹ درابوو بە شا و لە روانگەی ئەمریکاوە پێچانەوەی ئەم نوسخە عیلاجی دەردەکانی ئێران بوون. بە ئەنجامی بەشێک لەم کارانە، شا جارێکی دی لە لای ئەمریکا خۆی کڕییەوە و هەر رۆژە پێشنیار و پرۆژەیەکی دەدا.

شەریف ئیمامی نەیدەتوانی گیروگرفتەکان لا بدا. ناڕەزایەتییەکە یەکجار زۆر ببوو. بەرنامەکانی کە شا لە ئەمریکای وەرگرتبوو، پێویستی بە پیاوێکی زۆرزان، ورد و ئەترس بوو.

خەڵکی ناڕازی بە تایبەتی فەرهەنگییەکانی پایتەخت دەنگی ناڕەزایەتیی خۆیان دەردەبڕی، رۆژی ۱۲ی بانەمەڕی ۱۳٤۰ خۆپیشاندانێکی گەورەیان لە تاران وەڕێ خست. بۆ بلاوە پێ کردنیان تیرئەندازی کرا، دوکتۆر خانعەلی مامۆستای دەبیرستانەکانی تاران کوژرا. سەد هەزار کەس زیاتر لە ناشتنەکەیدا بەشدار بوون و دژی رێژیم دروشمیان دەدا و رۆژ لەگەڵ رۆژ قەیرانەکە توندتر دەبوو.

رۆژی ۱٦ی بانەمەڕ شەریف ئیمامی بێ ئەوەی لە ماوەی سەرۆک وەزیریی خۆیدا کارێکی گرینگی ئەنجام دابێ، لە بەرپرسایەتیی خۆی وازی هێنا و ئیستعفای دا.

شا بێ مەحتەل بوون، دوکتۆر عەلی ئەمینی کردە سەرۆک وەزیر کە رۆژی ۱۸ یانی دوو رۆژ دواتر کابینەی خۆی ناساند.

دوکتۆر ئەمینی کە بۆ ئەمریکا ناسرابوو، ئێستا ئەو قەراردادە پڕ سوودەی کونسێرسیۆمیشی لە بیر نەچووبووەوە، کە بۆ ئەمریکا و ئینگلیسی جێ بەجێ کردبوو،

یەکێک لە باشترین مۆرەکان بوو کە دەیتوانی بە گور بێتە مەیدانی کردەوە و ئەو بەرنامانەی لە لایەن شاوە بە ئەمریکا بەڵێن درابوو کە جێ بەجێ بکرێن، بەڕێوەیان بەرێ.

دوکتور ئەمینی زۆر بە راشکاوی قسەی کرد و گوتی: «شا دەبێ ئیزنم بدا کارەکانم بەڕێوە بەرم و داخوازەکانی ئەویش بەجێ بگەیەنم».

ئەمینی ئەفەسی لە جێگای گەرم را دەهاتە دەر و پشتیوانی بەهێزی شک دەبرد، لە نوتقی دواتری خۆیدا هێرشی کردە سەر سەرۆک وەزیرەکانی پێش خۆی، باسی بەرپرسانی ناڕاست و فەسادی کرد و هاتە سەر باسی پێویستی مەسەلەی زەوی و زار.

ناوبراو بێ مەحتەلی هێندێک کاری کرد کە لە ئێران تا ئەودەم نەکرابوو. بەختیاری بەرپرسی ساواکی وەلا نا، سپەهبود حاجی عەلی کیا، عەلەوی موقەدەم، سەرلەشکر ضرغام، سەرتیپ روح الله نوحی، سەرتیپ ئەحمەد ئاجودانی گرت کە بەڕێز بەرپرسایەتییەکانیان، سەرۆک روکنی ٢ی ستادی ئەرتەش، سەرۆکی شارەوانیی گشتی، وەزیری گومرگ، بەرپرسی ئیدارەی قەند و شەکر و بەرپرسی ئیدارەی کارەبا بوون.

هەروەها سپەهبود ئازمودەشی کە ماوەی ٩ ساڵی دوای کوودیتای ٢٨ی گەلاوێژ، حوکمداری یەکەمی بەشی قەزایی بوو، گرت. زۆر حوکمی کە ئەوان دابوویان هەڵوەشاندەوە. بەشێکی بەرچاو لە بەندییەکان لە ساڵەکانی ٤٠ و ٤١ بەردران. ئەو بەردانە بەشێکی بەرچاو لە بەندییەکانی حیزبی ئێمەشی گرتەوە.

شا بە دوای هاتنە سەر کاری ئەمینی مەجلیسی شورای دەورەی بیستەمی کە دوو مانگ زیاتر لە تەمەنی تێ نەپەڕیبوو هەڵوەشاوە راگەیاند.

جەبهەی میللی هەر لەو مانگەدا لە مەیدانی جەلالییە میتینگێکی گەورەی بەڕێوە برد. شاش بۆ یەکەم جار لە بەرامبەر ئەواندا لە دۆشان تەپە بە بۆنەی ٢٨ی گەلاوێژ و سەرکەوتنی کوودیتاکەی گۆڕین میتینگی بەرپا کرد و ئەو رۆژەی بە ردستاخیز، واتە رۆژی زیندووبوونەوە ناوبرد.

لە خەزەڵوەری ئەو ساڵەدا فەرمانی بەڕێوەچوونی دابەش کردنی زەوی بۆ ئەمینی نووسی کە دوایی گەیشتە پلەی سەرەوەتر و ناوی نا شۆڕشی شا و خەڵک.

گەلاڵەی دابەشکردنی زەوی لەجاری یەکەم دا بۆ دەردەبەگەهەرە زلەکان بوو کە ١/٥ی زەوییەکانی دەگرتەوەو پایەی ملکداریی گەورەی لەرزاند. ئەو کارە پەکی بەرهەمی خست و بەرهەم زۆر لەوە کەمتر بۆوە کە لە پێشدا هەبوو، چونکە زۆر کەس کەردستەی

رەنێوهێنانی نەبوو.

ئەمینی لە بەرنامە و کارەکانیدا زۆر بە توندی چووە پێش، بەڵام دیسان هەر هێمنایەتی بەردەوام نەبوو. رۆژنامەکان تەنانەت گۆڤاری «خواندنیها»ش زۆریان لە سەر دەربار و زێر و نیمکانات و دارائی ئەوان نووسی. سەرۆک وەزیران لەسەر بوودجەی ئەرتەش کە خوازیاری کەم کردنەوەی بوو، لەگەڵ شا نێوانی تێکچوو و پاش ١٤ مانگان کە دوای موسەدیق تا دەورەی راپەڕینی گەلان کراوەترین دەورە بوو، وازی لە سەرۆک وەزیری هێنا.

لە رۆژی ٢٨ی تیری ١٣٤١ شا فەرمانی سەرۆک وەزیریی بۆ ئەمیر اسدالله علم نووسی. لە مانگی گەلاوێژی ٤١ لیندون جانسون جێگری سەرکۆماری ئەمریکا هاتە ئێران، لە وەزعەکە رازی نەبوو، لە چەند شوێن کە قسەی کرد، باسی بەڕێوەچوونی بەرنامەی پێشکەوتوو و عەدالەتی کرد.

شەڕی تەبلیغاتیی ئێران و سۆڤیەتیش کە لەسەر بەستنی قەراردادی دوولایەنەی ئێران و ئەمریکا ساز ببوو و سێ ساڵی کێشا و تەواو بوو. لە هاوینی ١٣٤٢دا چەند قەراردادی گەورەی گاز و توانەوەی ئاسن و.. یان پێکەوە ئیمزا کرد.

عەلەم زۆری هەوڵدا جەبهەی میللی بێنێتە نێو حکوومەتەوە، بەڵام ئەوان لە شەرتەکانی خۆیان کە بەڕێوەبردنی قانوونی ئەساسی، دەست تێوەرنەدانی شا لە کارەکان و، ئازادی لەهەڵبژاردندا بوو، ئەهاتنە خوار و کێشەکە توند بوو و زۆریان لێگرتن.

رۆژی شەشی رێبەندانی ٤١ شا لەسەر گەڵاڵەی شەش ماددەیی خۆی ریفراندۆمی کرد و ئەو گەڵاڵە پەسند کرا:

١- هەڵوەشانەوەی نیزامی ئەرباب و رەعیەت

٢- قانوونی بوونی میللی کردنی لێرەوار لە هەموو وڵات

٣- بەشدارکردنی کرێکاران لە قازانجی کارخانەکاندا

٤- بەشدارکردنیان لە کارخانەکاندا بۆ ئەوەی هەست بە خاوەن بوون بکەن

٥- نوێ کردنەوە و باش کردنی یاسای هەڵبژاردن.

دوایەش چەند شتی دیکەی لێ زیاد کرد و خاڵەکان بوونە دوازدە.

لە پێوەندی لەگەڵ یاسای دابەشکردنی زەویدا پێویستە نیشارە بەوە بکرێ کە شا بە دوو مەبەستی سەرەکی ئەو کارەی کرد:

یەکەمیان ئەوە کە بۆی دەرکەوتبوو کە شۆڕشێکی جووتیاری خەریکی پێکهاتن و پەرسەندنە و بەو ریفۆرمە پێشی لەم مەسەلەیە گرت.

دووهەم ئەوە کە شا لەسەر زەخت و پێشنیاری ئەمریکا دەیهەویست نیزامی دەرەبەگایەتی زاڵ بەسەر کۆمەڵدا بگۆڕێ و سیستمی سەرمایەداری زووتر سەقامگیر بکا و بازاڕ بۆ کالای سەرمایەداری پێک بێنێ.

روحانیەت کە زۆر لە مێژ بوو نەقشی لە پارلەمان و بڕیاردان هەبوو، لەگەڵ ئەم کارانەی شا و ریفراندۆم موافق نەبوون.

پێش ریفراندۆم رۆژی ٢ی رێبەندان خومەینی ئیعلامیەی دەرکرد و ئەو کارەی بە دژی قانوون لە قەڵەم دا. دوو رۆژ دواتر شا لە قوم قسەی کرد و هێرشی کردە سەر مەلاکان و بە کۆنەپەرستی رەشی ناوبردن. لەوێڕا بەینی ئەو دوو لایەنە بەرەو توندی رۆیشت.

رۆژی ١٣ی جۆزەردانی ٤٢ بە بۆنەی عاشورا خومەینی لە قوم زۆر توندی قسە کرد و هێرشی سەختی کردە سەر شا و پێی دەگوت: تۆ، آقای شاه، بەدبەخت و لەم شتانە.

رۆژەکانی ١٣ و ١٤ی جوزەردان لە تاران و قوم خۆپیشاندانی گەورە بە دژی رێژیم کرا. شەوی پازدەهەم خومەینی لە ماڵی خۆی گیرا، بە دوای ئەوەدا چەند کەسی دیکەش لە مەلا ناودارەکان گیران و بردیانە تاران.

رۆژی پازدەی جۆزەردان خۆپیشاندانی زۆر گەورەتر کرا و چەکدارانی حکوومەت ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە خۆپیشاندەرانیان کوشت. ئەو راپەڕینە ناڵ و گۆڕێک بوو کە لە بواری پەرەساندنی دواتری بۆچوونی ئایینییەکان شوێنەواری خۆی دانا.

وەزع لە کوردستانی ئێران لەبار نەبوو، زەخت و فشار بۆ سەر خەڵک بەردەوام بوو. مەسەلەی زەوی و زار لەسەر پێوەندیی خەڵک بە تایبەتی لە بەینی ئاغا و رەعیەت تەنسیری دانابوو. هەر لەسەر ئەو وەزعە هێندێک کەس لە خاوەن ملکەکان لە ئێران تۆرابوون و چووبوونە کوردستانی عێراق.

ئەحمەد توفیق لە لای سەرۆک بارزانی وەک نوێنەری حیزبی دێموکرات دەناسرا، قسە هەر قسەی ئەوبوو. کاک رەحمان قاسملوو یەک دووجار بە کردەوە لە لایەن کاک ئەحمەد هەڕەشەی لێ کرابوو، هاوڕێیانی حیزبی چەند جار لە بەغدا دەچنە لای مەلا مستەفا بۆ شکایەت لە کاک ئەحمەد و چارەسەری کاری حیزب، وەزعی خۆیان و ئەو هەموو کوردەی لە ئێران را هاتبوون و زۆرتریان وەک لە پێشدا باسمان کرد، لە سلێمانی پێکەوە

ژیانێکی پڕ مەینەتیان دەبردە سەر، بەڵام ئەوانە هیچ سوودیان نەبوو، بەکردەوە مەلا مستەفا کاک ئەحمەدی دەویست و کەسی دی. زۆربەی هاوڕێیانی دی وەک کاک رەحمان قاسملوو کە لە زانکۆ دەرسی گوتۆتەوە و کاری دیکەشی کردووە، کاک کەریم حیسامی، حەمەی حاجی سەعید و یوسف ریزوانی لە بەغدا مەجالی کاری حیزبیان پێ نەدراوە. گیروگرفتەکان زۆر قووڵ ببوونەوە، تەنیا مەلا مستەفا دەیتوانی چارەسەری بکا. ئەویش یا نەیویستووە و یا ئەوەی راستی بێ بە خاتری کاک ئەحمەد دەستی لە هەموو بەرپرسان و کادرەکانی حیزبی هەڵگرتووە و قەت وەڵامێکی جێی رەزامەندی و پڕ سوود بۆ حیزبی پێ نەداونەوە.

کار گەیشتۆتە جێگایەک کە لە پێشدا کاک رەحمان قاسملوو بە خۆی و خێزانییەوە دەگەڕێتەوە ئورووپا، دوایەش لە ساڵی ١٩٦٠ دا کاک کەریم حیسامی دەڕوا.

هەر لەسەر ئەم وەزعە گەلێک کەسی دی وەک قاسم سوڵتانیان، یوسف ئەنوەری، عەزیز فەلاحی و محەمەد ئەمین راتبی دەگەڕێنەوە ئێران و کەم و زۆر دەگیرێن و ئەشکەنجە دەکرێن و حوکم دەدرێن.

هەتا ساڵی چل و یەک وشۆڕشی ئەیلوول، لە کوردستانی رۆژهەڵات تێکۆشانێکی ئەوتۆ نەبوود، ناکۆکیی هاوڕێیانی حیزبی لە بەندیخانە و کوردستانی عێراق تەئسیرێکی زۆر خراپی لەسەر کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان هەبوود.

وێدەچێ ئەگەر شەیتان و شۆفار دەمارگرژی، شووینیزمی عەرەب و بۆچوون و مەسلەحەتی ولاتانی زۆردار و پاوانخواز لێ گەڕابان، کورد و عەرەب وەک مانگەکانی سەرەتای شۆڕش و کاتی گەڕانەوەی بارزانییەکان بەیەکەوە برایانە ژیابان، ئەم هەموو ناکۆکی و ناتەبایی و شەڕ و شوورە پەیدا نەبووبا، ماوەی ئەو سی چل ساڵە یەکتریان نەدەکوشت و ئەم دەربەدەری و ژیانە تاڵ و پڕ لە دوژمنایەتییەش نەدەهاتە گۆڕێ.

بەڵام بە زۆر دەلیل و پێویستی مێژوویی لە ئەیلوولی ١٩٦١ مەشخەڵی شۆڕش لە کوردستان هەڵگیرسا و بە گەڕانەوەی مەلا مستەفا بۆ کوردستان پەرەی سەند.

هەڵایسانی ئەم شۆڕشە مەزن و درێژخایەنە کە بە مانای واقیع کڵپەی ساندبوو و ببوو شۆڕشێکی تەواو گەلی و هەموو چین و توێژی کوردستان تێیدا بەشدار بوون، لە سەر وردی زۆر لاوازبووی خەڵکی کوردستانی رۆژهەڵاتیش یەکجار کاریگەر بوو. هیوا و هومێدێکی تازەی لە دڵی خەڵکدا زیندوو کردەوە.

ئەندامانی حیزب لە کوردستانی عێراقیش تارادەیەک بە خۆیاندا چوونەوە، ریزەکانی خۆیان بە دوو مەبەستی سەرەکی رێکخست و پتەو کرد.

یەک لەم دوو ئامانجانە گەشەدار کردنەوەی کاری رێکخراوەیی و تێکۆشان لە کوردستانی رۆژهەلات بوو، دووهەمیان هەلگرتنی ناتەباییەکان و خۆسازدان بۆ بەشداریی چالاکانە و هەمەلایەنە لە شۆرشە پیرۆزەکەدا.

لە مەبەستی یەکەمدا توانیان بە ناردنەوەی هێندێک لە پەنابەرەکان و تێکۆشانیان بە شێوەی نهێنی زۆر زوو بچنەوە ناو خەلک، لە ناو چین و توێژە جۆراوجۆرەکاندا خەریکی رێکخستن بن.

لەو بوارەدا وا چوونە پێش کە لە زۆر شوێن کۆمیتە داندرانەوە، پشتیوانیی ئەوە ئاشکراش لە شۆرش دەکرا و گەلێک جار یارمەتیی بەرچاو کۆ دەکرایەوە و دەنێردرا بۆ شۆرشی کوردستانی عێراق.

لەم پێوەندییەدا زۆر لاوی خوێن گەرم و خاوەن هەست لە شوێنە جۆراوجۆرەکان را دەهاتن بۆکارو تێکۆشانی حیزبی و راستەوخۆ لەگەل شۆرش پێوەندییان دەگرت. بۆ نموونە بانەمەری سالی ٤٢ تاقمێکی باش لەم کەسانە وەک کاک حەسەن رەستگار و کاک حسێن مەددەنی و چەند کەسێکی دیکە لە مەهاباد را هاتن دەتوانین بلێین هێندێک لەم ئەفرادە ئێستاش بەشداری لە کاروباری پارتی دەکەن و تاق تاق بە بەرپرسایەتیی بەرزیش گەییون، ئەو کات هاتوون و هەروا لە خەبات دا بەردەوامن.

هەر لە سالی ٤٢ دا رێژیم بۆ چاوترساندنی خەلکی کوردستانی ئێران تاقمێکی زۆری بە کۆمەل لە تێکۆشەرانی شار و گوندەکان گرت و بۆ ماوەیەک لە بەندیخانەکانی قزل قەلا و قەسری قاجاری قایم کردن.

لە نێوخۆی کوردستانی عێراقیشدا هاورێیانی حیزبی وا دەبەردەوە چووبوون و بە چەشنێک خۆیان تێکەلاو کردبوو کە زۆر کەس وایان بیر دەکردەوە حیزبمان لە پارتیدا دەغم بووە.

هاورێیانی حیزبی ئێمە، کاک ئەحمەد تۆفیق و کاک رەشەی قاچاغچی لە یەکەم کەسانێک بوون کە بۆ هاوکاری و دەربرینی هاوکاریی حیزب بە پێیان و بە کوێرەوەرییەکی زۆر خۆیان گەیاندۆتە لای زاخۆ و چاویان بە مەلا مستەفا کەوتووە و ئامادەگیی دووبارەی خۆیان دوای پەلاماری بەرینی هێزی حکوومەت لەگەل ئەو دەربڕیوە کە زۆری پێ خۆش

بووه و سویاسی کردوون. دوایەش بە پەلە گەڕاونەوە، چەند فەردە پالتۆ و چەند کارتۆن دەرمانیان بۆ بردوون.

کە پێشمەرگە ڕێک خراوەتەوە، هەوالآنی ئێمەش بە نۆبەی خۆیان لە شەڕەکاندا بەشدار بوون و گەلێک کەسمان لەم سەنگەرە پیرۆزەدا شەهید بوون. لە چەند شوێنی وەک زینوێی شێخ، سریشم، سونێ و لای ماوەت بنکەی پێشمەرگەیان هەبووە. زۆر کەس دەزانن کە کاک ئەحمەد بۆ خۆی و جەماعەتێکیش کە لەگەڵی بوون، لە شەڕی هەندرێن و هێندێک شەڕی دیکە چالاکانە بەشدارییان کردووە.

لە باری دیپلۆماسییەوە، برایانی ئێمە زۆریان خزمەت کردووە. بۆ نموونە ئەو کات کە دوژمنان لە هەموو لایەکەوە خەریکی تێکدانی شۆڕش بوون، ئێران و تورکیە و سووریە هێزیان کۆکردۆتەوە لە سنوورەکان را بە پشتیوانی لە عێراق هەڵکوتنە سەر کوردان بارزانی چاری نامێنێ نامە بۆ دەوڵەتی سۆڤیەت دەنووسێ، ئەم نامە لە ڕێگەی کاک ئەحمەد و هاوڕێیانی دیکەی ئێمە بە هۆی کاک خدر مەرسەنە پێشمەرگەی حیزبمان دەبردرێتە تاران و لە ڕێگەی شەهید سەدیق ئەنجیرییەوە دەدرێ بە سەفارەتی سۆڤیەت، بە خۆشییەوە زۆر زوو نامەکە دەگا و پاش چەند ڕۆژ نەتیجەکە ئەوە دەبێ کە دەوڵەتی سۆڤیەت لە رادیۆ مۆسکۆ را هەرەشە لەو دوەڵەتانە دەکا و دەڵێ ئەگەر دەست لە کاروباری کوردان وەردەن و هێرشیان بکەنە سەر، ئێمە بێ لایەن و بێ دەنگ نابین، ئەوانیش پاشەکشەیان کرد و گەڕانەوە شوێنەکانی پێشوویان.

ئێستاش لە روانگەی هێندێک هاوڕێیانی حیزبی یەکێک لە تاوانەکانی کاک ئەحمەد تۆفیق، ئەوەیە کە پێوەندیی بۆ مەلا مستەفا لەگەڵ باڵوێزخانەی ئەمریکا پێکهێناوە زۆر نیشانەش هەن کە دەردەخەن ئەوە راستە.

بێ گومان قاچاخ بوون و هاتنی کاک سەدیق ئەنجیری بۆ کوردستانی عێراقیش لە ساڵی ٤٢ دا لەسەر بەشێک لەم پێوەندییانە بووە زۆر بە داخەوە قەتیش ئەگەڕایەوە و چاوی دایک و بابی لە تاوان کوێر بوون.

کاک ئەحمەد بە کردەوە بەرپرسی یەکەم دەبێ و لە روانگەی مەلا مستەفاشەوە نوێنەری ئەگۆڕی حیزب دەمێنێتەوە، خۆی لە بەرامبەر کەسدا بەرپرس نازانێ، بایەخ بە قسەی نزیکترین دۆستەکانی خۆی نادا بە پێچەوانەی ئەو کات کە لە کوردستانی ئێران بووە و روحی برایەتی، هاوکاری، جوامێری و نازایەتیی لە رادەبەدەر بووە، تووشی ڕەش

بینییەکی سەیر دەبێ و لەم پێناوەدا لە ساڵی ٣٩دا بێ لێکۆڵینەوە و زانیاریی پێویست فەرمانی کوشتنی یەکێک لە باشترین هاوڕێیانی حیزب کاک ئەسعەد خودایاری دەرکرد کە لە ڕێگەی قەلادزێ- سونێ دەیکوژن.

ئەو جۆرە کارانە بە تایبەت لە ساڵی ٤٢- ٤٣دا بوو بەهۆی ئەوەی بەشێکی بەرچاو لە کادر و ئەندامان کە لە عێراق بوون، پشتی تێکەن.

یەک دووجاری دیکەش هاوڕێیان کاک حەسەن ڕەستگار، کاک حسێن مەدەنی، کاک سەعید کوێستانی و... دەچنە لای مەلا مستەفا، وەزعی خۆیان و حیزب و ڕەفتاری کاک ئەحمەدی بۆ باس دەکەن کە بە داخەوە نە تەنیا ڕێگە چارەی بۆ نەدیتوونەوە، لێشیان تووڕە و نارەحەت ببوو!.

لەوەها وەزعێکدا کە کاک ئەحمەد دەبوو سەرافەتی هەموو لایەک بکا، کۆبوونەوە لەگەڵ کەس ناگرێ و گوێ بۆ قسەی کەس شل ناکا. حیزب و حیزبایەتی لە ڕەوتی ئاسایی ترازاوەو بۆتە هەرکەس هەرکەس. بۆیە هێندێک لە هاوڕێیان دێنە سەر ئەو باوەڕەی یەک لایەنە کۆمیتەیەک بە ناوی کۆمیتەی ساخ کەرەوە پێک بێنن. ئەو هاوڕێیانە وا بیر دەکەنەوە کە بەم شێوە دەتوانن ورده ورده ئەندام و پێشمەرگە لێک بڵاو و سەرگەردانەکانی حیزب کۆکەنەوە، چوارچێوەیەک دانێن و حیزبایەتی بە شێوەیەکی لەبار دەست پێبکەنەوە.

بۆ ئەم مەبەستە لە هاوینی ساڵی ١٣٤٣دا بەیانێک دەردەکەن و ئەو چەند کەسە وەک ئەندامانی کۆمیتەی ساخ کەرەوەی حیزب بڵاوی دەکەنەوە. لەو بەیانیەدا باسی کردەوەکانی ئەحمەد تۆفیق و لە خرتک چوونی دۆخی حیزبایەتی دەکەن و لە ئەندام و کادرەکان دەگێڕنەوە تا لە دەوریان کۆبنەوە و حیزب لەم وەزعە نالەبارە ڕزگار کەن.

ئەندامانی ئەم کۆمیتە بریتی بوون لە کاک حەسەن ڕەستگار، کاک حسێن مەدەنی، کاک سەعید کوێستانی، کاک قادر شەریف ( هاشم اقل الطلاب)، مەلا ئاوارە و مەلا ابو بکر فلسفی. ئەو هاوڕێیانە لە قۆڵێکەوە خەریک دەبن، کاک ئەحمەد و باقی هاوبیرانی لە قۆڵێکی دیکەوە، بەڵام مشت و مڕ و لێک دوان زۆر توند بووە، هەردووک لاش مەفرەزەی خۆیان بۆ کاری حیزبی دەنێرنەوە نێوخۆی وڵات.

ئەندامان و کادرەکانی کۆمیتەی ساخ کەرەوە تەقسیمی کار دەکەن، کاک حەسەن ڕەستگار لەگەڵ چەند کادر و پێشمەرگە بۆ ناوچەی مەنگوڕایەتی و مەهاباد، کاک حسێن

معدەنی بۆ ناوچەی گەورکایەتی، مەلا ئەبوبەکر و قادر شەریف و عبدالله سەدیق (عبدالله ئەعلیبندی) بۆ ناوچەی بانە، مەلا ئاوارە و خدر محەمەد پوور بۆ ناوچەی سەردەشت، سەعید کوێستانی و چەند کەسی دی بۆ ناوچەکانی ئەغەدە و پیرانشار دیاری کران. هەر تیمەی بۆ شوێنی خۆی وەڕێ کەوت یەک دوو جەولەی باشیان لەم ناوچانەدا کرد. تا رادەیەک خەڵکیان لە سەر وەزعی حیزب روون کردەوە. بناغەی کاری تەشکیلاتی تازەیان دامەزراند.

ئەم وەزعەش درێژخایەن نەبوو، لەبەر ئەوەی دەفتەری سیاسیی پارتی لە ماوەت هێرشی کرایە سەر و بە تەواوی لە سنوور تێپەڕین و ئاوای دیوی ئێران کران. ئەو هومێدەش کە بۆ کۆمیتەی ساخ کەردوە هەبوو و جارجار یارمەتییەکی مالی و چەک وتەقەمەنییان دەکردن، بڕا.

بەدبەختانە لەو کاتەشدا ناتەبایی و ناکۆکیی دەردی تێکدەر و ماڵ وێرانکەری کورد لە نێو سەرکردایەتی شۆڕشدا سەر هەڵدەدا. مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی پارتی لێک دەترازێن، مەلا مستەفا زۆرتر لە ناوچەی رانیە و بیتوین و دوایەش لە بادینان و باڵەکایەتی، چۆمان و حاجی ئۆمەران دەماوە. مامۆستا برایم ئەحمەد و مام جەلال و باقی برادەرەکانیان لە لای شارباژێر و جافەتی و ماوەت دەبن.

برایانی کۆمیتەی ساخ کەردوە، لەبەر ئەوەی کاک ئەحمەد لە لای مەلا مستەفایە و ئەویش پێشتر جوابی داخواز و ئیعترازەکانی ئەوانی نەداوەتەوە، پاڵ وەلای دەفتەری سیاسی دەدەن و وردە وردە کاری خۆشیان دەکەن.

لەم ئاڵۆز باڵۆزەدا لە سلێمانی کوردایەتی بە هێز دەبێ و جەرەیانێکی تازە بە ناوی کاژیک، کە شتێکی وەک کۆمەڵەی ژ-ک، ژیانەوەی کورد بووە، پێک دێ.

کاک سەلاحی موهتەدی و محەممەد ئیلخانی زادەش کە هەم خۆیان بە حیزبی زانیوە و هەم لە پێوەندی لەگەڵ دابەش کردنی زەوی و زار لە ئێران لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکە لە خاوەن مڵکەکان، هەریەکە لە شوێنێکەوە هاتبوونە کوردستانی عێراق، لە وەزعی شپرزەی حیزبیش لە کوردستانی عێراق حاڵی ببوون، لە هەل ومەرجەکە کەڵک وەردەگرن. لە ژێر تەنسیری کاژیکەکان جەرەیانێک بە ناوی رزگاریی کوردستان پێک دێنن کە جگە لەوانەی لە سەرەوە ناومان بردوون، مەلا رەحمان سەرشیوی، مەلا سەید رەشید، مەلا جەمیل، مەلا عومەر ئیگلەییان لەگەڵ بووە. کاک سەعدی موهتەدیش کە هاتبووە هێرۆی ناوچەی

قەڵادزێ، هاوبیری و هاوکاریی کردوون. زۆربەی ئەوانەی وەک ئەندامی رزگاریی کوردستان باسمان کردن، لە پێشدا ئەندامی حیزب بوون. هێندێک لەوانە دوایش گەڕانەوە نێو حیزب.

جگە لەوەی زۆر لە کادر و پێشمەرگەکان دڵسارد بوون، ئەندامانی حیزب ببوونە چەند بەش و هەر بەشەش بە نێوێک و بە هەوایەک کاری دەکرد. زۆرجاریش لە لای بارزانی شکایەت لە کاک ئەحمەد کرابوو، ناڕازییەکان هەموویان روویان لەو بوو، چونکە تەواوی کارەکانی بە تەنیا و بڕیاری خۆی جێ بەجێ دەکرد.

مەلا مستەفا ئەمری کردبوو کە دەبێ وەزعی خۆت لەگەڵ ئەو خەڵکە ساغ کەیەوە. هەموو رۆژێ ئەو شکایەت و سکالایانە وەڵام نادرێنەوە.

کاک سەدیق ئەنجیری و کاک سلێمان موعینی کە دۆستی هەرە کۆنی کاک ئەحمەد بوون، ئەیاندەتوانی لەوە زیاتر بێدەنگ بن. ئەوان پێش بینییان دەکرد کە ئەگەر وەزع هەر ناوا بڕوا، خەڵکەکەی بە دەوریانەوە ماون. بڵاو دەبن و زۆر ناکێشێ حیزب فیدای دەسەڵاتی تاکە کەسیی کاک ئەحمەد دەبێ. ئەوەشیان لەگەڵ خۆی باس کردبوو.

تێکۆشانی کۆمیتەی ساخ کەرەوەش لە نێو خۆی وڵات بۆ کاک ئەحمەد ببووە جێگای مەترسی. بیست سالیش بوو حیزب کۆنگرەی نەگرتبوو، لە سالی ٣٤ بەولاوە کە کۆنفرانسی یەکەم گیرابوو، هیچ چەشنە هەڵبژاردنێک نەکرابوو، رێبەرایەتییەکیش لە گۆڕێدا نەمابوو.

لە روانگەی کاک ئەحمەدەوە بە تایبەتی دوای رەتاندنی دەفتەری سیاسی پارتی کە خۆشی دەستی تێدابوو، چەند بنکەیەکی هاوڕێیانی حیزبیشی چەک کردبوو، شەرعیەت دانەوەیەکی تازە بە خۆی پێویست بوو. باشترین رێگاش بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەو شتانەی لە سەرەوە باس کران، گرتنی کۆنگرە بوو.

بۆیە لە ئاخری سەرماوەزی ١٣٤٣ لە بەینی شێنی و سونێدا لە نێوان سەردەشت و قەڵادزێ کۆنگرەی دوو بەسترا. نوێنەرانی بەشدار لەم کۆنگرەدا سێ سەد و چەند کەسێک بوون،بەشێکی بەرچاویان لە نێوخۆڕا و لە شارەکانی سەقز، بۆکان، مەهاباد، نەغەدە، بانە، سەردەشت و پیرانشارەوە هاتبوون و چەند کەسێکی ناوچەی شیمالیشی تێدا بوو. نوێنەرەکان هیچ کام لە رێگەی ئەساسنامە و لە لایەن شانە و ئۆرگان هەڵنەبژێردرابوون. زیاتر یان لەسەر بڕیاری کاک ئەحمەد تۆفیق و کاک سلێمان موعینی بانگ کرابوون.

دەبێ ئەو ڕاستییەش بگوترێ کە بە ڕاستی لە هەل ومەرجێکی ئاوادا هەڵبژاردن کارێکی هاسان نەبووە. بەشی زۆری بەشداران کادر و پێشمەرگەی ئەو کاتی حیزب بوون کە زیاتر لە ژێر دەسەڵاتی کاک ئەحمەددا بوون. شازدە حەڤدە کەس لە ئەندامانی کۆمیتە و کادرەکانی کۆمیتەی ساخ کەرەوە کە دەزانن کۆنگرە دەگیرێ لە ڕێگای دوور ڕا خۆ دەگەیەننە ئەو شوێنە بۆ ئەوەی ئیزنیان بدەن بەشدار بن و بەشی خۆیانی تێخەن و داخوازەکانیشیان بە کۆنگرە بڵێن و کێشەکە بە گشتی حەل بێ، بەڵام بە فەرمانی کاک ئەحمەد سەنگەریان لێ دەگرن و ناهێڵن بچن، لەوانە تەنیا کاک خدر مەرەسەنە کە هەم حیسابی عەشیرەتگەریی بۆ کراوە، هەم پێشتر هێندێک کاری گرینگ و تایبەتیی بۆ کاک ئەحمەد ڕاپەڕاندبوو، ئیزنی پێ دەدرێ بەشداری بکا.

باسەکانی کۆنگرە زیاتر لەسەر پەرەپێدانی خەبات و پشتیوانی لە شۆڕشی کوردستانی باشوور بووە، باسی خودموختاری لە کوردستانی ئێران هاتۆتە گۆڕێ، ئامادەیی وتووێژ لەگەڵ ڕێژیمی شا بۆ چارەسەری ئەم مەسەلە و ناسینی مەلا مستەفا وەک ڕێبەری جووڵانەوەی کوردستانیش باسێکی گەرم بووە. ئەو باسانە زۆربەیان بوونە بڕیار.

هەرچەند هاوڕێیانی خوێندەوار و لێزانی وەک کاک سەدیق ئەنجیری، کاک سلێمان موعینی و کاک ئەمیر قازی و زۆر مامۆستا و کادری لێ بوون، بەڵام ئەبز و ئەزمی بەڕێوەچوونی کۆنگرە هەر بە دەست کاک ئەحمەدەوە بووە.

ئەوەی زۆر بە ڕاشکاوی قسەی کردووە، کاک سەدیق ئەنجیری بووە کە لە زۆر باردوە سەرتر لە هەموان بووە. کاک سەدیق گوتوویەتی:

«ئێمە دەبێ وەک حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، سەربەخۆیی خۆمان بپارێزین و نابێ دوژمنایەتیی حیزبەکانی کوردستانی عێراق بکەین. خۆبەستنەوەمان بە هەر کام لەوان زیانمان لێ دەدا».

کاک سەدیق بڕوای بەوە بووە کە لەسەر بنەڕەتی ڕێزگرتنی بەرامبەر لەگەڵ هەموو لایەک پێوەندیی دۆستانەمان هەبێ.

کاک سەدیق و بەشێک لە بەشداران ئەهێشتنی هەڤاڵانی کۆمیتەی ساخ کەرەوەیان بە ناحەقی و کارێکی نادیموکراتیانە هەڵسەنگاندووە، بەڵام بە داخەوە زۆربەیان لەم بارەشەوە هەر لەگەڵ ئەحمەد تۆفیق بوون.

لەسەر حیزبی شیوعیش بڕیاریان دابوو بە تۆمەتی هاوکاری لەگەڵ ڕێژیمی ئەو کاتی

بەغدا بە دوژمنی دەرەجە دووی کوردیان بناسن.

لە کۆنگرەی دوودا ئەو کەسانەی ژێرەوە وەک ئەندامی رێبەری هەڵبژێردراون

١- کاک احمد تۆفیق

٢- کاک سلێمان موعینی(فایق)

٣- مەلا سەید رەشید سەقزی

٤- مەلا رەحیم ویردی

٥- کاک ئەمیر قازی

٦- کاک غەنی بلوریان

٧- کاک عەزیز یوسفی

٨- دوکتۆر عەلی مەولەوی(سێ ئەفەری دوایی، هەر سێکیان لە بەندیخانەدا بوون)

٩- حەبیب وەرزێر لە بۆکان

١٠- سنار مامدی

١١- باپیر شکاک(نحۆ)

١٢- مامۆستا هەژار

١٣- کاک سەدیق ئەنجیری

١٤- سەید کامل هاشمی

١٥- کاکە رەحیم جوائەرد قازی.

گوایە صارم الدین صادق وەزیریش هەر هەڵبژێردراوە، بەڵام لە خۆی نەبیستراوە، ئەوانە بەشێکیان لەوێ ئامادە نەبوون وغیابەن هەڵبژێردراون.

لەم کۆنگرەدا کۆمیتەیەکی چاودێریی بەرزیش هەڵبژێردراوە کە پێشتر لە حیزبی دێموکراتدا شتی وا نەبوود.

ئەندامانی چاودێریی بەرزیش ئەمانەی ژێرەوە بوون:

سەید حاجی، سەید رەسووڵ دێهقان، قادر لاچینی، م- ئیسحاقی، د- عەولا مەولەوی، سەید تاهیر کوڕی سەید کامیل هاشمی، کاک ڕەشەی قاچاغچی، عبدالله موعینی، مەلا نجمەددین کەوکەبی، مەلا کەریم عزیزی، وەستا رەئوف خەیات.

لەم کۆنگرەدا کاک ئەحمەد وەک بەرپرسی یەکەم داندراوە، کاری رێکخستنی نێوخۆ بەو نوێنەرانە ئەسپێردراوە کە بە نهێنی هاتبوون و دەگەڕانەوە بۆ نێوخۆ.

دوای کۆنگرە بەینێک کار کرا، تاڕادەیەکیش سەرکەوتنی تێدابوو، بەڵام بە پێی عادەتی کاک ئەحمەد جارێکی دیش بە کەڵک وەرگرتنی خراپ لە بەرپرسایەتی و دەسەڵاتی خۆی زۆرتری کارەکانی هەر لە دەست خۆیدا راگرتووە. کەمتر لەگەڵ هاوڕێیان و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی ماوەتەوە. حەزی کردووە زیاتر لە نزیک ئەو شوێنانە بێ کە مەلا مستەفای لێ بووە.

ناوبراو بە هەڵبژاردنی وەک بەرپرسی یەکەم، قەدری لە لای پارتی و شەخسی مەلا مستەفا زیاتر ببوو.

ئەندامانی کۆمیتەی ساخ کەرەوە پاش رۆیشتنی مامۆستا برایم ئەحمەد، مام جەلال، عومەر دەبابە، عەلی عەسکەری و باقی هەڤاڵەکانیان بۆ ئێران بێ ئیمکان مانەوە، هێندێک بنکەی ئەوانیش بەر پەلامار کەوت و بە ئەمری کاک ئەحمەد کە هێندێک جار بۆخۆشی بەشداری کارە ئیزامییەکان دەبوو، چەند بنکەیان لێ چەک کردن.

برایانی دەفتەری سیاسی پارتی کە لە کوردستانی عێراق جێگەیان لێژ ببوو، بەر لەوەی بچنە دیوی ئێران و بۆ هەممەدان دوور خرێنەوە، بە هەڤاڵانی کۆمیتەی ساخ کەرەوەی حیزبیان گوتبوو، مەسڵەحەتیان لەوەدایە لە جیاتی ئەوەی بچنەوە ئێران وتووشی گیروگرفت بن، خۆ بە پارتی و بارزانی بناسێننەوە باشترە. دیارە ئەوەدەم پێوەندییەکەی پارتی لەگەڵ رێژیم زۆر قووڵ نەببوو، زۆر شتیان بە قسە نەدەکردن. بەڵام سەرهەنگ موودەریسی خەیە و خەرگای بە عەرزێدا دابوو، راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ وەدوای کۆکردنەوەی خەبەر و زانیاری دەکەوت.

لە لایەکی دی هێندێک هەڤاڵ کە لە نێوخۆ بوون، بۆ بەرێوەبردنی ئەم سیاسەتە نامەیان نارد بۆ هەڤاڵانی خۆیان تا لە مەلا مستەفا داوا بکەن ئیزنیان بدەن بگەڕێنەوە کوردستانی عێراق. ئەم داخوازە لە لایەن مەلا مستەفاوە کە پێشتریش دژایەتیی لەگەڵ چوونەوەی کادر و پێشمەرگەی کوردستانی ئێران دەکرد، قبوڵ کرا و ئیزنی دان بچنەوە رانیە.

دەمێک بوو کاک ئەحمەد ئەهاتبووە پشدەر، بەکەڵک وەرگرتن لە دووریی ئەو، بەینی برایانی رێبەری هەڵبژێراوی کۆنگرەی ٢ و کۆمیتەی ساخ کەرەوە پێوەندییەک پەیدا بوودە، لە لایەن کاک سەدیق ئەنجیری، کاک سلێمان موعینی و کاک ئەمیر قازی و چەند هاوڕێی دیکەوە باسی تێکەڵ بوونەوە دێتە گۆڕێ. بە خۆشییەوە زۆری پێ ناچێ لەسەر ئەو قەرارە کە ئەندامانی کۆمیتەی ساخ کەرەوە ببنە جێگری کۆمیتەی ناوەندی، تێکەڵ

بوونەوە. رێبەریی حیزب بە هێزتر بوو، هێندێک کادر و پێشمەرگەش کە سەرگەردان بوون، هومێدیان پەیدا کردەوە، هەڤاڵان بە تێکڕا بەینێکی باش پێکەوە کاریان کرد.

قادر شەریف و سەعید کوێستانی کاتی ئەم یەکگرتنەوەی دوو بەشی حیزب کە یەکێک لە کارە باشەکانی ئەو سەردەمە بووە و هەموو لایەکی خۆشحاڵ کردووە، بۆ کاری حیزبی لە ناوچەی بانە دەبن. بە شوێنیاندا دەنێرن لە گوندی«ورچەک» دەیاندۆزنەوە، کاک سەعید کوێستانی لەگەڵ هەڤالانی نێردراو دەگەڕێتەوە، بەڵام کاک هاشم«قادر شەریف» ئەو ڕێککەوتنە قبووڵ ناکا و ناگەڕێتەوە.

بۆ ئەوەی کێشەکە کۆتایی پێ بێ، مەلا ئاوارە و چەند کەسی دی دەچن، بەڵام سەنگەریان لێ دەگرێ، ئەوانیش ناچار دەبن خۆی و ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵی بوون، چەک کەن و بیهێننەوە بۆ سونێ کە ئەو کات بنکەی سەرکردایەتیی لێ بووە. بە دوای ئەم وەزعەدا هاوڕێیان خۆ کورج و گۆڵ دەکەن و لە چەند تاقمدا دەچنەوە نێوخۆ. تیمێک کە سەرۆکەکەی کاک فایق و جێگرەکەی کاک حەسەن ڕستگار دەبێ، لە ناوچەی گەورک و مەنگوڕایەتی و هەردوو ئەڵێن، بە باشی و بە تێبینی دەگەڕێن و لە بواری تەشکیلاتیدا تێکۆشانی بەرچاویان دەبێ. ئەو هاوڕێیانە لە «پانە سەر» گوێز و گوێبەد لەگەڵ ژاندارمەکان تووشی یەک دێن و شەڕێکی قورسیان لە نێوان دەقەومێ، ژاندارمێک بریندار دەکەن، ئەوانی دیکەش هەموو بەدیل دەگرن. پاشان بریندارەکە تیمار دەکەن و لەسەر بۆچوونی خۆیان و تکای ڕدێن سپییەکانی ناوچەکە هەموویان سوێند دەدەن کە خیانەت نەکەن و ئازادیان دەکەن و چەکەکانیشیان دەدەنەوە.

ئەو ڕووداوە دەنگی دابووەوە، دواتریش لە زۆر شوێن ژاندارمەکان کە دەیانزانی پێشمەرگە لە گوند یا ناوچەکەیە، کەمتر خۆیان لێ دەدا.

سەرۆک بارزانی ئەو ڕووداوەی لە لایەن کاربەدەستانی ڕێژیمی ئێرانەوە بە گوێ هەڵێندرابوو، بە پێی ڕادەی تووڕەیی ئێرانییەکان، ناڕەزایی خۆی دەربڕیبوو. کاک حەسەن ڕەستگاریش کە بۆ کارێکی تایبەتی گەڕابووەوە بۆ دیوی عێراق، ئاگاداری تووڕەیی مەلا مستەفا دەبێ. کاک سلێمان ئاگادار دەکا. ئەویش دەگەڕێتەوە.

لەو کاتەدا بووە کە هێندێک لە بنکەکانی حیزبی دێموکرات لە سنوورەکان بە پێی بڕیاری سەرکردایەتیی شۆڕش کۆ دەکرێنەوە. کاک سەدیق ئەنجیری کە بۆ ماوەیەک دەچێتە لای چۆمان بۆ سەردانی کاک خالید حیسامی و مامۆستا هەژار و مامۆستا هێمن کە لەوێ دەژیان و هاوکاریی ڕادیۆی پارتیان دەکرد، بەداخەوە پاش بەینێک بە شێوەیەکی

ناجوامێرانه بێ سەرو شوێن دەکرێ. لەگەڵ ئەوەی هەم هاوڕێیانی حیزبی و هەم باوکی پیر و بە جەرگ و زەحمەتکێش و خەباتکاری دوای پێ و شوێنی کەوتن، بە تەواوی روون نەبووەوە بە دەست کێ و چۆن شەهید کرا، بەڵام دەنگۆی بەهێز هەبوو، چونکە پیاوێکی زاناو تێکۆشەر و شۆڕشگێڕ بووە، ئەچۆتە ژێر تەئسیری ئەحمەد تۆفیق، ناوبراو کاک سەدیقی بە رەقیبی سیاسی خۆی زانیوە، دوور نییە بە پیلانی ئەو تێدا چووبێ، هێندێک مرۆڤی کەم بڕواش لە نزیکانی ئەحمەد تۆفیق دوای ئەو رووداوە خۆیان تەحویلی رێژیم داوەتەوە کە پێشتر وازیان لە پێشمەرگایەتی هێنابوو، ئەوەش گومانەکە بەهێزتر دەکا.

کاک ئەحمەدیش هەر لەم بەینەدا کە هەست بەوە دەکا، هەموو لایەک دڵیان لێی ئێشاوە و کارەکانیش بە تەنێ راناپەڕن، کادر و پێشمەرگەش لە زۆر شوێن بە دەنگییەوە ناچن، لەگەڵ رەدکردنەوەی ئەو داوایەی مەلا مستەفا کە بە پێی وتەی هێندێک لە ئەندامانی رێبەری و نزیکانی خودی کاک ئەحمەد پێشنیاری پێ کردووە ببێتە نوێنەری پارتی لە تاران[*] و رەنگ بوو بتوانێ هێندێک کاری دیپلۆماسیش لە پێوەندی لەگەڵ باڵوێزخانەکان بکا، داوا لە بارزانی دەکا ئیزنی بدا لە شوێنێک دانیشێ و پێشمەرگایەتی بکا.

کاک ئەحمەد لەگەڵ چەند کادرێک و بەشێک لە پێشمەرگەکانی حیزب لە گوندی شێخانی باڵەکایەتی بەم مەسەلەوە خەریک دەبێ و تاڕادەیەک پێوەندی لەگەڵ هاوڕێیانی رێبەرایەتی کە زۆرتریان لە ناوچەکانی پشدەرو بیتوێن و شارەکانی قەڵادزێ و رانیە دادەنیشتن، زۆر کەم ببوو.

کاک سلێمان کە بەینێک لە قەڵادزێ و پشدەر دەبێ، وا دیارە لەوێ ژیانی بۆ بەز هەبووە و هەست بە مەترسی دەکا، دێتە دۆڵی شاوری و لە گوندی دێرێ دەمێنێتەوە.

چەند مانگێک ئەو وەزعە بەردەوام دەبێ و کار و تێکۆشانێکی ئەوتۆ بەرچاو ناکەوێ.

هەڤاڵان زیاتر خەریکی ژیانی شەخسی دەبن، چونکە دەردەتان بۆ کارو تێکۆشان لە نێوخۆی وڵاتدا نامێنێ.

---

(*) ئەم باسە وێ ناچێ راست بێ، چونکە ئەحمەد تۆفیق چەند جار لە دەست مەئموورانی ئێران هەڵاتبوو. کەسیش نەبوو بتوانێ لە قەول و قەراری ئێران دڵنیا بێ. مەلا مستەفاش نەفەری دیکەی زۆر بە دەورەوە بوو کە هەر کوردی عێراق بن و بتوانن ئەم کارە جێ بەجێ بکەن.

بەشی چوارەم

# کۆمیتەی شۆڕشگێری حیزب

لە ئێران لە ماوەی چەند ساڵی رابردوودا زۆر شت رووی دابوو. مەسەلەی دابەشکرانی زەوی ببووە هۆی نارەزایی بەشێکی بەرچاو لەو دەرەبەگانەی کە جاران دۆستی گیانیی شا و پشتیوانی بوون و خەڵکیان بۆ دەکوشت. ئەو مەسەلە گەیشتە شەڕێکی توند لە بەینی بویر ئەحمەدییەکان و مەمەسەنییەکان لە باشووری ئێران لەگەڵ دەوڵەت کە چەند مانگی کێشا و سەرکوت کران.

هەروەها ئەو مەسەلە سوودی ناخوندە گەورەکانی ئێرانیشی تارادەیەک خستبووە مەترسییەوە و هەر بۆیە ئەوانیش بە گشتی و لە پێش هەموویانەوە ایت الله خومەینی بە قسەکانی خۆی دژی شا و رێژیم لە دەورەی سەرۆک وەزیریی عەلەمدا گیروگرفتێکی زۆری پێکهێنا کە رووداوی رۆژی پازدەی جوزەردانی ۱۳٤۲ی لێ پەیدا بوو کە وەک باسمان کرد خەڵکێکی زۆری تێدا کوژرا و خومەینی و بەشێکی زۆر لە ناخوندەکان و بەڕێوەبەرانی«نهضت ئازادی» وەک ایت الله طالقانی و موهەندیس بازرگان و دوکتور سەحابی و عزت الله ی کوڕی لەو پێوەندییەدا گیران. هێندێکیش لە چەقۆکێشەکانی قەدیمی شا، وەک تەیب حاجی رەزائی کە لە کارگێڕانی کوودیتای ۲۸ی گەلاوێژ بوون، گیران و کوژران.

حیزبی تودەش بەشێکی بڕوای بە تێکۆشانی راستەقینەی نێوخۆی وڵات پەیدا کردبوو لە لایەک دەستەیەکی وەک بەهمەن قەشقائی و سمایل کەشکۆڵی ناردبووە جنووب، لە لایەکی دیکەوە بۆ ناردنەوەی کادری سیاسی وەک عەلی خاوەری و پەرویزی حیکمەت جوو ئیقدامی دەکرد، بەڵام هیچیان بۆ نەکرا.

جەبهەی میللیش شوورایەکی تازەی دانابوو‌وە، پێوەندییان لە ئەحمەدئاوا بە دوکتور موسەدقیشەوە گرتبوو و رێنوێنییان لێ وەردەگرت.

هێرشێکی هەمەلایەنە لە ژێر سێبەری «شۆڕشی سپی» شادا کرابووە سەر ئۆپۆزیسیۆن و هیچ هێزێک نەمابوو لاتی کەم چەند کەسی لێ نەکەویتە بەندیخانە.

رۆژی ١٨ی خاکە لێوەی ٤٣ خومەینی ئازاد بوو، ویستیان وا بنوێنن کە روحانیەت لەگەڵ شا رێک کەوتوون، بەڵام هەتا نووسراوەکانی رۆژنامەی ئیتلاعاتی لەم بارەوە پێ بەربەرچ نەدانەوە، دەستی هەڵنەگرت.

لە پاییزی ساڵی ٤٣دا لایحەی مەعافییەتی موستەشارانی ئەمریکایی لە سزادان لە ئێران، لە مەجلیس پەسند کرا. ئەو کارە بێ جێیە هەموو رووداوەکانی کۆنی زەمانی ئەنباکو و بەدەستەوگرتنی دەسەلاتی رابردووی بیر ئاخوندەکان خستەوە و بە تەواوی هاروژاندنی.

خومەینی لەسەر ئەو کارە کە لە بەرامبەر وەرگرتنی دووسەد میلیون دۆلار قەرز لە ئەمریکا جێ بەجێ کرابوو، زۆر بە توندی قسەی کرد و هێرشێکی بێ وێنەی کردە سەر شا و مەجلیس و بە نۆکەری ئەمریکای لە قەڵەم دان.

خومەینی لەسەر ئەو قسانەی دیسان لە رێکەوتی ٤٣ /٨/١٣ گیراوە و هێنرایە تاران و لەوێرا بە تەیارە نێردرایە تورکیە(*) پاش بەینێک لەوێش را بردرایە ئەجەف زۆری پێ نەچوو سەرۆک وەزیرانی تازە بە ناوی «منصور» کە دوای «علم» هاتبووە سەرکار، لە رێکەوتی هەوڵی رێبەندانی ٤٣ لە پێش دەرگای مەجلیس لە لایەن لاوێکی موسوڵمان بە ناوی بخارائی هێرشی کرایە سەر و بریندار بوو ودوای پێنج رۆژ مرد.

رۆژی ٤٤/٣/٢٦ بخارائی و جەماعەتێکی دیکە لەسەر ئەم مەسەلە ئیعدام کران.

بە دوای منصوردا ئەمیر عباس هویدا بوو بە سەرۆک وەزیر و هەتا گەلاوێژی ١٣٥٦ لەسەر کار مایەوە و حیزبی ئێرانی نوێی بۆ شا ساز کرد.

رۆژی ٢١ی خاکەلێوەی ١٣٤٤ شا لە کاخی مەرمەر لە لایەن سەربازێک بە ناوی شمس آبادی کە لە بەشی پارێزگاری شادا بوو، هێرشی کرایە سەر، لەگەڵ ئەوەی یەک دوو کەس لە دەوروبەری و پارێزەرەکانی کوژران، شا خۆی هیچی لێ نەهات.

دوایە دەرکەوت کە شمس آبادی لە رێگەی هێندێک رووناکبیری چەپی وەک پەرویزی نیکخواه و.. هان دراوە.

---

(*) تورکیە و ئێران ئەندامی پەیمانی سنتۆبوون کە لە جیاتی پەیمانی بەغدا ساز کرابووەوە، قەراری هاوکاریان لەم بابەتانەوە پێکەوە هەبوو.

لە گشتی ئەم رووداوانە و لە ئارادابوونی خەباتی چەکداری وەک شێوەی باو بە زۆربەی بزووتنەوەکان لە هێندێک لە ولاتانی جیهانی سێهەمدا و دەست تێوەردانی ئەمریکاییەکان لە کاروباری ئێران، بە تایبەت وەرگرتنی پارێزراوی سیاسی و قەزایی و لە هەمووان زیاتر سەرکوت کردنی راپەڕینی ١٥ی جوزەردان و دوور کردنەوەی خومەینی و گرتنی ئەو هەموو خەلکە و کوشتنی هێندێک و دانی حوکمی قورس بە زۆر کەس، رێگای قانوونی و خەباتی ئاسایی سیاسیی نەهێشتبووەوە(*). زۆربەی خەلکەکەی هێنابووە سەر ئەو باوەڕە کە دەبێ لە رێگەی خەباتی چەکدارانەوە، ئەو رژێمە نگریسە بە چۆک دابێنن. بۆ ئەم مەبەستەش موتالاکردن و خوێندنەوەی کتێبەکانی چریکی بۆکەلک وەرگرتن لە تەجرەبەی ولاتانی دیکە ببووە کاری رۆژانەی هەموو خاوەن هەستان.

دەست پێکردنی ئەو کارەش لە کوشتنی منصور سەرۆک وەزیر و مانگ و نیوێک دواتر لە تیرئەندازی لە شادا خۆی نواند.

هەر بۆیەش رێکخراوی لەم بابەتە وردە وردە لە ماوەی چەند سالاندا پێکهاتن کە لەوانە دەتوانین سازمانی چریکەکانی فیدایی، رێکخراوی موجاهیدینی خەلک، هێندێک دەستەی ئیسلامیی بچووک، هەروەها طوفان«گروە لرستان» و رێکخراوی شۆڕشگێری حیزبی توودە ناو بەرین.

بەلام بەرلە هەمووی ئەوانە رۆلە دلێرەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان بوون ئەو مەشخەلەیان بە ئازایانەترین شێوەی گونجاو هەلکرد. هەم زۆبەی بەرپرسانی لەم بواردا موتالای باشیان هەبوو، هەم ئاڕادەیەک هێز مەوجوود و ئامادە بوو و، لە ئەزموونیش بێ بەش نەبوو.

ئێران لەسەر راسپاردەی ئەمریکا خۆی زیاتر لە کاروباری شۆڕشی کوردستانی عێراق وەردەدا و لە هێندێک شوێن بە ئاشکرا ئەمر و نەهی دەکرد. هێدی هێدی شۆڕشی بەخۆیەوە گرێ دابوو. زۆربەی پارمەتییەکانی دەرەوەی لە رێگەی ئێرانەوە دەگەیشتە دەستی رێبەرایەتیی شۆڕش.

بەم پێیە داخوازی ئێرانیش لە شۆڕش دەچووە سەر، وای لێ هاتبوو داوای گرتن و تەحویل دانەوەی دیموکراتەکانیان دەکرد، هەر لەم پێوەندییەدا بوو کە ئەحمەد توفیقیان

---

(*) موهەندیس بازرگان لە دادگا گوتبووی ئێمە ئاخرین دەستەین کە لە رێگەی قانوونییەوە دژی ئێوە خەبات دەکەین.

نارده کانی ماسی بۆ ئەوەی لەبەر چاوان ون بێ. وێ دەچوو بۆ سلێمانیش بەرنامەیەکی ناوایان بووبێ لە دووشیان ناردبوو بچێتە پاراستن، بەڵام نەچوو. جگە لەوانەش بە توندی خوازیاری بەرگری لە چوونەوەی کادر و ئەندامانی حیزبی دیموکرات بۆ کوردستانی رۆژهەڵات بوون.

تەنگەبەر بوونەوەی ئەو مەیدانە و پێشێل کردنی ئەو مافە رەوایە بۆ تێکۆشەرانی کوردی ئێران، جگە لە سووکایەتیی چیدی نەبوو. بۆ مرۆڤی لیبرا و شۆڕشگێر تەحەمولی وەزعێکی ناوا، سەخت و دژوار بوو. بە تایبەت کە لە شەهید بوونی کاک صدیق ئەنجیری و دوور خستنەوەی ئەحمەد توفیق زۆر تێ نەپەری بوو. زۆربەشیان هەستیان بەم مەترسییە دەکرد و، مەترسی لەوەی کە بکەونە نێو ئەو داو و تۆڕانە و فیدا بن.

لە باس لێ کردن لەسەر ئەم وەزعە و هەل ومەرجە لەبەینی هاوڕێیان جیاوازیی بۆچوون دێتەگۆڕێ. هێندێک لە هاوڕێیان لەسەر ئەم باوەڕە دەبن کە ئەم وەزعە تەحەمول ناکرێ، ئەو شۆڕشە کە ناوا کەوتۆتە ژێر زەخت و تەنسیری ئێران، نایندەی روونی نییە و سەر ناکەوێ، بۆیە دەبێ چارەسەری وەزعی خۆیان بکەن و رێگایەکی خاوێنتر هەڵبژێرن و لە نێوخۆدا درێژە بە خەبات بدەن.

بەشێکی دیکەش لەسەر ئەو بڕوایە دەبن کە دەبێ چاوەڕوانی یەک لابوونەوەی شۆڕشی کوردستانی عێراق بن و بزانن چ دێتە پێش.

بەشێکی بەرچاو لە هەڤالان لایەنگری بۆچوونی یەکەم دەبن، بەڵام هێندێک لەوان دوایە پاشەکشە دەکەن و خۆ لە کێشەکە دەدزنەوە.

لایەنگرانی شێلگیری ئەم بۆچوونە قەرار دەدەن لە سەرەتای ساڵی ٤٦ی هەتاوی را بچنەوە نێوخۆ، لە پێشدا خەریکی پتەوکردنی ریزەکانی سیاسی و رێکخراوەیی حیزب لە نێو خەڵکدا بن. زەمینەکە خۆش بکەن و دوایەش بە شێوەی چەکداری لە بەرامبەر رێژیمی شادا خەبات بکەن. بۆ ئەم مەبەستە دوو کاری گرینگ دەکەن:

یەکەم، پێوەندی بە حیزبی شیوعی و نوێنەرانی حیزبی توودە لە بەغدا دەگرن، بەو هیوایە کە تەنییدی حەرەکەتەکەیان بکەن و یارمەتیی مالییان بدەن.

دووهەم، کۆمیتەیەک بە ناوی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکرات بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان پێک دێنن کە ئەندامەکانی بریتی بوون لە: کاک سلێمان معینی (فایق)، کاک سمایل شەریف زادە (مەلا عەزیز)، کاک محەمەد ئەمین سیراجی، مەلا ئەحمەد

شلماشی(ئاواره)، باپیر شکاک(نحو)، عەولا مەعینی. هێندێک کەس باسی سەنار مامەدی و مەلا عەولا سەربازیش دەکەن کە لەو کۆمیتەدا بوون، بەلام زۆرتر وەک دەنگۆ دەچێ. چونکە لە هیچ شوێنێک تێکۆشانی بەرچاویان نەبووە(*).

زۆربەی ئەو کەسانە لە نێو کۆمەلانی خەلکدا بەهۆی کاروتێکۆشانی پێشوویان ناسراو و خۆشەویست بوون. لەسەر ئەم ئەساسە لە نێوخۆیاندا کارەکان بەش دەکەن، چەک و چۆلی خۆیان هەلدەگرن و هەرچەند کەس بە سەرۆکایەتیی یەک دووکەس لە هاوڕێیانی کۆمیتە وەڕێ دەکەون.

بێ گومان ئەو کارەش وەک زۆر کاری دیکە لە ڕێژیمی شا ون نابێ، پێشتریش و بە تایبەتی دوای پێکهاتنی ئەو کۆمیتەیە سیخوڕەکان لە هەموو لایەکەوە ڕاپۆرت بە کاربەدەستانی ڕێژیم دەدەن. لەم بارەوە چەندین دەستوور و بەخشنامە بۆ بەرگری و بەربەرەکانی لە تاران و ورمێ و سنە ڕا بۆ کاربەدەستانی ڕێژیم و هێزە چەکدارەکانیان لە کوردستان دێ. نموونە لەم بابەتانە زۆرن، لە جێی خۆیدا یەک دوو دانە دەخەینە بەرچاوی خوێنەران.

هاوڕێیانی حیزبی کە ژمارەیان لە سەد کەس تێنەدەپەڕی، لە هەموو ناوچەکان بە شێوەیەکی ژیرانە لە نێو خەلکدا دەگەڕێن، لەسەر سیاسەتی حیزب، پێویستی و چلۆنایەتیی کارکردن و تێکۆشان لەم هەل ومەرجە، فڕوفیشالی شا و برسیەتی و هەژاریی خەلک و بێ بەشیی کورد بۆ جەماوەر باس دەکەن. بە چەشنێک کە حەساسیەتی ئالقە لە گوێکانی ڕێژیم نەجوولێنن و ئەوەندەی بکرێ جارێ تا پایە و بناغەیەکی باشی جەماوەری دەتەننەوە، تووشی شەڕ نەبن.

---

(*) کاک سەعید کوێستانی لە نامەیەک دا کە لە هاوینی سالی ۲۰۰۱ بۆمنی نووسیوە، ڕایگەیاندووە کە سەنار مامەدی و مەلا عەولای عبداللهی ناسراو بە سەرباز ئەندامی ئەو کۆمیتەیە بوون.

بەشی پێنجەم

# خەباتی چەکدارانەی ساڵەکانی ٤٦-٤٧

هەڤاڵان لەگەڵ هەموو وریاییەکی کە بەکاری دێنن و بە راستی لە وریا کردنەوەی خەڵک و پەرەپێدانی کاری حیزبیدا لە خۆبوردوویی زۆریان لە خۆیان نیشان دەدا.

خۆشەویستییەکەیان لە نێو جەماوەردا لە رادەبەدەر بووە و بۆ حەللی زۆر گیروگرفتی کۆمەڵایەتی لە زۆر شوێن لە جیاتی ئەوەی بچنە لای کاربەدەستانی رێژیم، داوای چارەسەری کێشەکانیان لەوان کردووە. ئەوانیش بە دڵپاکیی تەواو وڵامدەر بوون و ناکۆکی و ناتەباییەکانی نێو کۆمەڵانی خەڵکیان کە بەگشتی بۆ شۆڕش بە زیانبار زانیوە، کۆتایی پێهێناوە.

سەرەڕای ئەوەش دوژمنی فێڵباز و دڕندە غافڵ نەبووە، لەهەر دەرفەتێک کە بەدەستی هێناوە، زەبری خۆی وەشاندووە.

یەکەم دەستەی کە کەوتوونە بەر هێرشی دوژمن، کاک نەحۆ و چەندین هەواڵی دەبن، لە ناوچەی سەڵماس لە کاتی پشووداندا دەکەونە بەر پەلاماری تاقمێکی زۆر ژاندارم و گەمارۆ دەدرێن. لەم شەڕەدا جگە لە چوار هەواڵ کاک نەحۆ بۆ خۆشی دوای شەڕێکی قارەمانانە و کوشتنی تاقمێکی زۆر لە بەکرێگیراوان لە هێرشی هەمەلایەنەی ژاندارمی تازە نەفەس و هێلی کۆیەمردا کە لە ورمێ رادێنە یارمەتیی پیاوکوژانی پێشوو، شەهید دەکرێ.

هەر لە گەلاوێژی ئەو ساڵەدا پێنج کەس لە پێشمەرگەکان لە ناوچەی پیرانشار لە گوندی بندرەی دەکەونە بەر هێرشی دوژمن، دوای ئەوەی ٩ کەس لە دوژمن دەکوژن، پەنا دەبەنە گوندی«نالانە»ی کوردستانی عێراق کە لە ژێر حوکمی شۆڕش دابووە.

بەداخەوە دوایە هێرشیان دەکەنە سەر و لە ناکامدا یەکیان لێ دەکوژرێ و ئەوانی

دیکەش کە یەکیان برینداریش بووە، تەحویلی ئێران دەدەنەوە و ئیعدام دەکرێن.

مەلا مەحموود زەنگەنەش یەکێک لە رۆڵە تێکۆشەرەکان بووە کە لە رەزبەری ٤٦دا لە ناوچەی میرقازی مەهاباد شەهید دەکرێ و تەرمەکەشی لەسەر کاپووتی ماشێن دادەنێن و لە شارەکان دەیگێڕن، بە قەولی خۆیان بە چەتەیان لە قەڵەم داوە.(*)

هەر هاوینی ساڵی ٤٦ بوو کە کاک سلێمان و هاوڕێیانی لە سپی سەنگ تووشی شەڕێکی نەخوازراو بوون، هێزێکی زۆر و هێلی کۆپتەریان دێتە سەر. لەوێ کاک عەولا موعینی بریندار دەبێ و و دوایە عیلاج دەکرێ، بەڵام چەند ژاندارم دەکوژرێن و یەکێک لە ئەندامانی حیزب بە ناوی سلێمان کە بە زاهیر بۆ رێنوێنی، بەڵام لە راستیدا بۆ هەڵەکردنی ژاندارمەکان لەگەڵیان کەوتبوو، شەهید دەکرێ.

سەرەڕای ئەوەش کاروتێکۆشان هەر درێژەی دەبێ، وورەی خەڵکی زەحمەتکێش دەچێتە سەر وورەی دوژمن زیاتر دادەبەزی.

رێژیم لە بنەوە خەریکی سازدانی هێزی پوشتەوپەرداخ بوو، هەروەها بەهۆی پووڵێکی زۆر کە بۆ سەرکوتی کورد تەرخان کرابوو، تاق و لۆق جاشیشیان پەیدا کردبوو کە شان بە شانی ژاندارم و چەکدارەکانی دیکەی شا دژی خەباتگێرانی کورد رادەوەستان و شەڕیان لەگەڵ دەکردن.(**)

لە ساڵی ٤٧دا رێژیم هەستی بە مەترسییەکی زیاتر کرد. بۆیە جگە لە هەموو کەل و پەلێکی جەنگی سی تا چل ملیۆن تمەنی بوودجە بۆ تەرخان کرد، هێزێکی یەکجار زۆری لە هەموو شوێنەکانی دیکە را هێنایە کوردستان. بۆ فەرماندەیی ئەم کارەش سپهبد اویسی کە کاتێک بەرپرسی هێزی پارێزەری شا بووە و دوایە ببوو بە بەرپرسی گشتیی ژاندارمریی ئێران، دیاری کرابوو. جگە لەو هێزە، ساواکیش بە هەموو تواناوە هاوکارەکانی خۆی لە ناوچە جۆراوجۆرەکاندا بۆ وەرگرتنی زانیاری و هەڵگرتنی پێ و شوێنی پێشمەرگەکان هان دابوو وبە توندی وەگەڕی خستبوون.

کاربەدستانی ساواکیش کە پارە و پووڵی زۆریان بە دەست اویسی یەوە دەدی لەبەر

(*) رێژیمە زۆردارەکان بۆ شێواندنی زەینی خەڵک هەردەمە ناوێک لەسەر خەباتکاران دادەنێن. زەمانێک لە دوای کۆمار متجاسر، دوایە کافر و کۆمونیست، لەم فەترەیەشدا وشەی چەتەیان بۆ پێشمەرگەکانی کوردستان بەکار دێنا.

(**) جاشە بە ناوبانگەکانی ئەو سەردەم لە ناوچەی ورمێ، چیچو- لە پیرانشار، رەحمانی شلێم جاران و سەید باپیر- لە بانە، کوێخا شەریف و عەبدوڵلا خان و یەک دوو ئەحمەدی لە بۆکان، عەلی فەراش و لە سەردەشت، هەڵمەت دەبن.

دەستیدا وەک میوەڕۆن نەرم بوون. لەم ڕێگایەوە هێندێک ئەفرادی لەرزۆک و بێ ئیمانی وەک کوێخا شەریفیشیان کە بەناو لە ریزی شۆڕش دابوون، کڕیبوو.

کاک سمایلی شەریف زادە بە ناوی نهێنی مەلا عەزیز لەگەڵ کاک محەممەد امین سراجی و چەند کەسی دی لە ناوچەی بانە خەریکی تێکۆشان دەبن، کوێخا شەریفی خۆفرۆش دەرفەت دێنێ و کاک سمایل بریندار دەکا. بۆخۆی هەڵدێ و شوێنی هاوڕێیان بە جاش و چەکدارەکانی ڕێژیم دەڵێ.

نزیکەی ٤٠٠ کەس لە دارێنە هەڵدەکوتنە سەریان و داوای تەسلیم بوونیان لێ دەکەن، بەڵام بە خۆڕاگریی شێرانە و شەڕی شەش سەعاتەی دلێرانە وەڵامیان دەدەنەوە. کاک سمایل و سێ کەسیان شەهید دەبن و تەرمەکانیان دەبەنە بانە و سەقز و لەوێ را بۆ سنەیان دەبەن و هەر لەوێ بە خاکی نیشتمانیان دەسپێرن.

سراجی کە پێشتر گەڕابووەوە کوردستانی گەرمێن، چەند ساڵێک لە ژێر باڵی حیزبی شیوعی و هەروەها لە بەکرەجۆ لە لای مام جەلال بە نیوە نهێنی دەژیا.

هەر لەو مانگەدا کاک سلێمان بۆ کاری حیزبی چووبووە کوردستانی گەرمێن و بۆ چاوپێکەوتنی هێندێک کەس و پێوەندی گرتن لەگەڵ هەڤاڵانی دوورە وڵات و حیزب و ڕێکخراوەکان، لە گەڕانەوەدا بە دەسکیسی هێندێک پیاوی گومان لێکراو کە یەکیان قالە تەگەرانی بوو، لە داوی کاربەدەستانی شۆڕشی کوردستانی عێراق دەخرێ و بە هۆی سەدیق ئەفەندییەوە دەنێردرێتە سەرکردایەتی و بەداخەوە دوای چەند ڕۆژ تەرمەکەی دەدرێتەوە بە کاربەدەستانی ئێران.

تەرمی کاک سلێمانیان لە پیرانشار و نەغەدە گێڕابوو، بەڵام لە مەهاباد بەهۆی دژایەتیی خەڵک لەگەڵ ئەم کردەوە ناحەز و دژی ئینسانییە، نەتەنیا ئەودیان بۆ نەکرا، بەڵکو تەرمی پیرۆزیان لە گونبەزان تەحویلی بنەماڵە و هەڤاڵانی کاک سلێمان دایەوە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە لە ڕۆژی پێشتر دا خەڵک ئاگادار کرابوون و شار نیوە تەعتیل ببوو، لە نێو پەژارە و هەستی خاوێنی هەزاران کەس لە دانیشتوانی مەهاباد بە خاک ئەسپێردرا. بە پێچەوانەی ئەمری ساواک، چەند شەووڕۆژ سەرەخۆشیی بۆ داندرا. پێشمەرگەی دڵسۆز و ئازا خەلیل شەوباش خەڵکی بانەش کە لەم سەفەرەدا لەگەڵ کاک سلێمان بوو، بە شێوەیەکی نادیار شەهید کرا.

لە مانگی پووشپەڕدا لە ناوچەی گەورکایەتیی مەهاباد لە نزیک گوندی قالوێ،

هێزێکی زۆر هەڵدەکوتنە سەر دەستەیەکی دیکە لە پێشمەرگەکان کە فەرماندەرەکەیان کاک عبدالله موعینی دەبێ. لە شەڕێکی یەک ڕۆژی زۆر نازایانەدا دوای ئەوەی ئەفسەرێک و چەند ژاندارم و جاشێک دەکوژن، بەداخەوە خۆی و مینەشمم شەهید دەبن.
کەسێکیش بە ناوی حەسەن خورخورەیی بە برینداری دەگیرێ و پاش ماوەیەک لەبەر چاوی خەڵکێکی زۆری شار کە بانگ دەکرێنە پادگان، لە مەیدانی تیرگوللەباران دەکرێ.
ڕۆژی ٢٥ی گەلاوێژی ٤٧ لە چیای زمزیران تەقە و لێکدانێک لە بەینی پێشمەرگەکان و هێزێکی دوژمن ڕوودەدا، فەرماندەی ئەرتەشییەکان دەکوژرێ ودوو سەربازیش بە دیل دەگیرێن کە لە لایەن هاوڕێیانی حیزبیەوە ئازاد دەکرێن، بەلام دوایە بە دەستووری اویسی هەردووک گوللە باران دەکرێن.
لە مانگی پووشپەڕدا هێزێکی زۆر لە گوندی سەرشیوی سەردەشت هەڵدەکوتنە سەر خەڵک و داوای جێگا و ڕێگای پێشمەرگەکانیان لێ دەکەن. لە پڕ پێشمەرگەکان بە فەرماندەیی قادر شەریف[*] کە لەو دەوروبەرە دەبن، شێرانە لێیان وەدەست دێن و جگە لە کوشتنی جاشێک بە ناوی هەڵمەت بێتووشی کە پێشتر ئەندامی حیزب بووە و دوایە تووشی خیانەت و خۆفرۆشی ببوو، پازدە شازادە ژاندارم و چەکداری ڕەسمیی ڕێژیمیش دەکوژرێن.
هەوڵی مانگی ڕەزبەر لە چیای حاجی کێمی ناوچەی ئاختەچیش هێندێک لە کادر و پێشمەرگەکانی حیزب بە فەرماندەیی سەید فەتتاحی ئیزامی خیانەتیان پێ دەکرێ و، لە لایەن هێزێکی زۆری ڕێژیمەوە گەمارۆ دەدرێن، ئەوانیش ئازایانە لێیان وەدەست دێن و شەڕێکی قارەمانانە دەکەن و شەهید دەکرێن.
هەر لە ڕەزبەردا دوو تێکۆشەری دیکە لە ناوچەی گەورکان، تووشی شەڕێکی قورس لەگەڵ تاقمێکی زۆری دوژمن دەبن. لە جیاتی تەسلیم بوون کە ویستی ژاندارمەکان بوو، دەست دەکەنەوە و تا ئاخر گوللە بە شەڕ دێن، بەداخەوە ئەوانیش شەهید دەبن و تەرمەکانیان بە دێهاتدا دەگێڕن و دوایە دەیانبەنە سەردەشت و بۆ ماوەیەک بە مەبەستی ترساندنی خەڵک هەڵیان دەواسن.
مەلا ئاوارە کە یەکێک لە ئەندامانی بەوەجی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی حیزبی دێموکرات

(*) قادر شەریف دوای شەهیدبوونی زۆربەی بەرپرسان، بۆ تۆڵەئەستاندن گەڕاوەتەوە کوردستانی ئێران و فەرماندەیی باقی پێشمەرگەکانی وەئەستۆ گرتووە.

بوو، له ئاخرییه‌کانی هاوینی ٤٨دا له‌گه‌ڵ دوو پێشمه‌رگه فیدای پیلانێکی [*] دوژمنان ده‌بن و له گوندی دیوالانی ناوچه‌ی سه‌رده‌شت له داو ده‌خرێن و ده‌گیرێن. هه‌ر ئه‌و رۆژه به هێلی کۆپته‌ر ده‌یبه‌ن بۆ جه‌ڵدیان. هه‌ر سێکیان له دادگای نیزامیدا به ئیعدام مه‌حکووم ده‌کرێن و ده‌یانبه‌نه‌وه سه‌رده‌شت و له‌وێ تیره بارانیان ده‌که‌ن.

دوای شه‌هیدکردنی مه‌لا ئاواره، تێکۆشه‌رانی حیزب له چیاکانی ده‌وروبه‌ری شه‌لماش جێگه‌ی له دایک بوونی مه‌لا ئاواره، شه‌ڕێکی به ناوبانگ و قاره‌مانانه له‌گه‌ڵ دوژمن ده‌که‌ن. فه‌رمانده‌ریی ئه‌و شه‌ڕه‌ش به قادر شه‌ریف بووه، نزیکه‌ی ٢٠ که‌سیان له دوژمن کوشتووه و بریندار کردووه، بۆ خۆشیان به سه‌لامه‌ت ده‌رباز بوون.

له ناوچه‌ی پیرانشار هاوڕێیان تێکۆشانی باشیان هه‌بوو، مراد شیرێژ بۆ ماوه‌ی چه‌ند مانگ به خۆپاراستن له شه‌ڕ و ده‌رگیربوون له‌گه‌ڵ چه‌ند هه‌ڤاڵی دی له‌و به‌شه‌دا مانه‌وه، له نێو خه‌ڵکدا جێگای خۆیان کردبووه‌وه و زراوی دوژمنیان تۆقاندبوو.

چه‌ند جارێک ته‌قه و لێکدان په‌یدا بووه. یه‌ک له‌م شه‌ڕانه له گوندی قوڕمه‌دوودیی ناوچه‌ی لاجان بووه که له‌وێ جاشێک به نێوی کوێخا که‌ریی به‌رکه‌مران ده‌کوژرێ و چه‌ند که‌سیش بریندار ده‌بن، یه‌کێک له پێشمه‌رگه‌کانیش بریندار ده‌بێ، بۆ موعالیجه ده‌نێردرێته مه‌هاباد، دوای موعالیجه مه‌وزووعه‌که ئاشکرا ده‌بێ و له‌م پێوه‌ندی یه‌دا چه‌ند پیاوی کوردی تێکۆشه‌ر که بێ گومان پێشتریش کاری ئاوا جوامێرانه‌یان زۆر کردبوو، گیران و حوکم دران. ئه‌و که‌سانه بریتی بوون له: سه‌ید محه‌مه‌د ئیسحاقی، محه‌مه‌د مامڵێ، عبدالله حه‌کیم زاده و کاک عه‌لی جانداران. سه‌ید محه‌مه‌د که له به‌ندیخانه‌دا فه‌له‌جیان کردبوو، به‌داخه‌وه دوای ئازاد بوونیش چاری نه‌کراو هه‌تا مردن له ماڵی خۆی نیشته‌جێ بوو.

---

(*) مه‌لا ئاواره که کادرێکی سیاسی- کۆمه‌لایه‌تیی زۆر به توانا بوو، ببووبه جێگای متمانه‌ی زۆربه‌ی کۆمه‌لانی خه‌ڵک و، زه‌حمه‌تکێشان بڕوایه‌کی زۆریان پێ ده‌کرد و بۆ چاره‌سه‌ری گیروگرفته‌کانیان داوای رێگه چاره‌یان لێ ده‌کرد. کاربه‌ده‌ستانی رێژیمی شا که له خۆشه‌ویستی مه‌لا ئاواره له نێو کۆمه‌لانی خه‌ڵکدا ئاگادار ببوون، له‌و فکره که‌وتن که به‌و شێوه‌یه زه‌ربه له ناوبراو بده‌ن و که‌وتنه پیلان دانانه‌وه له رێگه‌ی ئالقه له گوێ خۆولاتییه‌کان. به‌م چه‌شنه ساواک له رێگه‌ی حاجی برایم ئاغای بێشاسپ و ئه‌ویش به هۆی کوێخا حه‌سه‌نی دیوالان (حه‌سه‌ن سه‌کر) ئاژاوه‌یه‌ک له نێو جووتیارانی گوندی دیوالان دا ساز ده‌که‌ن. هه‌روه‌ک جاران خه‌ڵکه‌که بۆ چاره‌سه‌ری ئاژاوه‌که په‌نا ده‌به‌نه به‌ر مه‌لا ئاواره، که له‌و گونده له ماڵێک ده‌بێ. ژاندارمه‌کان ده‌وری ئاوایی ده‌گرن و داوای ته‌سلیم بوونی لێ ده‌که‌ن. ئه‌و کات ئه‌و ده‌نگۆیه‌ش هه‌بوو که گوایا مه‌لا ئاواره له‌گه‌ڵ نان خواردندا مه‌سموم کراوه، بۆیه دژ کرده‌وه‌یه‌کی ئه‌وتۆی له خۆی نیشان نه‌داو له‌گه‌ڵ یه‌ک دوو هاوڕێی به دیل ده‌گیرێ و پاشان له‌سه‌ر ده‌شت ئیعدام کرا.

جارێكی دی لە كێوی مرادرسووی لاجان، شەڕێكی چەند سەعاتە لە بەینی هاوڕێیانی پێشمەرگە و ژاندارم و جاشەكاندا هاتە پێش. هەرچەند پێشمەرگەكان ژمارەیان كەم بوو، بەڵام زەبری چاكیان لە دوژمن دا.

لە ئاخرییەكانی هاوینی ۱۹٤۷دا، مراد شیرێژ لەگەڵ چەند كەسی دی لە كوێستانەكانی بەری مێرگان دەبن، راپۆرتیان لێ دەدەن، هێزێكی زۆری ژاندارم و سەرباز و جاشیان دەچێتە سەر، لە كوێستانی كانی باسی شەڕێكی توندیان لە نێواندا پەیدا دەبێ. دوژمن چەند كەسی لێ دەكوژێ و بەداخەوە مرادشیرێژ و چەند هاوڕێی شەهید دەكرێن. دوایە تەرمەكانیان لە شارەكانی پیرانشار و نەغەدە و مەهاباد بۆ تەماشای خەڵك هەڵواسی.

زۆر بەداخەوە بە دوای شەهیدكردنی یەك لە دوای یەكی ئەندامانی كۆمیتەی شۆڕشگێری حیزب و لاوازبوونی جووڵانەوەكە، ئەو هاوڕێیانەی مابوون، توانای خۆڕاگرتن لە بەرامبەر ئەو هێرشە مەغوولیەی هێزەكانی پۆشتەو پەرداخی رێژێمیان تێدا نەمابوو، مەجبوور بە گەڕانەوە بۆ كوردستانی گەرمیان دەبن.

ئەوكات دوو گیروگرفتی گەورە روو لە حیزب دەكەن، یەكیان تەحویل دانەوە و كوشتنی هێندێك لە كادر و پێشمەرگەكانی حیزب لە لایەن بەرپرسانی شۆڕش لە هێندێك ناوچەدا بە ساواك و ژاندارمی ئێران بوو كە شوێنەواری زۆر خراپی لەسەر وورەی باقی هاوڕێیان دانا و لە راستیدا بوو بەهۆی ئەوەی كە ماوەیەك واز لە هەوڵدان و تێكۆشان بێنن و برستی تێكۆشانیان لێ بڕین و هیچیان بە تەمای سەری خۆیان نەبوون.

نموونەی زۆر ئاشكرای ئەم وەزعەش لەوەدا دەبینین كە كاك ئەحمەد تۆفیقیش سەرەڕای ئەم هەموو ئیخلاس و نزیكییەی سەبارەت بە بارزانی هەیبوو، كە دەتوانین بڵێین بە پلەی پیر و مریدی گەیشتبوون، لە ترسی كاربەدەستانی ئێران دوور دەخرێتەوە بۆ كانی ماسیی بادینان و، پێوەندیی لەگەڵ هەڤاڵانی حیزبی و ئەو كەسانەی زۆریش لە خۆی نزیك بوون، بڕا. هەروەها زۆر كاری ناڕەوای دیكەش دەرحەق بە هاوڕێیانی كرا.

نموونەی ئەو كارە خراپانە ئەوانە بوون:

۱- شەهیدكردنی كاك سەدیق ئەنجیری لە چەند سەد میتری دەزگای رادیۆی پارتی.

۲- گرتنی كاك سلیمان موعینی(فایق) و خەلیل شەوباش، شەهیدكردن و تەحویل دانەوەی تەرمی سلیمان بە ڕێژیم و بێ سەروشوێن كردنی خەلیل شەوباش.

۳- گرتن و پاش ماوەیەك شەهیدكردنی مەلا رەحیم وێردی، ناسراو بە میرزا ئەحمەد، ئەندامی كۆمیتەی ناوەندیی حیزب لە نزیك تەوێڵە.

٤- تەحویل دانەوەی تاقمێک لە نازاترین پێشمەرگەکانی حیزب کە سالَح لاجانی و سلێمان کەرقشان دووکەس لەو تاقمە بوون و ودوایە هەموویان لە جەلدیان ئیعدام کران.
٥- شەهیدکردنی قادر شەریف لە شاری سلێمانی لە مانگی خەزەڵوەری ۱۹٦۹ بە دەستی یوسفە لیچە و یەکێکی تر کە پێشمەرگەی عەبدولوەهاب ئوترووشی بوون.
٦- شەهیدکردنی مەلا حسێن مارەغانی، ناسراو بە کاوە لە قەلادزێ لە مانگی مارسی ۱۹۷۰ بە دەستی حەمەدەمین جەوانمەردی.

پێویستە وەبیر بێنینەوە کە هەموو ئەو تیرۆرانە لە کاتێک و شوێنێکدا بوون کە شۆڕش ئەوکات خاوەنی دەسەلاتی تەواو لەم شوێنانە بووە.

لە لایەکی دیکەوە جەللادی ئەوکات لە کوردستان اویسی، بۆ ئەوەی بتوانێ پاش ماوەی بوودجەی دیاری کراو قووت دا وشاش لە سەرکەوتنی خۆی دلّنیا بکا، بە پێی لیستێک کە بە مەشوەرەتی سیخوڕەکان و ساواک و ژاندارمری ئامادە کرابوو، لە نیوەی مانگی رەزبەردا پەلامارێکی هەمەلایەنەیان بردە سەر شار وگوندەکانی کوردستان لە هەورامان را هەتا باکوور، لە ماوەی حەوتوویەکدا سەدان کەسیان لە هەموو چین و توێژەکانی کوردستان گرت، بە ماشێن وهێلی کۆپتەر گوێستیانەوە بۆ پادگانی جەلّدیان[*] لە نزیک پیرانشار. هێندێک کەسیش دەربازبوون و خۆیان گەیاندە کوردستانی گەرمیان، یەک لەوان مامۆستا هێمن بوو. بەر لە گیرانی ئەو خەلّکە رێژیم بە هیچ شێوەیەک باسی رووداوەکانی ٤٧-٤٦ یان نەدەکرد، شا ناوی ئێرانی نابوو دورگەی ئارام، بەلام پاش ئەوەی ئەو گیراوانە کە مەلاو شێخ و مامۆستای قوتابخانە، بازاڕی، قوتابی، جووتیار و ئاغای تێدابوو، بە دڕندانەترین شێوە بۆ ماوەی زیاتر لە مانگێک ئەشکەنجە و ئازار دران، بە چەند دەستە بەش کران. هێندێکیان هەر لە پادگانی جەلدیان بە حوکمی دادگای فەرمایشی نیزامی حوکم دران و هەر لەوێ ئیعدام کران، تاقمێک بۆ بەندیخانەی ورمێ بەڕێ کران کە زۆربەیان بە زیندان مەحکووم کران بەشکێش کە زیاتر لە سەد کەس بوون لە زیلی ئەرتەشیدا بە دەستی بەستراو بەڕێ کران بۆ قەلای فلک الافلاک لە خورردم ئاوای لوڕستان.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە لە تەواوی رێگادا تا گەیاندیانە شوێنی ناوبراو، سێ

---

(*) سێ پادگانی جەلّدیان، خانێ و گرتک شانە لە دوای رووخانی رێژیمی پاشایەتی لە عێراق بەهۆی مەترسیی زۆری شا و ئەمریکا، بە پێی گەلالەی ئەمریکاییەکان لەم شوێنانە و لە ژێر چاوەدێریی راستەوخۆی موستەشارە ئەمریکاییەکان دروست کران.

شەو و ڕۆژی کێشا و هەر بەو زیلانەی کە شەش کەس شەش کەس بە دوای یەکتردا دایان نابوون، بە شەقامی شارەکاندا جگە لە مەهاباد دەیانگێڕان و بە بڵیندگۆش هاوارایان دەکرد«ئەوانە ئەو چەتانەن گرتوومانن کە کەس و کاری ئێوە، ژاندارمە دلێرەکان و سەربازە نازاکانی ئەرتەشی شاهەنشاهییان کوشتووە، دوژمنایەتیی شا و وڵاتیان کردووە دەیانویست ئێران بدەنە دەست بێگانەکان!»

ڕەنگە ناحەقیشیان نەبووبێ! چونکە ئەو کات لە گرتنەکەی بە کۆمەڵی ساڵی ٣٨دا هەموو هەوڵی ساواک ئەوە بوو لە لێ پرسیندا حیزبی دێموکرات بە عێراق و بە دەوڵەتی سۆڤییەتەوە بلکێنێ، بەڵام ئەمجارە هەواکە گۆڕابوو، بۆ ئەوەیان هەوڵ دابوو حیزب و تێکۆشانی گەلی کورد بە چین و میسرەوە ببەستن!!

پاش چەند مانگ مانەوەی ئەو خەڵکە بە بێ لێ پرسینەوە لە فلک الافلاک کە هیچ بنەماڵەیەکیش نەیدەزانی لە کوێن یەک کەسیش مولاقاتی نەبوو، هێندێک لە تێکۆشەرەکان مانیان لە خواردن گرت و بەم شێوە ئیزنی ئاشکرا بوون و مولاقاتیان پێ درا.(*)

پاش نزیکەی ساڵێک، هێندێک لەوانیان هێناوە ورمێ و بە کەفالەت ئازادیان کردن و بەشێکی زۆریشیان بۆ یەزد، کرمان، بابەکشار و بافت و چەند شوێنی دیکەی باشووری ئێران تەبعید کردن و تا دووسێ ساڵ لەو حاڵەدا مانەوە.

ژمارەی ئەو کەسانەی لەم پەلامارەدا گیران، لە هەموو جارەکانی دیکە زیاتر بوو. هی زۆربەی ناوچە و شارەکانیشی تێدابوو، لە بەر زۆری ناوەکان و نەبوونی لیستی گیراوەکان لە ئارشیوی حیزبدا هەوڵ دەدەین لە هەر شوێنێک ناوی چەند کەس وەبیر بێنینەوە.

لە باشوور بەهمەنی ئەحمەدی، ئەحمەدی تۆفیق بەگ، حاجی نیازی، نیکو کرماشانی ئەوانە زۆربەیان لە ئێلی لهونی بوون. لە بانە: محەممەد ئەمین مەجیدیان، عەزیز و مستەفا زادە(دووبرای خەلیل شەوباش)، مەلا ئەبوبەکر فەلسفی، عبداللە ئیقدامی، محەممەد ئەمین وسەعید ئەسراری ، سالح خسرەوزادە، مەلا حەسەنی ساردکێ و مامە قالەی سووتو و مەلا حەسەنی وەیسک و مەلا حەسەنی شەیدایی، خەلیفە حەمە

---

(*) پەنجا کەس تۆماریان ئیمزا کردبوو مان لە خواردن بگرن. بەڵام دوای هەڕەشەی ساواک و ژاندارمری خوررەم ئاباد، زۆربەیان پاشەکشەیان کرد. هەر شەش کەس مانەوە و ئەو کاریان کرد: محەممەد ئەمین مەجیدیان، جەلیل گادانی، عەبدوڵلا ئیقدامی، صالح خسرو زادە، عەزیز و جەلیل مستەفا زادە. بەخۆشییەوە دەسکەوتەکەی بۆ هەمووان بوو. زۆرتریش دەوڵەمەندەکان سوودیان لێ بینی، چونکە ئەوان لانی کەم حەوتووی جارێک مولاقاتیان دەهات.

سالح رەحیمی. لە سەردەشت حەسەن مەولەوی، مەلا شێخ ئەحمەد بێوران، مەلا عەلی ئاغەلان، مەلا عەلی واشمەزینی، یونس ئەنوەری، حاجی مطلب شمامی، حسێن سید زادە، مەلا سەید رەشید. لە سەقز یەک دوو کەس بوون. لە بۆکان، ١٣ تا ١٤ کەس لە بنەماڵەکانی موهتەدی، ئیلخانی زادە و علیار گیرابوون کە لەوانە قاسم ئاغا موهتەدی، سەلاح موهتەدی، محەمد ئیلخانی زادە، ئیبراهیم ئیلخانی زادە، ئەبوبکر موهتەدی، ئیبراهیم علیار، سلیمان علیار، خالید علیار ،عوسمان علیار، حوسێن علیار. لە مەهاباد، ئیبراهیم نوذری، جەلیل گادانی، دوکتور موحەممەد بەهمەنی، رەحمان کابانی، حەمە رەش عومەری، بایز ئاریا، کمال شافعی. لە نەغەدە، ئەحمەد ئاهەنگەری، کەریم لێتان، ئەحمەد هورازی لە شنۆ مەولود لیتان. لە ورمێ خالید یزدان پەنا خەڵکی گەنگەچین. لە پیرانشار، مەلا نجمەددین کوکەبی، حسێن ئەستی، رەسوومەزنە، حاجی شەفیع. شەهیدان مەلا ئاوارە و سالح لاجانی و هاورێکانیشی هەر لە جەلدیان بوون. بەداخەوە، وەک پێشتر گوتمان بەشێکی بەرچاو لەوانە هەر لە جەڵدیان ئیعدام کران کە هێندێکیان ئەوانەی ژێرەوە بوون:

١- بەهمەن ئەحمەدی
٢- حاجی نیازی
٣- ئەحمەد تۆفیق بەگ
٤- نیکۆ کرماشانی
٥- سالح لاجانی
٦- سلێمان کەرقەشان
٧- حەمەدەمین شیرێژ و چەند کەسی دی.

چەند کەسێکیش وەک دوکتۆر بەهمەنی، حسێن ئەستی لە ژێر ئەشکەنجەی زۆرداردا لە مردن گەڕانەوە، ئەشکەنجە کردنەکە گشتی بوو هەموو کەس دەبوو لەسەر کورسییە تایبەتییەکان کە لە سالۆنێکی گەورە داندرابوون، رابخرێ و لانی کەم بەشی خۆی شەللاقی لێ بدرێ، بەلام هێندێکی وەک ئەو دووکەسەی سەرەوە و هەروەها سەلاح موهتەدی وموحەممەد ئیلخانی زادە بەشی تایبەتیی هەڵواسین و لێ دانیان بۆ داندرابوو.

بەشی شەشەم

# ئاکامی ١٨ مانگ خەباتی چەکداری

کاری کۆمیتەی شۆڕشگێری حیزب وتێکۆشانی شێوە سیاسی- چەکدارییان لە کاتێکدا ماوەی ١٨ مانگی خایاند کە شا ئیددیعای دەکرد ئێران ئارامترین وڵاتە و بۆتە دورگەی ئارامی دنیا و بەتایبەت لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. شا باسی لە کردنەوەی دەروازەی شارستانیەتی گەورەی لە ئێران دەکرد.

لەم ماوەیەدا بەبێ دەنگی خۆیان و سەرپۆش لەسەر دانانی مەسەلەکە نەیانهێشت دنیای دەرەوە بە زوویی بەم کارەساتە بزانێ، بەڵام دیسانیش جاروبار لە دەرەوە شتێک لەسەر ئەم زەخت و زۆرەی کەوتبووە سەر کوردستان، بە تایبەتی دوای دامرکانی کاری چەکداری و گرتنی خەڵکێکی زۆر لە ئەندام و لایەنگرانی حیزب، هێندێک حیزب و چاپەمەنیی دنیا لەسەر وەزعەکە شتیان نووسی. ئەوەش زیاتر بە دوای ئەوەدا بوو کە، هاوڕێیانی حیزبی لە ڕەزبەری ٤٨دا بەیانێکیان دەرکرد و لەوێ دا نووسرابوو:

«ڕێژیمی شا بۆ مانەوەی خۆی، هەموو ڕۆژێ وەک زوحاک دەبێ هێندێ لە لاوەکانی کورد بکاتە قوربانی. بۆ ترساندنی خەڵک تەرمی بێ گیانی کوژراوەکان بە شارەکانی مەهاباد، ورمێ، شاپوور، نەغەدە، شنۆ ، خانێ، سەردەشت، بۆکان، سەقز و سنە و کرماشاندا دەگێڕن و، بە دەهۆڵ و زورنا بە خەڵک رادەگەیەنن. (ئەوەیە ئەتیجەی خیانەت وچەتەگەری!)»

لەم بەیانەدا هەروەها داوا لە هێز و کۆڕ و کۆمەڵانی جیهانی دەکرێ هەوڵ بدەن لەم جینایەت و تاوانانەی ڕێژیمی شا پێشگیری بکرێ و بانگی ئیعتیرازی خۆیان دەربڕن.

ئەو حیزب و سازمانانەی دەنگی ئیعترازیان بەرامبەر بەم رەفتارە دڕندانە بڵاوکردەوە، بریتی بوون لە:
١- حیزبی توودەی ئێران
٢- رێکخراوی رووناکبیرانی کوردی ئێرانی لە دەرەوە
٣- رۆژنامەی«شوعلەی جنووب»
٤- گۆڤاری«پەیمان» ئۆرگانی دیفاعی(کونفدراسیۆنی جیهانی خوێندکارانی ئێرانی)
٥- خەبەرنامەی جەبهەی میللی
٦- شوورای کۆمۆنیستەکانی ئیتالیا
٧- جووڵانەوەی تازەی کۆمۆنیستی ئێران
٨- کۆمیتەی ئیجرائی سەر بە کۆنفدراسیۆنی جیهانی خوێندکارانی ئێران
٩- ئەنجوومەنی هاودەردی و یارمەتی بە گەلان
١٠- رۆژنامەی طریق الشعب، ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کومونیستی عێراق
١١- رۆژنامەی ئاڵای کرێکاران، بڵاوکراوەی حیزبی کۆمۆنیستی عێراق لە سلێمانی
١٢- رۆژنامەی ئیب سابات چاک ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی سۆسیالیستی کرێکارانی مەجارستان
١٣- رۆژنامەی حەوتوویی(الاخبار) چاپی لوبنان
١٤- رۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی لە ژمارەی ١٦ی نوامبری ١٩٦٨
١٥- رۆژنامەی«مۆرنینگ ستار» ئۆرگانی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی بریتانیا
١٦- رۆژنامەی سۆسیالیست لیدر چاپی گلاسکۆ
١٧- گۆڤاری ئاشتی سۆسیالیزم ئۆرگانی تیئوریکی حیزبە کۆمۆنیستە کرێکارییەکانی دنیا لە ژمارەی یەکی ساڵی ١٩٦٩
١٨- رۆژنامەی «ایل سیگلو» ئۆرگانی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی شیلی لە ژمارە ٢٧ی نوامبری ١٩٦٨دا
١٩- رۆژنامەی «ئونیتا» لە ژمارە ٢٦ی مانگی ئۆکتۆبەری ١٩٦٨
٢٠- رۆژنامەی «ایل پارتیتۆ» چاپی ئیتالیا لە ژمارە ٢٨ی ژوئەنی ١٩٦٩
٢١- رۆژنامەی رێگای کوردستان ئۆرگانی کۆمیتەی ئیقلیمی کوردستانی حیزبی شیوعی عێراق لە ژمارەی ٥ی نوامبری ١٩٦٨دا.
تەواوی ئەم رێکخراو و رۆژنامانە لە ساڵەکانی ٤٧-٤٦دا بەشێک لە راستییەکانیان

گوتووه، لەگەڵ دەربڕینی ئیعترازی خۆیان، تا ئەو رادەیەی زانیارییان پێگەیشتووە، پەردەیان لەسەر کردەوە دژی ئینسانییەکانی شا و قوڵە چۆماغەکانی بەرامبەر بە گەلی کورد لاداوە و داوای کورت کردنەوەی دەستی زۆردارانی رێژیمیان کردووە و خەباتی گەلی کوردیان بە رەوا و دیموکراتیک و گەلی لە قەڵەم داوە، بەڵام هیچ کام لەوانە نە ناوی حیزبی دیموکرات دەبەن و نە باسی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکرات دەکەن، بەڵام بە تێکڕا ئەو هاودەردی و پشتیوانییە جێگەی سپاسە و بێ گومان لە رزگاریی باقی بەندییەکان دا زۆری کەڵک هەبووە.(*)

هەرچەند لە هەڵسەنگاندنی خۆماندا کاروتێکۆشانی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی حیزب، گیانبازی و فیداکاریی ساڵەکانی ٤٧-٤٦ بە لاپەڕەیەکی زێڕینی تێکۆشانی حیزب نێو دەبردرێ، بەڵام جێگای خۆی بوو کە هەر زوو کتێبێکی تایبەتیی لەسەر بنووسرێ، بۆ ئەوەی خەڵکی جیهان بە گشتی و خەڵکی ئێران بە تایبەتی هێزە سیاسییەکان، نووسەران و مێژوونووسان، بزووتنەوەکە و بەرپرسان و میزانی فیداکاریی کادر و پێشمەرگەکان باشتر بناسن و زیاتری لێ ئاگادار بن.

ئەم دەورە لە خەباتی هەژدە مانگەی تێکۆشانی هاوڕێیانی حیزب لە لایەن نووسەرانی حیزبیشەوە زۆر کەمی لە سەر نووسراوە، رەنگە ئەگەر کتێبەکەی کاک کەریم حیسامی بە ناوی«کاروانێک لە شەهیدانی کوردستان» نەنووسرابا، ئەم لاپەرە زێڕینە لە خەبات هەر لە بیر چووبایەوە یا لانی کەم زانیاریی پێویستمان لەسەری وەچنگ نەکەوتبا.

بۆ ئاگاداریی خوێنەرانی بەڕێز وەبیرتان دێنینەوە کە بە دوای نووسینی ئەم کتێبە باشە لە لایەن کاک کەریمەوە بەم هەموو بەڵگە بەنرخانەی تێیدا جێی کردۆتەوە، لە جۆزەردانی ساڵی ٥٨دا لەسەر ئیبتکار و پێشنیاری جەلیل گادانی کە ئەو کات بەرپرسی تەشکیلاتی حیزبی دیموکرات لە تاران و ئەندامی هەیئەتی کۆمەڵەی کوردانی دانیشتووی تاران بوو، پێشانگایەک بە هاوکاریی ناسر قازی زادە، خەڵکی سەردەشت کە نەقاش بوو، بە کەڵک وەرگرتن لە وێنەکانی کتێبی«کاروانێک لە شەهیدانی کوردستان» و گەورەکردنەوەی تەواوی وێنەکان و لێ زیاد کردنی هێندێکی دیکەش کە لەوێ دا نەهاتبوون، لە مەیدانی «کندی»داندرا. دیارە پێشتر چەندین رێنوێنی باش بە ژێر نووسی لە بار تەرتیب درابوون. بە پێی چەند دەفتەرێکی نووسینی بیرەوەری کە داندرابوو، زۆر کەس ئەزدری خۆیان لەوان دا

(*) بۆ ئاگاداری زیاتر لە ئەم نووسین و ئیعترازانە بڕوانە بەشەکانی ئاخری کتێبی«کاروانێک لە شەهیدانی کوردستان» نووسینی کاک کەریم حیسامی.

نووسیبوو، ئەم پێشانگایە بە یەکێک لە سەرکەوتووترین نوێنگەکان داندراوە. ژمارەیەکی یەکجار زۆر خەڵک سەردانی ئەم نوێنگەیەی کرد. بۆ ماوەی حەوتوویەک داندرابوو، بەڵام بینەران دووجار و هەرجارە بۆ ماوەی پێنج رۆژ پێیان درێژکردنەوە.

بە دوای تاراندا لە رێگەی ئەندامانی حیزب و خوێندکارانەوە لە مەهاباد، کرماشان، تەورێز، مەشهەد و شیرازیش بۆ خەڵک نیشان درا و جەماوەر بە نووسراوە سیاسی خۆیان لە حیزب و کۆمیتەی شۆڕشگێڕ و کادر و پێشمەرگە قارەمانەکان دەربڕیوە.

بەڵام بەداخەوە لە دیرۆک و کتێبە مێژووییەکانی دوای ئەو کات و تەنانەت لەوانەدا کە دوای راپەڕینی گەلانی ئێرانیش دا نووسراون، هیچ کات بایەخی خۆی نەدراوەتێ و شتێکی کە راستییەکان دەرخا و ئەم بزووتنەوە مێژوویی و گرینگە نیشان بدا، نەنووسراوە.

رەنگە ئێستا ئیدی کەس نەبێ نەزانێ ئەم بڕیارە شۆڕشگێڕانەی هاورێیانی کۆمیتەی شۆڕشگێڕ چەند گرینگ بووە. تەنانەت رێژیمی شاش جگە لە هەزاران کەس کە ئەو کات لە پادگانەکانی ورمێ، خانێ، جەڵدیان، گرتکشانە، مەهاباد، سەقز و سنەدا هەیبووە، بە ناردنی اویسی و دوازدە تا پازدە هەزار ژاندارم و سەربازی دیکە، گرینگییەکی تایبەتی و ستراتیژیکی بە مەبەستی سەرکوت کردن پێ بەخشیوە.

پێویستە زۆر بە ئاشکرا ئەو گلەیی و گازندەیەی خۆمان دەرببڕین و بڵێین چۆن دەبێ هێزەکانی ئێرانی بە تایبەت ئەوانەی بڕوایان بۆ رزگاریی ئێران بە کاری چەکداری پەیدا کردبوو دوایەش بە کردەوە لە ساڵی ٤٩ را هاتنە ئەم مەیدانەوە، قەدری حیزبی دێموکرات و کۆمیتەی شۆڕشگێڕی ئەم حیزبە کە دایکی هەموو جووڵانەوە چەکدارییەکانی دواتر بوو نەزانن و بایەخی خۆی نەدەنێ.

با کڵاوی خۆیان بکەنە قازی و بڕیار بدەن، ئایا ئەم حەرەکەتە لە بواری چلۆنایەتی و چەندایەتییەوە لە رووداوی«سیاهکل» گرینگتر نییە؟!.

ئەو رێز و حورمەتەی ئێمە وەک حیزبی دێموکرات لە شارو شاخ بۆ رووداوی سیاهکلمان داناوە، لەگەڵ ئەوەیدا نەیانتوانیبوو جێگەی خۆیان لە نێو دڵی خەڵکدا بکەنەوە، هێزە سیاسییەکان یەک لە سەدی ئەوەیان بۆ رێزنان لە بزووتنەوەی ساڵەکانی ٤٧- ٤٦ لە کوردستان داناوە؟

بەڵام هەر لەبەر ئەوە ئێمە کوردین ، نە چەپەکان و نە نوسەرە شوێنیستەکان قەت بایەخی خۆیان بە جووڵانەوەکانمان بە تایبەت لاپەڕە زێڕینەکانی ٤٧- ٤٦ نەداوە.

تەنانەت شەهید جەزەنی کە مرۆڤێکی زۆر زانا و شۆڕشگێڕ بووە، لە کتێبی تاریخی سی

ساڵەی خۆیدا زۆر بە سادەیی لەم پێوەندییەدا بە سەر مەسەلەکەدا تێدەپەڕێ، لە هەردوو جلدیدا تەنیا لە لاپەڕەی ١٦١ دا دەنووسێ: «لە لایەکی دیکەوە ئەوان هەوڵیان داوە لە نێو خەڵکی شار بە تایبەت رووناکبیراندا لایەنگر بۆ خۆیان وەبێنن و لەم رووەوە شەریف زادە و سیراجی لە مەوقعییەتی دانشجوویی خۆیان کەڵکیان وەرگرت و یەکێک لە هەوڵەکانیان پێوەندی گرتن لەگەڵ عەلی رەزا «نابدل» بوو کە وتووێژێک لە نێوان ئەوو شەریف زادە پێکهات و بۆچوونەکانیان بە لای «نابدل»ەوە پەسند نەکرا و وەڵامدانەوەی بە وان دانا بۆ موتالاکردنی وردتری مەسەلەکان. وتووێژەکان بەهۆی پێشکەوتنی چالاکییە نیزامییەکان درێژەی پەیدا نەکرد و ئەو پێوەندییانەی نێوان ئەو تاقمە لەگەڵ تاقمێکی دیکەی سیاسی کە لە مەهاباد و سنە تێکۆشانیان هەبوو، بە ناکام نەگەیشت».

یا سەرهەنگ غولام رەزا نجاتی لە کتێبی «تاریخ سیاسی بیست و پنج ساڵەی ئێران» کە بەتێکڕا کتێبێکی زۆر بە کەڵک و رێکوپێکە، لەگەڵ هەموو تەحقیق و توێژینەوەیەک کە لە سەر زۆر مەسەلە کردوویەتی، لەسەر کوردستان و حیزبی ئێمە کە یەکێک لە لەمێژینەترین و پڕ ئەزموونترین و تێکۆشەرترین حیزبەکانی ئێرانە و لە ماوەی ٥٠ ساڵی رابردوودا جگە لەوەی پێوەند وشوێنەواری خۆی لە هەڵسوکەوتەکان و پێوەندی لەگەڵ هێزە پێشکەوتنخواز و خەباتکارەکانی ئێران هەبووە، حیزبی سەرەکیی کوردستانیش بووە، هیچ شتێکی ئەوتۆی نەهێناوە. تەنیا لە چەند جێگا زۆر نابەرپرسانە لە گۆشە و کەناردا وەک سەرە مەقەست ناوی حیزبی دێموکرات دەبا.

کەچی زۆر بە گەرمی باسی باقی حیزب و هێزەکان و کردەوە چەکدارەکانی دیکەی ئێرانی دەکا، بەڵام لە سەر کوردستان و کردەوەکانی حیزبی دێموکرات بە تەواوی کپ و بێ دەنگە.

لە حاڵێکدا هەر لەو کتێبەدا ئەگەر ویستبای و وێرابای، لەسەر حیزبی دێموکرات و تێکۆشانەکانی بنووسێ و راستییەکان دەرخا، دەبوو لە لاپەڕەکانی ٣٧٧، ٣٧٨، ٤٣٧ و ٥٢٧ دا لە جێگای خۆیدا بە لێکۆڵینەوە و زانیارییەکی زیاتر باسی حیزبی دێموکرات و جووڵانەوەی ٤٧-٤٦ بکا.

دیارە ئەگەر ئێمەی کورد بۆ خۆمان قەدری تێکۆشەرانی خۆمان و زەحمەت و کوێرەوەرییەکانیان نەزانین و ئەیان ناسێن و ئەیان ناسێنین، نابێ گلەیی لە بێگانە بکەین کە شتەکانمان لێ دادەپۆشن، بۆ ئەوەی مەسەلە چکۆلەکانی خۆیان گەورەتر بنوێنن.

هەتا نووسەرێکی بە توانا و لێزان و توێژەرەوەیەکی جوامێر و بە ئینسافی کورد پەیدا دەبێ لەسەر ئەم لاپەڕە زێڕینەی خەباتی گەلی کورد دیرۆکێکی باش و پاراو بنووسێ، ئێمە

لەو چەند خاڵەی خوارەوە زیان و سوودەکانی تێکۆشانی ٤٧-٤٦ وەک بڕوای خۆمان دەخەینە بەرچاوی خوێنەرانی ئازیز:

١- بەر لە هەموو شت دەبوو زیاتر لەسەر کاری ڕێکخراوەیی و سیاسی سوور بن. ئەوەندەی بۆیان کرابا لە شەڕ و تێک هەڵچوون خۆ بپارێزن، بەڵام بەداخەوە زۆر زوو تووش هاتوون و گەلێک گران کەوت.

٢- لە دەست چوون و شەهید بوونی ئەو ڕۆڵە تێکۆشەرانەی ئەندامی کۆمیتەی شۆڕشگێڕ و کادر و فەرماندە نیزامییەکانی ئەو سەردەم جگە لەوەی زیانێکی گەورە بوو جێگایان لە کاتی ڕاپەڕینی گەلانی ئێران و بە تایبەتی لە کوردستان خاڵی بوو. بێ گومان ئەگەر مابان، دەوری زۆر گرینگیان دەگێڕا.

٣- تێکدانی بەرنامەکانی شا سەبارەت بە کوردستان لە پێوەندی لەگەڵ بۆچوونەکانی تورکیە و ئێران لەسەر کورد و وتواندنەوەی خۆی و فەرهەنگەکەی.

٤- کەمکردنەوەی ڕەنگی شۆڕشی سپی شاکە بەڕاستی لە هێندێک شوێنی کوردستانیش شوێنەواری لەسەر بیروبۆچوونی گوندنشینەکان دانابوو. مەسەلەی نەتەوەیی خەریک بوو لە بیر دەچووەوە.

٥- جووڵاندنەوەی هەستی نەتەوایەتی، نیشاندانی زیانی چوونە ژێر تەنسیری هەرکام لە ڕێژیمەکانی داگیرکەر، کە ئاخرییەکەی بە شکست و تەسلیم بوون دەگا. مەگەر مەرجی یەکەمی ئەم پێوەندییانە پاراستنی مافی سەربەخۆیی ڕێکخراوەیی بێ. دوایەش بە کردەوە زۆر شت دیترا و سەلمێندرا.

٦- لاوازکردنی ڕووحیەی هێزی دوژمن بە تایبەتی لە بەرامبەر هێزێکی گەلیدا کە پشتی بە نەتەوەکەی خۆی بەستبێ. وەک دیتمان ماوەیەکی زۆر پێش هێنانی هێزی تایبەت نەیاندەوێرا تخوونی پێشمەرگە بن.

٧- ئاشکرا کردنی ئەو ڕاستییە کە بە پێچەوانەی ئیددیعای شا، ئێران نەتەنیا دورگەی ئارام نییە، بەڵکو گەلەکانیشی زۆر هەژار و بێ بەش و ناڕازین. لە دێموکراسیش ئاسەوارێک نییە و ڕوون بوونەوەی ئەم وەزعە بۆ خەڵکی جیهان.

٨- پێکهێنانی ڕووحی شۆڕشگێڕی لە نێو لاوەکانی کوردستان و ئێران بە تایبەتی ئیلهام بەخشین بەو هێز و تاقمانەی بەینێک بوو هاتبوونە سەر بڕوا بە کاری چەکداری بە تایبەتی بە چریکەکان و موجاهیدین کە لەساڵی ٤٩ را بە پێچەوانەی ویستی خۆیان زووتر لە کاتی پێویست تووشی کاری چەکداری بوون.

٩- وەرگرتنی تەجرەبەیەکی گەورە بۆ هاورێیانی حیزبی بۆ حەللی گیروگرفتەکان بە رووحی برایەتی، راستە هێندێکیان تێداچوون، بەلاّم هاورێیان ئەزموونیان وەرگرت و بەرەبەرە بە یەکبوون و لێک نزیک بوونەوەی خۆیان زەمینەی پتەوکردنی ریزەکانی حیزبیان پێکهێنا و پاش یەک دوو ساڵ بە شێوەیەکی لە بارتر لە پێشوو حیزبایەتییان درێژە پێدا.

**بۆ ئاگاداری خوێنەرانی بەرێز،**

بە دوای تایپی ئەم بەشەدا، ئەم نووسراوەیەمان بە دەستنووسی مەلا ئەبووبەکر فەلسەفی بە دەست گەیشت، کە بە پێویستمان زانی بۆ زانیاریی زیاتر چاپی بکەین:

«بەر لە پێکهاتنی کۆمیتەی ساخ کەرەوەی حیزب هێندێک لە هاورێیانی حیزب لە کوردستانی عێراق پەرەوازە ببوون و هەر یەکە لە لایەکەوە کاریان لەگەڵ شۆرشگێرانی کوردستانی عێراق دەکرد. چەند کەس لەوانە بریتی بوون لە: مەلا ئەحمەد شەلماشی (مەلا ئاوارە) رەشیدخانی کیوەرو، عبداللە سەدیق یان عبداللە ئەعلەبەندی و مەلا ئەبووبەکر فەلسەفی، کە لە مانگی بانەمەری ١٣٤٢ لە «عیساوێ»ی ماوەت بوون لە بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی کە ئەودەم ئیبراهیم ئەحمەد بە کردەوە سکرتێر بوو.

مەکتەبی سیاسی ئێمەیان هاندا و گوتیان: « بۆ لە بەرامبەر ئەحمەد تۆفیق دا کە گوترایەڵی ئەم لا و ئەولایە، خۆتان بە ناوی حیزب دەست بەکار نابن؟. لەم کۆبوونەوەیەدا عەلی عبداللە، نوری سەدیق شاوەیس لەگەڵ مامۆستا برایم ئەحمەد ئامادە بوون.

ئێمەش قسەکەمان بە رەوا زانی و خۆمان دەستمان بە کارکرد تا بتوانین لە بەستنەوەی حیزب لە لایەن ئەحمەد تۆفیقەوە پێشگیری بکەین و دەسەلاتی ئەو لاواز بکەین.

لە یەکەم کۆبوونەوەی خۆمان کە لە گوندی«بارێی بچووک» پێکهات، لقێکی حیزبیمان بە ناوی لقی ١ م. ب. س پێکهێنا کە ئەم لقە لە ناوچەکانی سەردەشت، سەقز، مەریوان و بانە تێکۆشانی خۆی دەست پێکرد و کارەکانی بەم شێوەیە دابەش کران:

مەلا ئاوارە بۆ سەردەشت. مەلا حەمەدەمین مەنگوری بۆ ناوچەی سەقز، عبداللە ئەعلەبەندی بۆ بانە و مەلا محەمەد دەرەتفەیی بۆ مەریوان.

هەر یەک لەوانە بۆ ناوچەکانی خۆیان بەرێ کران و بەگەرمی خەریکی تێکۆشان بوون و کۆمیتەی شارستانەکان پێک هێندرانەوە.

ئەندامانی کۆمیتەی بانە بریتی بوون لە: عبداللە ئەعلەبەندی، محەمەد صالح

رحیمی(خەلیفە)، دەروێش نوودیسی، محەمەد ئەمین مەعروفی، عبدالله ضیایی، محەمەد خاکی، حەبیبوڵلا مسگەری و ئەکرەم ئەحمەدی.

کۆمیتەی مەریوان بریتی بوون لە: مەلا محەمەد دەردتفەیی، مەلا مەحموود لنجاوایی، عبدالله دەرزیان و حاجی ئەحمەد بەگی سەردوش.

کۆمیتەی سەقز: مەلا محەمەد ئەمین مەنگوڕی، سەید تەهامی عکاس، حەسەن خان دایە سلێمان، عومەر رەنگەڕێژانی و...

کۆمیتەی سەردەشت: مەلا ئەحمەد شەلماشی(ئاوارە)، محەمەد مەلا عەلی دیناران، حسێن سەیدزادە و مەلا عبدولرەحمان شەخسە.

تێکۆشانەکە بەرچاو بوو، لە پاییزی ١٣٤٢ سێ بنکە لە گوندەکانی مرانی و باری لە سیوەیل و کانی سێوە لە ناوچەی پێنجوێن دامەزران.

بەینێک دوای ئەم وەزعە رۆژێک لە مەکتەبی سیاسیی ئەوەدەمی پارتی خەبەریان دامێ کە لە لایەن هێندێک کەسەوە کە ئەحمەد تۆفیقیشیان لەگەڵ بووە، ماڵەکەت تالان کراوە و بنکەی مرانیی سیوەیلیشیان کە چەند برادەری وەک کاک کەمال خالیدی، کاک عبدالله نیقدامی، کاک محەمەد ئەمین مەجیدیان، کاک محەمەد قادریان و کاک محەمەد سالح خندانی لێ بوون، چەک کراوە و بە تالان چووە.

لەو ماوەدا ئەحمەد تۆفیق دوو ئیعلامییەی توندیشی لەسەر ئێمە دەرکرد و بە ساواکیی لە قەڵەم داین.

لە بەهاری ١٣٤٣ ناتەبایی و ناکۆکییەکان لە نێوان خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی زۆر توندتر ببوو. منیش بە سەردان چوومە عیساوێ. لەوێ تووشی ئەو چەند هاوڕێ حیزبییە بووم کە ئەوانیش لە دەست ئەحمەد تۆفیق هەڵاتبوون و بنکەکانیان لە زینوێی شێخی و... چەک کرابوون. ئەوان بریتی بوون لە: کاک حەسەن رستگار، کاک حسێن مەدەنی، کاک قادر شەریف و..

لەگەڵ ئەو هاوڕێیانە دەستمان بە قسەو باس کرد و هاتینە سەر ئەو باوەڕە کە کۆمیتەی ساخ کەرەوە پێک بێنین. کۆمیتەکە پێکهات کە ئەندامەکانی بریتی بوون لە: کاک قادر شەریف، کاک حەسەن رستگار، سەید حسێن مەدەنی، مەلا ئەبوبەکر فەلسەفی، مەلا ئەحمەد شەلماشی و سەعید کوێستانی.

سێ کەسیش وەک جێگر یا موشاویر بۆ ئەو کۆمیتەیە دیاری کران: حەسەن ئەغەدەیی، مەلا رەسووڵ پێشنماز و مامەندی قازی.

## بەشی یەکەم

# بەرەو کۆنفرانسی دووهەم

حەرەکەتی چەکدارانەی سالەکانی ٤٧-٤٦ ئەگەر لە لایەک بێ نێوەڕۆک بوونی ئەفسانەی دورگەی نارامی شای لانی کەم بۆ گەلانی ئێران روونتر کردەوە و رەوابوونی داخوازییەکانی خەلکی کوردستان و فیداکاریی تێکۆشەرانی حیزبی دێموکراتی بۆ جارێکی دیکەش سەلماندەوە، لە لایەکی دیکەشەوە دەبێ ئەو راستییە بلێین کە حیزبی دێموکرات و خەلکی کوردستانیش زەربەیەکی قورسیان وێ کەوت، چونکە هەروەک پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، لە رەوتی ئەو حەرەکەتە چەکدارییە و فیداکاریی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی حیزبەکەمان، ژمارەیەکی بەرچاو لە کادرە بەوەج و فەرماندەرە لێهاتووەکان و پێشمەرگە بەجەرگەکانی حیزب شەهیدبوون، لە راستیدا حیزب تووشی ئەوعێک پرش و بلاوی بوو، چونکە جگە لە شەهیدەکانیش، ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی حیزب گیران و رەوانەی زیندانەکانی شای دیکتاتۆر کران. ئەو ژمارە کادر و پێشمەرگەیەش کە لە پاش ئەو حەرەکەتە چەکدارییە لە کوردستان مابوونەوە، بەرەو کوردستانی عێراق(گەرمیان) پاشەکشەیان کرد و زۆربەیان چوونە بەکرەجۆی نزیک سلێمانی کە ئەو کات مام جەلال و هاوڕێکانی لەوێ بوون و، ژمارەیەکیش لە لایەن هێزی کاوەی سەر بە پارتی دێموکرات گیران و دوای چەک کردن، رەوانەی دەشتی هەولێریان کردن و بەم چەشنە لانی کەم لە بواری تەشکیلاتی دا ئەو هاوڕێیانە سەرگەردان بوون و نەیاندەزانی چ بکەن. چەند کەسێکیش لە لای حکوومەتی عێراق بوون بە پەنابەر.

سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق کە تا رادەیەکی زۆر کەوتبووە ژێر نفووزی حکوومەتی شای ئێران، لە زەخت و فشاری خۆی بۆ سەر ئەندامان و پێشمەرگەکانی حیزب، نەک هیچی کەم نەکردبووەوە، بەلکو خودی ئەحمەد تۆفیقیش کە زۆر لایەنگری

پارتی و شەخسی سەرۆک بارزانی بوو، بە بیانووی ئەوەی کە با ئێرانییەکان (کاربەدەستانی حکوومەت) نەیبینن، بۆ گوندی کانی ماسی لە ناوچەی بادینان دوور خرابووەوە. ناوبراویش پاش ماوەیەک کە لەو گوندە دەبێ، مەترسیی لێ پەیدا دەبێ و خۆی تەحویلی حکوومەتی عێراق دەدا. هەروەها هاوڕێیانی دیکەش هەر لە ژێر زەخت و فشاردا بوون، بەڵام سەرەڕای ئەو زەخت و فشارەش، ژمارەیەک لە تێکۆشەرانی حیزبی وەک مەلا عەبدالله حەسەن زادە، کاک ئەمیر قازی و مامۆستا هێمن و کاک حەسەن ڕەستگار کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشدا دەژیان و لەگەڵ برادەرانی دیکەی دانیشتووی بەکرەجۆ ئاکۆک بوون، کەوتنە بیری ئەوە کە بە مەبەستی تەرمیمی کۆمیتەی ناوەندی کۆنفرانسێک بگرن.

سەرەنجام ئەو کۆنفرانسە لە ٢٦ی گەلاوێژی ١٣٤٨دا لە یەکێک لە گوندەکانی بناری قەندیل(سەر بە ناوچەی سەنگەسەر) گیرا.

کاک ئەحمەد تۆفیق کە تا ئەو کات هەر سکرتێری حیزب بوو، نەیتوانی لەو کۆنفرانسەدا بەشداری بکات و تەنیا نامەی ناردبوو.

ئەو کۆنفرانسە هەرچەند نەیتوانی هەموو گیروگرفتەکان چارەسەر بکات، بەڵام لانی کەم دوو ئەرکی گرینگی بەجێ گەیاند. یەکەم، ئەوە بوو کە مامۆستا عبدالله حسەن زادە، کاک حەسەن ڕەستگار و مامۆستا هێمن بە مەبەستی تەرمیمی کۆمیتەی ناوەندی وەک ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران و بێجگە لەو سێ کەسە، باقی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بریتی بوون لە هاوڕێیان: ئەحمەد توفیق، مەلا سەید ڕەشید، ئەمیر قازی، عەزیز یوسفی و غەنی بلوریان. پێویستە بگوترێ کە ئەو دوو کەسەی دوایی لە زیندانی حکوومەتدا بوون و بەشداری کۆنفرانس نەبوون.

دووهەم، ئەرکی بەرچاوی ئەو کۆنفرانسە ئەوە بوو کە بەتەرمیمی کۆمیتەی ناوەندی، توانی حیزب تا رادەیەکی باش لە حاڵەتی پرش و بڵاوی بێنێتەدەر و لە بواری تەشکیلاتییەوە ئەندامانی حیزبی کۆکردەوە. هەروەها ئەو کۆنفرانسە بوو بە بنەمایەک بۆ ئەوەی دوو ساڵ دواتر کۆنفرانسی (٣) ببەسترێ، کە لە کاتی خۆیدا باسی گرینگی ئەو کۆنفرانسە دەکەین.

ماوەیەک دوای کۆنفرانسی (٢) کۆبوونەوەیەکی بەرینی کۆمیتەی ناوەندی و ژمارەیەک کادر لە گوندی« سینەمۆکە»ی بناری قەندیل، دەبەسترێ. لەو کۆبوونەوەدا

بڕیار دەدەن کە داوا لە دوکتۆر قاسملوو و کاک کەریم حیسامی بکەن بگەڕێنەوە کوردستان و کاری حیزبی بکەن، هەروەها بڕیار دەدەن کە داوا لە کاک ئەحمەد تۆفیق بکەن کە وەزعی خۆی لەگەڵ حیزب روون کاتەوە، چونکە رێبەریی حیزب هاتبووە سەر ئەو بڕوایە کە حیزب لە ژێر نفووزی ئەم لا و ئەولا بێنێتەدەر و بەرەو سەربەخۆیی بڕیاردانی بەرێ.

هەر لەو ساڵەدا هێزەکانی حکوومەتی عێراق و حیزبی شۆڕش(مام جەلال و هاوڕێکانی) ناوچەکانی بیتوێن و شاری قەلادزێیان گرت. بە دوای ئەوەدا ژمارەیەکیش لەو پێشمەرگانەی حیزب کە وەک پێشتر باسمان کرد لە بەکرەجۆ لە لای مام جەلال بوون، هاتنە قەلادزێ و لەوێ بنکەیان دانا، فەرماندەکەیان ناوی مەلا حسێن، ناسراو بە کاوە مارەغانی، فەرماندەی بە تالیۆنی شەهید پێشەوا بوو.

کاوە مارەغانی لە قەلادزێ را نامەی بۆ سەرکردایەتیی حیزب نووسی و باسی وەزعی خۆیانی کردبوو کە لە لایەن سەرکردایەتی حیزبەوە وەڵامیان درایەوە و رێنوێنیی پێویست کران.

وەزعەکە هەروا بەردەوام دەبێ و ژمارەیەک لە هاوڕێیان هەر لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکوومەتدا دەبن تا ١١ی ئازاری ١٩٧٠(١٣٤٩) کە لە لایەن حکوومەتەوە بەیاننامەیەک کە بەرهەمی خەباتی چەند ساڵە و وتووێژی سەرکردایەتیی شۆڕش و حکوومەت بوو، بڵاو بووەوە. لەو بەیاننامەیەدا مافی خودموختاری بۆ خەڵکی کوردستانی عێراق بە رەسمی دانی پێدا نرابوو. هەربۆیە ئەم راگەیاندنە بوو بەهۆی خۆشحاڵییەکی لە رادەبەدەری خەڵکی کورد بە گشتی و خەڵکی کوردستانی عێراق بە تایبەتی. لە هەموو شوێنێکی کوردستانی عێراق شادی کرا و جێژن گیراو خەڵک هێز و وورەیەکی تازەی هاتەوەبەر. ئەو شادی و خۆشحاڵییە لە دوو لاوە حیزبی ئێمەشی گرتەوە، لە لایەک ئەو بەیاننامەیە دەسکەوتێکی گرینگ بوو بۆ گەلی کورد لەو بەشەداو چاوەڕوان دەکرا کە ئەوە ببێتە پاڵپشتێک بۆ خەباتی گەلی کورد لە بەشەکانی دیکەدا، لە لایەکی دیکەشەوە چاوەڕوان دەکرا ئەو زەخت و فشارەی کە لە لایەن سەرکردایەتی شۆڕشەوە و لە ژێر تەنسیری حکوومەتی شادا، لەسەر هاوڕێیانی حیزبی ئێمە بوو، نەمێنێ.

رێبەرایەتی حیزب سەبارەت بە پاراستنی بنکەکانی ئەو برادەرانەی حیزبی کە تا ئەو کات لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکوومەتدا بوون، نامەی بۆ مەکتەبی سیاسی پارتی نووسی، کە وەڵامی موسبەتی درایەوە.

به دوای ئەو وەزعەدا ئەو هاوڕێیانە کە لە گوندەکانی بناری قەندیل و دەوروبەری بوون، چوونە قەڵادزێ و لەوێ جێگیر بوون، بەڵام دوای سێ چوار مانگ سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری دابوو کە هاوڕێیانی حیزبی ئێمە هەموویان لە شوێنێک کۆ بکرێنەوە. حیزبیش موافقی ئەو بڕیارە بوو. سەرەنجام لە مانگی ٦ی ١٩٧٠ دا بارگە و بنەی ماڵ و بنکەکانی حیزب لە بەکرەجۆ و قەڵادزێ را بەرەو هیران و نازەنین پێچرایەوە و لەوێ نیشتەجێ بوون، تاق و لۆقیش لە شار و گوندەکانی دیکە مابوونەوە.

ئەوکات بۆ خەرجی ژیان و گوزەرانی پێشمەرگەکان بەم چەشنە یارمەتییان پێ دەکرا، کە مانگانەی ڕەبەنەکان ١٠ دینار و ژن ومنداڵدارەکانیش ١٤ دیناریان دەدرایە.

بۆ پێراگەیشتن بە نەخۆش و چارەسەرییان لەو شوێنە، نەخۆشخانەیەکی سەرەتاییان هەبووە، کە لە لایەن کەسێک بە ناوی دوکتۆر کەریم سەرپەرستی دەکرا.

هەروەها بۆ ئەوەی نەخوێندەواران لانی کەم فێری خوێندن و نووسین بن، لە لایەن خوێندەوارەکانەوە دەرسی پۆلی یەک و دوویان پێ دەگوترا.

لێرەدا پێویستە نیشارە بەوە بکەین چونکە لە یەک دوو ساڵی پێش ئەو وەزعەدا هاورێیان بەشێکیان لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی حکوومەت دا (بەکرەجۆ) بوون و بەشێکی زۆریشیان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشدا بوون، ئەو لێک دابرانە تا رادەیەک ببووە هۆی هێندێک ناتەبایی فکری و جارجار ئەوناتەبایی یە لە هیران و نازەنینیش دا کە هەردوولا لەوێ کۆببوونەوە، سەری هەڵدەدایەوە. کاک حەمەدەمینی سیراجی کە پێشتر لە بەکرەجۆ بوو، لە پێشدا خاوەنی فکری مائۆیستی بوو، کە دوایی بووە لایەنگری حیزبی توودە. کاک ئەمیر قازی و مامۆستا عبدالله حەسەن زادە و.. کە لە بناری قەندیل بوون، فکری ناسیۆنالیستییان هەبوو. جا ئەو دوو جۆرە فکرە بوون کە ببوونە هۆی هێندێک ناتەبایی نێوخۆیی.

بەڵام ئەو دوو جەرەیانە وردە وردە لە یەک تر نزیک بوونەوە و لە فکری کۆنفرانسێک و دانانی بەرنامە و ئەساسنامە و تەرمیمی کۆمیتەی ناوەندی کەوتن و بەرە بەرە دەست بەکار بوون. ئەو برادەرانەی کە لە کۆنفرانسی دووەدا داوایان لێ کرابوو لە دەرەوە را بگەڕێنەوە کوردستان، ئامادەگیی خۆیان ڕاگەیاندبوو. هێنانەوەی ئەحمەد تۆفیق لە بەغدا و تەوزیح لێ خواستنی، لە مەڕ ئەو وەزعەی بەسەر حیزب هاتبوو، لە باسە گەرمەکانی ئەو سەردەمی نێو شوێن و بنکەکانی حیزب بووە، چونکە هەم دوکتور قاسملوو

رایگەیاندبوو کە لەگەڵ ئەحمەد تۆفیق کار ناکات، هەم ئەحمەد تۆفیقیش رایگەیاندبوو کە نابێ دوکتۆر قاسملوو بێتەوە نێو حیزب. لەسەروبەندی ئەو باسانەدا بوو کە،مەقەر و ماڵەکان گوێزرانەوە شاری کۆیە و سەرەنجامی ئەو باسانە ئەوە بوو کە ئاخرەکەی دوکتۆر قاسملوو لە ئورووپا را گەڕایەوە و هەر لە گەڕانەوەیدا چالاکانە دەستی بە کاری سیاسی کرد و سەردانی لای بارزانی و مەکتەبی سیاسی پارتی کرد و لە کۆیە پێوەندەیی بە هاوڕێیانی حیزبیشەوە گرتەوە.

دوای گەڕانەوەی دوکتۆر قاسملوو، جم و جۆڵی سیاسی زیاتر بوو، یەکەم هەنگاوی گرینگ ئەو بوو کە بۆ یەکپارچەتر بوونی ریزەکانی کادر و پێشمەرگە، بڕیار درا کە تا کۆنفرانس یان کۆنگرە، لایەنی کەم کۆمیتەی ناوەندی تەرمیم بکەنەوە. بەم شێوەیە بڕیار دراوە کە سەرکردایەتیەکی کاتی بۆ حیزب هەڵبژێرن. ئەندامانی سەرکردایەتی بریتی بوو لە:

١- دوکتۆر قاسملوو
٢- کاک ئەمیر قازی
٣- مامۆستا هێمن
٤- کاک حەمەدەمین سیراجی
٥- کاک حەسەن رستگار
٦- مامۆستا عبداللە حەسەن زادە
٧- کاک یوسف ریزوانی
٨- کاک کەریم حیسامی (کە ماوەیەک دوای ئەو بڕیارە لە دەرەوە گەڕایەوە بۆ کوردستان)

کۆمیتەی سەرکردایەتی کاتی بڕیاریدا کە لە کۆنفرانسێکدا هەم گیروگرفتەکانی حیزب چارەسەر بکەن و هەم خەت و رێبازێک لە پەیرەو و پرۆگرامدا بۆ حیزب دەست نیشان بکەن و بۆ ئەو مەبەستە کۆمیسیۆنێک بە ناوی کۆمیسیونی نووسینی پەیڕەو و پرۆگرام دیاری کرا کە ئەندامەکانی بریتی بوون لە:

١- دکتۆر قاسملوو
٢- کەریم حیسامی
٣- حەمەدەمین سیراجی
٤- مامۆستا عبداللە حەسەن زادە.

ئەو کۆمیسیۆنە گەلاڵەی پەیڕەوپرۆگرامی ئامادە کرد و سەرەنجام ڕۆژی ١/ ٥/ ١٩٧١ کۆمیتەی سەرکردایەتی بڕیاریدا کە ئەو گەلاڵەیە بۆ باس و قسە لەسەر کردن بدرێ بە ئەندامانی حیزب تا هەم ئەزمراتی خۆیان بدەن بە کۆمیتەی سەرکردایەتی و هەم لە کۆنفرانسی ٣دا بە ئامادەگی زیاترەوە قسەی لەسەر بکەن.

بەیاننامەی ١١ی ئازار و ئەو هەلومەرجە نوێیەی بۆ کورد هاتبووە پێش، شوێنی لەسەر هاوڕێیانی حیزبی ئێمەش دانابوو، هەربۆیە لەسەر مەسەلەی چۆنیەتیی کار و تێکۆشان لە کوردستانی ئێراندا قسەو باسێکی زۆر دەکرا و بیروڕای جۆراوجۆر بڵاو دەبوونەوە. هێندێ کەس ئیحساساتی پێیان وابوو کە دەبێ هەرچی زووترە بچنەوە نێو شاروگوندەکانی کوردستان و شەڕی چەکداری دەست پێ بکەن. هێندێ کەسی دیکەش پێیان وابوو کە بە بێ ڕێکخراوی حیزبی بە بێ تەشکیلاتێکی ڕێکوپێک دەست دانە چەک کارێکی دروست نییە. بۆ چارەسەری ئەو ناکۆکی و ئالۆزییە فکرییە ڕۆژی ١٣/ ٥/ ١٩٧١ کۆمیتەی سەرکردایەتی دوای راوێژ و لێکدانەوەیەکی زۆر ئەم بڕیارانەی دان:

١- «کۆمیتەی ناوەندی ئەزەری ئەوەیە کە شۆڕشی چەکدارانە ڕێگای ئەسڵیی ڕزگاریی ئێرانە لە ژێر باری ڕێژیمی شا و ئیمپریالیزم.

٢- کۆمیتەی ناوەندی لەو بڕوایە دایە کە خەباتی گەلانی ئێران گەیشتۆتە قۆناخێکی تازە و زۆر کارەساتی ئەو چەند مانگەی دوایی ئەو ڕاستییە ئیسبات دەکا.

٣- هێندێ شەرتی ئەساسی وەک یەکگرتنی هێزە دێموکراتییەکانی ئێران، شەرایەتی دەرەوەی لەبار بە تەواوی بۆ بەرپاکردنی شۆڕشی چەکداری پێک نەهاتووە. بە تایبەتی ڕوون بوونی هەڵوێستی سەرۆکایەتیی شۆڕشی کوردستانی عێراق زۆر گرینگە.

٤- دەست پێکردنی جووڵانەوەی چەکداری بەم چەشنە، واتە بە بێ ئامادەیی و بێ پێکهێنانی تەشکیلاتێکی ڕێکوپێکی حیزبی و بە هۆی ئەو کەسانەوە کە ناوبانگیان لە کوردستانی ئێران باش نییە، بە ڕاست نازانین.

٥- کۆمیتەی ناوەندی لەو بڕوایەدایە کە حیزب دەبێ لە هەموو جوڵانەوەیەک کە کۆمەڵانی خەڵک پشتیوانیی لێ بکەن، بەشداری بکا.

٦- کۆمیتەی ناوەندی دەبێ ڕێکخراوی حیزبی ئامادە بکا بۆ ئەوەی بە هەموو هێزییەوە لە بەرپا کردنی شۆڕشی سەرتاسەریی ئێراندا هاوبەشی بکا.

٧- کۆمیتەی ناوەندی دەبێ هەر لە ئێستاوە بە گورجی خەریکی پەروەردە کردنی کادری

سیاسی و عەسکەری بێ.

٨- کۆمیتەی ناوەندی دەبێ لە پێوەندیی خۆی لەگەڵ هێزەکانی دەرەوەی کوردستانی ئێران بۆ بەشدار بوونی حیزب لە جووڵانەوەی چەکداری دا کەڵک وەرگرێ». [*]

ڕۆژنامەی «کوردستان» ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب کە بۆ جارێکی دیکەش لە ڕێبەندانی ساڵی ١٣٤٩ دا یەکەم ژمارەی تازەی دەرچوو، لە ڕوونترکردنەوەی هەڵوێست و بڕیارەکانی حیزبدا دەورێکی ئەساسیی هەبوو. ڕۆژنامەی«کوردستان» گرینگترین هۆی پروپاگەندەیی حیزب بوو. دروشمی سەرەکیی حیزب کە لە دوو بەش پێکهاتبوو و هەموو جارێک لە یەکەم لاپەڕەی ڕۆژنامەی«کوردستان» دا چاپ دەکرا، بریتی بوو لە: بەشی یەکەم، بۆ ڕووخانی ڕێژیمی کۆنەپەرستی پادشایەتی و بۆ ڕزگاریی ئێران خەباتی خۆمان پەرە پێ بدەین. بەشی دووەم، بۆ پێکهێنانی خودموختاری لە کوردستانی ئێران لە چوارچێوەی ئێرانێکی دیموکراتیدا تێ بکۆشین. هەروەها «سەرکەوێ خەباتی یەکگرتووانەی گەلانی ئێران» دروشمێکی دیکەی ڕۆژنامەی «کوردستان» بوو.

پێش ئەوەی ئەو باسە کۆتایی پێ بێنین و بچینە نێو باسەکانی پێوەندیدار بە کۆنفرانسی ٣، بە پێویست دەزانین مەسەلەیەکی دیکە بخەینە بەرچاو:

پاش بەیاننامەی ١١ی ئازار کە بوو بەهۆی خۆشحاڵیی هەموو دڵسۆزێکی کورد، حیزبی ئێمە چاوەڕوان بوو کە سەرکردایەتی شۆڕش و پارتی دیموکرات لە مەڕ پێوەندیی خۆیان لەگەڵ حکوومەتی ئێران و بەرخوردیان بە هاوڕێیانی ئێمە، بە خۆیاندا بچنەوە و ئەو سارد و سڕییەی نێوان ئەم دوو حیزبە لابچێ. کاتێکیش کە لە لایەن مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقەوە، دەعوەت نامە بۆ بەشداری لە کۆنگرەی ٨ دا بە کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی ئێمە گەیشتبوو، کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی ئێمە زۆری پێ خۆش بیوو و وتارێکی زۆر باش و گونجاوی لەگەڵ هەولومەرجی ئەو کات ئامادە کردبوو. بەڵام لە کۆنگرەدا، سەرەڕای قەول و بەڵێنی پێشوو، دەستەی سەرۆکایەتی کۆنگرە ئیزنی نەدا کە کۆڕی نوێنەرایەتی حیزبی ئێمە وتاری خۆی وەخوێنێ و لەبەر زۆر بوونی وتارەکە بە پێویست نازانین ئەو وتارە لێرەدا بنووسینەوە. بەڵام دەقی نامەی نارەزایەتی کۆڕی نوێنەرایتی حیزب بۆ سەرۆکایەتیی کۆنگرەی ٨ی پارتی کە هەر ئەو کات پێشکەش کرا، دەخەینە بەرچاو:

---

(*) وەرگیراو لە کتێبی« بیرەوەرییەکانم» نووسینی: کەریم حیسامی، بەرگی چوارەم.

«بۆ لیژنەی بەڕێوەبەرایەتی کۆنگرەی هەشتەمی پارتی دیموکراتی کوردستان!
وێڕای سڵاو،
دەستەی نوێنەرایەتیی حیزبی دیموکراتی کوردستان کە لە لایەن مەکتەبی سیاسی پارتییەوە بە چەشنێکی ڕەسمی بۆ بەشدار بوون لە جەلەسەی افتتاحییەی کۆنگرەدا دەعوەت کرابوو، پێش کردنەوەی کۆنگرە پێوەندیی بە مەکتەبی سیاسییەوە کرد و ڕایگەیاند کە وتاری خۆی بۆ خوێندنەوە لە کۆنگرەدا ئامادە کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە موافقەتی خۆیان بۆ ئەم مەبەستە نیشان دا لە جەلەسەی کردنەوەی کۆنگرەدا بە ئێمە ڕاگەیەندرا کە لەبەر خستنە پێش چاوی هێندێک بەرژەوەندیی تایبەتی، پەیامی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە بەرنامەدا نەگونجاوە. سەرەڕای هەوڵ دانمان بۆ خوێندنەوەی وتارەکە، موافقەتیان نەکرد و پێشنیاریان کرد کە خۆیان لە لایەن ئێمەوە شتێک بە ناوی پیرۆزبایی بخوێننەوە. ئاشکرایە لە کاتێکدا خۆمان لە جەلەسەدا ئامادە بووین و ئەو پێشنیارەمان دایە دواوە. ئێمە پاش دەرچوونی بەیانی ١١ی ئازاری مێژوویی چاوەڕوانی ئاڵ و گۆڕێکی بنەڕەتی بووین لە مەوقفی پارتیدا بەرامبەر بە حیزبمان، کەچی زۆر بەداخەوە سەرنج ئەدەین ئەو سارد و سڕییەی پێشوو هێندێک وردە تێبینی لە هەڵوێستێتی پارتیدا بەرامبەر بە حیزبمان هەر ماوە کە ئەم کاری پارتی بەڵگەیەکی زیندووی ئەو حەقیقەتە تاڵەیە.
ئێمە لە کاتێکدا سەرکەوتنی کۆنگرەی هەشتەمی پارتی بە ئاوات دەخوازین، ناتوانین ناڕەزایی خۆمان لەو هەڵوێستە نالەبارە بشارینەوە.
دەستەی نوێنەرایەتیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران»
- وێنەیەک بۆ سەرۆک بارزانی بۆ ئاگاداری.
- وێنەیەک بۆ دەستەی نوێنەرایەتی هەموو حیزب و ڕێکخراوەکانی بەشدار لە جەلەسەی افتتاحییەی کۆنگرەی هەشتەمی پارتی.

بەشی دووهەم

# کۆنفرانسی سێهەم و
# دیاریکردنەوەی ڕێبازی سیاسی حیزب

ماوەیەک پێش بەستنی کۆنفرانس، سەرکردایەتی بڕیاری دابوو کە دوکتۆر قاسملوو بچێتە لای سەرۆک بارزانی و مەسەلەی بەستنی کۆنفرانسی لەگەڵ باس بکات. هەروەها بڕیار درابوو کە داوای یارمەتیی مالیش بکات. دوکتۆر قاسملوو ئەو سەفەرە دەکا و دوای گەڕانەوەی دەڵێ کە مەلا مستەفا گوتوویەتی ئێوە ڕۆژنامەتان بۆ چیەو بۆ بڵاوی دەکەنەوە، ڕۆژنامە بەکەڵکی چی دێ؟ هەروەها گوتبووی کە سەرۆک بارزانی بەڵێنی داوە کە مانگانە ٥٠٠ دینار کۆمەکی مالیمان پێ بکات. بەڵام پاشان دەرکەوت کە ئەو بەڵێنیەش وەک پێویست جێ بەجێ نەکرا.

ڕۆژ و کاتی دیاری کراو بۆ کۆنفرانسی (٣) ڕۆژ بەڕۆژ نزیکتر دەبوودەوە، ئەندامان و کادر و پێشمەرگەکان زۆر بە دڵگەرمی و هەر لەو کاتەدا بە پەرۆشەوە بەرەو پیری کۆنفرانس چوون. حیزب تا ڕادەیەکی باش لە حاڵەتی پرش و بڵاوی بێ سەرە و بەرەیی هاتبووە دەرێ وبەرەو سەربەخۆ بڕیاردان چوو. لێرەدا جێی خۆیەتی کە ئیشارە بە ئەخشی بەرچاوی دوکتۆر قاسملوو بکرێ، چونکە بە ڕاستی دوکتۆر قاسملوو دەورێکی کاریگەر و بەرچاوی لە یەک خستنەوەی ریزەکانی حیزب و تەنانەت زیندوو کردنەوەی حیزب لە بواری سیاسیدا هەبوو، چونکە ناوبراو شەخسیەتێکی ئاگا و زانا و تارادەیەکی زۆریش بۆ لایەنە سیاسییەکان ناسراو بوو. بە هاتنەوەی دوکتۆر قاسملوو ناو و ناوبانگی حیزب لە بواری سەربەخۆبوونی حیزب باشتر دەنگی دایەوە، بەچەشنێک کە هەم تا ڕادەیەک

پارتی دیموکرات و هەم حکوومەتی عێراق حیسابێکی تایبەتییان لەسەر حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دەکرد، بەڵام پێویستە لەسەر کەسایەتیی دوکتور قاسملوو ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە ناوبراو بە هۆی ئەوەی کە زۆربەی دەورانی ژیانی سیاسی هەر لە وڵاتانی ئورووپایی بووە، تارادەیەکی بەرچاو لەگەڵ فەرهەنگ و داب و نەریتی کوردەواری نامۆ ببوو، کە ئەو شتە زۆرجار دوکتور قاسملووی تووشی گیروگرفت کردوە.

لە هەلو مەرجێکی ئاوا و لە وەزعییەتێکی ئەوتۆی حیزبی داو لە رۆژی ٢١/٦/١٩٧١ لە شاری کۆیە بە بەشداری ٣٢ کەس کۆنفرانسی سێهەمی حیزبی دیموکرات دەکرێتەوە.

لە سەرەتادا لەسەر ئەوە ناکۆکیی بیرورا هەبووە، داخوانەوە کۆنفرانسی دوویە، یان کۆنفرانسی سێ، چونکە لە لایەک دوکتور قاسملوو پێی لەسەر ئەوە داگرتووە کە ئەوە کۆنفرانسی دوویە. ناوبراو پێی وابووە کۆنفرانسی دوو کە لە ساڵی ١٣٤٨ دا گیرابوو، شەرعیەتی نەبووە و ئەو کۆنفرانسەی رەد دەکردەوە. لە لایەکی دیکەش کاک ئەمیر قازی و مامۆستا عبدالله حەسەن زادە .. پێیان لەسەر رەوا بوونی کۆنفرانسی دوو داگرتووە. پاش دەمەتەقە و باس و راوێژێکی زۆر، سەرەنجام بڕیار دراوە کە ئەم کۆنفڕانسە کۆنفرانسی سێهەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بێ. ئەم کۆنفرانسە گەڵاڵەی بەرنامە و پێڕەوی نێوخۆی پەسند کردووە و بەو پێیە حیزب خەت و رێبازێکی روون و ئاشکرای لە پێش بووە. هەروەها سەرەڕای هێندێک کەم وکوری کە کۆنفڕانسەکە هەیبوو، توانیویەتی بناخەیەکی رێکوپێک بۆ حیزبی دیموکراتی کوردستان دابڕێژێ. بەڵام ناکامی پێ داگرتنی دوکتور قاسملوو لەسەر ناڕەوا بوونی کۆنفڕانسی دوو، ناخۆشەویست بوونی لە نێو لایەنگرانی ئەحمەد توفیق دا وپێ داگرتنی لەسەر کاندیدا بوونی کاک حەمەدەمینی سیراجی(*) بوو بەهۆی پێکهاتنی زەمینەی ناکۆکییەک کە لە رەگ و دەماری حیزبیدا ریشەی داکوتا و خودی دوکتور قاسملووش هەر بەو هۆیە لەو کۆنفرانسەدا بەوەدەست

---

(*) کاک حەمەدەمین سیراجی دوای ئەوەی لە کوردستانی ئێران را لە لایەن هاورێیانی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی حیزبەوە بۆ هێندێک پێداویستی دەنێردرێتە کوردستانی گەرمێن، کارەکان رانابەرێنێ و سەرەتا لە لای حیزبی شیوعی و پاشان لە لای مام جەلال لە بەکرەجۆ دەمێنێتەوە. بەم هۆیە زۆر لە هاورێیان پێیان وابووە کە ناوبراو سەلاحییەتی ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندیی نییە، بەڵام دوکتور قاسملوو گوتبووی ئەگەر نەهێڵن ئەو کاندید بێ، منیش کارناکەم. سەرەنجام لەبەر زەرووورەتی بوونی دوکتور قاسملوو، کاک حەمەدەمینیش دەبێتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی.

هێنانی ٢٤ دەنگ دەبێتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بەڵام کاک کەریم حەداد کە تەنانەت سەوادی خوێندن ونووسینی ئەوتۆشی نەبوو، هەر چونکە بێ لایەن بووە، بە ٣١ دەنگ دەبێتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. دوکتۆر قاسملوو زۆری گلەیی لە هاوڕێیانی کردووە و گوتوویەتی کە خەتای ئەوان بووە کە ئەویان وەک پێویست نەناساندووە و ئاوا دەنگی کەمی هێناوە. دیارە گلەییەکە زۆرتر لە کاک ئەمیر قازی و کاک حەسەن ڕەستگار وماموٚستا عبدالله حەسەن زادە بوو.

ئەو هاوڕێیانەی لە کۆنفڕانسی (٣)دا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێراون:

١- دوکتۆر قاسملوو
٢- کەریم حیسامی
٣- محەممەد ئەمین سیراجی
٤- ماموٚستا هێمن
٥- عبدالله حەسەن زادە
٦- حەسەن ڕەستگار
٧- ڕەسووڵ پێشنەماز
٨- قادر وێردی
٩- سەید ڕەسووڵ دیهقان
١٠- ئەمیر قازی
١١- کەریم حەداد

لە پاش تەواوبوونی کۆنفرانس، ڕۆژی ١٩٧١/٦/٢٤ کۆمیتەی ناوەندی لە کۆبوونەوەی خۆیدا دوکتۆر قاسملوو بە سکرتێری گشتیی حیزب و کەریم حیسامی حەمەدەمین سیراجی، ماموٚستا هێمن و ماموٚستا عبدالله حەسەن زادە بۆ ئەندامەتیی دەفتەری سیاسی هەڵبژاردووە. لێرەدا پێویستە ئیشارە بە وەزعی ئەحمەد تۆفیق بکرێ، چونکە ناوبراو کە پێشتر بەرپرسی یەکەمی حیزب بوو، بەڵام لە کۆنفرانسدا بەشداریی نەکردووە.

ڕۆژی ١٩٧١/٦/٢٥ کۆمیتەی ناوەندی بڕیاری داوە کە پێوەندیی پێوە بگیرێ و داوای هاتنەوە ژێر بڕیار و دیسیپلینی حیزبی لێ بکرێ، بەڵام ناوبراو لە وەڵامدا گوتبووی کە نە کۆنفرانسم وەک کۆنفرانس قبووڵە و نە ئەو ڕێبەرایەتییەش بە ڕێبەرایەتی حیزب

دەزانم.

جارێکی دیکەش لە رۆژی ١٩٧١/٨/٥ دا دەفتەری سیاسی مەئموورییەتی داوە بە مامۆستا عبداللە حەسەن زادە کە پێوەندی لەگەڵ کاک ئەحمەد تۆفیق بگرێ و داوای وازهێنان لە موخالەفەتی حیزبی لێ بکا، بەڵام ناوبراو هەروا دژی رێبەرایەتی حیزب لێرە و لەوێ قسەی دەکرد.

دەفتەری سیاسی لە کۆبوونەوەی رۆژی ١٤/ ١٠/ ١٩٧١ دا بڕیار دەدا کە بۆ ئاخر جار پێوەندی بە ئەحمەد تۆفیقەوە بگرێ و پێی بگوترێ کە واز لە تەبلیغاتی دژی ئەندامانی رێبەری بێنێ و بگەڕێتەوە نێو حیزب. بەڵام وا دیارە ئەو پێوەندیانە هیچ سوودیان نەبووەو کاک ئەحمەد نەگەڕاوەتەوە بۆ نێو حیزب هەر بۆیە کۆمیتەی ناوەندی لە کۆبوونەوەی مانگی ژانوییەی ١٩٧٢ بڕیاری داوە کاک ئەحمەد تۆفیق لە حیزب وەلا بنرێ.

لە هاوینی ١٩٧٢ دا دەفتەری سیاسی ئاگادار دەکرێ کە ئەحمەد تۆفیق دیار نییە و خانووەکەشی (لە بەغدا) داخراوە. پاشان دەنگۆ بڵاو دەبێتەوە کە ناوبراو لە لایەن حکوومەتی عێراقەوە گیراوە. دەفتەری سیاسی دەست بەجێ دوای بڵاوبوونەوەی خەبەری گیرانی کاک ئەحمەد، بڕیار دەدا کە شوێن پێی کەون و بۆ ئازادکردنی هەوڵ بدەن. بۆ ئەو مەبەستە مەئمووریەت دەدەن بە جێگری کۆمیسیۆنی پێوەندییەکانی دەرەوە (حەمەدەمین سیراجی) کە لە پێوەندیی خۆی لەگەڵ کاربەدەستانی حکوومەتی عێراقدا زۆربەتوندی داوای ئازادکردن یان شوێن و جێگاکەی بکا، بەڵام بەداخەوە کاربەدەستانی ئەو کاتی حکوومەتی عێراق نەک هەر ناوبراو ئازاد ناکەن و شوێن و جێگاکەی بە حیزب ناڵێن، بەڵکوو دەرکەوت کە کاک ئەحمەد دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر ئیعدام کراوە. هۆی گیران و ئیعدام کردنەکەی تا ئێستا وەک نهێنییەک ماوەتەوە و بۆ حیزب مەعلووم نییە، چونکە لەو بارەوە دەنگۆی جۆراوجۆر بڵاو بونەتەوە. خودی حکوومەتی عێراقیش نەک هەر حاشای لە ئیعدام کردنەکەی کردووە بەڵکو هەر حاشای لە گیرانی ناوبراویش کردووە.

کۆنفرانسی سێهەمی حیزب بە سەرەتای ئاڵ و گۆڕێکی گرینگ لە مێژووی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا دەژمێردرێ. چونکە هەروەک پێشتر باس کرا، حیزبی لە ژێر نفووزی ئەم لاو ئەولا دەرهێنا و سەربەخۆی کردەوە و بەرنامە و ئەساسنامەیەکی پێشکەوتووانەی گونجاو لەگەڵ هەلومەرجی بۆ حیزب پەسند کرد. جگە لەوانەش هەروەک رەسمی حیزبە پێشکەوتووەکانە، کۆنفرانس چەندین پەیامی بۆ ئۆرگان و لایەنە جۆراوجۆرەکان بڵاو

کردوونەوە. هەروەها بە دوای کۆنفرانسی ٣دا حیزب بۆ دامەزراندنی پێوەندیی سیاسی و نوسوولی لەگەڵ حیزب و ڕێکخراوەکانی کوردستانی و ئێرانی هەوڵی زیاتری داوە و لە پێوەندی لەگەڵ حکوومەتی عێراقیشدا پێوەندییەکەی ڕێکوپێکتر کردووە. لە بواری چاپەمەنی و تەشکیلاتیشەوە هەنگاوی بە کەڵکی هەڵێناوەتەوە، لە لایەک بۆ وشیار کردنەوەی کۆمەڵانی خەڵک و بڵاوکردنەوەی سیاسەتەکانی حیزب ڕۆژنامەی«کوردستان»ی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و پڕ ئێوەڕۆک چاپ و بڵاو کردۆتەوە و لە لایەکی دیکەشەوە بۆ پەروەردەکردنی ئەندامانی حیزب نامیلکەیەکی نێوخۆیی بە ناوی تێکۆشەر چاپ و لە نێوخۆی حیزبدا بڵاو کردۆتەوە.

هەروەک باسمان کرد، بە دوای کۆنفرانسی سێهەمدا حیزب لە بواری سیاسی و تەشکیلاتیدا پێشکەوتنی بەرچاوی بووە، بەڵام ژیان و گوزەرانی کادر و پێشمەرگەکانی حیزب هێندێک تووشی گیروگرفت بوون. چونکە سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق بە پێچەوانەی قەول و قەرارێک کە بە دوکتور قاسملوویان دابوو، تا ئەو کاتیش هیچ یارمەتییەکی ماڵییان بە حیزب نەکردووە، هەروەها حکوومەتی عێراقیش هەوڵی داوە کە حیزب بە شێوەیەک بەرێتەوە ژێر نفووزی خۆی و بۆ مەبەستەکانی خۆی، بێ وەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیی حیزب، لە دژی ڕێژیم هانی بداو لەو پێوەندییەدا هێندێک چاوەڕوانیی هەبووە کە حیزب زۆر مەسئوولانە جووڵاوەتەوە و نەچۆتە ژێر باری ئەو شتانە کە لەگەڵ بەرژەوەندیی خۆی و گەلەکەی نەگونجاون. هەر بۆیە حکوومەتی عێراق ئەو بڕە پارەیەی کە پێشتر داویە بە حیزب، دەیبڕێ و بەم چەشنە حیزب لە باری ماڵییەوە دەکەوێتە تەنگانەی زیاترەوە.

بە دوای ئەو وەزعەدا کاک حەمەدەمین سیراجی و مامۆستا عەبدالله حەسەن زادە لە لایەن کۆمیتەی ناوەندییەوە دەچنە کۆیە، کە تا ئەوکاتیش زۆربەی بنەماڵە و کادر و پێشمەرگەکان هەر لەوێ بوون. لە کۆبوونەوەیەکی گشتیدا کاک حەمەدەمین و مامۆستا عەبدالله باسی وەزعەکە بۆ بەشدارانی کۆبوونەوەکە دەکەن و داوا دەکەن کە بەشدارانی کۆبوونەوەش نەزەراتی خۆیان بڵێن. بەشدارانی کۆبوونەوە لە نوێنەرانی دەفتەری سیاسی پرسیار دەکەن کە لەو بوارەدا نەزەری کۆمیتەی ناوەندی چییە؟ ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە و دەڵێن کۆمیتەی ناوەندی پێی وایە ئەو کارانەی داوامان لێ کراوە لە بەرژەوەندی حیزبدا نین پێمان وایە نەداری و برسیەتی و نەبوونی قبووڵ بکەین، بەڵام سەربەخۆیی بڕیاردان بۆ

حیزب دەستەبەر بکەین، باشترە. بە خۆشییەوە هەموو بەشدارانی کۆبوونەوەکە لەگەڵ ئەو بڕیارەی کۆمیتەی ناوەندی هاودەنگ دەبن.

بەم چەشنە بۆ بەرێوەچوون ودەستەبەرکردنی ژیانێکی ئەمر ئەژی، هاوڕێیانی کادر و پێشمەرگە لە نێو شار و گوندەکانی ناوچەی سلێمانی، کۆیە، قەڵادزێ و رانیە دا بڵاو دەبنەوە و هەرکامیان پیشەیەکی گونجاو لەگەڵ توانای وەزعی خۆی رەچاو دەکات. جا لە وردەواڵە فرۆشی، دەرمان رشاندنی دێهات، تووتن کردن، حەمباڵی و.. بگرە تا هەر کارێکی دیکەی شەرفمەندانە کە پارەونانێکی تێدا بایە.

بۆ ئەوەی ئەو هاوڕێیانە لانی کەم دەست مایەیەکیان بۆ کارکردن هەبێ، ئیزن دەدرێن کە ١٧ قەبزە تفەنگ بفرۆشن و پارەکەی بەسەر خۆیاندا دابەش بکەن.

ئەوەی لەو کاتەدا جێگەی رێز و تەقدیر بووە، ئەوەیە کە ئەو هاوڕێیانە سەرەڕای باری قورسی ژیان و لە ژێر زەختدا بوونیان لە لایەن کاربەدەستانی شۆڕشەوە دیسان زۆر بە وریایی کاروباری حیزبیان هەر بەڕێوە بردوە و پێوەندیی خۆیان بە شێوەی تەشکیلاتی لەگەڵ دەفتەری سیاسی هەر راگرتووە.

دوای کۆنفڕانسی (٣) دوکتۆر قاسملوو بۆ سەردانی ماڵ و منداڵی بۆ ئورووپا سەفەر دەکا. بۆیە دەفتەری سیاسی مەئمووریەت دەدا بە کاک کەریم حیسامی کە بۆ باس کردنی چۆنیەتیی کۆنفرانسی سێهەم و وەزعی حیزب، بچێتە لای مەلا مستەفا بارزانی لە حاجی ئۆمەران. ئەو دیدارە دەکرێ، بەڵام سەرۆک بارزانی داوایەک لە حیزبی دێموکرات دەکات کە حیزب ناچێتە ژێر باری. کاک کەریم دەگەڕێتەوە دەفتەری سیاسی لە بەغدا. بۆ جارێکی دیکەش مەئمووریەت دەدرێتەوە کاک کەریم حیسامی کە دیسان سەردانی مەکتەبی سیاسی پارتی بکات و مەلا مستەفا ببینێ. ئەوجارە کاک کەریم هەر کاک ئیدریس بارزانی دەبینێ، بەڵام دیسان بۆچوونەکان یەک ناگرنەوە، چونکە ئەوەی راستی بێ لە لایەک کاک ئیدریس دەیەویست حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران هەروەک دەورانی کاک ئەحمەد تۆفیق هەر لە ژێر نفووز و تەنانەت دەسەڵاتی بارزانی دا بێ، لە لایەکی دیکەشەوە حیزبی ئێمە ویستوویەتی کە کەسایەتیی سیاسی خۆی بپارێزی و لەگەڵ حیزب و رێکخراوەکانی تری کوردستان لەسەر ئەساسی حورمەتی دوولایەنە پێوەندیی دۆستانەی هەبێ. دوای ئەو وەزعە کاک ئیدریس بەرخوردی زۆر سارد دەبێ و داوای دیتنی دوکتۆر قاسملوو دەکات.

هەرچەند دوکتۆر قاسملوو ئەو داوایەی کاک ئیدریسی پێ دروست نەبوو، بەڵام بە مەبەستی چارەسەری گیروگرفتەکان و تەنزیم کردنی پێوەندییەکی دۆستانە، دەچێتە لای کاک ئیدریس بارزانی. بەڵام ئەم سەفەرەش نەک هەر دەسکەوتێکی ئەوتۆی تێدا نابێ، بەڵکو حیزبی ئێمە ناچار دەبێ کە لە کۆبوونەوەی ١٩٧١/٦/٨ی کۆمیتەی ناوەندیی خۆیدا بڕیاری نووسینی نامەیەک بۆ کۆمیتەی ناوەندیی پارتی دیموکرات بدات. لەبەر دوورو درێژی نامەکە ناتوانین دەقەکەی لێرەدا بنووسینەوە.

لەو نامەیەدا کۆمیتەی ناوەندی وێڕای ڕەخنەگرتن لە هەڵوێستەکانی پارتی دەرحەق بە حیزبی ئێمە، هێندێک پێشنیاری بە کەڵکیشی بۆ تەنزیم کردنی پێوەندی دوولایەنە، هێنابووە گۆڕێ.

ئەوەش چەند دێڕێک لەم نامە مێژووییە: «ئەگەر بەڕێوەبەریی شۆڕشی کوردستانی عێراق پێوەندیی خۆی لەگەڵ حکوومەتی ئێران دەپارێزێ، یا ناپارێزێ، کەیفی خۆیەتی. ئەوەی بۆ ئێمە گرینگە بە ئەزەری ئێمە ئەم پێوەندی یە نابێ بە زیانی جووڵانەوەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران تەواو ببێ. ئێمە لەو بڕوایە داین کە پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق نابێ بچێتە ژێر باری هیچ شەرتێکی حکوومەتی ئێران کە مەبەستی زەربە وەشاندن لە جووڵانەوەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران و لێدانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بێ..». [*]

## رادیۆی شۆڕشگێرانی ئێران

ساڵی ١٣٥٠ (١٩٧١) ڕژێمی پاشایەتی ئێران و حکوومەتی عێراق لەسەر هێندێک مەسەلە و یەک لەوانە داگیرکردنی دوورگەکانی ئەبوومووسا، تونبی گەورە و تونبی بچووک، نێوان ناخۆشییان لێ پەیدا ببوو. بۆیە هەرکام لەو دوو حکوومەتە ببوونە پاڵپشتی نەیارانی حکوومەتەکەی دی، لە هەل وەرجێکی ئەوتۆدا دەبێ کە بەشێکی بەرچاو لە نەیارانی شای ئێران لە عێراق کۆ دەبنەوە. یەکێک لەو نەیارانە ژێنراڵ پەناهیان، ژێنراڵی فرقەی دیموکرات دەبێ کە دوای تێکچوونی کۆماری ئازەربایجان دەچێتە باکۆ و لەوێرا دەچێتە بەغدا. حکوومەتی عێراقیش بۆ زەربەوەشاندن لە شای

(*) وەرگیراو لە کتێبی ( لە بیرەوەرییەکانم) نووسینی: کەریم حیسامی، بەرگی چوارەم.

ئێران و ئیزامەکەی ئیمکاناتێکی باش دەدا بە ناوبراو. هەروەها ئیزنیان دەدا کە بەرنامەیەکی رادیۆیی بەڕێوەبەرن. بۆ ئەو مەبەستە ژێنراڵ پەناهیان لەگەڵ ڕێبەرایەتی حیزبی ئێمە پێوەندی دەگرێ و داوا دەکا کە حیزب لە بەڕێوەبردنی رادیۆدا بەشداری بکات.

دەفتەری سیاسیی حیزب لە کۆبوونەوەی ١٩٧١/٧/١٥ دا بڕیار دەدا بەو شەرتەی بتوانێ سیاسەتی حیزب لەو رادیۆیەدا بڵاو بکاتەوە، بەشداری لە بەڕێوەبردنی بکات. هەروەها گەڵاڵەیەکی بۆ بەڕێوەبردنی بەرنامەی رادیۆ پێشکەش کرد و کاک حەمەدەمین سیراجی وەک نوێنەری حیزب و بەرپرسی بەشی کوردیی ئەو رادیۆیە کە ناوی «رادیۆی شۆڕشگێڕانی ئێران» بوو، دیاری کردووە.

ماوەیەک ئەو هاوکاریە درێژەی دەبێ. تا ئەو کاتە کە سەننار مامەدی[*] لە نزیک ڕەواندز، لە لایەن هێزەکانی شۆڕشەوە دەگیرێ و پاشان تەحویلی ئێران دەدرێتەوە و لەو پێوەندییەدا ژێنراڵ پەناهیان بەیاننامەیەکی توندی لەسەر پارتی و سەرۆک بارزانی ئامادە کردووە ویستوویەتی کە بە زمانی فارسی و کوردی لە رادیۆ بڵاو بکاتەوە، بەڵام دەفتەری سیاسی حیزب دژی ئەو بەیاننامەیە دەوەستێ و بەو شێوەیە هاوکاری نێوان حیزب و ژێنراڵ پەناهیان تێکدەچێ. کارێکی گرینگی دیکە کە پاش کۆنفرانس ئەنجام دراوە گرینگی دان بە کاری دیپلوماسی و ناساندنی زیاتری حیزب و جووڵانەوەی گەل بە خەڵک و حکومەتەکانی هەندەران بووە. لەو پێوەندییەدا لە سێپتامبری ١٩٧١ دەفتەری سیاسی نوێنەری خۆی (کاک کەریم حیسامی) دەنێرێتە لوبنان تا لەگەڵ حیزبی کۆمونیستی لوبنان و حیزبی سۆسیالیستی پێشکەوتنخوازی لوبنان بە سەرۆکایەتیی کەمال جونبەلات پێوەندی بگرێ. ئەو سەفەرە دەکرێ و هەردووک حیزبی ناوبراو پێشوازییەکی باش لە نوێنەری حیزبی ئێمە دەکەن. هەر لە درێژەی ئەو سەفەرەدا لەگەڵ حیزبی کۆمونیستی بولغارستانیش پێوەندی دەگیرێ.

حیزبی توودەش کە ئەو کات ناوەندەکەی لە ئاڵمان دەبێ، داوای چاوپێکەوتن لەگەڵ

(*) سەننار مامەدی پاییزی ١٩٧١ دەچێتە لەندەن و لەوێ لەگەڵ سەفارەتی عێراق پێوەندی دەگرێ. پاش چەند ڕۆژ لەگەڵ پەناهیان و دوو نەفەری دیکە دەچێتە بەغدا. لەوێ داوای دیتنی ڕێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دەکات. ئیزنی پێنادەن، پاش ماوەیەک لەگەڵ پەناهیان ڕێک دەکەوێ و بە مەبەستی هەڵایساندنی شەڕی چەکداری لە لای ورمێ، لەگەڵ ٦ کەس بە ٧ بار فیشەک و تەقەمەنییەوە لە بەغدا را بەرەو سنوور دەکەوێتە ڕێ. هەر کە لە ڕەواندز وەدەردەکەوێ تەقەیان لێ دەکرێ و سەننار بە برینداری دەگیرێ و دوای ١٧ ڕۆژ تەحویلی ڕێژیمی شای دەدەنەوە.

نوێنەری حیزب دەکا، کاک کەریم پاش ئەوەی بە تەلیفۆن لەگەڵ دەفتەری سیاسی راوێژ دەکات، دەچێتە ئاڵمان و لەوێ رێبەرانی حیزبی توودە دەبینێ. ئیرەج ئەسکەندەری وەک سکرتێری یەکەمی حیزبی توودە رەزامەندیی خۆی لە بەرنامەی پەسند کراوی کۆنفرانسی سێ دەردەبڕێ و دەڵێ بەرنامەیەکی دژی«ئیمپریالیستی» و پێشکەوتنخوازانەیە و دەمانهەوێ لەگەڵ هاوڕێیانی رێبەریی حیزب دانیشتنمان هەبێ. بەڵام کیانووری بە پێچەوانەی سکرتێری یەکەمی حیزبەکەی، پێی وا دەبێ کە حیزبی دێموکراتی کوردستان دەبێ لقی کوردستانی حیزبی توودە بێ، بەڵام نوێنەری حیزبی ئێمە لەو دانیشتنانەدا زۆرتر لەسەر پێکهێنانی بەرە قسەی کردووە. لە ئاخردا قسەکانیان ناگەنە یەک و نوێنەرانی حیزبی توودە داوای مولاقاتێکی دیکە لەگەڵ رێبەرایەتی حیزب دەکەن.

ئەرکێکی گەلێک گرینگی دیکە کە کۆنفرانسی سێهەم خستوویەتە سەرشانی کۆمیتەی ناوەندی، دامەزراندنەوەی تەشکیلاتی حیزب و رێکخراوەکانیەتی لە نێو کوردستاندا. بۆ ئەو مەبەستە کۆمیسیۆنێک لەو هاورێیانە پێک دێ: کەریم حیسامی، مەسئوولی کۆمیسیون، حەسەن رەستگار، رەسووڵ پێشنەماز، کەریم حەداد و قادر وریدی، ئەندامانی کۆمیسیۆن.

پاش دامەزرانی ئەو کۆمیسیۆنە چالاکیی تەشکیلاتی وردە وردە دەستی پێکردەوە. بە تایبەت لە ناوچەکانی بانە، سەردەشت و مەهاباد، پێوەندی لەگەڵ ئەندامانی حیزب تازە دەکەنەوە. بە دوای ئەو چالاکییە تەشکیلاتییانەدا دەبێ کە چەندین کەس لە لاوانی سەردەشت و مەنگوڕایەتی کە زۆربەیان فەقێی حوجرەکان دەبن نامە بۆ رێبەرایەتی حیزب دەنووسن و داوای پێوەندی گرتن دەکەن، کە لە لایەن کۆمیسیۆنی تەشکیلاتەوە وەڵامیان دەدرێتەوە.

لەو سەروبەندەدا دەبێ کە کۆمیتەی ناوەندی بۆ پەروەردەکردنی کادر و پێگەیاندنیان بۆ دوارۆژ بڕیار دەدا دەورەیەکی سیاسی بکرێتەوە. مەئمووریەتی دانانی ئەو دەورەیە بە کۆمیسیۆنی تەشکیلات دەسپێردرێ. ئەم دەورەیە لە مانگی ئاخری ساڵی ١٩٧١ دەکرێتەوە و ٢١ کەس بەشداریی تێدا دەکەن. لەسەریەک ئەو دەورەیە لە لایەن کۆمیتەی ناوەندییەوە بە دەورەیەکی باش هەڵسەنگێندرا.

بۆ بووژاندنەوەی تەشکیلاتی حیزب لە نێو کوردستاندا هەر دامەزراندنی کۆمیسیۆن و کردنەوەی کلاسی کادر بەس نەبوو، بەڵکو پێویست بوو کە هاوڕێیانی رێبەری و بە تایبەت ئەندامانی کۆمیسیۆن و کادرەکان لە جاران زیاتر چالاکیی تەشکیلاتی ئەنجام بدەن.

یەکێک لەو رۆڵە تێکۆشەرانەی کۆمیتەی ناوەندی کە زۆر چالاکانە دەستی بە کاری ڕێکخستنەوەی شانەکانی حیزبی دەکا، قادر وێردی دەبێ. ناوبراو لە زستانی ١٩٧٤ سەفەرێک بۆ ناوچەکانی بانە دەکات و هێندێک لە ڕێکخراوەکانی حیزبی دەبووژێنێتەوە.

لەو سەفەرەدا دەبێ کە کابرایەکی خۆفرۆش و جاسووس بە ناوی سەلیمی خاشمرافەت خۆی لێ نزیک دەکاتەوە و وا دەنوێنێ کە دڵسۆزی حیزب و گەلی کوردە. پاش گەڕانەوەی کاک قادر بۆ سلێمانییش. ئەو کابرا جاسووسە یەک دووجار هاتوچۆی کردووە و بەڕواڵەت کاری حیزبی ئەنجام داوە. چەند رۆژێک پێش نەورۆزی ١٣٥٢ سەلیمی جاسووس دێتەوە سلێمانی. سەرەتای ساڵی ١٣٥٢، مەلا قادر وێردی و کادرێکی دیکە بە ناوی محەممەد سدیق سالحی لەگەڵ سەلیم بەرەو ناوچەی بانە دەکەونە رێ. رۆژی پێنج شەممە ١٣٥٢/١/٢ لە نێو شاری بانە، سەلیم بە هاوکاریی دوو ئامۆزای خۆی، مەلا قادر و محەممەد سدیق دەباتە ماڵی عەزیز مستەفا زادە(برای شەهید خەلیل شەوباش) و بۆخۆی دەڕوا و خەبەریان لێ دەدا. ساواکی و ژاندارم و پۆلیس دەوریان دەدەن و تەقەو لێکدان دەست پێ دەکات. قادر وێردی زۆر ئازایانە تا دوایین فیشەکی دەمانچە چواردە خۆرەکەی تەقە دەکا و سەرەنجام سەربەرزانە تێکەڵ بە کاروانی شەهیدانی حیزب و گەل دەبێ. محەممەد سەدیق بە برینداری لەوێ دەرباز دەبێ، بەڵام سەرەنجام لەسەر جادەی سەقز- بانە لە لایەن ژمارەیەک لە جاشی (چریک) خۆفرۆش بە دیل دەگیرێ و نوامبری ١٩٧٢( خەزەڵوەری ١٣٥٢ ) لەگەڵ عەزیز مستەفازادە لە شاری سنە تیر باران دەکرێن.

کۆمیتەی ناوەندی کاتێک کە لە شەهیدبوونی قادر وێردی ئاگادار بووە بەیاننامەیەکی بڵاو کردەوە کە وێڕای سەرەخۆشی و نیشاردەکردنی بە خەبات و تێکۆشانی ئەو تێکۆشەرە، داواشی لە کۆڕ و کۆمەڵە بەشەرەدۆستەکانی جیهان کرد کە بێزاریی خۆیان لەو کردەوەیەی شا و بەکرێگیراوەکانی دەربڕن. بە دوای ڕاگەیەندراوی کۆمیتەی ناوەندیدا لە لایەن ڕێکخراوەکانی جەبهەی میللی ئێران لە ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست، حیزبی کۆمۆنیستی عێراق، لقی پێنجی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، پارتی دیموکراتی کوردستانی سووریە، یەکیەتیی لاوانی دیموکراتی کوردستانی عێراق، یەکیەتیی قوتابیانی کوردستانی عێراق، ڕێکخراوی ڕووناکبیرانی کوردی ئێران لە ئورووپا و زۆربەی ڕێکخراوەکانی حیزبی پەیام و نامەی سەرەخۆشی بە ڕێبەرایەتیی حیزب گەیشتووە و ئەو جینایەتە مەحکووم کراوە. هەروەها شەهید کردنی مەلا قادر وێردی لە هەندەرانیش دەنگی

دابوومەوە. فـینربروگـودی، نوێنەری مـەجلیسی لۆردەکان لە لەندەن و سەرۆکی ڕێکخراوی لیبیرەیشن(ڕزگاری) و ستیوارت سکرتێری کۆمەڵەی مافی مەدەنی ئێرلەندی باکووری، برووسکەی نارەزایەتییان بۆ شا لێداوە و ئەو کردەوەیان مەحکووم کردووە.

ڕۆژنامەکانی «باختر امروز» (ئۆرگانی ڕێکخراوەکانی جەبهەی میللی)، «١٩ بهمن» (ئۆرگانی جبهە ء آزادیبخش ملی ایران) «الثورە»، «الجمهوریە»، «التاخی»، کە سێ ڕۆژنامەی گرینگی عێراقن «بیری نوێ»، «ڕۆژنامەی حیزبی کۆمۆنیستی عێراق»، «هاوکاری» کە لە بەغدا دەرچووە، «ورکیرس پریس» ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندیی یەکیەتیی سوسیالیستی کریکارانی ئینگلستان، ژمارە ١٠٧١ ساڵی ١٩٧٣، «نافتون بلادیت» گرینگترین ڕۆژنامەی خەبەری سوئید ڕۆژی ٥/٥/١٩٧٣، «داگینز نی هیتیر» ڕۆژنامەیەکی بە ناوبانگی سوئیدە «لوموند» ڕۆژنامەی بە ناوبانگی فەرانسە «ڕۆناهی» کە لە لایەن کوردەکانی تورکیە بە نهێنی دەردەچوو، هەر کامەیان بە شێوەیەک لەسەر مەسەلەی شەهیدکردنی قادر وێردی وەدەنگ هاتوون و تەنانەت هێندێکیان دەقی ڕاگەیەندراوەکەی حیزبیان چاپ کردووە.

شایانی باسە کە کوردەکانی ئێران دانیشتووی سوئید بەم بۆنەیەوە تەزاهوراتیان کردووە و چوونەتە بەر دەرگای سەفارەت خانەی ئێران، کە بۆتە هۆی ئەوە کە مەسەلەکە زۆرتر لە وڵاتانی دەرەوەدا دەنگ بداتەوە.

بە دوای ئەو کارەساتەدا ڕێکخراوەکانی حیزب تووشی مەترسی دێن و چەند کەسێک لە لایەن ساواکەوە دەستگیر دەکرێن. چەند کەسێکیش ئاوارە دەبن و بەرەو عێراق دەکەونە ڕێ. کاک هاشم کەریمی کە ئەو کات لە تاران بووە و پێوەندیی ڕاستەوخۆی لەگەڵ حیزب هەبووە، کاک مەلا عوسمان میراوەیی ناسراو بە جەلال کە لە بانە خەریکی خوێندنی دەرسی ئایینی دەبێ، لەو کەسانەن کە بە دوای کارەساتی شەهید بوونی مەلا قادر وێردی، تێکۆشانی ئاشکرایان دەست پێکردووە و خۆیان گەیاندۆتە ناوەندی حیزب، کە ئەوکات لە بەغدا بووە.

بەر لەوەی کۆتایی بە باسەکانی پێوەندیدار بە کۆنفرانسی سێهەم بێنین، پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە مەلا سەید ڕەشید و چەند کەسی دیکە کە پێشتر پێوەندیان بە حیزبەوە هەبووە، بە لایەنگری لە بۆچوونەکانی ئەحمەد توفیق، لە دژی بڕیارات و کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێراوی کۆنفرانسی سێهەم کەوتنە تەبلیغ کردن، ئەو تاقمە لە ژێر

ناوی کۆمیتەی کاتیی حیزبی دیموکراتدا (کە پاشماوەکەیان دواتر بوو بە کۆمەڵەی یەکسانی) لە گوندی «نێندزێ»ی ناوچەی ناودەشتی سەر بە شارۆچکەی سەنگەسەر بنکەیان دانابوو. پێویستە ئەوەش بڵێین کە ئەوانە لە لایەن بەشی پاراستنی پارتی دیموکراتەوە کۆمەکیان پێکراوە و چەک و چۆڵیان دراوەتێ. ئەو مەسەلە بۆتە هۆی ئەوە کە لەو پێوەندییەدا چەندین نامە لە بەینی ڕێبەرایەتیی حیزبی ئێمە و پارتی دیموکراتدا ئاڵ و گۆڕ بکرێن. حیزبی ئێمە پێی ناخۆش بووە کە پارتی دیموکرات یارمەتیی ئەو کەسانەی داوە کە زۆر نامەسئوولانە لە دژی حیزبی دیموکرات جووڵاونەوە.

ئەو تاقمە سەرەنجام نەیانتوانی لە ژێر ئەو ناوەدا گەشە بکەن، بۆیە لە ساڵەکانی دواتردا ناوی کۆمەڵەی یەکسانیی کوردستانیان بۆ خۆیان هەڵبژارد.

# کۆنگرەی سێهەمی حیزب و گرینگی دان بە کاری نێوخۆی وڵات

ئەگەر لە ماوەی سێ چوار ساڵی پێش کۆنگرەی سێهەمدا رێبەرایەتیی حیزب نەیتوانیبوو وەک پێویست لە نێوخۆی کوردستاندا جم وجۆڵی سیاسی بکات، یان تەشکیلاتێکی رێکوپێک دابمەزرێنی، لانی کەم پاش هەوڵ و کۆششێکی زۆر توانیبووی ریزەکانی حیزب یەکگرتوو بکا و لە نێو کادر و ئەندامانی ناشکرای حیزبدا تەشکیلاتێکی رێکوپێک دابمەزرێنێ و سەرەنجام لە کۆنفرانسی سێهەمدا، بەرنامە و پێرەوی نێوخۆ و خەت و رێباز بۆ حیزب دیاری بکا. بەڵام بە پێی رووداوەکانی جیهان وناوچە و بە پێی بەردەوام پێش چوونی حیزب لە بواری سیاسی و تەشکیلاتییەوە پێویست بوو کە حیزب هەنگاوی باشتر و خێراتر هەڵێنێتەوە. لەو پێوەندییەدا لە «راگەیاندنێک لەسەر کۆنگرەی سێهەمی حیزبی دیموکراتی کوردستان» کە لە پێشەکیی بەڵگەکانی کۆنگرەی سێهەمدا چاپ و بڵاوبۆتەوە، ئاوا باسی پێویستیی بەستنی کۆنگرەی سێهەم دەکرێ: «کۆمیتەی ناوەندی پاش لێکدانەوەیەکی زۆر هاتبووە سەر ئەو باوەڕە کە هەلومەرجی ئێستای خەباتی حیزبەکەمان پێویستی بەوە هەیە کە کۆنگرەی سێهەمی حیزب بگیرێ. هەلومەرجێکی نوێی خەبات پێکهاتووە کە پێویستی بە تەرازبەندیی تێکۆشانی رابردووی حیزب، روونکردنەوەی زۆر بەسەرهاتی گرینگ و بە تایبەتی بە دیاری کردنی رێبازی سیاسیی دواڕۆژ و ستراتیژی و تاکتیکی حیزب هەیە و هەروەها پێویستە ئۆرگانی بەڕێوەبەریی حیزب لە کۆنگرەی حیزبیدا کە بەرزترین ئۆرگانی حیزبە هەڵبژێردرێ...».

بەم شێوەیە بە پێی ئەو زەرووردتە رۆژی ۱۹۷۳/۹/۲۲(رەزبەری ۱۳۵۲) کۆنگرەی سێهەم کە ٤۹ کەس لە نوێنەرانی رێکخراوەکانی حیزبی لە نێوخۆی وڵات و دەرەوە تێیدا

بەشدار بوون، بە خوێندنەوەی سروودی نەتەوایەتیی«ئەی رەقیب» لە یەکێک لە بیناکانی نێو شاری بەغدا دەستی بە کارەکانی خۆی کردووە. لە نێو بەشدارانی کۆنگرە ئەندامی وا هەبوو کە لە دامەزرێنەرانی حیزب بوو، هی واش هەبووە کە هەر دووساڵ بەسەر تەمەنی حیزبی بوونیدا رابردووە. بە تەمەنترین ئەندامی کۆنگرە، ٥٢ ساڵ و لاوترین ئەندام ٢٠ ساڵ و تەمەنی نێونجی بەشدارانی کۆنگرە ٣٥ ساڵ بووە.

پاش سروودی «ئەی رەقیب» سەرەتا مامۆستا هێمن وەک بە تەمەنترین ئەندامی بەشدار، کۆنگرەی کردۆتەوە و پیرۆزبایی کردووە. ئەوجار دوکتۆر قاسملوو ٤٩ دانە کتێبی(کوردستان و کورد)ی بە سەر بەشدارانی کۆنگرە دا دابەش کردووە.

بەر لەوەی راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی پێشکەش بکرێ، لەسەر ئەوە داخوا کۆنگرەی سێهەمە یان دووهەم، دەمەتەقە دەست پێدەکات. دوکتۆر قاسملوو بە پشتیوانیی هێندێک لە ئەندامانی کۆنگرە لەسەر ئەوە پێی داگرتووە کە ئەمە کۆنگرەی دووهەمە. لە روانگەی دوکتور قاسملوو کۆنگرەی دووهەم شەرعیەتی نەبووە، هەر بۆیە پێی وابووە کە دەبێ ئەوە کۆنگرەی دووهەم بێ. بەڵام زۆربەی ئەندامانی کۆنگرە پێیان وابووە کۆنگرەی دووهەم کە ساڵی ١٩٦٤ لە سونێ گیراوە، شەرعیەتی هەبووە، هەربۆیە پێیان وابوو دەبێ ئەمە کۆنگرەی سێهەم بێ. شتێکی روونە کە هەردوولای باسەکە بۆ نیددیعای خۆیان دەلیل و بەڵگەیان هێناونەتەوە. سەرەنجام کار دەگاتە دەنگ وەرگرتن لە بەشدارانی کۆنگرە. کۆنگرە بە زۆربەی دەنگ بریار دەدا کە ئەمە کۆنگرەی سێهەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانە، بەڵام لەسەر پێشنیاری مامۆستا عبداللە حەسەن زادە، بەشدارانی کۆنگرەی ٣ بەنیسبەت کۆنگرەی ٢ بریارێک بەم چەشنە پەسند دەکەن: «کۆنگرەی سێهەمی حیزبی دیموکراتی کوردستان بەیان و بریارەکانی کۆنگرەی دووهەم، بێجگە لە بەشێکی کەمیان کە لەسەر مەسائیلی سیاسین، رەت دەکاتەوە، بە تایبەت هێندێک هێرشی ناڕەوا و نادروست بۆ سەر کۆماری دیموکراتی کوردستان و بەشێک لە بەرێوبەران و کادرەکانی حیزبی مەحکووم دەکات».

دوای ئەو باس و بریارانەو راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی و کۆمیسیۆنی تەشکیلات پێشکەش دەکرێن، کە دوای قسە لەسەرکردن بە تێکرای دەنگ پەسند کراون.

بەرنامە و پێڕەوی نێوخۆی حیزب، پەسندکراوی کۆنفرانسی سێهەم، بە هێندێک دەستکارییەوە، لەسەر را پەسند کرایەوە. دروشمەکانی خەبات دژی ئیمپریالیزم، جودایی

دین له دەوڵەت و دەستنیشـان کـردنی سۆسـیالیزم وەک ئامـانجی دوارۆژ پێیـان لەسـەر داگیراوە.

کۆنگرەی سـێهـەمی حیزب لەسەر ئەو بڕوایە بوود که بۆ رووخاندنی رژێمی پاشایەتی دەبێ هەموو هێزە نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕەکان یەک بگرن و له بەرەیەکدا هاوئاهەنگی بکەن. هەربۆیە حیزب کۆمەڵێک دروشم بۆ دانانی بناغـەی بەرەی رزگاریخواز پێشـنیار دەکا و رادەگەیەنێ که بۆ ئەم مەبەستە ئامادەیه لەگەڵ هەموو رێکخراوەکانی نیشتمانی و دێموکراتی وتووێژ بکات. دروشمەکانی پێشـنیاریی حیزب بەم چەشنەی خوارەوە بوون:

- لابردنی رژێمی دیکتاتۆری سەر بە ئیمپریالیزم

- هێنانه سەرکـاری حکوومـەتێکی دێموکراتی و نیشـتـمـانی که به ئەنجـام گـەیاندنی ئامانجەکانی خوارەوە بکاته بەرنامەی کاری خۆی.

- دابین کردنی ئازادییه دێموکراتییەکان بۆ کۆمەڵانی خەڵکی ئێران.

- دانی مافی خودموختاری بە نەتەوەکانی زۆرلێکراوی ئێران له چوارچێوەی ئێراندا.

- دارشـتنی سـیـاسـەتێکی ئابووری - نیشـتـمـانی بۆ پاراسـتنی قـازانجی خـەڵک و پێشخستنی وڵات و بەرزکردنی پایەی ژیانی زەحمەتکێشان.

- به ئەنجام گەیاندنی ئیسـلاحی زەوی لەسەرانسـەری ئێران به چەشنێک که قـازانجی جووتیارانی هەژار و ئێونجی بپارێزێ.

- دانانی هەشت سـەعـات کـاری رۆژانه و دابین کـردنی بیمـەی کۆمـەڵایەتی بۆ هەموو کرێکاران و زەحمەتکێشان.

- له ئێوبردنی ئەخـوێندەواری و بەرزکـردنەوەی پایەی فـەرهەنگی و زانسـتـیی گـەلانی ئێران.

- هاتنەدەر له پەیمانەکانی ئیزامی و گرتنەبەری سیاسەتێکی سەربەخۆی دەرەوە.

- هاودەردی و لایەنگریی هەمـوو جـووڵانەوەکـانی رزگـاریخـواز و پشـتـگرتنی مـافی دانانی چارەنووسی نەتەوەکان به دەست خۆیان.

- دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ وڵاتان لەسەر ئەسـاسی رێزگرتن و ئاسینی حاکمـیـەتی نەتەوایەتی و دەست تێـوەرنەدان له کـاروباری ناوەوەی یەکـتـر و پێکهـێنانی پێـوەندیی دۆسـتـانه و هاوکـاری لەگـەڵ وڵاتانی دژی ئیـمـپـریالیـسـتی و هەروەها دەوڵەتانی سۆسیالیستی.

کۆنگرە لە دوا کاتەکانی خۆیدا بەشێوەیەکی دیموکراتی و نهێنی کۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژاردوە. شایانی باسە کە لەو کۆنگرەیەدا دووکەس لە هاورێیانی نێوخۆی کوردستان وەک جێگری کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران.

سەرجەمی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و جێگرەکانی هەڵبژێراوی کۆنگرەی سێهەم بریتی بوون لە:

١- دوکتۆر قاسملوو

٢- کەریم حیسامی

٣- محەمەد ئەمین سیراجی

٤- مامۆستا عبداللە حەسەن زادە

٥- مامۆستا هێمن

٦- محەمەد موهتەدی

٧- ئەمیر قازی

٨- دوکتۆر حەسەن شتوی

٩- دوکتۆر سوڵتان وەتەمیشی

١٠- هاشم کەریمی

١١- رەسووڵ پێشنماز

١٢- غەنی بلوریان

١٣- عەزیز یوسفی.

ئەم دووکەسەی دوایی لە زیندانی رێژیمی شادا بوون و غیابەن هەڵبژێران.

هەروەها ئەو هاورێیانەش وەک ئەندامی جێگری کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێران:

١- کەریم حەداد

٢- مەلا سمایل حاجی

٣- حەمە رەسووڵ حەسەن پوور

٤- مەلا سەلام نجنەیی

کە ئەو دوو کەسەی ئاخری لە ئێران دەژیان. هەروەها شایانی باسە کە دوکتور قاسملوو بە سکرتێری حیزب هەڵبژێرایەوە.

کۆنگرەی سێهەمی حیزب بۆ ئەو کەس و لایەن و گەلانە پەیامی ناردبوو:

- پەیام بۆ ئەندامانی حیزب
- پەیام بۆ گەلی کورد لە کوردستانی ئێران
- پەیام بۆ گەلانی ئێران
- پەیام بۆ ڕێکخراوە دژی ئیمپریالیستی و دیموکراتییەکانی ئێران.
- پەیام بۆ زیندانییە سیاسییەکان.
- پەیام بۆ گەلی کورد لە کوردستانی عێراق.
- پەیام بۆ گەلی کورد لە کوردستانی تورکیە.
- پەیام بۆ گەلی کورد لە کوردستانی سووریە.
- پەیام بۆ گەلی فەلەستین
- پەیام بۆ خەباتکەرانی زەففار.
- پەیام بۆ گەلی کامبۆج
- پەیامی هاودەردی لەگەڵ گەلی شیلی.
- پەیام بۆ گەلی ئێرلەند.
- پەیام بۆ گەلانی ئاسیاو ئەفریقا و ئەمریکای لاتین.

دوای تەواوبوونی کۆنگرە پێویست بووە کە کۆمیتەی ناوەندی لەسەر دوو مەسەلەی گرینگ ساغ بێتەوە: یەکەم، ئەوە کە هەست بەوە کراوە لە داهاتوویەکی ئەهێندە دووردا لە نێوان حکوومەتی عێراق و پارتی دیموکراتدا شەڕ دەست پێدەکاتەوە، بۆیە پێویست بوو کە حیزب خۆی بۆ هەلومەرجێکی ئەوتۆ ئامادە بکات. دووهەم، شت ئەوە بوو کە پاش ئەوەی هاوکاریی رادیۆیی نێوان حیزب و ژێنراڵ پەناهیان پەکی کەوتووە، حیزب داوای لە حکوومەتی عێراق کردووە کە ئیزن بدات لە رادیۆی بەغداوە بەرنامەیەکی نیو سەعاتی بەڕێوە بەرێ. بۆیە پێویست بوو کە کۆمیتەی ناوەندی لەسەر ئەو مەسەلەیەش بڕیاری یەکجاری خۆی بدا.

کۆمیتەی ناوەندی کۆ دەبێتەوە و پاش لێکۆڵینەوە و راوێژێکی زۆر لەمەڕ هەردووک مەسەلەکاندا بەم چەشنە بڕیار دەدا:

«١- ئەگەر لە کوردستانی عێراق شەڕ هەڵگیرسێتەوە، کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکراتی کوردستان، عێراق بەجێ بێڵێ و بچێتەوە ئێران و خەباتی خۆی لە کوردستانی ئێران درێژە پێ بداو کۆمیتەی ناوەندی هەر لە ئێستاوە پێویستە هەنگاو بۆ ئامادەبوون باوێژێ.

٢- كۆمیتەی ناوەندی بە زۆربەی دەنگ بڕیار دەدا کە بەرنامەی رادیۆیی لە رادیۆی بەغداد بەڕێوەبەری» .

دانانی ئەو بەرنامە رادیۆییە سوودی باشی بۆ حیزب هەبووە، لەو بەرنامەیەدا پێڕەو و پرۆگرامی کۆنگرەی ٣، راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی و شیعر و سروودی نیشتمانی بڵاودەکرانەوە. بەڵام بەداخەوە ئەو بەرنامەیە زۆری نەخایاند، چونکە لە نێوان حکوومەت و شۆڕشی کوردستانی عێراقدا شەڕ ساز دەبێتەوە و رێبەرایەتیی حیزبی ئێمەش تووشی گیروگرفت دەبێ و بەرنامە رادیۆییەکەشی پێ تەعتیل دەکەن. هەر لەو سەروبەندەشدا دەبێ کە ئیرەج ئەسکەندەری و نوورەدین کیانووری کە پێشتر داوای چاوپێکەوتن لەگەڵ رێبەرانی حیزبیان کردبوو، بۆ هێندێک ئیش و کار دەچنە بەغدا و بە رێبەری حیزبی کۆمۆنیستی عێراقیان گوتبوو کە دەیانهەوێ چاویان بە رێبەرانی حیزبی دێموکرات بکەوێ، بەڵام حکوومەتی عێراق بەو شتەی زانیوە و موخالەفەتی لەگەڵ کردوون.

یەکێکی دیکە لە کارە گرینگەکانی حیزب دوای کۆنگرە ئەوە بوو کە دەفتەری سیاسی بڕیار دەدا بە مەبەستی باشتر شارەزاکردنی ئەندامی رێبەری بەسەر مەسائیلی سیاسی و تیئۆریداو .. ،کلاسێکی سیاسی بۆ ئەندامانی رێبەری دابنێ، ئەو کلاسە رۆژی ١٩٧٤/٢/٢ دەستی پێ کردووە، دوکتۆر قاسملوو دەرسی فەلسەفە، ئابووریی سیاسی، مەسەلەی کورد و پێوەندیی نێونەتەوایەتیی گوتۆتەوە. مامۆستاکانی دیکەش بریتی بوون لە: کاک کەریم حیسامی، کاک هاشم کەریمی، دوکتۆر سوڵتان وەتەمیشی و کاک حەمەدەمین سیراجی. ئەو کلاسە ٢٥ رۆژی خایاندوە. لە رۆژی تەواوبوونی کلاسەکەدا دوکتۆر قاسملوو دەڵێ: ئێستا کە نزیک بە تەواوی ئەندامانی رێبەری لێرەن و مەترسیی ئەوەش هەیە کە پارتی و حکوومەت بە یەکجاری تێک بچن، پێویستە چاوێک بە بڕیاری پێشوومان، لەمەڕ چوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کوردستانی ئێران، لە کاتی هەڵگیرسانەوەی شەڕدا بخشێنینەوە.

لەسەر ردتکردنەوە یا وەک خۆ هێشتنەوەی ئەو بڕیارە، باس و دەمەتەقێ دەست پێدەکا کە سەرەنجام بە زۆربەی دەنگ بڕیارەکەی پێشوو هەڵدەوەشێتەوە، بڕیارێکی دیکە بەم چەشنە پەسند دەکرێ:

«١- بڕیاری کۆمیتەی ناوەندی کە بریتی بوو لەوە کە ئەگەر لە کوردستانی عێراق شەڕ دەستی پێکردەوە، بەڕێوەبەر و رێکخراوی حیزب لە عێراق بە چەکداری بچێتەوە کوردستانی ئێران و خەباتی چەکداری دەست پێ بکا، هەڵوەشێتەوە و پەیڕەوی لە تیئۆری

راپەڕینی چەکداری نیجباری نەکا کە نەتیجەی کەوتنە مەترسیی هەموو حیزبە.

٢- درێژە پێدان بە تێکۆشانی حیزبی لە هەموو هەل ومەرجێکدا بە تەنیا ڕێگای نوسوولی دادەنێ و بە پێویستی دەزانێ بۆ ئەم مەبەستە لە ئێستاوە تێبکۆشێ».

هەروەکو کۆمیتەی ناوەندی پێشبینی کردبوو، ڕۆژبەڕۆژ زیاتر نێوانی حکوومەتی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، ناخۆش دەبوو، هەردوو لا لە یەکتر دەکەوتنە بیانوو. شایانی باسە کە شا و ڕێژیمەکەشی لەو بەینەدا لە بواری فیتنە گێڕییەوە دەوری بەرچاویان هەبووە. چونکە شا بە هیچ جۆر لایەنگری چارەسەری کێشەی کورد لە هیچ کام لە پارچەکاندا نەبووە. بەداخەوە سەرەنجام مەسەلەکە بەو لایەدا دەکەوێ کە شا و ئەربابەکانی پێیان خۆش بووە.

ڕۆژی ٩ی مانگی مارسی ١٩٧٤ کاک ئیدریس بارزانی بێ ئەوەی لە وتووێژی خۆی لەگەڵ حکوومەتدا بە ئاکام بگا، دەگەڕێتەوە کوردستان و بەم شێوەیە مەترسیی دەست پێکردنەوەی شەڕ زیاتر دەبێ.

لە نێوان ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبدا جیاوازیی بیروڕا لەسەر هەڵوێستەکانی پارتی دیموکرات و حکوومەتی عێراق دەست پێدەکا و زۆر جار دەمەتەقەشیان دەبێ.

سەرەنجام دەفتەری سیاسی بڕیار دەدا کە ئەگەر شەڕ دەست پێ بکاتەوە و ئیمکانی مانەوە لە بەغدا نەبێ، ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی بڵاو بێن، ژمارەیەک بێنەوە کوردستانی عێراق، چەند کەسێک لە بەغدا وەمێنن و چەند کەسێکیش بچنە ئورووپا. سەرەنجام پاش ١١ی ئازاری ١٩٧٤، شەڕی نێوان حکوومەتی عێراق و شۆڕشی کوردستان دەست پێدەکاتەوە و حیزب لە بواری سیاسیدا وا ساغ بیووەوە کە لەو پێوەندییەدا بێ لایەنی خۆی بپارێزێ.

لە مانگی ٥/ ١٩٧٤ ڕێبەرایەتیی حیزبی توودە داوای کردووە کە نوێنەری حیزب کاک کەریم حیسامی ببینن. ئەم مولاقاتەش دەکرێ. کیانووری داوای ڕوون بوونەوەی هەڵوێستی حیزب بە نیسبەت شەڕ سازبوونەوە لە کوردستاندا دەکا. ئەم کۆبوونەوەیەش ناکامێکی ئەوتۆی نابێ. ڕێبەرانی حیزبی توودە داوای چاوپێکەوتن لەگەڵ دوکتور قاسملوو دەکەن، دوکتور قاسملووش لەو سەروبەندەدا کە وەزعی عێراق بەرەو ئاڵۆزی دەڕوا، لە لایەن دۆستانەوە پێی دەگوترێ کە لە عێراق نەبێ باشە. هەر بۆیەنەویش بەرەو ئورووپا دەچێ.

لە ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی ٨ی ١٩٧٤دا کۆڕی نوێنەرایەتیی حیزب(دوکتور

قاسملوو،کەریم حیسامی و حەمەدەمین سیراجی) لەگەڵ ڕێبەرانی حیزبی توودە(ئیرەج ئەسکەندەری، کیانووری و عەلی گەلاوێژ) لە «بێرلین» کۆدەبنەوە.

لەو کۆبوونەوەدا ئاغای ئەسکەندەری لەسەر پێویستیی لێک نزیک بوونەوەی هێزە نەیارەکانی ڕێژیم قسەی کردووە، بەڵام ئاغای کیانووری تەنانەت حازر نەبووە حیزبی دیموکراتی کوردستان(ئێران) بە ڕەسمی بناسێ و لەمەڕ ئاولێنانی کۆبوونەوەکەش گوتوویەتی:«دەبێ بڵێین کە حیزبی توودە لەگەڵ چەند کوردی پێشکەوتنخوازی ئێرانی دانیشتنی بووە».

بەڵام کۆڕی نوێنەرایەتیی حیزبی ئێمە کە زۆر بە سەداقەتەوە بۆ لێک نزیک بوونەوەی هێزە نەیارەکانی ڕێژیم هەوڵیان داوە، تەنانەت ئامادە بوون کە بنووسرێ ڕێبەرانی حیزبی توودە لەگەڵ ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستان کۆبوونەتەوە.

عەلی گەلاوێژ و ئیرەج ئەسکەندەری ئامادە بوون ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان بنووسرێ، بەڵام کیانووری لە هەڵوێستی ئەوان تووڕە دەبێ و جانتاکەی دەست دەداتێ و لە شوێنی کۆبوونەوەکە دەچێتە دەر. بەم شێوەیە کۆبوونەوەکە بێ ئەوەی ئاکامێکی بووبێ، تێکدەچێ.

دوکتور قاسملوو بە پێی بەرنامەیەک کە بۆ خۆی دایڕشتبوو، ویستوویەتی ماوەیەک لانی کەم تا وەزعی عێراق بە لایەکدا روون دەبێتەوە، لە ئورووپا بمێنێتەوە، بۆیە باسی چوونەوە چیکۆسلوواکی و دەرس گوتنەوە لە زانکۆ لەگەڵ کاک کریم و کاک حەمەدەمین دێنێتە گۆڕێ. ئەوان موخالەفەتی لەگەڵ دەکەن و دەڵێن دروست نییە بە بێ ئاگاداریی کۆمیتەی ناوەندی ئەو کارە بکەی، بەڵام دوکتور قاسملوو دوای هێندێک تەوجیهات، نامەیەک بۆ کۆمیتەی ناوەندی دەنووسێ و پێشنیار دەکا کاک کەریم حیسامی وەک جێگری سکرتێر هەڵبژێرن.

دوای گەڕانەوەی کاک کەریم بۆ بەغدا، کۆمیتەی ناوەندی کۆبوونەوە دەکا و بۆ جارێکی دیکەش لەسەر هەلومەرجی پێکهاتوو قسەوباس دەکەن. سەرەنجام بڕیار دەدەن کە بە ناوی کۆمیتەی ناوەندییەوە بەیاننامەیەک بڵاو بکەنەوە.

لەو بەیاننامەیەدا کۆمیتەی ناوەندی پێی لەسەر ئەوە داگرت کە کێشەی کورد و حکوومەتی عێراق ڕێگەچارەی نیزامیی نییە. حیزب زۆر بە ڕاشکاوی لایەنگری چارەسەری ئاشتییانەی کێشەکە بووە و پێی وابوو کە لەو ئاڵۆزییە دوژمنانی کورد وعێراق کەڵک وەردەگرن، هەروەها لەو بەیاننامەیەشدا حیزبی ئێمە بێ لایەنیی خۆی

پاراستووه و بەلای لایەنگری لە هیچ لایەکدا نەکەوتووە.

چونکە لەو بەیاننامەیەدا حیزبی ئێمە شۆڕشی کوردستان و پارتی دیموکراتی خەتابار نەکردووە، حکوومەتی عێراق، بەرەبەرە هەڵوێستەکانی بە نیسبەت حیزب دەگۆڕێ و دەکەوێتە حاڵەتی بیانوو پێگرتن. کە غوونەی ئەو شتە گرتنی ٥ کەس لە ئەندامانی حیزب لە شاری کۆیە دەبێ. هەروەها بۆ هاتوچۆی ئەندامانی ڕێبەریش بۆ کوردستانی عێراق، زۆرجار گیروگرفتیان پێکهێناوە.

ساڵی ١٩٧٥ دەست پێدەکا و وەزعی کوردستانی عێراق هەروا ناڵۆزتر دەبێ. ئەو ناڵۆزییە لەسەر حیزبی ئێمەش شوێن دادەنێ. ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بەشی زۆریان لە کوردستانی عێراق دەبن و چەند کەسێکیش لە ئورووپا. ئەندامانی دەفتەری سیاسی لە بەغدا دەبن و بەکاری نووسینی ڕۆژنامە و نامیلکەی نێوخۆیی تێکۆشەر و هێندێک پێوەندی لەگەڵ ئەم لا و ئەولا خەریک دەبن. زیاتر لە ٢٥٠ کەسیش لە کادر و پێشمەرگە و ئەندامانی حیزب هەر لە کوردستانی عێراق دەبن.

شەڕە جنێو و تەبلیغاتی ئێران و عێراق لە دژی یەکتر بە ڕواڵەت لە جاران توندتر دەبێ، حکوومەتی عێراق بۆ پشتیوانی لە خۆی و لە دژی ئێران کۆنفرانسێکی گەورە پێکدێنێ، حیزبی ئێمەش دەعوەت دەکرێ.[*] بەڵام هەر لەو کاتەدا بۆ زۆر کۆڕ و کۆمەڵ و لایەن دەردەکەوێ کە لە ژێر ئەو هەراوبگرە ڕواڵەتییەدا سات و سەودایەک لە نێوان ئێران و عێراقدا بە شێوەی نهێنی لە گۆڕێدایە.

شتێکی روونە هەر ئەوعە سازانێکی ئێران و عێراق، لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا لەسەر کەوڵی کورد دەکرێ، بۆیە ڕێبەرایەتی حیزب هەم لە عێراق و هەم لە دەرەوە دەکەوێتە جم وجۆڵی سیاسی و پێوەندی گرتن لەگەڵ ئەم لا و ئەولادا. بەهۆی پێوەندی گرتن لەگەڵ دیپلۆماتێکی سۆڤیەتی، حیزب ویستوویەتی لە کارەساتەکە پێشگیری بکا. نوێنەری حیزب لەو بارەوە دەچێتە لای کاک ئیدریس بارزانی، پەیامی دیپلۆماتە رووسەکەی دەداتێ، وەڵامەکە واناێ کە حیسابی لەسەر بکرێ. بۆیە بەم شێوەیە ئەو هەوڵەش بێ ئاکام دەبێ.

ڕۆژی ١٥/١/١٩٧٥ حکوومەتی عێراق حیزبی ئێمەی ئاگادار کردووە کە یان دەبێ لەسەر بارزانی بنووسن و وەک پیاوی ئەمریکا بیناسێنن، یان نابێ ڕۆژنامەکەتان چاپ

---

(*) وتاری نوێنەری حیزب تەنیا وتارێک بووە کە لەو کۆنفرانسەدا دژی شۆڕشی کوردستانی عێراق و مەلا مستەفا بارزانی نەدواوە.

بکەن. پاش باس و راوێژ دەفتەری سیاسی دێتە سەر ئەو بڕوایە کە رۆژنامەکە چاپ نەکەن و هیچ لە دژی بارزانی و بزووتنەوەی کورد نەنووسن.

رۆژی ١٩٧٥/٣/٦ دەنگوباسی رێککەوتنی ئێران و عێراق لە «الجزایر» بڵاو دەبێتەوە و گەلی کورد بە گشتی تووشی نیگەرانییەکی زۆر دەبێ. هەردوو رۆژ دواتر (١٩٧٥/٣/٨) حکوومەتی عێراقی بە نوێنەری حیزب(محەممەد ئەمین سیراجی)یان گوتووە کە دەبێ هەموو چاپەمەنییەک دابخەن و هاتوچۆی ئێرانیش نەکەن.

وەزعەکە هەر دێ و مەترسیدارتر دەبێ، خیانەتی شای ئێران دەرحەق بە شۆڕشی کوردستانی عێراق روون و ئاشکرا دەبێ. لەو کاتەدا کۆمیتەی ناوەندیی حیزب نامەیەک بەو نێوەڕۆکە بۆ دەفتەری سیاسیی پارتی دەنووسێ: «ئێستا کە شای ئێران خیانەتی لەگەڵ شۆڕشی کورد کرد و لە پشتەوە را خەنجەری لێدا، کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران پێشنیار دەکا: «شەڕ بخەنە ئێران و با شۆڕشی کورد درێژەی هەبێ و بتەنێتەوە. حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران شان بەشانی خەڵکی کوردستان وەک پێشمەرگەیەک لە ژێر رێبەرایەتی پارتیدا بە هەموو تواناوە بەشداری دەکا، تکاتان لێ دەکەین چەک دامەنێن، بڵاوە بە شۆڕش مەکەن، با خوێنی هەزاران لاوی کورد بە فیڕۆ نەڕوات». بەڵام بەداخەوە بەر لەوەی نوێنەری حیزب بگاتە حاجی ئۆمەران، ئەو ناوە چۆڵ دەکرێ و بارگە و بنە و مەقەڕ و ماڵ بەرەو دیوی ئێران ناودیو ببوون.

بەم شێوەیە ئەم شۆڕشەی کورد لە کوردستانی عێراق بەهۆی خۆش باوەڕیی رێبەرانی بزووتنەوە بە دوژمنان و رێککەوتنی دوو قۆڵیی ئێران- عێراق و پشتیوانیی ئەمریکا لەو رێککەوتنە، تێک دەشکێ و خەڵکی کورد بە گشتی تووشی دڵساردی و ناهومێدی دەبن.

پاش ئەوەی حکوومەتی عێراق ئیزن نادا رۆژنامەی کوردستان لە بەغدا چاپ بکرێ، رێبەرایەتی حیزب بڕیار دەدا کە هەرچۆنێک بێ رۆژنامەکە، ئەگەر لە هەندەرانیش بێ، هەر چاپ بکرێ. رۆژنامەی«کوردستان»یش وەک ئەندامانی حیزبی تووشی گیروگرفت دەبێ، بەڵام لە تێکۆشان ناوەستێ. لە سوئید و لە بێروت، پاریس و ئاڵمان و لە هەر کوێ هەلی بۆ رەخسا بێ، چاپ بووە و خزمەتی خوێنەرانی کردووە و سیاسەتی حیزبی بۆ باس کردوون و رۆژنامەکە بە شێوەی مومکین بە دەستی ئەندامانی حیزبی لە نێوخۆی کوردستانی ئێرانیش گەیشتووە.

لە پێوەندی لەگەڵ چاپ بوونی رۆژنامەی«کوردستان» لە بێروت دا، پێویستە سوپاسی

کاک سەلاح بەدرەدین تێکۆشەری بەناوبانگی کوردی سووریە بکرێ، چونکە ناوبراو لەو بوارەدا ئەوکات هاوکارییەکی بەرچاوی حیزبی ئێمەی کردووە.

لەسەر مانەوەی کۆمیتەی ناوەندی لە عێراق، لە نێو ئەندامانی رێبەریدا ناکۆکیی بیرورا هەبوو. دوکتۆر قاسملوو کە بۆ خۆی لە دەرەوە دەبێ، پەیتا پەیتا داوا دەکا عێراق بەجێ بیلَن و بۆ ولاتێکی دیکە بچن. بەلام بەشێکی زۆری ئەندامانی رێبەری هەم بە پێی لێکدانەوەی خۆیان و هەم بە پێی ئامۆژگاریی حیزبی شیوعیی عێراق(*) لەسەر بەردەوام بوونی پێوەندیی حیزب لەگەل حکوومەتی عێراق و مانەوەی رێبەری لە بەغدا پێیان داگرتووە، چونکە عێراقیان وەک پردێکی پێوەندی گرتن لەگەل کوردستانی ئێران سەیر کردووە.

بە تایبەتیش لەو سەروبەندەدا لە نێوخۆی کوردستانی ئێراندا جم وجۆلی سیاسیی رێکخراوەکانی حیزبی دەستی پێکردۆتەوە، رۆژنامەی«کوردستان» و "تێکۆشەر"یان پێدەگا، بۆیە پێویست بووە کە رێبەریی حیزب لە کوردستان نزیک بێت و سەرپەرستی تەشکیلاتی حیزبی بکا. بەلام دوکتۆر قاسملوو هەر لەسەر چوونەوەی ئەندامانی رێبەری پێ دادەگرێ، تا سەرەنجام رۆژی ١٩٧٦/٢/١٢ کۆمیتەی ناوەندی مەوجوود لە عێراق لە شاری کۆیە کۆبوونەوە دەکا و پاش باس و راوێژ ئەم بریارە پەسند دەکا: «کۆمیتەی ناوەندی پێشنیاری دوکتۆر قاسملوو لە بارەی بەجێهێشتنی عێراق و گۆرینی سیاسەتی حیزب رەت دەکاتەوە. پێویستە بە درێژی نامەی بۆ بنووسرێ و کاک کریم حیسامی سەفەر بکا و بچێ قسەی لەگەل بکا».

کاک کەریم سەفەرەکە دەکا و دەگەرێتەوە، بەلام بۆ ساغ بوونەوەی زیاتر پێویست بوو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کۆببنەوە. لەسەر ئەو ئەساسە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی نیشتەجێ لە بەغدا و کوردستانی عێراق دەچنە ئورووپا و رۆژی ١٩٧٦/٥/١٣، لە شاری وارنای بولغارستان کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی دەست پێدەکا. لەو کۆبوونەوەیەدا پاش راوێژ و قسەوباسێکی زۆر لەسەر وەزعی مەوجوود، دوکتۆر قاسملوو لەسەر چۆنیەتیی کارو تێکۆشانی داهاتوو گەلالەیەک بە ناوی گەلالەی(سیا-می) واتە سیاسی- نیزامی پێشکەش بە کۆبوونەوە(پلینۆم) دەکا. بە گوێرەی ئەو گەلالەیە کە بە هێندێک دەسکاریەوە تەنیید دەکرێ، دەبوو رێبەری و ئەندامانی حیزبی وردە وردە لە

(*) حیزبی شیوعی لە هەموو ئەو دەورانە ئالۆزەدا کە مەقەریان لە بەغدا بووە، زۆر سادقانە لەگەل حیزبی ئێمە جوولاونەتەوە.

عێراق را بەرەو ئێران بچنەوە، چەک پەیدا بکەن، کۆمیتەی سێ کەسی یا کەمتر لە شارەکانی کرماشان، سنە، ورمێ، تەورێز، تاران، مەهاباد، دابمەزرێنن، ئەو کۆمیتانە بەیەکەوە پێوەندییان هەبێ و...

کۆمیتەی ناوەندی، کۆمیتەیەکی بۆ جێ بەجێ کردنی (سیامی) هەڵبژارد، بەڵام هیچی بۆ نەکرا، چونکە دوکتۆر قاسملوو کە پێشنیارەکەی کردووە، گەڵاڵەی داوە، خۆی و دوکتۆر حەسەن شتوی خوارزای و کاک حەمەددمین سیراجی بۆ ئورووپا دانابوون و حازر نەبووە بۆ خۆی بەرپرسایەتیی کۆمیتەکە بە ئەستۆ بگرێ.

پاش گەڕانەوەی هاوڕێیانی کۆمیتەی ناوەندی بۆ عێراق، دەفتەری سیاسی بە پێی بڕیاری پلینۆم بۆ بەڕێکردنی چەند کەس لە هاوڕێیانی حیزبی بۆ نێوخۆی کوردستانی ئێران ئیقدام دەکەن.کاک سەید رەسووڵ بابی گەورەی(سەید رەسووڵ دیهقان) و فەقێ عەولای قەلەڕەشێ ئامادگیی خۆیان رادەگەیەنن و بە شێوەیەکی تەواو نهێنیی ئەو دوو کەسە لەگەڵ نەفەرێکی دیکە بە ناوی میرزا عەلی بەرەو کوردستانی ئێران دەکەونە رێ.

دوای کۆنگرەی سێ هەرچەند لە هێندێک لە شارەکانی وەک بانە،سنە، سەردەشت و تاران، تا رادەیەک پێوەندیی حیزبی دادەمەزرێ، بەڵام ئەو هەنگاوە هەوەڵین هەنگاوە کە لەودا راستەوخۆ کادر دەنێرنەوە نێوخۆی وڵات. پاش ماوەیەک سەید رەسووڵ دەگەڕێتەوە بەغدا و دەڵێ لەگەڵ چەند کەسی شاری مەهاباد قەرارم داناوە بێنە دەردوەی شار، بۆ ئەوەی باشتر لەگەڵیان ساغ بینەوە، پێویستە یەکێک لە هاوڕێیانی رێبەری لەگەڵم بێت و بچین بیانبینین و بەم شێوەیە مامۆستا عبداللە حەسەن زادە و سەید رەسووڵ و کەریم ئەستانی بۆ ئەنجامی ئەو سەفەرە بەرەو کوردستانی ئێران وەڕێ دەکەون.

لە مانگی ١١/١٩٧٦ دوکتۆر قاسملوو و کاک ئەمیر قازی لە ئورووپا را دێنەوە بۆ عێراق. رۆژی ١٩٧٦/١١/٢١ کۆمیتەی ناوەندی کۆبوونەوەی خۆی دەست پێدەکا.

پاش باسێکی چەند رۆژە و هەمەلایەنە لەسەر باروەزخی تێکۆشان و لێکدانەوەی هەلومەرجی خەبات، بڕیار دەدا کە بۆ پیادەکردنی ئەخشەی(سیامی) هەنگاو باوێژرێ. بۆ ئەو مەبەستە کۆمیتەیەک هەڵدەبژێرن کە ئەندامەکانی بریتی دەبن لە:

دوکتۆر قاسملوو، کاک ئەمیر قازی، کاک حەمەددمین سیراجی، مەلا رەسووڵ پێشنماز، مامۆستا عبداللە حەسەن زادە. بەڵام پاش دوو رۆژ مامۆستا عبداللە حەسەن زادە لەو پێوەندییەدا خۆی دەکێشێتەوە دوایە لە جێگەی ئەو مەلا سمایلی حاجی هەڵدەبژێرن.

هەر دوابەدوای ئەو کۆبوونەوەیە، رۆژی ١٩٧٦/١١/٢٧ دوکتۆر قاسملوو سەردەرای

نارازی بوونی بەشێکی زۆر لە ئەندامانی رێبەری، دیسان دەچێتەوە ئورووپا و گیروگرفتەکانی حیزب بەسەر هاورێیانی دیکەدا بەجێ دێڵێ.

چەند رۆژ دواتر بەرپرسی موخابەراتی حکوومەتی عێراق(سەعدون شاکر) لە جەلسەیەکدا کە لەگەڵ نوێنەرانی حیزب دەیبێ دەڵێ: «لە چەند ساڵی رابردوودا ئێمە یارمەتیی ئێوەمان داوە، بەڵام ئێوە یارمەتیی ئێمە نادەن. ئێستا لە کوردستاندا عەسابەی(پارتیزانی)) جەلال تالەبانی دەسووڕێنەوە. مەلا مستەفا نۆکەری ئیمپریالیزم بوو، بۆیە دەمانهەوێ لەسەر ئەوانە بەیانێک دەربکەن و کردەوەی ئێستاو رابردوویان مەحکووم بکەن. هەروەها گلەیشی لە سکرتێری حیزب هەبووە کە لەگەڵ ئەیارەکانی ئەوان پێوەندیی هەبووە. نوێنەرانی حیزب لە وەڵامدا گوتوویانە لە پێوەندی لەگەڵ خەبات دژی ئیمپریالیزم و شای ئێران ئێمە هاوخەباتین و چیمان لە دەست بێ، دەیکەین، بەڵام لە پێوەندی لەگەڵ کاروباری نێوخۆی عێراقدا ئێمە دەست لە کاروباری ئێرە وەرنادەین و..».

سەرەنجام سعدون شاکر دەڵێ: «ئەگەر وایە ئێوە لە دەرەوەی عێراق شوێنێک بۆ خۆتان بدۆزنەوە، مانەوەتان لە عێراق نابێ». بەم شێوەیە رێبەرایەتی حیزب دەکەوێتە ژێر فشار و نیگەرانی.

سەرەتای ساڵی ١٩٧٧ بە پێی داخوازی پێشوو، حکوومەتی کۆماری یەمەنی دیموکراتی، موافقەتی چوونی هەیئەتی حیزب بۆ وڵاتەکەی دەکا. دەفتەری سیاسی بڕیار دەدا کە دوکتور قاسملوو(کە ئەو کات لە ئورووپا دەبێ) لەگەڵ کەریم حیسامی ئەو سەفەرە بکەن.

دوکتور قاسملوو و کاک کەریم لە کوێت یەک دەگرنەوە و دەچنە یەمەن. لەوێ هەم لەگەڵ عەبدولفەتاح ئیسماعیل سکرتێری گشتی بەرەی نەتەوایەتیی یەمەنی دیموکراتی و هەم لەگەڵ سەرکۆمار(سالم ربیع علی) بە جودا چاوپێکەوتنیان دەبێ، لە هەردوو دانیشتنەکەدا، زۆر بەگەرمی وەردەگیرێن و بەڵێنی هاوکارییان پێ دەدرێ، لەوێ را دوکتور دەگەڕێتەوە بۆ پاریس و کاک کەریمیش دەگەڕێتەوە عێراق.

لە پاریس دوکتور قاسملوو رۆژنامەی«کوردستان» چاپ دەکا، بەڵام وتارەکانی دەستەی نووسەران چاپ ناکا و بۆ خۆی هەر بابەتەکانی خۆی چاپ دەکا، بۆیە کاتێک رۆژنامەکە دەگاتە کۆمیتەی ناوەندی، هەم لە لایەن دەستەی نووسەران و هەم لە لایەن ئەندامانی دەفتەری سیاسییەوە بە نووسینی نامە، رەخنە لە دوکتور قاسملوو دەگرن و دەڵێن رۆژنامەکە وەک ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندی ناچێ و بۆتە ئۆرگانی خۆت و..

له مانگی ٤ /١٩٧٧دا حکوومەتی عێراق زەختەکەی بۆ سەر هاوڕێیانی حیزبی زیاتر دەکاو تەنانەت چەند کەسێکیش لە ئەندامانی حیزب دەگرێ. هەروەها هەر لەو مانگەدا ماڵ و منداڵی رەسووڵ پێشنماز، سەید رەسووڵ، رەحیم کەپەکەندی، حەسەن بێوڕەیی و لەتیف-یان لە کۆیە بێ ئاگادار کردنەوەی پێشوو دەلۆرییان هاویشتوون و دوای یەک دوو رۆژ هاوڕێیان دەزانن کە ئەوانەیان بۆ رومادی بردوون. مەترسیی ئەوەیش هەبووە کە هەر هەموو هاوڕێیانی حیزبی بۆ باشووری عێراق دوور بخرێنەوە. بۆیە لە سەرەتای مانگی ١٩٧٧/٥ دا کۆمیتەی ناوەندی بە بەشداریی کادرەکانی دەوروبەریشیەوە کۆبوونەوەیەک دەکا. بەشدارانی ئەم کۆبوونەوەیە کە سەرجەم ٢١ کەس دەبن، ئەو بڕیارانە پەسند دەکەن: ٣/ ١٩٧٧/٥ ، ١- کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی پاش باس و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو هەلومەرجە نوێیە کە لە عێراقدا بۆمان هاتۆتە پێش، بڕیاری دا ئەگەر حکوومەتی عێراق بیەوێ ئەندامانی حیزبی ئێمە بۆ باشوور بگوێزێتەوە و نەهێڵێ لە کوردستان دانیشن، هێندێک لە ئەندامانی حیزب بە گوێرەی بڕیاری کۆمیتەی ناوەندی خۆ بشارنەوەو خۆ بە دەستەوە نەدەن.

٢- کۆمیتەی ناوەندی بۆ ئەو بڕیارەی سەرەوە کۆمیتەیەکی حەوت کەسی هەڵبژارد لەو برادەرانەی ناویان نووسراوە:

١ - کاک حەمەدەمین سیراجی

٢- کاک سەید رەسووڵ

٣- کاک مەلا رەسووڵ

٤- کاک هاشم کەریمی

٥- کاک کەریم حەداد

٦- کاک حەسەن شیوەسەلی

٧- مەلا سمایل حاجی

رۆژی دواتر کاک حەمەدەمین موخالەفەت لەگەڵ کۆمیتەکە و بوونی خۆی لەو کۆمیتەیەدا رادەگەیەنێ، بۆیە لە جێگای ئەو کاک پیران (کەریم حیسامی) هەڵدەبژێرن. شایانی باسە ئەو کۆمیتەیە ناوی نراوە کۆمیتەی رابەر(ک-ر) کە کاک پیران مەسئوولی گشتیی کۆمیتەکە بوود. ئەو کۆمیتەیە تەقسیمی کاری خۆی دەکا و بۆ هەلومەرجی تایبەت خۆی ئامادە دەکا. دەفتەری سیاسی لەو پێوەندییەدا نامەیەک بۆ دوکتور قاسملوو دەنووسی و داوای رێنوێنی لێ دەکا، بەڵام لە وەڵامدا دوکتۆر قاسملوو داوای کۆبوونەوەی

کۆمیتەی ناوەندی لە پاریس دەکا.

هەلومەرجێکی دژوار و حەساس بۆ کۆمیتەی ناوەندی دێتە پێش، لە لایەک حکوومەتی عێراق دەڵێ دەبێ لە عێراق بڕۆن و هەر لەو کاتەدا ماڵ و منداڵی هاورێیانی حیزبی بۆ رومادی دوور دەخرێنەوە، لە لایەک دوکتۆر قاسملوو رێگەی نییە بێتەوە بەغدا و داوای کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیش دەکا، لە لایەکی دیکەش لە نێوخۆی کوردستاندا رێکخراوەکانی حیزبی چالاکتر دەبن و تەنانەت تەشکیلاتی بانە بۆ خۆی تایپ وتەکسیر پەیدا دەکا و نەشرییاتی حیزبی بڵاو دەکاتەوە.

سەرەنجام پاش باس و راوێژ لە نێوخۆی کۆمیتەی ناوەندی و پێوەندی گرتن لەگەڵ حکوومەتی عێراق، ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی دەچنە پاریس. رۆژی ١٩٧٧/٧/٢٧ لە شاری«شانیو مون لیڤو» لە ماڵی کریس کوچرا کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی دەست پێدەکا.

دوای سێ رۆژ رەخنە و رەخنەکاری، کۆمیتەی ناوەندی چەند بڕیارێک پەسند دەکا کە زۆرتریان پێوەندی بە گواستنەوە لە عێراق و پیادەکردنی نەخشەی (سیامی)ن. بەڵام ناکۆزیی نێو کۆمیتەی ناوەندی و ناهەماهەنگ بوونی هەروەک خۆی دەمێنێتەوە و بەرەو عێراق دەگەڕێنەوە.

لە پێوەندی لەگەڵ باشتر پیادەکردنی نەخشەی (سیامی)دا ئەو کۆبوونەوەیە بڕیار دەدا کە ١٠ نەفەر لە کادرەکانی حیزب بە مەبەستی دیتنی دەورەی نیزامی بنێردرێن بۆ یەمەنی دێموکراتی تا بۆ کاتی پێویست ئامادەگیی تەواویان هەبێ.

ئەو ١٠ نەفەرە کە بۆ ماوەی زیاتر لە چوار مانگ لە یەمەنی دێموکراتی دەورەیان دیتووە، بریتین لە:

١- حەسەن رەستگار
٢- هاشم کەریمی
٣- سەید رەسووڵ دیهقان
٤- فەقێ عەولا قەلەڕەشی
٥- مەلا سەدیق
٦- مەلا حەسەن شیوەسەلی
٧- میرزا عەلی
٨- محەممەد بۆکانی

٩- مەلا عوسمان(جەلال میراوەیی)

١٠- مەلا مەحموود قازانی

پێویستە بگوترێ کە بەرپرسی ئەو تیمە کاک هاشم کەریمی بووە.

لە نیوەی دووهەمی ساڵی ١٣٥٦(١٩٧٧)دا کاتێک دوو تێکۆشەری حیزبی بۆ ئەنجامی مەئمووریەتی حیزبی بەرەو کوردستانی ئێران دەکەونە رێ، لە سەر سنوور لە لایەن چەند چەکداری کوردی کوردستانی عێراق دەگیرێن و تەحویلی پاسگای ژاندارمری بەردەپانیان دەدەنەوە. لەو پێوەندییەدا هەر ئەوکات بورووی (دەفتەر) سیاسی حیزب راگەیەندراوێک دەردەکا کەوا دەقەکەی لێرەدا دەخەینە بەر ئەزەر:

راگەیاندنێک لە لایەن بورووی سیاسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە(*)

لە ساڵەکانی رابردوودا، لە ماوەی هاوکاریی سەرۆکایەتی جووڵانەوەی کورد لە کوردستانی عێراق لەگەڵ رێژیمی شا، بەرامبەر بە خەباتکارانی کوردی ئێران زۆر کاری ناڕەوا کران کە یەکێک لەوانە گرتن و تەسلیم کردنەوەیان بە جەللادەکانی رێژیمی شا بوو.

هێزە پێشکەوتووەکانی کوردستانی عێراق لە کاتی خۆیدا بە تێکڕایی ئەو کردەوەیان مەحکووم کرد. پاش هەرەس هێنانی سەرکردایەتی بارزانی، ئەم کارە لە هەموو لایەکەوە بە یەکێک لە لاپەرە رەشەکانی مێژووی ئەم جووڵانەوەیە داندرا.

بەداخەوە هێندێ کەس لە مێژوو تەجرەبەیان وەرنەگرتووە و ئێستاش نۆکەرایەتیی رێژیمی شایان بە ئەرکی خۆیان داناوە.

شەوی ١٣٥٦/٦/٣٠(١٩٧٧/٩/٢١) چەند خۆفرۆشی چەکداری کوردستانی عێراق بە سەرۆکایەتی ساڵح دەروێش قادر و فەقێ قادری کوڕی تووشی دوو کوردی نیشتمانپەروەری کوردستانی ئێران بە ناوی کەریم ئەستانی و ئەحمەد ئەستانی هاتوون و پاش ئەوەی رووتیان کردوون و باڵیان بەستوون، بردوویانە پاسگای بەردەپان و تەسلیمی حکوومەتی ئێرانیان کردوون.

ئەو دوو نیشتمانپەروەرە کە پتر لە ١٠ ساڵە، لەسەر ئازادیخوازی و خەباتی دژی رێژیمی شا دەربەدەر بوون و لە لایەن رێژیمی پۆلیسی دیکتاتوری شاوە راونران، بە دەستی چەند کوردی خائین و خۆفرۆش گیراون وبە دیاری دراون بە حکوومەتی کۆنەپەرستی ئێران و ئێستا گیانیان لە مەترسی دایە.

---

(*) وەرگیراوە لە کتێبی (لەبیرەوەرییەکانم)، نووسینی: کەریم حیسامی

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە کاتێکدا ئەو کردەوە بێشەرمانە بە توندی مەحکووم دەکا، بە مافی خۆی دەزانێ کە لە دوا رۆژدا هاندەر و دەستکیسی ئەو تاوان و خۆفرۆشییە بە گەلی کورد بناسێنێ. دڵنیایە کە گەلی کورد لە کوردستانی ئێران لە کردەوەی خائینانەی ئەو تاوانبارانە خۆش نابێ و بە سزای خۆیان دەگەیەنێ.

**بوورووی سیاسیی ح.**

**د. ک. ئ.**

**هەوەڵی ئوکتوبری ١٩٧٧- ١٣٥٦/٧/١٠**

١٣٥٦ مانگ بە مانگ جم وجۆڵی سیاسی و ئیعترازی و خۆپیشاندان بە تایبەت لە شارە گەورەکاندا پتر پەرەی سەند. تەخت و بەختی رژێمی پاشایەتی کەوتبووە لەرزین. حیزبی ئێمەش دەبوو خەباتی خۆی لە نێوخۆی کوردستاندا لەگەڵ خەباتی سەرانسەری هاوئاهەنگ بکا. ئەندامانی حیزبی لە نێو شار و گوندەکانی کوردستان دا هەڵسووڕتر دەبن، بە شێوەی مومکین پێوەندی بە رێبەرایەتیی حیزبەوە دەگرن، شتێکی سروشتی بوو کە دەبوو رێبەرایەتیش چالاکانەتر وەخۆ کەوێ.

رۆژی ٢٥/١٠/١٩٧٧ بە مەبەستی دۆزینەوەی رێگا و شوێن و کەسانی باوەڕپێکراو رەسووڵ پێشنماز لەگەڵ چەند هاوڕێی دیکە بەرەو کوردستانی ئێران دەکەونە رێ، تا دەوروبەری میراوێی سەردەشت دەچن و دوای چەند رۆژ دەگەڕێنەوە. ئەو سەفەرە لە لایەک بۆتە هاندەر بۆ هاوڕێیانی دیکە و لە لایەکی دیکەشەوە لە بواری تەشکیلاتیدا هێندێک بەسوود بووە. بە دوای ئەو سەفەرەدا، کاک مەلا خدر دۆڵەگەرمی و دوو هاوڕێی دیکە بەرەو ناوچەی باژاری سەردەشت دەکەونە رێ. بەڵام لە گوندی قوڵە سوێرو هەست بەوە دەکەن کە گوزارشیان لێ دراوە، بۆیە هەر ئەو دەم دەگەڕێنەوە بۆ قەڵادزێ.

بە دوای ئەو یەک دوو سەفەرەدا تا ماوەیەکی زۆر کۆمیتەی ناوەندی کەسێکی ئەوتۆی نەناردۆتەوە نێوخۆی کوردستان، چونکە وەک باسکرا، لە لایەک لە لایەن حکوومەتی عێراقەوە لە ژێر فشاردا بوون و نیزنی تێکۆشانی سیاسییان نەبوو، لە لایەکی دیکەشەوە، ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لە باردی چوونەوەدا یەک دەنگ نەبوون. دوکتور قاسملووش کە سکرتێری یەکەمی حیزب بووە، هەر لە دوورەوە (ئورووپا)را چاوەدێریی وەزعەکەی کردووە و لە زۆر باریشەوە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی گلەییان لێی هەبووە.

هەروەها لەسەر رێک کەوتنێک کە دوکتور قاسملوو لەگەڵ حیزبە کوردستانییەکان

کردوویەتی، کۆمیتەی ناوەندی گلەییبان هەبووە، چونکە هەم بە بێ ئاگاداریی کۆمیتەی ناوەندی بووە، هەم بۆ هاوڕێیانی کۆمیتەی ناوەندی جێگیر لە عێراق بۆتە مایەی دەردەسەری.

زەختی حکوومەتی عێراق لەمەڕ چوونەدەری کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لەم وڵاتە هەر بەردەوام دەبێ، هەر لەو کاتەشدا مەیدانی تێکۆشانی سیاسی لە کوردستانی ئێران، بەرفراوانتر دەبێ، بەڵام لەو حاڵەشدا بە ناچاری کۆمیتەی ناوەندی لەگەڵ نوێنەری حکوومەت ساغ دەبنەوە کە ١١ کەس لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لە عێراق بچنەدەر. بەر لە ئیقدام بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو بڕیارە، دوکتور قاسملوو خەبەر دەدا کە برادەران هەر لە بەغدا بن و ئەو دێتەوە لایان. بەر لە گەڕانەوەی دوکتور قاسملوو، سەید ڕەسووڵی بابی گەورە لەگەڵ میرزا عەلی خەڵکی پیرانشار و مەحموود دەچنەوە نێوخۆی کوردستانی ئێران. ساڵێک پێشتر کاک عەزیز یوسفی کە سەرجەم ماوەی نزیک بە ٢٥ ساڵی لە زینداندا بووە، ئازاد دەبێ. بۆیە لە لایەن یەکێک لە ئەندامانی دەفتەری سیاسییەوە نامە بۆ جەلیل گادانی(کە ئەو کات لە تاران دەبێ) دەنووسرێ و باسی ناردنی کاک عەزیز بۆ بەغدا دەکەن تا لەوێوە بۆ ئورووپای ڕەوانە بکەن. بەڵام بەداخەوە ئەو شتە سەرناگرێ(*). ناوبراو بەهۆی ڕاگرتنی ماوەیەکی ئەوتۆ لە زینداندا، لەو سەروبەندە و بەهۆی تووش بوونی چەندین نەخۆشی، گیانی لە دەست دەدا. جا ئەمە کە چۆن مەرگی ئەو ڕۆڵە تێکۆشەرەی گەل بوو بە مەشخەڵێک و ڕێگەی خەباتکردن لە کوردستانی ئێرانی ڕووناکتر کرد، لە باسەکانی دوایی دادەخەینە بەرچاو.

تیمی دوایی سەید ڕەسووڵ و هاوڕێکانی، جەلال میراودیی و میرزا عەلی پیرانشار و قادر لاجانی دەبن کە لە مانگی ١٩٧٨/٦دا بەرەو کوردستانی ئیران وەڕێ دەکەون.

هەروەها تیمێکی دیکەش کە بریتی بوون لە کاک هاشم کەریمی، فەتتاح باساودیی(مەلا خدر) و حسێنی کوێخا محەمەدی کونەمشکێ، بەمەبەستی دیتنی حەمە ڕەسووڵ حەسەن پوور کە ئەندامی جێگری کۆمیتەی ناوەندی و هەر لە نێو شاری سەردەشت بووە، دەچنە ناوچەی سەردەشت و دوای بەجێگەیاندنی مەئمووریەتەکەیان، دەگەڕێنەوە بۆ عێراق.

---

(*) نامەیەکی ئاوا هیچ کات بەمن نەگەیشتووە بەڵام وەک ئەرکی ئینسانی لە تاران زۆرمان هەوڵ دا پاساپۆرتی ئێرانی بۆ سازکەین کە بەداخەوە جێبەجێ نەبوو. ئەگەر ئەو نامەگەیشتبا دەستم، بەرێ کردنی کاک عەزیز بۆ عێراق کارێکی هاسان بوو.

**بەشی یەکەم**

# ڕاپەڕینی گەلانی ئێران و ئاشکرا بوونەوەی تێکۆشانی حیزب

بە دوای ئەو هەلومەرجە دژوارەدا کە لە ژێر زەختی ڕێژیم و ئەو کوشت و بڕو بگرە و بەردە پان و بەربنانە لە لایەک و لە لایەکی دیکەوە بۆ هاوڕێیانی حیزبیمان لە کوردستانی عێراق بەهۆی بەرپرسانی شۆڕشەوە، هاتبووە گۆڕێ و لە ساڵەکانی دواییدا بە دوورخستنەوەی هەڤالان لە یەکتر لە لایەن عێراقەوە و گەلێک زەختی دیکەش کە لەسەریان زیادببوو، بە حاڵە حاڵ دەیانتوانی سەری خۆیان ڕاگرن.

ناعیلاج دەبوو خۆیان لەگەڵ دەستکورتی و کەم دەسەلاتی و نەبوونی مەودا و مەیدانی تێکۆشان ڕێکخەن و چاوەڕوانی هەلێکی لەبار بۆ تێکۆشان و دەست پێکردنەوەی خەباتێکی شێلگیر و جیددی بن. بە خۆشییەوە دوای چەند ساڵ ناڵ و گۆڕێکی ئەوتۆ دێتە پێش.

لە ئێران ئەم گۆڕانکارییانە کە ناکامی نالەباری وەزعی نێوخۆی ڕێژیم، خراپیی وەزعی ئابووری، پەرەسەندنی زیاتری فەساد، زاڵ بوونی دیکتاتۆرییەت و درێژەدانی سیاسەتی دژی گەلیی شا و دەست و پێوەندەکەی بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو زەق بوونەوە.

دە ساڵ دوای سەرکوتی جووڵانەوەی کورد لە ساڵەکانی ٤٧- ٤٦ لە کوردستانی ئێران زەمینەی ڕاپەڕینی گەلانی ئێران و ڕووخانی ڕێژیی پاشایەتی پێکهات.

بۆ ئەوەی زەینی خوێنەری بەڕێز بۆ هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەی چلۆنایەتیی ڕەخسانی

ئەم هەلومەرجە زیاتر ئامادە بێ، بە پێویست دەزانین شتێکی بەرچاو لە وەزعی ئابووری، نەوت و دیپلۆماسیەتی ساڵەکانی دوایی دەورەی شا بە کورتی بیر بخەینەوە.

لانی کەم ئەگەر ڕێژیم هیچ بڕوایەکی بە خەڵک و هێزی لەبن نەهاتووی گەلان کە بە رواڵەت شا خۆی بە ئاڵاهەڵگری ئەو شۆڕشە سپییە دەزانی، دەبوو فکرێک لە حاڵی میللەت بکاتەوە، بە تایبەتی بە دوای ئەوەدا کە هویدا هاتە سەر کار و پاش چەند ساڵ تێپەڕبوون لە رێگەی دوو حیزبە دەستکردەکەی شا (مردم و ایران نوین) چییان بۆ نەکرا و دڵی«سێبەری خوا!»شیان لە خۆیان ئێشاند. ئەو کات کە عەبباس هویدا بە فەرمانی شا لە ساڵی ٥٣دا حیزبی رەستاخیزی ساز دەکرد و دەبوو هەموو ئێرانییەکیش ئەندامی بێ، بە دوای ئەوەدا کە هویدا کابینەیەکی بە شا ناساند کە زۆربەیان دەرسیان لە ئەمریکا خوێندبوو و، هێندێکیشیان راستەوخۆ پێوەندییان بە سەفارەتی ئەمریکا لە تاران و وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا و... هەبوو، هەمووشیان لایەنگری پێوەندیی توند وتۆڵ لەگەڵ ئەمریکا بوون و حەزیان دەکرد بەرنامەی پێشنیاری واشنگتۆن لە ئێران بچێتە پێش. لانی کەم بە قازانجی خۆیان دەبوو ئاورێک بە کردەوە لە خەڵک بدەنەوە، بەڵام قەت نەکراو، بە پێچەوانە هەر زەخت بوو لەسەر خەڵکیان زیاد دەکرد، رۆژ لەگەڵ رۆژ باری تاقەت پرووکێنی جەماوەری هەژار و زەحمەتکێشیان قورستر دەکرد، هەر بەرپرسێک لە خۆیان و هەموو شت بۆ خۆیان بوو.

راستە گەلاڵەی بە رواڵەت«شۆڕشی سپی شا و خەڵک» بە هەموو خاڵەکانییەوە هێندێک لە شتە سەر خانییەکانی گۆڕی و بۆ بەینێک حوکمی هێدی کەرەوەی دەردو ئەخۆشییەکانی کۆمەڵی هەبوو، بەڵام چونکە ناڵ و گۆڕەکان بنەڕەتی نەبوون، نەیتوانی کۆمەلانی ملیۆنیی زەحمەتکێشانی شار و دێ رازی بکا و ناڕەزایەتییەکان بۆ هەتا سەر دامرکێنێ.

بۆ نموونە لە بواری ئیسلاحاتی زەویدا، دەبێ ئەو راستییە قبووڵ بکەین کە ئەم کارە واتە خاوەن زەوی کردنی زیاتر لە ١/٥ ملیۆن بنەماڵە و دڵخۆش کردنی بە رواڵەت و کورت خایەنی ئەوانیشی تێدابوو، لە لایەک راستە کە پایە و بنەی گەورە مالیکەکانی لە دێهات گواستەوە بۆ شار و خستنییە نێو گێژاوی بورژووازییەت و گچکە بورژووازیی شاوە، بەڵام لە لایەکی دیکەشەوە بوو بەهۆی ناڕەزایی بەشێک لە گەورە مالیک و ئەربابەکان، لە کوردستان بوو بە هۆی کۆچی هێندێک لە ئاغاکان بۆ عێراق، لە ئوستانی

فارسیش شەڕ و کێشەیەکی چەند مانگەی پڕ خەرجی لە نێو ڕێژیم و عەشیرەتەکان پێکهێنا. رووحانییەتی شیعەش جگە لە ناڕازی بوون لە ئیسلاحاتی ئەرزی، لە هاتنەگۆڕی مەسەلەی ژنانیش زۆر تووڕە بوون. بە هاندانی رووحانییەت لە پازدەی جۆزەردانی سالی ١٣٤٢دا خەلک لە هێندێک شوێنی وەک تاران و قوم ناڕەزایەتییان دەربڕی کە لە لایەن ڕێژیمەوە سەرکوت کرا.

جگە لەوەش دوای سەرکوتی پازدەی جۆزەردانی ١٣٤٢، ناڕەزایی زیاتری توێژی ئایینی و بە تایبەت ناڕەزایی رووحانییەتی ریزی سەرەوەی گەیاندە رادەی تووڕەییەکی ئاشکرا. بە دانانەوەی قانوونی کاپیتۆلاسیۆن بۆ ئەمریکاییەکانی دانیشتووی ئێران، ئەم تووڕەییە بەوپەڕی خۆی گەیشت و یارمەتی دان تا ئاخوندەکان یەکگرتوویی خۆیان بگەیەننەوە پلەی دەورەی تەنباکو و مەشرووتییەت.

گرتن و دوور خستنەوەی خومەینیش لە درێژخایەندا یارمەتیی زۆری بەم مەسەلە کرد.ئەویشی کرد بە ئەوەدەی توێژی بەرینی ئایینییەکان.

شای مەسلەحەت پارێز کە خۆی بە سێبەری خوا دەزانی، هەر ئەو سالەی اویسی جەلادی ناردە کوردستان و گۆمی خوێنی لەوێ سازکرد (١٣٤٧) بۆ فریودانی خەلکی دنیا و چاوبەستنی گەلانی ئێران و پووش بەسەر کردنی ئەم هەموو جینایەتانەی بە درێژایی چەند سالی دوای کوودیتای گەلاوێژی ١٣٣٢ کردبووی، کۆنفرانسی جیهانیی پاراستنی مافی مرۆڤی لە تاران گرت. پاش کۆنفرانس بە ئاشکرا هاواری دەکرد: بەلێ ئێمە شکەنجەشمان هەیە!.

راست ئەو سالەی شا جێژنی ٢٥٠٠ سالەی شاهەنشاهیی دەگرت، واتە لە سالی ١٣٥٠ کە ئەم جێژنە فیرعەونییانە بە بەشداریی ٦٩ ولات و ئامادەبوونی ٢٠ پادشا و ئەمیری عەرەب، پێنج مەلەکە، ٢١ شازادە، ١٦ سەرکۆمار، سی سەرۆک وەزیر، چوار جێگری سەرکۆمار و دوو وەزیری کاروباری دەرەوە و، هەلگرتنی خەرجێکی ٢٠٠ ملیۆن دۆلاری بەڕێوە دەچوون، داهاتی سەرانەی یەک ئێرانی لە سالدا ٢٥٠ دۆلار بووە کە ئەو کات دۆلارێک بایی ٧ تا ٧/٥ تمەن بووە. هەر لەو سالەدا زیاتر لە ٢/٣ی دانیشتووانی ئێران لە دوکتور و دەرمان بێ بەش بوون. لەو سالەدا تەنیا ١/٥ی زەوی بەرهەمهێنەر چێندرابوون، باقی زەوییەکان لەبەر نەبوونی بەنەتوو کەل و پەلی پێویست و نەداریی خەلکی دێهات بەیار مانەوە.

لەو ساڵەدا بەرهەمی کشتوکاڵ ۲ ٪ زیاد بووە، بەڵام ژمارەی دانیشتووانی وڵات ۳ ٪ زیاد بووە و خەرجی ژیان ٦ ٪ چۆتە سەر هەر لەو ساڵە پڕ نەگبەتییەدا کە میلیۆن کیلۆوات کارەبا بۆ شوێنەکانی بەڕێوە چوونی جێژنەکانی شا و فەرەح تەرخان کرابوو، نەتەنیا زۆر لە گوندەکان و شارەکان، بەڵکو لە هێندێک شوێنی دەوروبەری تارانی پێتەختیش کارەباو ئاوی خواردنەوە نەبووە.

ئەو کات کە ۹۰ ٪ی گوندەکان کارەبایان نەبوو وسەدان کرێکار و زەحمەتکێش بە هیوای ژیانێکی باشتر روویان لە شارەکان کردبوو، بەڵام کار و ژیانیشیان بۆ دابین نەدەبوو، لە شاری تاران زیاتر لە ٤۲ ٪ی خەڵکی شوێنی شیاویان بۆ ژیان نەبووە.

هەرچەندە بەڕواڵەت بوودجەی ئامووزش زیادکرابوو، زیاتر لە چل لە سەدی منداڵان نەیانتوانی بچنە مەکتەب و دەرس بخوێنن.

سەرەڕای ئەم وەزعەش بوودجەی ئەرتەش کە لە ساڵی ٤۲دا ۲۹۳ میلۆن دۆلار بوو لە ساڵی ٥٦ گەیشتبووە ۷/۳ میلیارد دۆلار، لە ساڵەکانی ٤۹ تا ٥۲ش بایی زیاتر لە ۱۲ ملیارد دۆلار کەرەسەی شەڕ کردرابوو. ڕژێم تەنیا لە ساڵی ٥٦دا مەبلەغی ۱۲ ملیاردی بۆ کڕینی چەک تەرخان کردبوو.

رادەی ئەفەراتی ئەرتەش کە لە ساڵی ٤۲ تەنیا دووسەد هەزار کەس بوو، لە ساڵی ٥٦دا گەیبووە (٤۱۰۰۰۰) کەس، لە ۲٥ ساڵی دوای کوودیتاوە ۳۰ ٪ بوودجەی وڵات بۆ ئەرتەش تەرخان کرابوو. پاش ئەوەی کە لەلایەن ڕێکخراوی ئوپێکەوە لە ماوەی چەند ساڵدا نرخی ئەوت چوار قات گران ببوو، شا لافی ئەوەی لێدەدا کە ئێران لە بواری نیزامی بێتە ریزی دەوڵەتانی گەورەی جیهان.

دیارە فرۆشی ئەوتیش لە ساڵی ٥٦دا گەیشتبووە ..۱۸/٤ ملیارد. ئەو چەشنە فرۆشە شوێنەواری لەسەر دەرچوونی باقی کاڵای غەیرە ئەوتییەکان بۆ دەرەوە دانابوو و گەیبووە ۲ ٪.

هەر لە ساڵی ٥٦دا بوو کە شا چووە ئەمریکا، هەرچەند خۆپیشاندانی دژی شا زۆر بەهێز بوو و زۆر دروشمی دژی ئەمریکاش درا، بەڵام پرێزیدنت کارتێری کە پێشتر زۆری رەخنە لە چەک فرۆشتنی ئەمریکا گرتبوو، لە خشتە بردو لەسەر ئەوە رێک کەوتن کە ئەو بایی ۱۲ ملیارد چەک بە ئێران بفرۆشن و «شا»ش لە ئوپێک پێشی چوونە سەری لەوە زیاتری بایەخی ئەوت بگرێ.

لە وەزعێکی ناوادا بێجگە لە دزیی زۆر گەورەی دەرباچەکان لە داهاتی میللی و «بیت المال» بونیادی پەهلەوی کە بەڕواڵەت بونیادێکی خێرخواز بوو، بەڵام لە ۲۰۷ شیرکەتدا بەشدار بووە، ساڵی ٤٠ ملیۆن دۆلاریشی لە پوولی فرۆشی نەوت وەک یارمەتی لە دەوڵەت وەردەگرت. شا خۆی جگە لەو هەموو حیساب و پارەی لە دەرەوە هەیبوو، خاوەنی چەند کارخانە و کانگا بوو. شەهرامی کوڕی ئەشرەفی خوشکی شا، بە تەنیایی لە هەشت بونیادی گەورەی بەرهەم هێنەردا بەشدار بوو.

لەسەر ئەم سفرە راخراو و پڕ پیتەی ئێران، لە ساڵی ۱۳۵۵دا ۲٤٠٠٠ موستەشاری ئەمریکایی حەوانەوە، بڕیار وابووە کە لە ساڵی ۱۹۸٠دا ئەم ژمارە بگاتە ٥٠٠٠٠ کەس.

ئەمەش لەم پێوەندییەدا بووە کە ئێران گەورەترین مشتەریی چەک وچۆڵی ئەمریکایی بووە.

وەزعی سیاسی زۆر نالەبار بوو، هیچ ناسەوارێک لە دیموکراسی نەمابوو، شا کە لە پێوەندی لەگەڵ حیزبی رەستاخیزدا گوتبووی هەر کەس ئەندامی ئەم حیزبە نەبێ، دەبێ لە دڵدا و بە نهێنی توودەیی بێ، نیشانەی ئەم خەفەقانە توندە سیاسییە بوو.

لە دوایین هەڵبژاردنی پارلەمانی شادا کە دەورەی ۲٤ بوو، بە پێی فەرمانی شا هەموو کەس دەبوو دەنگ بدا و بەم شێوە ئێرانی بوونی خۆی نیشان بدا. شا ئەمری کردبوو هەم پێش دەنگدان و هەم کاتی دەنگدان ناسنامەکان مۆر بکرێن.

بۆ ۲۹۸ کورسیی شورا و ۳٠ کورسیی سەنا کە ئەوە بەشی هەموو خەڵکی ئێران لە سەنادا بوو و، «شاش» بۆ خۆی سی کەسی دادەنا، دە هەزار کەس ناوی خۆیان نووسیبوو، لەوانە ۸٤۱ کەس بە باوەڕپێکراو ناسران. بەپێی ئاماری وەرگیراو و ناسنامەی مۆرلێدراوی بەر لە هەڵبژاردن ٦/۸ میلیۆن کەس دەبوو دەنگ بدەن، بەڵام کاتێک دەنگەکان خوێندرانەوە، بە حیسابی خۆیان ٥/۱ ملیۆن کەس دەنگیان دابوو ۱/٥ ملیۆن کەس لە دەنگدان خۆیان بواردبوو کە ئەوە خۆی نیشانەیەکی گەورەی ناڕەزایی و بەرهەڵستکاری لەگەڵ ڕێژیم بوو.

شا دوای کوودیتای گەلاوێژی ۳۲ جگە لە چەند مانگێکی دەورەی سەرۆک وەزیریی دوکتۆر ئەمینی، دیکتاتۆرێکی تەواو بووە، پایەی تەختەکەی لەسەر ئەم چوار شتە خۆی راگرتبوو. هێزە چەکدارەکان، ساواک، رێکخراوە جاسووسییەکان، دەربار و دەزگا

جاسووسییەکانی حیزبی رەستاخیز. بێگومان پاڵدانەوە بە وڵاتانی ئیمپریالیستی بە تایبەتی ئەمریکا لەم بوارەدا جێگەی تایبەتی خۆی هەبووە.

بۆیە لەم دە ساڵەی دوایی پادشایەتیی حەمە رەزا شادا، بە دوای ئەم مەسەلە گرینگانەی لەسەرەوە باسمان کردن و بە تایبەتی بە وەرگرتنی ئیلهام لە بزووتنەوەی چەکداریی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ساڵەکانی ٤٧-٤٦ زۆر هێزی چریکی لە تاران و باقی شوێنەکانی دیکەی ئێران بە نهێنی پێکهاتن کە بە فیداکاریی زۆرەوە خەباتی چەکدارییان دەکرد. لەم پێناوەدا ٣٤١ کەس لە چریکی فیدایی و موجاهیدەکان شەهید بوون. جگە لە تەقەولێکدان ٣٤٠ جار بۆمب لە شارە جۆراوجۆرەکان تەقێندرانەوە،بێ شک لەم هێرشانەدا کە بۆ سەر بنکە و بونیادەکانی سەر بە شا کراوە، بە سەدان کەسیش لە هێزی دوژمن کوژراون. ماوەیەک وای لێ هاتبوو کە بەرپرسان و چەکدارەکانی شا لە سێبەری خۆشیان دەترەوینەوە.

لە دەرەوەی وڵاتیش هێزی لاو و خوێندکار بە تایبەتی ئەوانەی سەر بە فیدراسیۆنی خوێندکاران بوون، لە بواری سیاسی و رێپێوان و خۆپیشانداندا چالاکیی باشیان دەنواند.

شەپۆلێکی بە تەوژمی تەبلیغاتی و سیاسیی و مەزهەبییەکانیش لە نێوخۆ و دەرەوە پەرەی سەندبوو.

ناردنی ئەواری قسەکانی خومەینی لە پێشدا لە نەجەفرا و دوایش لە فەرانسەرا هاندەرێکی کەم وێنە بوو، چونکە بە هەزارانی لێ هەڵدەگیراودو لە نێو جەماوەردا بڵاو دەبووەوە.

دەتوانین بڵێین ئەم مەوجە تەبلیغییە پاش دوکتور شەریعەتی کە زۆریش لە مردنی تێ نەدەپەڕی، هەرچەند شێوەکەیان و بۆچوونەکەیان لەگەڵ خومەینی تەواو جیاوازیی هەبوو، بەڵام رۆڵی تایبەتیی لە بواری راپەڕاندنی خەڵکدا بینی.

بە تایبەتی دوای هاتنی خومەینی بۆ دەوری پاریس، پێوەندیی راستەوخۆی خۆی و دەوروبەری لەگەڵ دەزگا تەبلیغاتییەکان و رۆژنامەکان، هێزێکی تازەی بە مەزهەبییەکان بەخشی و رێکی خست.

بەندیخانەکان لە بەندییە سیاسییەکان ئاخنرابوون. هەلومەرجێکی دوور لە یاسا و نوسووڵەکانی مرۆڤایەتی بە سەر تەواوی بەندیخانەکاندا سەپابوو. زۆرجار بوو بەندی کاتی حوکمەکەی بەسەر چوود، بەڵام چەند ساڵ دواتریش رایانگرتووە. هێندێکی واش

هەبوون کە بە بیانووی گواستنەوەی جێگا بە شێوەی تاکە کەسی یا چەند کەسی بە بیانووی بردنیان بۆ لای دوکتۆر و نەخۆشخانە لە بەندیخانەکانیان هێناونە دەرێ و لە چۆڵگە گوللە بارانیان کردوون.

لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا لە ڕێگەی ئاخوندەکانەوە کە دواییش دەرکەوت لەسەر بۆچوونی خۆیان وریایی تایبەتییان هەبووە و کاری ڕێکخراوەییان کردووە و لە زۆر شوێن گەرایان داناوە، لە قوم و هێندێک شوێنی دیکە چەند خۆپیشاندان ساز بوو.

بە لە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە مینبەر و بڵیندگۆی مزگەوتەکانیشیان هەر لە کۆنەوە بە دەستەوە بووە، خۆپیشاندانەکان زیاتر شکڵیان گرت و گەیشتە جێگایەک کە رووحانییەکان لە شارە گەورەکانی وەک تاران، ئیسفەهان، تەوریز و مەشهەدیش وردە وردە پشتیوانییان لێکردن.

دوو ڕووداوی گرینگ لە هاوینی ٥٧دا یەکیان ئاورتێبەردانی سینەما ڕێکسی ئابادان[*] و ئەوی دیکە خۆپیشاندانی حەڤدەی خەرمانان لە مەیدانی ژالە، کە بوو بە هۆی کوژرانی لانی کەم سەدان کەس لە خۆپیشاندەران و هەر لەسەر ئەم وەزعە حکوومەتی نیزامی ڕاگەیەندرا و نەتەنیا لە تاران لە زۆر شاری دیکە و بە تایبەتی لەو شارانەی وەکو قوم، شیراز، مەشهەد کە ئیمام زادەی لێن، زۆر سەختیان گرت، بەڵام فایدەی نەبوو، خۆپیشاندان ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر تەشەنەی کرد. بازارییەکانیش بوونە هاودەنگی فەقێ و مەلاکان، وردە وردە سامی خەڵکی وەزاڵەهاتوو شکا و جووڵانەوەکە بوو بە مەسەلەیەکی جەماوەریی پان و بەرین. بەرزبوونەوەی دەنگی خومەینی لە فەرانسە بە دوای جواب کردنی لە لایەن حکوومەتی عێراقەوە و ڕانەگرتنی لە لایەن کوێت و چەند شوێنی دی لە ترسی شا کە پێش ئەم وەزعە بە مانای واقع بیووە ژاندارمی ناوچەی کەنداوی فارس، هاتنی ئیعلامییەکانی بۆ ئێران، وتووێژەکانی لەگەڵ ڕادیۆکان و چاپەمەنیی دەرەوە، جێ و شوێنێکی تایبەتی هەم لە دڵی خەڵکدا و هەم لە ڕوانگەی سیاسەتمەدارانی جیهانی و دەوڵەتەکاندا بۆ کردەوە. بە تایبەتی ئەوەی کە هێندێک تیکنۆکراتی ئێرانی ناسراو بۆ وڵاتانی ڕۆژئاوایی لەگەڵی کەوتبوون، گرینگییەکی تایبەتییان بە کەسایەتیی خومەینی لە ڕوانگەی ڕۆژئاواوە بە تایبەت ئەمریکاوە بەخشی و، هێدی هێدی وەک ئاڵترناتیوی شا هاتە گۆڕێ.

---

(*) سەبارەت بە ئاگرتێبەردانی سینەماڕێکسی ئابادان هێندێک پێیان وا بوو کە ئەوە بە دەسکیسی ئاخوندەکان کراوە کەچی دوایە ڕوون بۆوە دارو دەستەی شا کردوویانە.

کوردستان دواتر دەستی پێکرد. دیارە گەلی کورد بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی تاوانەکانی شا ببەخشێ و ئەو هەموو خراپەی لە دەورەی پاشایەتیی خۆیدا لەگەڵ گەلی کوردی کردبوو، لە بیر هیچ کوردێک نەدەچووەوە. بە تایبەتی خاڵە بەرچاوەکانی وەک تێکدانی کۆمارە ساواکەی کوردستان، شەهید کردنی پێشەوا قازی محەممەد و ئەو هەموو پیاوە خەباتکارانەی ئەو سەردەم، کوودیتاکردن لە دوکتۆر موسەدیق، گرتنە بە کۆمەڵەکانی ساڵەکانی ٣٨و ٤٢، کوشتاری بێڕەحمانەی شۆڕشگێرانی دیموکرات لە ساڵی ٤٦و ٤٧ و دوور خستنەوەی ئەم خەڵکە نیشتمانپەروەرە و بیرکردنەوە لەم هەموو جینایەتە سامناکانەی دەرحەق بە کورد کردبووی، ئاگری ئەفرەتی لە دەروونی هەموو کوردێکی دڵسۆزدا هەڵکردبوو، برینی خیانەتی شا و ئەمریکا لە ساڵی ٧٥ و بەستنی پەیمانی ئەلجەزایریش سەبارەت بە وەزعی کوردستانی عێراق زۆر قووڵتر لەوە بوو وا زوو سارێژ بێ و زۆر لەمێژ بوو بە دڵ چاوەڕوانی هەلێکی گونجاو بوون، بەڵام دەرفەتی لەبار نەهاتبووە پێش.

کاک عەزیز یوسفی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب دوای نزیک بە ٢٥ ساڵ لە بەندا بوون کە دواجار ١٩ ساڵی تەواو لە بەندیخانەکانی شادا مابووەوە و، تووشی نەخۆشی ببوو و لە ساڵی ٥٦ لە بەندیخانە رزگار ببوو، بەداخەوە لە ١٤ی جۆزەردانی ١٣٥٧ لە تاران فەوتی کرد. لەسەر پێشنیاری جەلیل گادانی و چەند هاوڕێی دیکەی حیزبی تەرمەکەی برداوە بۆ مەهاباد، بەڵام تەرمەکەی هەر لە تاران کە وەدەرکەوت ، لە لایەن جەماوەرێکی زۆرەوە بەدردقە کراو لە مەیدانی شەهیادی ئەو کات کاک صارم الدین صادق وەزیری بە فەرمایشە جوانەکانی دڵی عالەمی هەژاند. بە پێچەوانەی تێبینی ئەمنییەتی بەرپرسانی رژێم جادە و شەقامەکانی میاندواو و مەهاباد پڕ لە پۆلیس کرابوون، بەڵام سەرەڕای ئەوەش رێ و رەسمەکە جۆرێک رێکخرا کە بە هەزاران کەس لە رێ و رەسمی بە خاک سپاردنیدا بە رێپێوان بەشدار بوون. لە گۆڕستان جەلیل گادانی وێڕای باسێکی کورت لەسەر ژیانی تێکۆشەر عەزیز یوسفی و سوپاس لە جەماوەری دڵسۆزی شاری پێشەوا قازی، داوای لە مامۆستا شێخ عیزەدین کرد بە کوردی و بە لەباری تەلقینی بدا. ئەویش تەنسیری تایبەتیی خۆی دانا.

سەرەخۆشییەکی سێ رۆژی زۆر قەرەباڵغ و سیاسی لە خانەقای ئەهرێ بۆ داندرا، رۆژی سێهەم بە پێچەوانەی هەڕەشەی ساواک زیاتر لە بیست هەزار کەس کە لە زۆربەی

شوێنەکانی کوردستانیش ڕاهاتبوون، ڕێپێوان لە شوێنی سەرەخۆشی ڕا تا سەر گڵکۆکەی دەستی پێکرد. لەم ڕێ و ڕەسمەدا چەند کەس بە هەستی خاوێن و نێوەرۆکی سیاسییەوە قسەیان کرد کە بریتی بوون لە جەلیل گادانی، حەوسەت دەبباغی، فەوزیە جەوانمەرد و، موهەندیس سلێمان تیکان تەپە. شوێنەواری ئەم ڕێ و ڕەسم و قسانە بەرادەیەک بوو کە خەڵک لە گەڕانەوەدا چوونە سەرگڵکۆی شەهیدان سلێمان موعینی و مەلا مەحموودی زەنگەنە. لەوێش لە لایەن کاک عومەر قازییەوە چەند قسە و دروشمێک گوترا، جەماوەر کە هاتنە سەر شەقام، دەستیان بە دروشم دان دژی ڕێژیم کرد و بوو بە خۆپیشاندان.

ئەو کارانەی لە پێوەندی لەگەڵ فەوتی کاک عەزیز یوسفی دا بەو شێوەی باس کرا و لە پێشدا هاتنە گۆڕێ، یەکەم خۆپیشاندانی کوردستان لەم فەترەیەدا بوو.

ساواک بە دوای ئەم خۆپیشاندانانەدا لە ماوەی دوو ڕۆژدا نزیکەی چل کەسی لە خەڵکی مەهاباد گرت، هێندێکی وەک جەلیل گادانی و حەسەن ماوەرانییان لە تارانەوە هێناوە. هێندێک لەم کەسانەی لەسەر ئەو ڕووداوە گیران و لە بیرماون، بریتی بوون لە: خەلیل گادانی، جەلیل گادانی محەممەد گادانی،عومەر قازی، سەید حەسەن هاشمی، سەید محەممەد نیزامی، عومەر شێخ محەممەدی، حەسەن ماوەرانی، قادر ماوەرانی، عەزیم مودەفەقی، پۆلا ئانەوازادە، کەریم ئەفسەر دلێر، قاسم سولتانی، حسێن وەستا جەلیل، وشیار نیمامی، سیامەند موعینی، حسێن بەخشی، سەعید کوێستانی، مەلا سادق، سەید خدر، خوسرەو مێعمار نازدر، تەها کەرباسی، حەوسەت دەباغی، قاسم چیرە، محەممەد ئەمین چیرە، ئیبراهیم شێخانی، خوسرەو خوسرەوی و عبداللە گادانی.

جەوی خەفەقان هێندێک شکابوو، بۆ یەکەم جار بە پێی یاسای تازە ئیزن درابوو بەندیی سیاسی بتوانێ وەکیلی عادی بگرێ، بە هاوکاریی چەند کەس لە وەکیلەکان پشتیوانیی کانوونی وەکیلان و تێکۆشانی سارم خان و دوکتور کەریم لاهیجی و بوزچلوو، لەباری سیاسییەوە بۆ بەردانیان زۆر هەوڵ درا. شازدە کەس بۆ ورمێ بەڕێ کران و باقی بە هەوڵی دڵسۆزان بەردران. بۆ هێندێک لەم شازدە کەسە داوای ئیعدام کرابوو، بەڵام فیداکاریی خەڵک و وەکیلەکان لە تاران و کوردستان لە لایەک و درێژەی خۆپیشاندانی خەڵکی مەهاباد تا ڕادەی شەهید دان(*) و برینداربوون لە لایەکی دی بوونە هۆی ئەوەی پاش چوار پێنج مانگ لە نێو بەدرەقەی دەیان ماشێن کە لەبەر دەرگای

(*) لەم خۆپیشاندانانەدا جەمال فەقێ یەعقووب شەهید بوو، چەند کەسیش بریندار بوون.

بەندیخانەی دەریا لە ورمێ ئامادە ببوون. لە ڕۆژی هەینی کە هەموو شوێنە دەوڵەتییەکان لە پشووداندا بوون، بەریان بدەن و بەرەو مەهاباد بەدرەقە بکرێن.

هەرچەند ساواکی ئوستان بۆ ئەوەی درەنگ بگەنەوە مەهاباد، فرت و فێڵی خۆی بە خەرجدا، سەرەڕای ئەوەش کە تاوپەران گەیشتنەوە شار، بە پێی قەراری پێشوو یەکسەر چوونەوە سەر گڵکۆی کاک عەزیز یوسفی و لەبەر نووری دەیان چراتۆڕ، میتینگێکی پان و بەرین بە هێندێک وتاری بەنرخ کە لە جەلیل گادانییەوە دەستی پێکرد پێکهات. خەڵکی شارەکانی کوردستان کە ئەوەیان دیت و بیست، ئازایانە ڕاپەڕین و بێ پسانەوە تا ڕووخانی ڕێژیی شا هەر ڕۆژە لە شوێنێک و دوو شوێن ڕێپێوانیان دەکرد و ناڕەزایی خۆیان بەرامبەر بەو ڕێژیمە دەردەبڕی.

بێگومان لە زۆربەی ئەو میتینگ و ڕێپێوانانەدا ئەندامانی حیزب ڕێنوێن و بەڕێوەبەری سەرەکی بوون، لە ڕاستیشدا ئەو کات جگە لە حیزبی دێموکرات، ڕێکخراوێکی ناسراوی دیکە نەبوو.

کوردستان بە گشتی درەنگی دەست پێکردبوو، بەڵام زۆر زوو دواکەوتنەکەی قەرەبوو کردەوە، لە سنە و باقی شوێنەکانی جنووبی کوردستان زۆر توندتر لە ڕادەی چاوەڕوان کراو دەچوونە پێش.

بەکردەوە لە هێندێک شوێن ڕێکخراوی حیزبی بە نهێنی دامەزرابوووەوە، پێوەندی لەگەڵ هاوڕێیانی پەڕیوەی عێراق و ئەندامانی ڕێبەری لە عێراق و فەرانسە گیرابووەوە، جگە لەوەی ئەواری ڕێ و ڕەسمی سەر قەبری کاک عەزیزیان زۆر زوو دەتوانین بڵێین هەر ئەو ڕۆژە بۆ بەڕێ کرا، زۆر بە جیددیش بە تایبەتی لە لایەن کاک جەلیل گادانی و دوکتور سەعیدەوە داوایان لێ دەکرا بگەڕێنەوە.

وجوودی ئەو ١٦ کوردە لە بەندیخانەی ورمێ و، بەربوونیان بەم شێوە و پێشوازییەکی گەرم کە هەم لە شاری ورمێ و هەم لە مەهاباد لێیان کرا، هەروەها خەباتی ئەپساوەی شارەکانی کوردستان بوو بەهۆی ئەوە کە خەڵکی ورمێ کە پێشتر بە شادۆست ناسرا بوون و، باقی شارەکانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، ڕاپەڕن و دەست بە خۆپیشاندان بکەن.

دوای ئەوە میتینگێکی پان و بەرین لە بۆکان بە بۆنەی سێ ڕۆژی شەهیدەکانی یەکەم ڕێپێوانی ئیعترازیی ئەو شارە بەڕێوە چوو و هێندێک کاری ڕێکخستن بە شێوەی

نهێنی لە مەهاباد و بۆکان ئەنجام درا، رێکخراوی حیزبی تاران بە هاوکاریی بەشێک لە هاورێیانی جێی متمانە دامەزراندرایەوە و چەند میتینگی بەرچاو لە جنووبی تاران و گومرگی رۆژئاوای تاران وەرێخرا. پاش ماوەیەکی دیکە لە مانگی سەرماوەزدا بە دوای نووسینەوەی وەڵامێک بۆ تیمسار قەرەباغی کە لە رۆژنامەی ئایندەگاندا هێرشی کردبووە سەر کوردان، لە زانستگەی تاران کۆبوونەوەیەک بۆ کوردەکان پێکهات و بناغەی کۆمەڵەی کوردەکانی دانیشتووی تاران دارێژرا. لە هەموو ئەم کارانەدا جەلیل گادانی دەوری بەرچاوی هەبوو.

لە رێگەی ئەم کۆمەڵەوە بوو کەیەک دوو رۆژ دواتر یەکەم رێپێوانی تایبەتیی کوردان بە خوێندنەوەی سروودی ئەی رەقیب لە شەقامەکانی تاران کرا و لە مەیدانی قەزوێنەوە تا دانشگای میللی کە دوایە بوو بە مەجید واقفی، رۆیشتن و لەوێ لەگەڵ پێشوازییەکی گەرمی دەیان هەزار کەس رووبەروو بوون. لەوێش جەلیل گادانی بە وتاری خۆی پشتیوانیی گەلی کوردی لە راپەڕین راگەیاند و لەمە بەدوا کۆمەڵەی کوردانی تاران وەک نۆرگانێکی تێکۆشەر حیسابی بۆ دەکرا و لە زۆربەی رێپێوان و میتینگەکاندا بانگ دەکران و نۆبەی تایبەتییان بۆ پێشکەش کردنی وتار بۆ دادەنان.

لە مانگی خەزەڵوەردا تەوژمی رێپێوان یەکجار زۆر بوو، کەمتر شوێنی ئێران مابوو کە خۆپیشاندانی تێدا ساز نەبووبێ و خەڵک بە ئاشکرا نەڕژابێتە شەقامەکان و دژی شا و بنەماڵە و داروودەستەکەی دروشمیان نەدابێ. وتەی خومەینی کە رایگەیاند:

«شا دەبێ بڕوا» هێندەی دی خەڵکی هاندا.

شا لە بەرامبەر ئەم تەوژمەدا بەرادەیەک لاواز ببوو کە لە هاوینی ٥٧ را تا زستان سێ سەرۆک وەزیری گۆڕی کە بریتی بوون لە: شەریف ئیمامی، ئەزهاری و دوکتور شاپووری بەختیار، بەڵام ئەم ئاڵ و گۆڕانە نەتەنیا کەڵکیان نەبوو، بەڵکو لە مانگی خەزەڵوەردا لە بەرامبەر ویستی خەڵک لەسەر ئازاد کردنی بەندییە سیاسییەکان بە چۆک داهات و فەرمانی دا دەستە دەستە زیندانییە سیاسییەکان لە هەموو شارەکان ئازاد کەن. هەر ئەم دەسکەوتە کە بوو بەهۆی ئازادیی هەزاران بەندیی سیاسی، خەڵکی زیاتر هان دا و بوو بە جێژنێکی گشتی و لە ماوەیەکی کەمدا وەزعی شارەکان و بە تایبەتی تارانی گۆڕی.

جگە لە سەردان و بەخێر هاتنەوە و سوپاس لە خۆڕاگریی بەندییەکان، بارستایی

خۆپیشاندانەکانیش گۆڕدرا و خەڵک خوازیاری دەسکەوتی زیاتر بوون.

بۆ نموونە کاک غەنی بلووریان کە لە بەندیخانەی شیراز هاتەوە و لە تاران لە ماڵی جەلیل گادانی بوو، بە هەزاران کەس بۆ چاوپێکەوتنی هاتن و دەیان رۆژنامە نووس و هەواڵدەر لە رۆژدا چاویان پێی دەکەوت.

گەڕانەوەی کاک غەنی بۆ مەهاباد بە پێچەوانەی ویستی خۆی، کرا بە پێشوازییەکی وا گەرم کە ٦٠ هەزار کەس لەم شارەدا لە بۆلواری تەورێز کۆبوونەوە و گەیشتنەوەی تا ماڵی خۆیان کە لە گەڕەکی ئەرمەنیان بوو، چوار سەعاتی خەیاند.

هەر لەم مانگەدا کۆمیتەی ناوەندی حزبی دیموکراتی کوردستان لە بەغدا بڕیاری دابوو کە لەژێر ناوی «کۆمیتەی زاگرۆس» چەند ئەندامی رێبەری و کادری حیزب بە نهێنی بگەڕێنەوە کوردستانی ئێران. بە خۆشییەوە ئەم بڕیارە بەڕێوە چوو، لە پێشدا دوکتۆر قاسملوو، مامۆستا عەبدوڵلا حەسەن زادە، کاک ئەمیر قازی، کاک هاشم کەریمی، کاک سەلیم بابانزادە، سەید رەسووڵ دێهقان و مەلا حەسەن شیوەسەلی و دوای مانگێک کاک حەمەدەمین سیراجی گەڕانەوە و بە تەرتیب لە تاران، مەهاباد، کرماشان، سنە، بۆکان، پیرانشار، ورمێ و سەقز بە نهێنی خەریکی کارو تێکۆشان بوون. ئەو کارە یەکێک لە باشترین ئەرکەکانی حیزبی بوو، چونکە پێشتر هێندێک کەس خەریکی سازکردنی رێکخراوی دیکە بوون.

شا لە مانگی سەرماوەزدا بۆ ئەوەی وەزعی مەهاباد ئارام کاتەوە و جێ پێیەک بۆ خۆی لە نێو داروودەستەکەی خۆیدا بهێڵێتەوە، سپەهبود کەریم و رەهرامی نارد بۆ ئەوەی بەڵکو لە دۆستایەتیی و خۆشەویستیی پێشووی لە نێو خەڵکدا کەڵک وەرگرێ و کارێک بۆ شا بکا و کوردستانی پێ ئارام کاتەوە، بەڵام لە لایەن کەسێک بە ناوی سەید عومەر پەلاماری درایە سەر. پۆلیسەکانیش سەید عومەریان دایە بەر دەستڕێژ و شەهیدیان کرد. ناوبراو دووهەم قوربانیی ئەم خۆپیشاندانانە بوو لە شاری مەهاباد کە بە شکۆیەکی زۆرەوە تەسلیم بەخاک کرا و رێپێوانێکی گەورەی بۆ رێکخرا.

شا لە ناخرییەکاندا کە دیتی ئەمریکا پشتی تێدەکا و ژێنڕاڵ هاوزێر خەریکی رێککەوتن لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنە، ئامادەی سازش بوو، تەنانەت گوتیشی: «ئەی خەڵکی ئێران گوێم لە دەنگی شۆڕشەکەتان بوو»، بەڵام زۆر درەنگ بوو، هەم لە نێو خەڵک ئیعتباری نەمابوو، هەم لە روانگەی نێو نەتەوەییەوە سومعەی لە دەست چووبوو، تەنانەت

دەست و پێوەندەکانی خۆشی وردە وردە پشتیان تێکرد بوو.
لەم بەینەدا بە کەڵک وەرگرتن لە هەلومەرج لە زۆر شوێنی ئێران و هەروەها لە کوردستانیش هێندێک کۆڕ و کۆمەڵی دیوکراتیک لە نێو مامۆستایان، خوێندکاران و قوتابیان پێکهاتبوو کە لە رێکخستنی رێپێوان و بڕیاردان لەسەر دۆزینەوەی رێگە حەللی گیروگرفتەکانی سنفی زۆر بە کەڵک بوون و بەرەو ئەوە دەچوو خەڵک خۆیان بەڕێوەبردنی کارە گشتییەکانیش وەئەستۆ بگرن.
زەخت و زۆری ساواک و کاربەدەستانی ڕێژیم نەمابوو، لە هێندێک شوێن شۆڕش سەری هەڵدابوو. کوردستان یەکێک لەم شوێنانە بوو کە بۆ ئەم کارانە دەست پێشخەریی دەکرد.
لە زۆر شوێن مانگرتن دەهاتە گۆڕێ و لە چوارچێوەی گونجاودا داخوازییەکانی خۆیان دابین دەکرد، خۆپیشاندانەکانی کوردستان وا پەرەگرتوو ببوون، کە غەیرە کوردەکان هێندێک جار بە تایبەتی ناخوندەکان لە شارەکانی دیکەوە دەهاتن، هێزێکی تازەی دەروونییان پەیدا دەکرد و دەگەڕانەوە. تەواوی شارەکانی کوردستان وەک تاران و شوێنەکانی دیکە راست ببوونەوە.
لەسەر فتوای خومەینی ئەرتەشییەکانیش کەم کەم دەستیان لە کار دەکێشایەوە و لە ریزی خۆپیشاندەراندا دەبیندران.
ئەمریکا و وڵاتانی رۆژئاوا پشتیان لە شا کرد و ئەمریان دەرکرد ئێران بەجێ بێڵێ.
شا تازە هیچ هومێدێکی بۆ نەمابوو، رۆژی ٢٦ی بەفرانباری ١٣٥٧ لە فڕۆکە خانەی میهرئابادەوە ئێرانی بەجێهێشت. ڕۆیشتنی شا تەواوی ئێرانی غەرقی شادی و خۆشی کرد. لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا هیچ پەیکەرێکی شا و باوکی بەسەر پێوە نەما و هەموو خرانە خوارەوە.
حەوتوویەک دواتر بۆ یەکەم جار لە مێژوودا لە تالاری فیردەوسی زانستگەی تاران لە لایەن کۆمەڵی کوردانی تاران کە ئەوکات بەرپرسی یەکەمی جەلیل گادانی بوو، ڕێ و رەسمی ٢ی ڕێبەندان، رۆژی دامەزرانی کۆمار پێکهات، یەکەم وتار لەسەر کۆمار و پێشەوا و غەدری ڕێژیم لە کورد لە لایەن کاک جەلیل گادانییەوە پێشکەشی بەشدار بووان کرا، دووهەم وتار بە پێی بەرنامە لە لایەن کاک صارم الدین صادق وەزیرییەوە بە زمانی فارسی هەر لەم ماوەدا کە لەسەرەوە باس کرا، پێشکەشی بەشداران کرا کە بەشێکی زۆریش لەوان کەسایەتی و خوێندکارە غەیرە کوردەکان بوون. ئەم ڕێ و رەسمە

پێشوازییەکی کەم وێنەی لێ کرا و هەستی خەڵکی زۆر هەژاند.

هەر لە حەوتووی یەکەمی ڕێبەندانداندا ئەو ڕێ و ڕەسمە لە چەند شاری کوردستان بە تایبەتی لە مەهاباد بەڕێوە چوو، کە شوێنەواری تایبەتیی خۆی لە پتەوبوونی ڕیزەکانی حیزب دانا و هاندەرێکی بەهێز بوو.

شا ڕۆیشتبوو، بەڵام ڕێژیمی پاشایەتیی بە سەرۆک وەزیریی دوکتۆر شاپووری بەختیار هەر مابوو. ناوبراویش زۆری هەوڵدا بە شێوەیەک وەزعەکە ڕاگرێ، بەڵام تازە پاشەکشە مەحاڵ بوو. ئەو دەسکەوتەی کە بەنرخی خۆپیشاندان و مانگرتن و بە هاوکاریی هەمەلایەنەی هەموو چین و توێژەکان پێکهاتبوو، گەڕانەوەی شای غەیرە مومکین کردبوو، خەڵک ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ بە هومێدی دامەزرانی دێموکراسی و هاتنە سەرکاری حکوومەتێکی گەلی زیاتر هەوڵیان دەدا. خۆپیشاندان بێ پسانەوە لە تاران و شارە گەورەکان بەردەوام بوو.

خومەینی بە وەعد و بەڵێنی زیڕین کە بە قسە چی تێدا نەهێشتبووەوە، لە نێو دڵی خەڵکدا بە تەواوی جێی خۆی کردبووەوە، تەبلیغات چییەکانی سەر بە ناخوندەکان بە هەموو ئیمکاناتی خۆیانەوە، لە هەزاران مزگەوت، لە هەموو تەکیە و خانەقاکان، لە تەواوی خۆپیشاندانەکان دا تەبلیغیان بۆ دەکرد، شەو نەبوو لە چەند کەناڵی ڕادیۆ و تلویزیۆنی دنیا باسی نەکرێ، وتوویژ لەگەڵ خۆی یا قسەکەرەکانی دەورووبەری نەکرێ. مەسەلەی ئێران و خومەینی بە تایبەتی دوای ڕۆیشتنی شا، پڕ هات و هاوارترین سووژەی سیاسیی ئەو کات بوو، خۆشەویستیی خومەینی گەیشتبووە ڕادەیەک کە کۆنەپەرستان بۆیان بڵاوکردبووەوە وێنەی لە مانگدا هەیە و بەکردەوەش بە هەزاران کەس دەیانڕوانییە مانگ، بەڵکو وێنەی خومەینی تێدا ببینن.

ئەم وەزعە بە تایبەتی دوای سەفەری موهەندیس بازرگان و حەسەن نزیە و دوکتۆر سەنجابی و چەند کەسی دیکە بۆ پاریس و چاوپێکەوتن و دانیشتنیان لەگەڵ خومەینی، ئەمریکا و وڵاتانی غەربی ڕازی کردبوو کە خومەینی بگەڕێتەوە تاران و وەک بۆ خۆی گوتبووی لە گۆشەی مزگەوتێک دانیشێ و خەریکی کاروباری ئایینی خۆی بێ.

ڕۆژی ١٢ی ڕێبەندان فەرانسەوییەکان بە تەیارە و ئیسکورتی خۆیان هێنایانەوە فڕۆکەخانەی میهرئاباد. لە مەیدانی ئازادییەوە تا ئاخری شار لە لایەن چەند ملیۆن خەڵکەوە، پێشوازییەکی وای لێکرا کە لە مێژوودا نەبیندرابوو. لەبەر زۆریی خەڵک بە هێلیکۆپتەر بردیان بۆ گۆڕستانی بەهەشتی زەهرا تا سەری گلکۆی شەهیدان بدا.

هەر ئەو پێشـــوازییـــە، هۆیەکی گـــرینگ بوو بۆ لە خـــۆبایی بوون و دامـــەزراندنی دیکتـاتۆرییەتی خومەینی. شاراوە نییە کە خومەینی لە هاندانی جەماوەری ئایینیدا ئەویەڕی تەنسیری هەبوو. بۆیە ئەو لە هاندان نەدەوەستا، هێزەکانی دیکەی خەباتکاریش کە بە هەزاران قوربانییان بۆ ئازادی دابوو، خۆیان ئاشکرا کرد.

هەرچەند هەر کام لەوانیش هەر لە سەرەتای خۆپیشاندانەکاندا بە پێی توانای خۆیان بەشداریی چالاکانەیان کردبوو، بەلام دوای هاتنەوەی خومەینی بە ئاشکرا هاتنە مەیدان.

زۆر جار لە ڕێپێوانەکاندا خۆ بەزل زانی و خۆسەپێنی ئیسلامییە بن ئاژۆیەکان بەرچاو دەکەوت و ئەو چەشنە بۆ چوونەش بۆ زۆر کەس جێی پرسیـار بوو، کە لە دوا ڕۆژدا لەگەڵ ئەوانە چۆن دەژین، بەلام خەڵکەکە ئەوەندە لە ڕێژیم بێـزار بوون کە دەگوترا«هەر شا بڕوا، هەر چی دەبێ، با ببێ»، هیچ کەس لە بیری پێکهێنانی بەرەیەکی پێشکەوتنخوازدا نەبوو. ئەگەر جاروباریش کە ئموونەی زیندوو لەم بابەتەوە هەیە، دڵسۆزێک یا خاوەن ئەزموونێک ئەم مەسەلەی لەگەڵ باس کردبان، بە گمە وەلام دەدرایەوە و هیچ کات جێی نەدەگرت.

سـەرەنجام بۆ ڕزگاری لەم وەزعـە نارۆون و تێکەڵ پێکەڵەی ئەو کـات، ڕۆژی ٢٢ی ڕێبـەندان ڕاپەڕینی گـشـتی و هەڵکوتان بۆ سـەر بنکە و بونیـادەکـانی ڕێژیم لە پێش هەموویانەوە حیزبی ڕەستاخیز، بونیادی پەهلەوی و بەندیخانەی ئەوین دەستی پێکرد.

نابێ لە بیرمان بچێتەوە کە یەکەم دەستەکانی پەلاماردەر بۆ سەر ئەم شوێنانە چریکە فیدائییەکان و موجاهیدینی خەڵک بوون. جەماوەر دوای ئەوان دەستی دایە. بە تایبەتی دوای دەربڕینی پشـــتـیـــوانی لە شـــۆڕش لە لایەن بەشـێکی بەرچاو لە ئەفـرادی هێـزی هەوایـیـەوە، پادگـانەکـانی تاران یەک بە دوای یەکـدا تەسلیـمی مـیـللەت بوون. ئەوەی خۆڕاگریشی کردبا، بە زۆر بە چۆکدا دەهێندرا کە بە خۆشییەوە ڕادەی ئەوانە زۆر کەم بوو.

ڕاپەڕین سەرکەوت، بەلام دەسکەوتەکەی تەنیا لە لایەن ئاخوندە توندڕەوەکانەوە دەستی بەسەردا گیرا. ئەوان زۆر زوو دەستیان بەسـەر هەموو شت داگرت، حکوومەتێکی کاتی بە سـەرۆکـایەتیی موهەندیس بازرگـان پێکهـات تا کـارەکـان بەڕێوەبەرێ. ڕێژیمی پاشـایەتی پێچرایەوە، بەلام ڕوانگەی زۆر ڕوون نەبوو، کەس نەیدەزانی چ شتێک دێتە جێی.

لە ڕۆژی ٢٢ی ڕێبەندان و چەند ڕۆژیش دواتر لە زۆربەی شارەکان پەلامار درایە سەر بنکە و بونیـادە نیـزامی و پادگانەکـان بە تایبـەتی ژاندارمـری و شـارەوانی. بەشـێک لەو چەک وچۆلەی دەست شۆڕشگێران دەکەوت، دەدرا بە خەڵک تا لە جیاتی داردەستەکانی

پێشوو که بۆ دیفاع له خۆیان بەدەستیانەوە بوو، کەڵکی لێ وەرگرن. زۆر زووش لەهەر شارێک له چەند شوێن دەورەی ئامووزشی نیزامی بۆ خەڵک داندرا.

دیارەشەم وەزعە کوردستانیشی گرتەوە، جگه لەوەی له شارەکان شارەوانی و ژاندارمری چەک کران، به تایبەتی له گوندەکانی کوردستانی ناوەندی له ژێر چاوەدێریی هێندێک له بەرپرسانی حیزبی وەک سەید رەسووڵ دیهقان و چەند هاوڕێی دیکەی حیزبی، یا ئەگەر ئەوانیش فریا نەکەوتبان، خەڵک بۆ خۆی پاسگاکانی ژاندارمەیان چەک دەکرد، چەکەکان بۆ وریایی زیاتر و پارێزگاریی دەسکەوتەکانی شۆڕش له گەلێک شوێن دراون به خەڵکی خاوەن هەست.

خەڵک که له رووخانی یەکجاریی رێژیمی شا دڵنیا ببوون، جگه له بینینی دەورەی نیزامی و هەڵگرتنی چەک بیری بەڕێوەبردنی شار و گوندەکانیشیان له رێگەی شوورای خەڵکییەوە بۆ هاته پێش و بەر لەوەش دواتر له لایەن حیزبەوە بۆ هەر کام له کارەکانی کۆمەڵ نوسوولێک دانرا، به شێوەیەک خۆیان وڵاتیان ئیدارە دەکرد، روحی هاوکاری و برایەتیی ئەو سەردەمە جێگەی رەزامەندی و سوپاس بووە.

بەهۆی تێکۆشانی هاوڕێیانی حیزبی له تاران لەبەر وەزعی تایبەتی و ستراتیژیکی کوردستان و ئەخشی بەرچاویان له درێژایی ساڵی ٥٧دا، له رۆژەکانی ئاخری رەشەمەی ١٣٥٧ وەفدێک له لایەن دەوڵەتیی کاتیی بازرگانەوە هاته مەهاباد که داریوش فروهەر و دوکتۆر ئیسماعیلی ئەردەلانیش لەگەڵ بوون. ئەم وەفدە لەگەڵ نوێنەرانی هێزە سیاسییەکان و یەک لەوان دوکتۆر قاسملوو سکرتێری گشتی و نوێنەری حیزبی دیموکرات له ماڵی میرزا رەحیمی خەڕازی دانیشتن و به درێژی قسەیان کرد.

له ئاکامدا ویستی گەلی کورد له حکوومەتی کاتی له ٨ ماددەدا نووسراو پێشکەشیان کرا. حەوت خاڵ لەم خاڵانە زۆر باش بوون، بەڵام خاڵی هەشتەم مەعلووم ئەبوو دوکتۆر قاسملوو بۆ لەم هەلومەرجە ناسکەدا قبووڵی کردووە؟ و بۆ چۆتە ژێر تەفسیری پێشنیار دەرانی ئەم خاڵە؟

ئەم خاڵە که لەسەر قیادەی مووەقەتی پارتی بوو، له ساڵەکانی دواییدا زیانی زۆری به جووڵانەوەی کورد گەیاند.(*)

---

(*) له ماددەی هەشتدا به پێچەوانەی ئوسوولی میوانداری و کوردایەتی له حکوومەت داوا کرابوو قیادە مووەقەت له ئێران ئەمێنێ.

ئەم وتووێژە و ٨ خاڵەکە وەک دواییش دەرکەوت، هیوایەکی ئەوتۆی نەبەخشی و بە تایبەتی حیزبی دیوکراتی دڵنیا نەکرد. ئێستا هەیئەتەکە ئەگەڕابووەوە کە بە پێی گەلاڵەی داڕێژراو و زەحمەتی زۆری جەلیل گادانی و سەرگورد عەبباسی کە لە تارانەوە بە تایبەتی بۆ ئەم مەسەلە هاتبوونەوە، هەروەها لە ژێر چاوەدێریی دوکتۆر قاسملوودا، بە فیداکاریی چەند ئەفسەر و دەرەجەداری کورد و نیشتمانپەروەر، سەرهەنگ ئیرەج قادری، کاک حامید گەوهەری، سەروان ئەفشین، سەروان جاویدفەر(هەژار) کاک سەلاح فازلی لە رۆژی ٣٠ی رەشەمە پادگانی مەهاباد بێ خوێن رێژی[*] لە لایەن حیزبەوە دەستی بەسەردا گیرا و سەرگورد عەبباسی بۆ ماوەیەکی کورت کرا بە فەرماندەی پادگان.

حیزب هەر ئەو کات رایگەیاند کە مەبەستی لەم کارە دژایەتی لەگەڵ حکوومەتی کاتی و خومەینی نییە، پێویستی بە چەک و چۆل بۆ خەڵک و ئامادە کردنیان بۆ دیفاع لە شۆڕشە. دەتوانن بەرپرسێکی دیکە دابنێن. بە شێوەیەکی زۆر ئاسایی موشکیلەکە حەل بوو، بە پەیام لە تاران را دوکتۆر ئیسماعیل ئەردەلان کە هەم کورد بوو، هەم ئەندامی هەیئەتی وتووێژ بوو، بۆ ماوەیەک وەک سەرپەرستی پادگان دیاری کرا و دوایەش فەرماندەیەکی کوردی دیکەیان نارد، بەڵام لەم ماوەدا دەسەڵات و پاراستنی پادگان زیاتر بە دەست حیزبەوە بوو، چونکە هەر رۆژی هەوەڵ سەربازەکان بۆ شارەکانی خۆیان بەڕێ کرانەوە. ئەفسەرەکانیش کە لە پێشدا هەموو گیرابوون، دوای چەند رۆژ ئازاد کران و بۆ شارەکانی خۆیان بەڕێ کرانەوە.

ئەم کارە تا رادەیەک حکوومەتی سەبارەت بە حیزب رەش بینتر کرد، بە پێچەوانە لەسەر خەڵک تەئسیری زۆر باشی هەبوو، بە تایبەتی کە بەشێک لە چەکەکان لە نێو خەڵکدا بلاوکرانەوە و سەد تفەنگێکیش بۆ پاراستنی ئەزمی نێو شار درا بە شووورای شار. ئەیارانی حیزب زۆریان هەوڵدا کەڵکی خراپ لەم کارە وەربگرن، بەڵام تەئسیرێکی گرینگی لەسەر زەینی خەڵک دانەنا.

هەتا گرتنی پادگانی مەهابادیش حیزب هەر بە نیوە نهێنی کاری دەکرد و لە زۆر شوێن بە ئاشکرایی نەدەهاتە مەیدان، بەڵام لەوە زیاتر مانەوەی بەم شێوە رەوا نەبوو، دەبوو خۆی ئاشکرا بکا و بەم پێیەش قەوارەی حیزب بەرینتر کاتەوە، بە تایبەتی هەتا

(*) تەنیا سەرتیپ پزشک پوور لە لایەن سەربازێکی بروجردی بە سووکی برینداز ببوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش بەداریوش فرووهەردا کە ئاوڵ زاواشی بووە، بەڕێ کراوە بۆ تاران.

ئەو کاتیش حیزبێکی دیکەی ناسراو نەبوو، ئەوانەی کە دوایەش بوونە کۆمەڵە، لەو کاتدا لەهەر شار و ناوچەیەک ناوێکیان هەبوو.

بەرپرسایەتی گرینگ و مێژوویی کە لە کوردستان و لەو هەلومەرجەدا بە تایبەتی کەوتبووە سەرشانی حیزب، پێویستی ئاشکرابوونی حیزبی زیاتر کرد. بۆ ئەم مەبەستە بڕیار درا میتینگێک پێک بێ، پێشتر هاوڕێیانی حیزبی لە کۆمیتەی شارستانەکان هەر لە تاران و کرماشانەوە هەتا ماکۆ ئاگادار کرابوون، بۆ مەراسیمەکە نوێنەر بنێرن.

ڕۆژی ١١ی ڕەشەمەی ١٣٥٧ لە میتینگێکی بەرینی سەد هەزار کەسی لە ستادیۆمی وەرزشیی مەهاباد بە ڕێ و ڕەسمێکی پڕ شکۆ و پێشکەش کردنی وتارێک لە لایەن سکرتێری گشتی حیزب دوکتور قاسملوو ئاشکرابوونی حیزب ڕاگەیەندرا و لەو کاتەوە، لە شار و ناوچەکان بە ئاشکرا دەفتەری حیزب کرایەوە. هەزاران کەس بۆ هاتنە نێو ڕیزی حیزب خۆیان ناونووس کرد.

جێگەی وەبیر هێنانەوەیە کە دوکتور قاسملوو بۆ بەشێکی زۆری خەڵکی کوردستان غەریب و نەناسراو بوو، بەڵام لە پێش قسەکردنەکەی دوکتور لە لایەن جەلیل گادانی کە لە تاران ەوە بۆ بەشداری لە میتینگ هاتبووەوە و بەڕێوەبەری ئەم میتینگەش بوو، دوکتور قاسملووی بە جەماوەر ناساند.

بەداخەوە زوو دەرکەوت کە گوێی بەرپرسانی حکوومەتی کاتی و خومەینی لە بارەی کوردستان و مافی گەلان هەروەک گوێی شا و داروودەستەکەی کپ و کەڕە. تێکۆشانی ٣٣ ساڵەی پێشوو، هەوڵدانی بەرچاوی دەوری شۆڕش لە لایەن خەڵکی کوردستان و هاوکاریی حیزب لەم ماوەدا بۆ بردنە پێشی کارەکان لە لایەن ئاخوندەکانەوە هیچ بایەخی بۆ دانەندرا، داخوازە هەشت ماددەییەکەش بە تەواوی پشت گوێ خرا و لە بیر خۆیان بردەوە.

بەوەش ڕانەوەستان، لە نەورۆزی ٥٨دا شەڕێکی نەخوازراوی چەند ڕۆژە بەسەر شاری سنەدا سەپا کە بە دەیان کەسی تێدا کوژرا، حیزبی ئێمە بەو پەڕی لە خۆبوردووییەوە بۆ تەواو کردنی ئەم شەڕە لە کوردستان و تاران هەوڵی دا. لە مانگی بانەمەڕی هەر ئەو ساڵەدا بۆ پێشگری لە میتینگی حیزبی دێموکرات شەڕێکی خوێناوییان لە نەغەدە ساز کرد کە سەدان کەس لە کورد و عەجەمی ئەم شارە و شارەکانی دی کە بۆ بەشداریی میتینگ چووبوون، بوونە قوربانیی ئامانجی پیسی کۆنەپەرستان و کۆنە ساواکییەکان.

بەوەش قەناعەتیان نەکرد، پیلانگێڕی هەر درێژەی هەبوو. هیچ کام لەم ڕووداوە

دڵتەزێنانە نەتەنیا حیزبی نەشڵەژاند، بەڵکو هەستکردن بە بەرپرسایەتیی بەرپرسانی حیزبی زیاتر کرد. حیزب باشی دەزانی کە ساواکییەکانی پێشوو و کۆنەپەرستانی خاوەن دەسەڵات لە شوێنە جۆراوجۆرەکان چۆن لە دەوری یەک هاڵاون و زۆرجاریش بۆچوونی خۆی بە وتە و نووسراوە رادەگەیاند، بەڵام قەتی گوێ نەدرایە سەرەڕای ئەوەش کارەکانی خۆی هەر درێژە دا.

خومەینی و داروەدەستەکەی مەبەستیان لەم شەڕانە لاوازکردنی هەستی نەتەوایەتیی خەڵک و زەق کردنەوەی ناتەباییەکانی مەزهەبیی نێوان سوننی و شیعەکان بوو تا بتوانن سوودی دڵخوازی لێ وەرگرن.

هەر لەم پێناوەدا خومەینی ویستی بە زووترین کات، کۆماری ئیسلامی بەسەر خەڵکدا بسەپێنێ و مەوقعییەتی خۆی لەم چوارچێوەدا وەک ئیمام قایمتر بکا. بۆیە قەراری دا رۆژی ١٢ی خاکە لێوە بە ریفراندۆم و وەرگرتنی دەنگی «ئاریێ و نا» بێ ئەوەی هیچ کەس بزانێ نێوەرۆکی کۆماری ئیسلامی چییە و یاسایەکی بۆ داندراێ، چاوی خەڵک ببەستێ و دەنگی خەڵک لەگەڵ رای خۆی بخا.

حیزبی ئێمە بە هەستی بەرپرسایەتییەوە رۆژێک بەر لە بەڕێوەچوونی ریفراندۆم هەیئەتێکی پایە بەرزی بە سەرۆکایەتی دوکتور قاسملوو و ئەندامەتیی غەنی بلووریان، ئەمیر قازی، محەمەد ئەمین سیراجی، سەنار مامەدی، ئەبی قادری، دوکتور سادق شەرەفکەندی، عەلی کەریمی و جەلیل گادانی ناردە قوم و چاویان بە خومەینی کەوت. لەگەڵ دەربڕینی پشتیوانی لە شۆڕشی گەلان لەسەر بنەمای قسەکانی ایت الله تاڵەقانی کە لە سنە گوتبووی:« خودموختاری مافی بێ ئەم لا ئەو لای خۆتانە» پێشنیاری پێ کرا ئەویش تەنیبدی ئەو هەڵوێستە بکا و رای بگەیەنێ تا گەلی کورد لە دابین بوونی ئەم مافە رەوایە دڵنیا بێ و بەم دڵخۆشییەوە دەنگ بە کۆماری ئیسلامی بدا. بەڵام هەر هێنای و بردی ناخرییەکەش وشەیەکی لەم بابەتە بەدەمدا نەهاتووە و وەڵامەکەی «همه باید مسلم باشند» بووە و هیچی دی.

دووجاری دیش دوای شەڕی نەغەدە لە جۆزەردانی ٥٨ وەفدێکی دی بەسەرۆکایەتی دوکتور قاسملوو بۆ تەوزیح لەسەر شەڕەکە، جاری سێهەم جەلیل گادانی لەگەڵ جووتیارانی ناوچەکان چوونە لای خومەینی، بەڵام فکری خومەینی قابیلی گۆڕان نەبوو.

وەفدی یەکەم گەڕاوە تاران و لە ماڵی جەلیل گادانی کۆبوونەوەیەکی درێژی چەند

سەعاتەی کرد، بە خۆشییەوە لەگەڵ ئەوەی چەند کەس موافقی دەنگدان بە کۆماری ئیسلامی بوون، زۆربەی هاوڕێیان موخالیف بوون، هەر شەو بەیانییەیەک نووسراو بە تەلیفون بە کۆمیتەی شارستانەکان ڕاگەیەندرا کە حیزب بەهۆی ئاگادار نەبوون لە نێوەڕۆکی کۆماری ئیسلامی دەنگ نادا و تەحریمی دەکا.

بێ گومان ئەو هەڵوێستەی حیزب خومەینی و ڕێژیمەکەی تا ڕادەیەک لە حیزب دڵێش کرد، بەڵام وەک بڕیارێکی بەرپرسانە و شۆڕشگێڕانە و نیشانەیەک لە تەسلیم نەبوونی کوێرانە لە بەرامبەر نەزەری خومەینی و باقی ناخوێندەکاندا بۆ مێژوو دەمێنێتەوە. ڕاستیی ئەو بڕیار و بۆچوونەش لە شازدە(*) ساڵی ڕابردوودا بە تەواوی دەرکەوتووە و بۆ دنیا ڕوونە.

هەر ئەو وەفدە بە دوای چاوپێکەوتنی خومەینیدا، لەگەڵ موهەندیس مەهدی بازرگان سەرۆک وەزیری کاتیش چاوپێکەوتنی هەبووە، بەڵام ئەویش شتێکی وای نەگوتووە کە بۆنی بەرچاوخستنی مافی گەلانی ئێران و یەک لەوان گەلی کوردی لێ بێ.

کە ڕیفراندۆم کرا و خەڵکی چارەڕەشی ئێران دەنگیان بە کۆماری ئیسلامیدا خومەینی مەسەلەی مەجلیسی خوبرەگانی هێنایە گۆڕێ تا لەسەر دانانی قانوونی ئەساسی و زۆر مەسەلەی دی بدوێن. لەم بوارەشدا حیزب بە پێچەوانەی چاوەڕوانیی دەوڵەتی کاتی، سکرتێری حیزب دوکتور قاسملووی لە کوردستان کاندید کرد، کە بە خۆشییەوە بە دەنگی زۆر باش دەرچوو.

دیار بوو خومەینی کینەی لە کورد لە دڵە ڕەشەکەی دایە و نایهەوێ بیانبینێ. لە سەر ئەو نیگەرانییەش بوو کە دوکتور قاسملوو کاتی کۆبوونەوەی نوێنەرانی هەڵبژێردراو نەچووە خزمەت ئیمام! لەوێ خومەینی دەپرسێ ئەدی کوا دوکتۆر قاسملوو، لە وەڵامدا دەڵێن نەهاتووە، وە دەنگ دێ و بە غەرەزەوە دەڵێ«بریا هاتبا!»

جا چ حوکمێکی بۆ دابوو، مەعلووم نییە، زۆر وێدەچێ حوکمی تیرۆری هەر ئەودەم درابێ.

حیزبە پێشکەوتنخوازەکان و ئەو ڕێکخراوانەی بۆ مافی گەلەکانیان تێدەکۆشان، کاتێک دیتیان کۆماری ئیسلامی سەپێندرا، بە ئیبتکاری کۆمەڵەی حقوق زانانی ئێران هەوڵیاندا کۆنفرانسێکی بەرین لە زانستگەی تاران پێک بێنن لە ژێر سەردێڕی «ویستی خەڵکی ئێران لە قانوونی ئەساسی» بۆ ئەوەی چوارچێوەیەک دیاری کرێ و بەم زووانە

(*) دیارە ئێستا ئەوە ١٧ ساڵ بەسەر ئەو بڕیارە تێدەپەڕێ و زیاتر جێگەی فەخرە.

دیوکراسییەت بە تەواوی پێشێل نەکرێ و مافی گەلان بەرچاو بگیرێ. ئەم کۆنفرانسە کە لە ڕێکەوتی ٥٨/٣/٢٩ تا ٥٨/٤/٦ی خایاند، ٤٨ دەستە و حیزب و ڕێکخراوی تێدا بەشدار بوون. لەو ماوەدا ٦٥ کەس لەسەر مەسەلەکانی قانوونی ئەساسی قسەیان کرد کە هی ٤٢ دەستەی بەشدار بوو. جەلیل گادانی و ئەسعەد ئێران زادە لەم کۆنفرانسەدا وەک نوێنەری حیزب بەشداربوون و وتارەکەیان لە لایەن بەشداران پێشوازییەکی گەرمی لێکرا. لەو کۆنفرانسەدا پێشنیاری زۆر باش کران کە بە تەواوی لایەنگری ئازادی و دیوکراسی و وەبەرچاو گرتنی مافی مرۆڤ بە شێوەی تاکە کەسی و کۆمەڵ بوو، کە بەداخەوە هیچ یەک لەم هەموو قسە جوان و مەنتقی و قانوونییە بەرچاو نەگیران. دیکتاتۆری کە بە هەموو شێوەکانییەوە لەم کۆنفرانسەدا دوای باس لەسەر کردنی دووروودرێژ مەحکووم کرابوو جێگەی هەموو شتی بە ناوی ویلایەتی«فقیە» لە قانوونی ئەساسیی داسەپاودا گرتەوە.

هەر بە دوای ئەوەدا کانوونی گەلان وەک ئۆرگانێکی تێکۆشەر بە هاوکاریی بێ دریخی دوکتۆر هدایت الله مەتین دەفتەری لە دەفتەری وەکالەتی ئەو پێکهاتبوو، لە جەلەسەکانی دواییدا قەرار درا کۆبوونەوەیەکی بەرینی کانوونی دیوکراتیکی گەلان لە ١٥ی خەرمانان لە شاری مەهاباد بگیرێ. کۆنفرانسی «ویستی گەلان لە قانوونی ئەساسی» و هەروەها بڕیاری پێکهاتنی کانوونی دیوکراتیکی گەلان، بە تایبەتی دیاری کردنی کۆبوونەوەی دووهەم لە کوردستان و هەڵسووڕان و تێکۆشانی ڕۆشنبیران و ئەحزابی پێشکەوتنخواز، خومەینی کە بەهەموو هێزییەوە خەریکی سەپاندنی ویلایەتی «فقیە» بوو، تەواو تووڕە کردبوو. بەم هۆیانە و نیگەرانی زۆری ئەو لەشکڵ گرتنی کاری دیوکراتیک و ترس لە یەکگرتوویی داهاتووی حیزب و ڕێکخراوە پێشکەوتنخوازەکان ئەوی هێنایە سەر ئەو باوەڕە کە هەرچی زووتر سەرکوت و خەفەقان دەست پێ بکا.

بۆیە لە ڕۆژەکانی ٢٢و ٢٣ی گەلاوێژ، هێزی ڕەش و کۆنەپەرست ڕژانە شەقامەکانی تاران بە تایبەت لە شەقامی شاهرەزا-ی جاران و ئازادیی دوایە، هەرچی کتێبخانە بوو، بەستیان هەموو خوانچەی کتێب و ڕۆژنامە فرۆشانیان ئاور تێ بەردا، دەفتەری حیزبەکانی توودە و چریکیان داگیر کرد، هێرشیان کردە سەر موجاهیدەکانیش، ئەوان بە پشتیوانیی ایت الله تاڵەقانی و خۆڕاگریی خۆیان لەم هێرشە ڕزگار بوون. پاسدارەکانی بە ڕواڵەت شۆڕش دەرگای زانستگەیان گاڵەدا و جەوێکی ناسالم و کۆنەپەرستانە بەسەر تاراندا زاڵ بوو!.

رۆژی ٢٥ی گەلاوێژ لە کۆشکی لاوان لە مەهاباد بە بۆنەی ٣٤مین ساڵرۆژی دامەزرانی حیزب بۆ یەکەم جار بە ئاشکرا جێژن گیرا، رێ و رەسمێکی بە شکۆ بوو، چەند کەس قسەیان کرد، جەلیل گادانی کە بە نوێنەرایەتیی رێکخراوی حیزب لە تاران هاتبووەوە، لە نێو قسەی خۆیدا گوتی: « ئەوەی من لەو چەند رۆژەدا لە تاران دیومە بە مانای راستی خۆی کۆنەپەرستی رەشی ماڵ وێرانکەرە، لە کردەوەکانی شاش توندترن» و ئەوەی دیتبووی باسی کرد. ناوبراو هەروەها گوتی: « حیزب دەبێ ئامادەی دیفاع بێ، پێویستە بە پێی توانا جەماوەر چەکدار بکا. ئەگەر ئەو کارە نەکا، لە کوردستانیش خەڵک دەهارن، هەروەک جووڵانەوەی تورکمەن سەحرای کوتا، گەلی کوردیش دەکوتێ.

لانی کەم تا ئەو سەعاتیش حیزب ئاگادار نەبوو کە رۆژی پێشتر بە دەسیسەی کۆنەپەرستانی رێژیم ساواکییەکان و هێندێک گومان لێکراوی سەر بە عێراق لە پاوە شەڕێکی خوێناوییان سازکردووە. لەم شەڕەدا کە نزیکەی حەوتوویەکی کێشا، هەم لە خەڵک و هەم لە هێزەکانی دەوڵەتی ژمارەیەکی زۆر کوژران و بریندار بوون.

خەڵکی ناوچە لە گوندی قۆری قەڵا نزیک پاوە تەحەسونیان کردبوو، بەڵام نەتەنیا گوێی نەدرایە، بەڵکو دوکتور چەمرانیش کە ئەو کات موشاوری سەرۆک وەزیران بوو، بە دڕندانەترین شێوە و بە نیمکاناتی ئەرتەشی شاوە هێرشی کردنە سەر. هێزی هەوایی و کۆماندۆشیان بۆ گیانی کورد وەگەڕ خستبوو.

لەم شەڕەدا فڕۆکەیەک و هێلی کۆپتەرێکیش خرانە خوارەوە. خومەینی کە تووڕەییەکەی بەوپەڕی خۆی گەیشتبوو، رۆژی ٢٨ی گەلاوێژی ١٣٥٨ فەرمانی جیهادی دژی کوردان داو حیزبی دێموکراتیشی هەڵوەشاوە راگەیاند و جارێکی دی کوودیتای ٢٨ی گەلاوێژی ساڵی ٣٢ی شا بیری خەڵک کەوتەوە.

هێزێکی زۆری دیکە لە چەند لاوە بەرەو هەورامان بۆ دوکتور چەمران نێردرا. ناوبراویش کە ساڵەکانی پێشتر دەورەی چریکی لە چەند شوێن دیبوو، دەستی کرد بە هێرشێکی سەخت و پان و بەرین، هەر کە کاری پاوەی تەواو کرد، بەرەو نەوسوود و مەریوان، سەقز و بانە وەرێ کەوت و لە هەموو ئەو شوێنانە دەستی بە کوشت و بڕ کرد.

لەم شەڕانەدا بۆ ئەوەی خەڵکی ساویلکەی شوێنەکانی دیکەی ئێران فریو دەن و بیانکەنە خۆراکی شەڕ، بە بێ شەرمیی تەواوەوە تەنانەت لە رادیۆکانیشیانەوە هاواریان دەکرد، شاپەرستەکان و بە تایبەت ئیسرائیلییەکان یارمەتیی کوردان دەدەن.

لەم پێوەندییەدا نامەیەکی سەرناوەڵە لەلایەن کۆمیتەی ناوەندیی حیزبەوە لە ڕێکەوتی ٢٨/ ٥/ ١٣٥٨ بۆ کۆڕ و کۆمەڵانی بەشەردۆست و ئازادیخوازی جیهان نووسراوە کە ئەوەش دەقی وەرگێراوەکەیەتی لە فارسییەوە:

نامەی سەرناوەڵە بۆ:

ئاغای یاسر عەرەفات، ڕێبەری ڕێکخراوی ڕزگاریدەری فەلەستین.

ئاغای موعەممەر قەزافی، سەرۆک جەماهیری عەرەبی لیبی.

حەرزەتی پاپ، ڕێبەری کاتولیکەکانی جیهان.

جەنابی ئاغای برێژنێف، «سەدری هەیئەت رەئیسەی شووڕای بەرزی یەکیەتی سۆڤیەت

جەنابی ئاغای ژیسکار دیستەن، سەرۆک کۆماری فەرانسە

جەنابی ئاغای جوزف تیتۆ، سەرۆک کۆماری یوگوسلاوی

جەنابی ئاغای فیدل کاسترۆ، سەرۆک وەزیرانی کووبا

جەنابی ئاغای عەبدولفتاح ئیسماعیل، سەرۆک کۆماری دیموکراتی یەمەن

ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان

فیدراسیۆنی سەندیکای جیهانیی کرێکاران

ئەنتێر ناسیۆنالی دووهەم

ڕێکخراوی نێونەتەوەیی «حقوق دانانی» دیموکرات

خاچی سووری نێونەتەوەیی

ئامنیستی ئەنترناسیونال

یونسکو

حیزبی کۆمۆنیستی فەرانسە

حیزبی کۆمۆنیستی ئیتالیا

حیزبی سۆسیالیستی سوئید

حیزب سۆسیالیستی فەرانسە

حیزبی سۆسیالیستی نۆرویژ

سەرۆک کۆماری فنلاند

«دەگەڵ ڕێز!

بە سەرنجدان بەو وەزعە ئاڵۆزەی کە ئێستا لە کوردستانی ئێران پێکهاتووە، بە

پێویستمان زانی رەوتی رووداوەکانتان بە ئاگاداری بگەیەنین.
ئێمە لەسەر ئەو بڕوایەین کە روون کردنەوەی بیروڕای گشتیی جیهان پێویستییەکی مێژووییە و بۆ حەللی گیروگرفتەکانی ئەو ناوچەیە زۆر بە کەڵک دەبێ. ئاگادارن کە گەلی کورد شان بەشانی هەموو گەلانی ئێران لە سەرەتای جوولانەوەی خەڵکی ئێران بەرامبەر شای دیکتاتۆر، هەنگاوی ناوەتە مەیدانی خەباتەوە و لەو رێگایەدا لە بەخشینی گیان و ماڵ و خوێن و فیداکاریی رۆڵەکانی خۆی نەپاراستووە. لەبەر ئەوەی گەلی کورد هیوادار بوو بە رووخاندنی رێژیی دیکتاتۆر، بە مافەکانی رەوای نیشتمانی و مرۆڤایەتیی خۆی بگا. دوای رووخانی دیکتاتۆریی بنەماڵەی پەهلەوی، گەلی ئێمە بە هیوادارییەکی زۆر ویستەکانی نیشتمانیی خۆی سەبارەت بە خودموختاری لە چوارچێوەی ئێرانی یەکگرتوو و یەکپارچەدا لەگەڵ رێبەری شۆڕش ئیمام خومەینی و دەوڵەتی کاتیی کۆماری ئیسلامی باس کرد. ئێمە ئەوجار بۆ حەللی مەسەلەی کورد رێگا حەللی سیاسیمان هەڵبژارد و رێگای ئیزامیمان وەلانا کە شێوەی کۆنی خەباتی خەڵکی کوردستانە بۆ وەدەست هێنانی مافە نیشتمانییەکانی. کارو بارەکان بە دانی بەڵێنی دڵخۆشکەر تێپەڕ بوو. دەوڵەتی کاتی بە بەهانەی کاتی بوونی خۆی هەنگاوێکی جیددی هەڵ نەگرت و رێبەری شۆڕش بەڵێنی دا کە لە بڕیارنامەی یاسای بنەڕەتی بە مافی گەلانی غەیرە فارسی ئێران رابگا. لەو ماوەیەدا بۆ هێنانە ژێر سێبەری گیروگرفتی بنەڕەتی و خافڵاندنی بیروڕای گشتیی ئێران، بە مەسەلەکانی لاوەکی پیلانێکی زۆر پێکهات. لە سنە، نەغەدە، تورکمەن سەحرا(گونبەد کاوس) خورڕەم شار، مەریوان و جێگاکانی تر هێندێک پیلان بەڕێوە چوو کە بوو بەهۆی کوژرانی هەزاران کەس لە خەڵکی گەلانی زەجر دیتووی کورد و تورکمەن و عەرەب و بەلووچ.
رێبەریی شۆڕش و دەوڵەت بە قایم کردنی جێگای خۆیان وردە وردە ئازادییە دیموکراتییەکانیان بەرتەسک کرد و دەستیان کرد بە سەرکوتی گەلانی ئێران. لە خووزستان خەڵکێکی کە بۆ وەدەست هێنانی مافی رەوای خۆیان راست ببوونەوە، تیرباران کرد، تورکمەنەکانیان سەرکوت کرد و ئێستا هەر ئەو نەقشانە بە هێزێکی هەرچی زیاتر و بە پڕچەک کردنی هەموو هێزەکانی ئەرتەش و ژاندارمەری و پاسداران لە کوردستان بەڕێوەی دەبەن. ئێستا لە کوردستاندا شەڕێکی تەواو عەیار بە کەڵک وەرگرتن لە هێزی ئاسمانیی مودێرن، هێزی زەوی و تانک و تۆپخانە دەستی پێکردووە.

خولاسەی کەلام دیموکراسی جارێکی دیکەش لە ئێران سەرکوت کرا. راگەیەنە گشتییەکان بە توندی سانسۆر لەسەریان بەڕێوە دەچێ. قەڵەمەکان شکاون، یاسای بنەڕەتیی داسەپاو هیچ کام لە مافەکانی گەلانی وەخۆ نەگرتووە. سازمانە دیموکراتییەکان کەوتوونەتە بەر پەلاماری تاقمە دەمارگرژەکان و رووناکبیران و پیاوان و شێرە ژنان کەوتوونەتە ژێر جەزرەبە و ئازارەوە. دۆزینی بیروڕا دەستی پێکردووە. ئیمام خومەینی فەرمانی شکاندنی قەڵەم و سووتانی کتێبەکان و چاپەمەنییە دیموکراتییەکان لە رێگای راگەیەنە گشتییەکان هەموو رۆژێ دووپات دەکاتەوەو وردە وردە دیکتاتۆریی ڕەشی مەزهەبی بە شێوەی سەدەکانی ناوەندی لە ئێران دا بڵاو دەبێتەوە.

لە حاڵی حازردا بەرنامەی دەوڵەت و رێبەرایەتیی ئیمام خومەینی بۆ کوردستان کە بە سەنگەری ئازادی و دیموکراسیی ئێران ناوبانگی دەرکردووە، سەرکوتی هەموو هێزە سیاسییەکان و دووپات کردنەوەی بەرنامەکانی محەممەد رەزا شا و بابیەتی بە توند وتیژییەکی زیاترەوە. ئیمام لە راستیدا بەرامبەر بە هەموو میللەتی کورد جیهادی راگەیاندووە. هاواری دەمارگرژییەکانی شیعە بۆ قەتڵ و عامی گەلی کورد لە رادیۆ و تلویزیۆنەوە بەرزە. خراپترین بوختان، بۆ رێبەرانی مەزهەبی و سیاسیی ئێمە بە ڕەوا دەزانێ. روونە کە ئەو چارەنووسە هی تەواوی گەلانی غەیری فارسی ئێرانە کە بەهۆی ناسیونالیزمی بەرچاوتەنگانەی قەومی سەردەستی فارس، ئەوجار لە دەرپیچەی دەمارگرژیی مەزهەبییەوە بەڕێوە دەچێ. ئەوەی ئەورۆ لە کوردستان روودەدا، بەرنامەیەکی رێکوپێکە بۆ لە نێوبردنی گەلی کورد، هەر ئەو بەرنامەیە لە بەشەکانی تری ئێران کە میللەتی ژێر دەستی دیکەی تێدا دەژی، دوای کوردستان بەڕێوە دەچێ.

پڕوپاگەندەیەکی بەربڵاو لە نێو ئەرتەشیان و موجاهید و پاسداران بۆ بە کافر ژماردنی گەلی کورد دەکرێ. لە ئیمام دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی کوردستان لە پێشەوەی شەیتان و کافرەکاندایە، وەختێک ئیمام خومەینی فەرمانێکی ئەوتۆ دەردەکا پێتان وا نییە کە موجاهید یا سەرباز یا پاسداری ناردراو نابێتە هەمان سەربازی مەغول«ئاتیلا یا ئیس ئیسەکانی ئاڵمان» بەڵێ لە حاڵی حازردا مەسەلەی لە نێو بردنی یەکپارچەیی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران دا بۆتە ئامانجی دامودەزگای کۆماری ئیسلامیی ئێران.

ئێمە لە ئێوە و بیرورای گشتی و هەموو ئەو کەسانەی ئیمانیان بە ئازادی و دیموکراسی هەیە، داوا دەکەین کە لە هەموو هێزی خۆتان بۆ پێشگیری لەو چارەنووسە

شوومەی کە چاوەڕوانی گەلانی کورد، بەلووچ، عەرەب و تورکمەن و ئازەربایجانییە، دەنگی ڕەخنەی خۆتان بەرز کەن و مەهێڵن سیاسەتی زەوی سووتان و لە نێوچوونی بەکۆمەڵی ئەو گەلانە دووپات بێتەوە.

گەلی کورد بۆ وەدەست هێنانی مافی ئینسانی و ڕەوای خۆی خەبات دەکا و لەو ڕێگایەدا تووشی هیچ شک و گومانێک نابێ. ئێمە هەمیشە گوتوومانە بۆ جاری ئاخر دووپاتی دەکەینەوە کە ئامانجی ئێمە لەت کردنی ئێران نییە، ئێمە ئێرانین و ماف و دەسەڵاتی خۆمان لە چوارچێوەی ئێرانێکی یەکپارچە و دێموکراتیدا دەوێ. تۆمەت لێدانی جیاوازی خوازی و بوختانی کافر بوون، ئامرازی کۆنەپەرستیی ڕەش و مەزهەبییە کە بۆ حەشاردانی ڕاستییەکان بەکار دەهێنرێ. هاوکاریی گەلی کورد بکەن بە یارمەتیی ماددی و مەعنەویی خۆتان و بە دەنگی ڕەخنە و لە ژێر فشارنانی دام و دەزگای ڕێبەری و دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی پێشگیری لە نێوبردنی گەلی کورد و قەتڵ و عامی ژنان و منداڵان و بە ساڵداچووانی ئەو وڵاتە بکەن.

**کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی**
**کوردستانی ئێران**
**٢٨ی گەلاوێژی ١٣٥٨**

هەرچەند هێزی پێشمەرگە کەم بوو هێشتا بە باشی نەعاملا بوو و بەرنامەی شەڕ لەگەڵ ڕێژیم هەر لە گۆڕێدا نەبوو، بەڵام کە هێرشیان کراوەتە سەر، لە زۆر شوێن قارەمانانە شەڕیان کردووە. لە دووناوی سەقز، بەرەی ورمێ- مەهاباد، میاندواومەهاباد، بە باشی بەرگری لە بەرامبەر هێرشەکانی دوژمندا کرا. گەلێک ڕۆژ بۆ پارێزگاریی دەوری مەهاباد لە تۆپخانە و تانکیش کە پێشتر لە پادگانی مەهاباد گیرابوون، کەڵک وەردەگیرا.

ڕێژیم لە دوازدەی خەرماناندا هێرشێکی بەرینی هەوایی و زەمینی کردە سەر مەهاباد. ڕێبەرایەتیی حیزب زۆر پێشتر بڕیاری دابوو کە لە شارەکاندا شەڕ نەکەن، هەربۆیە هێزی پێشمەرگە لە نێو شارەکاندا نەمابوو. بە هاتنی ئەرتەش بۆ نزیک شاری مەهاباد بە هەزاران کەس شاریان بەجێهێشت و چوونە گوندەکانی دەوروبەر.

لێرەدا شەڕێکی دی بە ناوی شەڕی سێ مانگە دەست پێدەکا.

خومەینی بە دانی حوکمی جیهاد و لەشکرکێشی بۆ کوردستان چوار نامانجی ناشکرای هەبوو کە پێی گەیشت:

١- سەپاندنی شەڕ بەسەر کورد و حیزبی دیموکرات وەک ناوەندی هەرە گرینگی دیموکراسی و نەو حیزبە وەک پارێزەری دیموکراسی و دیفاع لە مافی ڕەوای گەلانی نیران.

٢- توند کردنی ناتەبایی نێوان شیعەکان و کوردان وەک سوننی، ناساندنی نەوان بە کافر، چونکە جیهاد لە ڕوانگەی نایینی نیسلامەوە تەنیا لە بەرامبەر کافری هێرشکەردا جایزە.

٣- هەڵوەشاوە ڕاگەیاندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان، بۆ نەوەی نەتوانێ لەوە زیاتر خەڵک هان بدا و ڕێکیان بخا و، لەسەر پەرەپێدانی باری دیموکراسییەت هەوڵ بدا کە بێ گومان لەسەر بەشەکانی دیکەی نیرانیش تەنسیری بەرچاوی دەبوو.

٤- هەر بەم هۆیەی سەردوە پێشی بەستنی کۆنفرانسی گەلانی نێرانیشی گرت کە قەرار بوو لە ١٥ی مانگی خەرمانان لە مەهاباد بەڕێوە بچێ و وێ دەچوو بڕیاری زۆر گرینگیشی تێدا بدرێ.

بە پێویست دەزانین بەر لەوەی بچینە سەر شەڕی سێ مانگە، زۆر بە کورتی کارنامەی کاری نەو چەند مانگەی حیزب لە چەند خاڵدا بخەینە بەرچاو:

**الف- لە بواری حیزبیدا:**

١- دامەزراندنەوەی تۆرگانەکانی حیزبی بە شێوەی نهێنی لە شارەکان و ناوچەکانی جۆراوجۆر.

٢- ڕاکێشانی سەرنجی خەڵکی کوردستان بۆ لای حیزب بە شێوەکانی گونجاو و یەک لەوان وەڕێ خستنی میتینگ لە شار و دێ لە لایەن کادرە ناسراو وخۆش ناوەکانی حیزب و باس کردن لەسەر وەزعی گشتی، سیاسەت و بەرنامەی حیزب.

٣- بەشداری چالاکانەی کادر و نەندامانی حیزب لە خۆپیشاندانەکانی شارەکانی کوردستان، تاران و ورمێ، تا ڕووخانی ڕێژیم. بەدەستەوە گرتنی نیبتکاری نەم بەشە گرینگە لە خەبات لە زۆربەی شوێنەکان.

٤- ناشکرا کردنی تێکۆشانی حیزب لە میتینگی بەرین و کەم وێنەی وەرزشگای مەهاباد.

٥- ئاشکرا کردنی ئۆرگانەکانی حیزبی لە شارەکان و کردنەوەی دەفتەر لە زۆربەیان.
٦- هەوڵدانێکی سەرەتایی بۆ ئامووزشی سیاسی.
٧- هەڵبژاردنی چەند موشاوری وەک دوکتۆر سادق شەرەفکندی، جەلیل گادانی و... بە مەبەستی بە هێز کردنی رێبەری بۆ پێڕاگەیشتنی باشتری کارەکان.

**ب- لە بواری کۆمەڵایەتیدا:**

١- بە تەفاهوم و مودارا بەڕێوەچوون لەگەڵ باقی لایەن و دەستەکان و کەسایەتییەکان، لەو فەترەیەدا بۆ راگرتنی روحی هاوکاری و برایەتی کەهۆیەکی گرینگی چوونە پێشی کارەکان و سەرکەوتن لە بەرنامەکاندا بوو.
٢- هەوڵدان و هاوکاریی پێویست بۆ دامەزراندنی شوورا لە شارەکان بە شێوەیەکی دێموکراتیک، هەروەها بەهێزکردنی ئۆرگانە سینفییە دێموکراتیکەکان.
٣- دامەزراندنی کۆمەڵی کوردانی دانیشتووی تاران وەک ئۆرگانێکی پڕ سوود و بە هەڵسووڕی میللی کورد.
٤- هاندانی ئەو رێکخراوە دێوکراتیکانەی دیفاع لە مافی گەلەکانیان ئامانج بوو.
٥- بەشدارکردنی ژنان لە تێکۆشانی حیزبی و زۆربەی رێ و رەسمەکاندا.
٦- کردنەوەی چەند کلاسێک لە شوێنە جۆراوجۆرەکان بۆ فێرکردنی خوێندن و نووسینی زمانی کوردی.

**ج- لە بواری تەبلیغی دا:**

١- بەڕێوەبردنی سەدان میتینگ و کۆبوونەوە بۆ جەماوەر و شارەزاکردنیان لە بۆچوونەکانی حیزب.
٢- درێژەدان بە بلاوکردنەوەی رۆژنامەی «کوردستان»، ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندی، کڕین و دامەزراندنی چاپخانەیەک بە یارمەتیی خەڵک لە شاری مەهاباد.
٣- چاپ کردنەوە و بلاوکردنەوەی چەند پەرتووک و کتێبی حیزبی و دانانی کتێبخانەی پێشەوا لە گۆڕەپانی چوارچرای مەهاباد بەم مەبەستە.
٤- دانانی پێشانگای شەهیدان لە تاران و چەند شاری دیکەی ئێران و کوردستان بۆ راکێشانی زیاتری سەرنجی خەڵک بۆ سەر مەسەلەی کورد و ئاگاداربوونیان لە

تێکۆشانی رابردووی حیزب.

٥- بڵاوکردنەوەی چەند ژمارە رۆژنامەی دەنگی کورد ئۆرگانی رێکخراوی حیزب لە تاران، هەروەها گۆڤاری پێشەوا ئۆرگانی رێکخراوی حیزب لە مەهاباد.

**د- لە بواری ئیزامیدا:**

١- راگرتنی ئەمنییەت و ئاسایش لە شارەکان لە رێگەی شوراکان و خەڵک و بە تایبەتی لاوە خوێن گەرمەکان کە ئەوانە ماوەیەکی زۆر چەکی دەستیان گۆپاڵ و تێلا بوو.

٢- تێکۆشانی بەرچاو بۆ چەک کردنی بنکە و بونیادە ئیزامییەکانی سەرکوتکەری زەمانی شا.

٣- چەک کردنی زۆربەی بنکەکانی ژاندارمەری لە دێهات بێ کوشت و کوشتار.

٤- بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی پادگانی مەهاباد بێ شەڕ و خوێنڕێژی.

٥- چەکدارکردنی بە شێک لە خەڵکی شارەکان لە قەدەر پاراستنی ئەمنییەتی نێو شارەکان.

٦- راهێنانی ژمارەیەک لە لاوەکان بە مەبەستی سەردوە و پێشگیری لە هێرشی هێزە سەرکوتکەرەکانی پاشماوەی هێزەکانی شا بۆ سەر خەڵک.

٧- بەرگری کردنی بە کردەوە لە بەرامبەر هێرشی سوپای پاسداران بۆ کوردستان، بە تایبەتی کە دوای فەرمانی جیهادی خومەینی لە کرماشان، هەمەدان، بیجار، ورمێ و تورێز و میاندواو را هەڵیان کوتایە سەر شارەکانی کوردستان و بێ گومان هەر کام لە شارەکان حەماسەی خۆیان نواندووە.

**هـ- لە بواری دیپلوماسی و سیاسییەوە:**

١- پێکهێنانی پێوەندی دۆستانە لەگەڵ زۆربەی حیزب و رێکخراوە سیاسی و دیوکراتیکەکانی ئێران و کوردستان، بە تایبەتی لە تاران.

٢- راکێشانی سەرنجی رۆژنامەوانەکانی بێگانە و ئێرانی بۆ کوردستان و بە تایبەت مەهاباد وەک ناوەندی تێکۆشانی گەلی کورد لەم بەشە.

٣- ئامادە کردنی زەینی دەوڵەتی کاتی بۆ ناردنی هەیئەتی وتوویژ بۆ مەهاباد، دانیشتنی گشتیی حیزب و کەسایەتییەکان لەگەڵ ئەم هەیئەتە و گەڵاڵە کردنی داخوازییەکانی واقیعی لە ٧ خاڵدا.
٤- هەوڵدانی چالاکانە بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕەکانی داسەپاو بەسەر سنە و نەغەدە و پاوە، دەربڕینی ئامادەگیی بە کردەوە بۆ رێککەوتن لەسەر بنەمای دێموکراسییەت و دابین بوونی خودموختاری بۆ کوردستان.
٥- هەر لەم بوارەی سەرەوەدا دوو سێ جار چاوپێکەوتنی خومەینی و چەند جار بینینی ایت الله تاڵەقانی و موهەندس بازرگان سەرۆک وەزیری دەوڵەتی کاتی بە مەبەستی دۆزینەوەی رێگە حەللی ئاشتییانەی مەسەلەی کورد لە کوردستانی ئێران.
٦- بەشداریی چالاکانە لە کۆنفرانسی بەرینی(ویستی گەلان لە قانوونی ئەساسی) کە بۆ ماوەی چەند رۆژ لە تاران بەرێوە چوو.
٧- هەوڵ و کۆشش بۆ پێکهاتنی کانوونی دێموکراتیکی گەلانی ئێران لە تاران و بەشداری لە کۆبوونەوەکانیدا.
٨- تەحریمی بەجێی ریفراندۆمی خومەینی بۆ سەپاندنی رێژیمی کۆماری ئیسلامی لە ئێراندا.
٩- بەشداریی حیزب لە هەڵبژاردنی نوێنەرانی مەجلیسی خوبرەگان و هەڵبژێرانی دوکتۆر قاسملوو، سکرتێری گشتیی حیزب بە نوێنەرایەتیی کوردستان لەم مەجلیسەدا.

## بەشی دووهەم

# شەڕی سێ مانگە و هەیئەتی نوێنەرایەتیی گەلی کورد

دیارە بەر لەم هێرشە پان و بەرینانە بە تەواوی هەست دەکرا کە ڕێژیم خەریکی پیلان و لەشکر کۆکردنەوەیە و ناتوانێ وجوودی کوردستانێکی ڕزگار کراو و ئازاد و دیموکراتیک کە بە تایبەتیی لە ژێر ڕێنوێنیی ڕێبەرایەتیی حیزبی دیموکرات دابێ، قبووڵ بکا. پێشتریش لە لایەن حیزبەوە بڕیار درابوو کە لە شاردا شەڕ نەکەن و بەم شێوە پێشی وێرانکردنی شارەکان لە لایەن ئەو ڕێژیمە دڕندەوە بگرن، بە دوای ئەو بڕیارەدا قەراریشیان داوە کە ڕێبەری لە شار بچێتەدەر و هەرواش کرابوو، پازدە شەو بگرە مانگێک پێش هێرشەکەش جگە لە سمایل حاجی جێگری کۆمیتەی ناوەندی، جەلیل گادانی موشاوری کۆمیتەی ناوەندی(*) و کەریم حیسامی بەرپرسی کۆمیتەی مەهاباد کەسی لێ نەمابوو.

لەم بابەتەوە دوو سێ خاڵی جێی ڕەخنە هەیە کە دەبێ بێنە گۆڕێ:

١- هەڤاڵان هێندە دوور ڕۆیبوون کە لە سەردەشتیش تێپەڕیبوون بە دوور بوونەوەی ئەوان، خەڵک لە ترسان شاری سەردەشتیان نیوە تەعتیل کردبوو.

٢- هیچ شێوەیەکی موناسب بۆ ڕاگرتنی وردی خەڵکەکە دانەندرابوو، کە بە ڕاستی هاتنە خوارێی وردی خەڵک بۆ زۆر هاتنە پێشی دوژمن زۆر تەئسیری خراپی هەبوو.

٣- تەکلیف بۆ کۆمیتەی شارستانەکان دیاری نەکرابوو، هەر کەس بە ئیبتکاری خۆی دەجووڵایەوە.

٤- لانی کەم دوو بەردی شەڕی پڕ هێز و چەک لە کوێزدکەڕێز و ئەمیرئاباد هەبوو،

(*) جەلیل گادانی دوای هاتنەوەی کۆمیتەی زاگروس بەهۆی کاروتێکۆشانی زۆر بەرچاو لە یەکەم کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیدا ببووە موشاور، بە دوای ئیعلامی جیهادی خومەینی دا کە لە تاران خەریکی گرتن و کوشتن بوون، بە هەزار زەحمەت و هاوکاریی هاوڕێیانی حیزبی لە تاران و تەورێز خۆی دەرباز کردبوو، هاتبووە مەهاباد.

هاونیشتمانانی زۆریش هاوکاریی فەرماندە و پێشمەرگەکانیان دەکرد و تا دوای گەڕانەوەی دوژمن بۆ مەهابادیش لە درێژەدانی ئەرکی خۆیان هەر بەردەوام بوون. بەڵام بە قەولی شەهید سەرگورد عەبباسی لە ڕۆژەکانی دواییدا لە لایەن ڕێبەرایەتییەوە بە قەزا و قەدەر ئەسپێردرا بوون.

٥- ڕێبەرایەتی کە قەراری دابوو لە شاردا شەڕ نەکەین، بڕیاری ئەوەی نەدابوو لە دەرەوەی شارەکانیش شەڕ نەکەین، بەو پێیە درێژەدانی شەڕ مەسوگەر بوو، بەڵام بیر لە پێکهێنانی هیچ ئیمکاناتێک وەک چەک و تەقەمەنی و خواردن نەکرابووەوە(*).

ئەو بێ نەزمی و پەریشانییە لەسەر پاشەکشەی پێشمەرگەکانی حیزبی و هاونیشتمانان تەئسیری زۆر خراپی هەبوو. لە دواییشیدا بۆ ڕێکخستنەوەی هێزە بڵاوبووەکانی حیزبی زۆری تووشی زەحمەت کردوون.

ڕێکخراوەکان و هێزی چەکداری حیزب و هاونیشتمانانی بەشدار لە شەڕەکاندا بە شێوەیەکی نارێک پاشەکشەیان کرد و، هەر کام لە شوێنێک بۆ ماوەیەکی کورت لە سەغڵەتی و وەزعێکی نارووندا مانەوە. بەداخەوە لەگەڵ ئەم هەموو کەرەستەی بێ سیم کە وەدەست کەوتبوو، هیچ هۆیەکی پێوەندی گرتن لە نێوان کۆمیتە و هێزەکان لەگەڵ دەفتەری سیاسی نەبوو. بێ ئیمکانی و نەداری و کەم دەستیی، دۆستانی لەمێژینەی حیزبەکەمان بوون، بەڵام لەگەڵ ئەم هەلومەرج و هەستانەوەی شۆڕش نەدەگونجان.

بە زەحمەتێکی یەکجار زۆر پاش پازدە شەو تا مانگێک بە هیممەتی خەڵک نیوە بووژانەوەیەک پەیدا بوو. هێندێک لە هاوڕێیان دوو ڕۆژ دوای پاشەکشەکە، لە گوندی گوێچکەدەرێ، لە کۆبوونەوەیەکدا بە بەشداریی مەلا محەممەد جوانڕۆیی، سەرگورد عەبباسی، مەلا ڕەسووڵ پێشنماز، شەهید کەمال دەباغی و جەلیل گادانی، بڕیاری تازە کردنەوەی هێز و بەرەنگاربوونەوەی دوژمنیان دا. وەک ڕاستییەکی تاریخیش دوایە کۆمیتەی شارستانی مەهاباد لە مەیداندا چەقییەوە. لەو چەقینەوەش دا هاوڕێ یانی

(*) لە ڕۆژەکانی ئاخردا جەلیل گادانی لە سمایل حاجی و کەریم حیسامی پرسی، چ فکرێک بۆ ئەم شتانە کراوەتەوە؟ وەڵامیان دابووەوە هیچ. لەسەر پێشنیار و باوەڕی ئەو بە پەلە کۆمیتەیەکی چوار پێنج کەسی بۆ وەرگرتنی یارمەتیی نەقدی و خواردەمەنی پێکهات کە بە خۆشییەوە پێشوازیی باشیان لێکراو شتێکی زۆریان کۆکردەوە و لە ژێر چاودێری کۆمیتەکەدا بەڕێ کرا بۆ چەند شوێنی دەوری مەهاباد و بە ڕاستی لە کاتی عاستەم دا زۆری کەڵک لێ وەرگیرا.

شەهید سەرگورد عەباسی، سەروان احمد جاوید فەر(کاک هەژار) کەمال دەبباغی و هەروەها ئەمر کاک کەریم حسامی، کاک مەلا رەسووڵ پێشنماز و مەلا محمد جوانڕۆیی کاریگەریی بوێرانەو بەرچاویان هەبوو.

هاوڕێیانی باشوور زۆر بڵاوببوون، بەڵام بە هۆی پیاوی ئازا و بە هیممەتی وەک سەعید کاڵ کاڵ زوو پێوەندییان لەگەڵ ڕێبەرایەتی گرتەوە. هاوڕێیانی بانە کۆزیلەی ئەسڵیی خۆیان تێک نەدا و لە بناری سوورکێو دامەزران. هاوڕێیانی سەردەشت وەزعیان زۆر لەبار نەبوو، بە تایبەتی هێزی پێشمەرگەیان تەواو بڵاوببوو. هاوڕێیانی پیرانشار پەنایان بۆ بناری قەندیل بردبوو، برایانی شنۆ خۆیان گەیاندبووە دەوری کێلەشین، برایانی سەقز لە شوێنە شاخاوییەکان مابوونەوە، کوڕانی ئازای مەریوانیش خۆیان ڕاگرتبوو.

خەڵکێکی زۆریش پەڕیوەی کوردستانی عێراق ببوون و لە ئۆردووگاکاندا شوێنیان بۆ دیاری کردبوون.

پێوەندییەکان یەک بە دوای یەکدا دەگیرانەوە، بەڵام گلەیی و گازندە زۆر بوو. لەم هەلومەرجە نالەبارەدا هێزە کوردستانییەکان لە گوندی بنێوخەڵەفی سوێسنایەتیی سەردەشت کۆبوونەوەیەکیان پێکهێنابوو بۆ باس لەسەر وەزع، کە دوو سێ ڕۆژی خایاند، بەرپرسانی یەکەمی حیزبیش لەم کۆبوونەوەیەدا بوون. بڕیارێکی مێژوویی درا کە ئێستاش هێندێک هێزی مەسئوول لەسەری سوورن، بڕیارەکە ئەوە بوو:

«بە لەبەر چاوگرتنی هەلومەرجی تایبەتیی کوردستان، هەر هێزێکی خەباتکار دەتوانێ لەگەڵ دەوڵەتەکانی داگیرکەری کوردستان بۆ بەرژەوەندیی جووڵانەوە پێوەندیی هەبێ، بەڵام ئەم کارە نابێ بە هیچ شێوەیەک بە بایەخی سات و سەودا لە سەر بەشێکی دیکە بێ و بە شێوەیەک زیانی حیزب و ڕێکخراوێکی کوردی تێدا بێ».

ئەم بڕیارەش تا ڕادەیەک دەستی حیزبی ئاواڵە کرد. دەفتەری سیاسی کە پاش هاتنەوەی ڕێژیم لە پشکاوتێ سەر سنوور جێگیر ببوو، بڕیاری دا بە پەلە و بە کەڵک وەرگرتن لە ئیمکاناتی مەوجوود پێشمەرگە سازماندەی بکرێتەوە و لە جەرگەی کوردستاندا تێکۆشانی خۆی دەست پێ بکاتەوە.

هەروەها بە تێبینییەوە بڕیار درابوو کار لە نێو هاوڕێیانی ئامادەی تێکۆشان دابەش بکرێتەوە. کۆمیتەی شارستانەکان بە چاوپێداخشاندنەوەیەک تەرمیم بکرێنەوە بە گوڕج و گۆڵی دەست بدەنەوە کار و تێکۆشانی ڕێکخراوەیی سیاسی و چەکداری.

دوکتۆر قاسملوو پێوەندی و کاری پێشمەرگەی بە ئەستۆ گرت. جەلیل گادانی بوو بە بەرپرسی تەشکیلات، عەزیز ماملێ بوو بە بەرپرسی دەبیرخانە.

ئەو کارانە بە توندی جێ بەجێ کران. هێزەکانی شەهید موعینی، شەهید ئاوارە و شەهید پێشەوا لە یەکەم هەنگاودا رێکخرانەوە و دەست بەکاربوون و زەبری زۆر کاریگەریان لە دوژمن وەشاند.

جەلیل گادانی و سەرهەنگ چیا و کەریم پوور قوباد سەردانێکی بانە و سەردەشتیان کرد. هێزی ئاربەباش لە گوندی دوونیس پایەی داندرا. هێزی عەزیز یوسفیش بناغەکەی هەبوو، بەڵام جارێ نێودێر نەکرابوو.

ماوەیەک دواتر هەر تیمی ئاوبراوی سەرەوە سەفەرێکی هەورامان و مەریوانیان کرد. وێرای دامەزراندنەوەی کۆمیتەکانیان، هێزی شاهۆ و شەریف زادەشیان لەم دوو شوێنە پێکهێنا. بناغەی هێزی کێلەشین لە شنۆ بووژابووەوە و تێدەکۆشا. تێکۆشەرانی بۆکانیش خەریک بوون بە کردەوەی ئازایانەیان بناغەی هێزی بەیانیان دادەمەزراند.

لە هەموو لایەکەوە هێرش دەکرایە سەر هێزەکانی کەم ئەزموونی دوژمن و لە زۆر شوێن وەک گەڵا ڕێزانی پاییز لێیان دەخستنە سەر زەوی.

پێوەندیی رێکخراوەیی لە نێو شارەکان بە نهێنی تازە کرابوونەوە، لە هێندێک شوێن تاقمی چەکدار پێکهاتبوو، زەبریان دەوەشاند. خەڵک بە هەموو ئیمکاناتەوە پشتیوانیی لە شۆڕش دەکرد.

بەشی چاپەمەنی حیزبی تارادەیەک وەگەڕ کەوتبووەوە، لەبارەی شەڕەکانەوە ئاگاداری بۆ خەڵک دەنووسرا و خەڵک هێندەی دی ئیمانیان بە هێز دەبوو.

بە راستی پێشمەرگە دوژمنی وەزاڵە هێنابوو، بە زەحمەت دەیتوانی لە شوێنی خۆی وەجووڵێ، بەخۆشییەوە جاش لە کوردستان پەیدا نەبیوو تا هەموو کەلێنە بەرد و ئەشکەوت و پەناکان بە دوژمن نیشان دا.

دوای یەک دوو مانگ هێندێک لە بەرپرسانی حیزبی کە گەشتیان لە ناوچەکان کرد، لە نێو جەنگەڵ و لێرەوارەکان، لە هەورامان، مەریوان، بانە، سەقز، سەردەشت، دەوری مەهاباد و پیرانشار بە چاوی خۆیان گۆڕستانی ماشێن و زرێپۆش و تانکیان دیتبوو، راپۆرتی کۆمیتەی شارستان و هێزەکانیش ئەم وەزعەیان تەئیید دەکرد. لە لێدانی دوژمن لە شارەکانیش خەبەری زۆر خۆش دەگەیشتە دەفتەری سیاسی، کاتێک کادر و

پێشمەرگەکان پاش سێ چوار مانگ بە دەست پێکردنی وتوویژ گەڕانەوە بۆ شارەکان، ڕاستیی ئەم هەواڵ و هەڵمەتە جەرگبڕانە لە ڕێگەویان و نێو شارەکانیش دا بە ئاشکرا بەدی دەکرا.

یەکێک لە هۆیەکانی پاشەکشەی ڕێژیم لە ئاست هێزی پێشمەرگەدا، تەفروتوونا کردنی ستوونی گەورەی گاردی جاویدانی ڕێژیم بووە لە قەراخ شاری بانە کە بە دەیان ماشێنی ئەفەرهەڵگریان سووتێندرا و تێک شکێندرا و بە سەدان کەس لەو هێزانە کوژران و بە دیل گیران و دەسکەوتێکی گەورەش کەوتە دەست هێزی پێشمەرگەی کوردستان.

کاتی ئەوە هاتبوو خومەینی ئیمام کە ڕۆژ نەبوو بە قەولی خۆی خەبەری چوونە بەهەشتی دەیان کەسی پێ نەگا و خەڵخالی جەللاد کە بە نۆبە لە پاوەرا بە یەکەیەکی شارەکاندا گەڕا بوو، لە هەرکام بە نێو قازی شەرع حوکمی تیر بارانی چەند کیژ و کوڕی تێکۆشەری کوردی دابوو، بە خۆیان دا بچنەوە، واز لە کەللە شەقی بێنن و بۆ نەجاتی چەکدارەکانیان و پاراستنی وەزعی نالەباری خۆیان ڕێگایەکی ئاخوندی بدۆزنەوە. لەسەر ئەم وەزعە بوو کە خومەینی لە ڕۆژی ٢٦ی خەزەڵوەردا بە هەڵڕشتنی فرمێسکی حەرام لە پەیامێکی ڕادیۆ تلویزیۆنی دا داوای ئاگربەس و وتوویژی کرد و بەڵێنی دا مافی ڕەوای کورد بدا.

ڕاستیی قسەکانی«ئیمامی ڕاحل!» لەوەرادەرکەوت کە هەر ئەو کات کە ئەفەری دەنارد بۆ لای حیزب و کۆمەڵە و شێخ عیزەدین، زووتر وتوویژدکە دەست پێ بکا، ئیسکادرانی فڕۆکەی جێت و فانتۆمی دەنارده سەر شارەکانی سەردەشت و بانە و پیرانشار تا بە گرمەی خۆیان وشکاندنی سموت شووشەی پەنجەرەکانیان لێ بشکێنن و ماڵ و منداڵ دەربەدەر و ئاوارە بکەن.

دیارە حەوت هەشت ساڵ دواتر بۆ خۆشی لە قسەکانیدا باسی ئەو مەسەلەی کرد و گوتی«کاتی وتوویژ من پێم گوتن لە پێشدا گەمارۆیان دەن، دوایە وتوویژیان لەگەڵ بکەن!»

لە پاییزی ١٣٥٨دا مەسەلەی کاندیداتۆریی چەند کەس بۆ سەرۆک کۆماری هاتە گۆڕێ. کاک مەسعود ڕەجەوی بەرپرسی یەکەمی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵکی ئێران یەکێک لەو کەسانە بوو کە خۆی کاندید کردبوو، بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی بە شێوەی ڕەسمی ڕایگەیاندبوو، ئەگەر سەرکەوێ و ببێتە سەرۆک کۆمار، خودموختاریی کوردستان

بە مـافی ڕەوای کـورد دەزانێ، حـیـزبی ئێـمـە لە بەرامـبـەر بەنی سـەدردا کـە کـاندیدای خومەینی بوو پشتیوانیی لێ دەکرد، بڕیاری دا دەنگ بە ڕەجەوی بدا.(*)

ڕاوێژکـاری لەسـەر مەسـەلەی وتوویژ کـردن لەگـەڵ ڕێژیم زۆری کـێشـاوەو بۆچوونەکـان فەرقیـان هەبووە، بەڵام لە کۆبوونەوەیەکدا کە بە بەشداریی زۆربەی ئەندامان و جێگران و مـوشـاورەکـانی کـۆمـیـتـەی ناوەندی لە گـوندی دۆڵەتوویی مـەنگوڕان لە نیـزیـک سنوور پێکهاتووە و یەک دوو ڕۆژنامەوانی خارجـیشی لێ بووە، لەسەر ئەوە سـاغ بوونەوە کە ئاگربەس قبووڵ کەن و هێزی پێشمەرگە بە تێکڕا نەنێردرێتەوە شارەکان و بۆ ماوەی پازدە ڕۆژ خەریکی وتوویژ بن. ئەگەر سەرکەوتوو بوو واتە ددانیان بە مافی ڕەوای کورددا هێنا، ئەوە باشە، دەنا شەڕ دەست پێ بکرێتەوە.

لەسـەر ئەم بڕیارە هەر کـەس چۆوە سـەر ئەرکی خـۆی، بەڵام بە هێندێک لە هاوڕێیـان مەئمووریـیەتی تازە درا. مسـتـەفا شـەلماشی بۆ باکـووری کوردسـتـان، جەلیل گـادانی بۆ باشوور بەڕێ کران تا خەریکی بەرنامەڕێژی لەسەر بڕیارەکە بن و نەهێڵن کاری پێشمەرگە و تەشکیـلاتی لە ژێر تەئسـیـری وتوویژدا بەرەو لاوازی بچێ. کـاک غـەنی بەڕێ کـرایە دەوری مەهاباد تا لە نزیکەوە وەزعەکە ببینێ و دەفتەر ئاگادار کاتەوە.

کاک غەنی و کاک کەریم حیسـامی کە کەوتبوونە لای یەک، خۆیان بە تەواوی لەسەر مەسـەلەکە کردبووە کـوێخای حیـزب و مەوقفی حیـزبیـان لە وتوویژەکانی خۆیاندا لاواز نیـشـان دابوو، بەڵام مـوافـقـەتی حـیـزبیـان لەسـەر وتوویژ بە بەرپرسـانی حکوومـەتی ڕاگەیاندبوو.

پاش هەشت نۆ ڕۆژ دوکتۆر قاسملوو و چەند کەسێکی دی لە هاوڕێیـان بەرەو مەهاباد وەڕێ کەوتبوون. لە شاری مەهاباد میتینگێکی گەورە پێک دێ و دوکتۆر قـاسملوو وەک سکرتێری حیزب بەو هومێدەی دڵی خومەینی نەرم بێ و موشکیلە حەل بێ، «لبیک»ی بۆ خومەینی گوتبوو و تووشی خۆش باوەڕی ببوو، کیـسـەیەکی گەوردشی بۆ ناکـامی باشی وتوویژەکە هەڵدروبوو.

بە دوای ئەوەدا ڕۆژێک وەک ڕۆژی هەم بەسـتـەگـیی کـورد، دیاری کـرا، لە زۆربەی

(*) ڕەجەوی لەم کـاندیداتوورییەدا لەگـەڵ موخالەفەتی خومەینی ڕووبەڕوو بوو، ئەوەش لەبەر ئەوەی لە سـەرەتای کارەوە کێشە و هەللا دروست نەبێ و نیـگەرانی و دژایەتیی خومەینی لەگەڵ ڕێکخراوی موجاهیدین زەق نەکاتەوە، خۆی کێشایە قەراغ و ئەو کارەش ڕێگای بۆ بەنی سەدر زیاتر خۆش کرد.

شارەکان میتینگی بەرین بە بەشداریی هەموو هێزەکانی کوردستان درا و هەرکام لە ئەندامانی ڕژیمی لە شوێنێک وتاریان دا کە نیشانەی پێشوازیی گەرم لە پێشنیاری ڕێژیم بۆ حەللی یەکجاریی مەسەلەکە بوو.

هەیئەتی هاوبەشی کورد لە نوێنەرانی حیزبی دێموکرات، کۆمەڵە و چریکەکان و مامۆستا شێخ عیزەدین وەک کەسایەتییەکی ئایینی- سیاسی پێکهاتبوو. شێخ عیزەدین وەک ڕەئیس و دوکتور قاسملوو وەک قسەوێژی هەیئەت داندرابوون.

هەیئەتی ڕێژیمیش بریتی بووە لە سەباغیان، موهەندس عزت اللا سەحابی و...

ئەم هەیئەتەش هەر لە هەوەڵەوە بروبیانوویان گرتبوو، بۆ وێنە گوتبوویان ئێمە چۆن لەگەڵ چریک دانیشین، ئەوان ڕەبتیان بە کورد و مافی کوردەوە نییە.

پاش چەند جار دانیشتن لەسەرئیعلامیەیەکی ٢٦ ماددەیی وەک داخوازی گەلی کورد ساغ بوونەوە کە بەڕێ کرا بۆ تاران و قوم تا بڕیاری لەسەر بدەن، بەڵام بەداخەوە هەر بە ئەندازەی ٨ ماددەی یەکەی ساڵی پێشتر بایەخی پێ درا و هیچ نەتیجەیەکی لێ دەست نەکەوت. ئەوەش دەقی گەلاڵەی ٢٦ ماددەیی کەبەهۆی لەبەر دەستدا نەبوونی مەتنی کوردییەکەی، لە کتێبی« نیو سەدە تێکۆشان» لە نووسینی مامۆستا عبداللە حەسەن زادە وەرگیراوە.

گەلاڵەی دەستەی نوێنەرایەتی گەلی کورد
دەربارەی خودموختاریی بۆ کوردستانی ئێران
ماددەی(١)

کوردستانی ئێران سەرزەوینێکە لە چوارچێوەی جوغرافیایی ئێران دا کە لە باری مێژووییەوە شوێنی دانیشتنی هۆزەکانی کورد بووە و ئێستاش زۆربەی دانیشتوانی لە نەتەوەی کورد پێک هاتووە، ئەم سەرزەوینە هەموو ناوچە کوردنشینەکانی ئۆستانەکانی ئیلام، کرماشان، کوردستان و ئازەربایجانی ڕۆژئاوا دەگرێتەوە.

ماددەی(٢)

کوردستانی ئێران بەشێک لە وڵاتی کۆماری ئیسلامیی ئێرانە کە پێوەندیی قووڵی مێژوویی، ئابووری، سیاسی و فەرهەنگیی هاوپێوەندیی نەتەوەی کوردی دانیشتووی وێی لەگەڵ نەتەوەکانی دانیشتووی ئێران دا پتەو کردووە.

ماددەی(٣)

دەسەڵاتی نەتەوەی کورد بە سەرزەوینی کوردستانی ئێراندا بە شێوەی خودموختاری لە چوارچێوەی یەکیەتیی سیاسی، ئابووری و نەتەوایەتیی خاکی وڵاتی ئێران دا بەکار دەبرێ.

ماددەی(٤)

دەوڵەتی ناوەندیی کۆماری ئیسلامیی ئێران بۆ دابین کردنی یەکیەتیی سیاسی و نەتەوایەتیی خاکی وڵات دەسەڵاتی پێوەندیدار بەم مەسەلانەی خوارەوە لە سەرزەوینی خودموختاری کوردستاندا بەڕێوە دەبا.

الف- کاروباری پێوەندیدار بە دیفاع لە سنوورەکان، سەربەخۆیی وتەواویەتی خاکی ئێران لە بەرامبەر دەستدرێژیی بێگانەکاندا کە بە هۆی هەرسێک هێزی زەوینی و هەوایی و دەریایی سوپاوە بەڕێوە دەچێ و بەهۆی ئۆرگانەکانی حکوومەتی ناوەندییەوە سەرپەرستی دەکرێ.

ب- کاروباری پێوەندیدار بە سیاسەت و پێوەندییەکانی دەرەوە و هەروەها پێوەندی لەگەڵ کونسوولگەرییەکانی دەرەوە کە لە سەرزەوینی کوردستانی ئێران جێگیرن، لە سەڵاحییەتی دەوڵەتی ناوەندی دایە.

ج- بازرگانیی دەرەوە و گومرگەکان و ئەو سیاسەتە گشتییانە کە پێوەندییان بەم مەسەلانەوە هەیە، بەهۆی ئۆرگانەکانی دەوڵەتی ناوەندییەوە بەڕێوە دەبرێن و سەرپەرستی دەکرێن.

د- بەرنامەدانانی درێژ خایەنی ئابووری، کە پێویستیی بە دەسمایەی زۆر و زەوەند هەیە و، رێکخستن و بەڕێوە بردنی سیستەمی دراوی و ئەرزیی وڵات لە سەڵاحییەتی ئۆرگانەکانی دەوڵەتی مەرکەزیدا دەبێ.

روونکردنەوەی (١) لە باری کاروباری دیفاعییەوە، دەبێ هەردەم ئەم ئەسڵە لە بەرچاو بگیرێ کە پادگانەکان و دام و دەزگا نیزامییەکان دەبێ هەمیشە لە سنوورەکان و دوور لە شارەکان بن، بە جۆرێک کە بە بیانووی پێداویستییە نیزامییەکان و شتی لەو بابەتە هیچ کارێک نەکرێ کە بکێشێتە دەست تێوەردان لە کاروباری نێوخۆیی سەرزەوینی خودموختاری کوردستاندا.

روونکردنەوەی (٢) سەرباز وەزیفەکانی دانیشتووی سەرزەوینی خودموختاری

کوردستانی ئێران دەبێ لە پێگە ئیزامییەکان و سەربازخانەکانی کوردستاندا خزمەتیان پێ بکرێ.

روونکردنەوەی(٣) لەو ئیدارە ناوچەییانەدا کە پێوەندییان بە بازرگانیی دەرەوە و گومرگەکان و بەرنامەدانانی درێژ خایەنی ئابووری و بەڕێوەبردنی سیستمی دراوی لە سەرزەوینی خودموختاری کوردستاندا هەیە، دەبێ لە کارمەندانی خۆولاتی کەلک وەرگیرێ.

ماددەی (٥)

جگە لەو شتانەی لە ماددەی (٤)دا باس کراون، بەکاربردنی دەسەلات لە هەموو کاروبارێکی سەرزەوینی خودموختاری کوردستانی ئێراندا بێ هیچ هەلاواردنێک لە سەلاحییەتی ئۆرگانەکانی خودموختاریدا دەبێ.

ماددەی (٦)

ئەنجوومەنی نەتەوایەتیی کوردستان بەرزترین ئۆرگانی دەسەلاتداریی نەتەوەی کورد لە سەرزەوینی خودموختاری کوردستانی ئێران دایە. ئەم ئەنجوومەنە هەر دوو ساڵ جارێک لە رێگای هەڵبژاردنێکی ئازاد، راستەوخۆ، نهێنی و گشتیی هەموو دانیشتوانی کوردستانی ئێرانەوە هەڵدەبژێرێ و پێک دێ.

روونکردنەوەی(١) هەر پەنجا هەزار کەس لە دانیشتووانی سەرزەوینی کوردستانی ئێران نوێنەرێک بۆ ئەنجوومەنی نەتەوایەتیی کوردستان هەڵدەبژێرن.

ماددەی (٧)

ئەنجوومەنی نەتەوایەتی کوردستان هەموو رێ و شوێنێکی پێوەندیدار بە پێڕەوی نێوخۆی خۆی و هەروەها بە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنەکانی شار و دێ وە دادەنێ و پەسند دەکا.

ماددەی (٨) ئەنجوومەنی نەتەوایەتیی کوردستان بە لەبەر چاوگرتنی قانوونە گشتییەکانی ولات هەموو قانوون و رێ و شوێنێکی بەکاربراو لە دەزگاکانی خودموختاری دا و هەروەها بوودجەی تایبەتی سەرزەوینی خودموختاری کوردستان پەسند دەکا.

ماددەی(٩)

ئەنجوومەنی نەتەوایەتیی کوردستان، حکوومەتی خودموختاری کوردستان بۆ بەڕێوەبردنی هەموو کاروباری سیاسی، ئابووری، فەرهەنگی و ئینتیزامیی سەرزەوینی خودموختاری کوردستان هەڵدەبژێرێ.

ماددەی (١٠)

حکوومەتی خودموختاری کوردستان لە بەرامبەر ئەنجوومەنی نەتەوایەتیی کوردستاندا بەرپرسایەتیی هاوبەشی دەبێ و هەرکام لە ئەندامانی حکوومەتی خودموختاری بە تەنیا بەرامبەر بە ئەنجوومەنی نەتەوایەتیی کوردستان بەرپرس دەبن.

ماددەی (١١)

ئەنجوومەنی نەتەوایەتی کوردستان ماف و ئەرکی سەرشانیەتی کە هەلومەرجی تێکۆشانی ئازاد و دیموکراتیی ژیانی کۆمەڵایەتی لە بوارەکانی ئازادیی حیزبەکان و کۆبوونەوەکان و چاپەمەنی و بیروڕا دەربڕین و قەڵەم و بیروباوەڕ و مەزهەب و ئەنجوومەنە دیموکراتییەکان و حەقی مانگرتن لە هەموو سەرزەوینی کوردستاندا پێک بێنێ و بەوردی چاوەدێری بەڕێوەچوونی ڕێ و شوێنەکانی لە لایەن هێزی ئیجراییەوە بکا.

ماددەی (١٢)

بوودجەی خودموختاری کوردستان بەهۆی حکوومەتی خودموختاری کوردستانەوە ڕێک دەخرێ و بە ئەنجوومەنی نەتەوایەتیی کوردستان پێشنیار دەکرێ و پاش پەسند کران بەڕێوە دەبرێ.

ماددەی (١٣)

سەرچاوەکانی دابین کردنی بوودجەی کوردستانی خودموختار بریتین لە:

الف- مالیات و باج و داهاتە ناوچەییەکانی دیکە.

ب- بەشێک لە بوودجەی گشتیی وڵات کە لە لایەن حکوومەتی ناوەندییەوە دەدرێ بە حکوومەتی خودموختاری کوردستان.

ماددەی (١٤)

بەرنامەدانان بۆ هەڵدان و پێگەیشتنی ئابووری لە سەرزەوینی کوردستاندا بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو دواکەوتوویییە کە بەهۆی زۆرداریی نەتەوایەتییەوە دروست بووە، واتە پێکهێنانی پیشەسازیی نەتەوایەتی، پەرەپێدانی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری، پێشخستنی کاروباری ئاوەدان کردنەوە و خۆش گوزەرانی و خزمەتە گشتییەکان بە جۆرێک کە ژیانی کۆمەڵانی زەحمەتکێشی گەلی کورد گۆڕانی بەسەر دابێ. جگە لەو شتانە کە لە بەندی (د)ی ماددەی (٤)دا باس کراون، بەشێک لە ئەرکەکانی حکوومەتی خودموختاری کوردستانە.

ڕوونکردنەوەی ماددەی (١٤) پاش دەرکردنی بوودجەی کاروباری دەوڵەتی ناوەندی لە داهاتە گشتییەکان بوودجەی پەرەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بە پێی ڕادەی حەشیمەت لە نێو ناوچە جۆراوجۆرەکانی وڵاتدا دابەش دەکرێ.

پێوانەی دابەش کردنی ئەم بوودجەیە جۆرێک دەبێ کە بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو پاشکەوتووییە ئابوورییە کە بەهۆی زۆرداریی نەتەوایەتییەوە درووست بووە، بەشی دانیشتووانی ئەم ناوچانە و یەک لەمان کوردستانی خودموختار بەپێی پلەی پاشکەوتوویەکەیان زیاتر لە داهاتی نێونجیی سەرانسەری وڵات بێ.

ماددەی (١٥)

زمانی کوردی لە هەموو ئیدارەکانی سەرزەوینی خودموختاری کوردستان دا چ ئیدارەکانی ئۆرگانە خودموختارەکان و چ ئیدارەکانی دیکە زمانێکی ڕەسمییە، لەگەڵ دوویات کردنەوەی ئەو خاڵە کە زمانی فارسی هەروەک جاران زمانی ڕەسمیی سەرانسەری ئێران بە کوردستانیشەوەیە.

ماددەی (١٦)

لە سەرزەوینی خودموختاری کوردستانی ئێراندا فێرکردن لە هەموو پلەکاندا بە سەرەتایی و نێونجی و بەرزەوە بە زمانی کوردی دەبێ. بەڵام خوێندنی زمانی فارسیش پاش تەواوبوونی ساڵی چوارەمی سەرەتایی لە هەموو قوتابخانەکانی سەرزەوینی کوردستانی ئێراندا بە زۆری (اجباری) دەبێ.

ڕوونکردنەوەی (١) کەمایەتییە نەتەوەییەکان لە سەرزەوینی خودموختاری کوردستانی ئێراندا هەقیان هەیە فەرهەنگ و داب و نەریتی خۆیان بپارێزن و برەوی پێ بدەن و لە قوتابخانەکاندا بە زمانی زگماکی دەرس بخوێنن.

ماددەی (١٧)

پێکهێنانی دام و دەزگا و ناوەندەکانی فێرکردن و فەرهەنگ و بەرنامەدانان بۆ تێکۆشانی ئەو دام و دەزگا و ناوەندانە لە سەرزەوینی خودموختاری کوردستانی ئێراندا لە هەموو پلەکانی سەرەتایی و نێونجی و بەرزدا بەشێک لە دەسەڵاتەکانی حکوومەتی خودموختاری کوردستانی ئێرانە.

ڕوونکردنەوەی (١) ناوەندی ڕادیۆ تلویزیۆنی سەرزەوینی خودموختاری کوردستان لە ژێر چاوەدێریی حکوومەتی خودموختاری کوردستانی ئێراندا بەڕێوە دەبرێ.

ماددەی (١٨)

پاراستنی ئەمنییەتی نێوخۆ و کاروباری ئەزم راگرتن لە سەرزەوینی خودموختاری کوردستانی ئێراندا لە شار و دێ بەهۆی هێزەکانی پێشمەرگەوە کە بە ردسمی لە لای حکومەتی خودموختاری کوردستان دادەمەزرێن، دابین دەکرێ.

ماددەی (١٩)

بەرپرسانی ئەزم و پاراستنی شار و دێ لە سەرزەوینی خودموختاری کوردستانی ئێران دا راستەوخۆ لە لایەن حکومەتی خودموختاری کوردستانەوە دیاری دەکرێن و بەرامبەر بەو بەرپرس دەبن.

ماددەی (٢٠)

هەموو ساڵێ ژمارەیەک خوێندکار لە لایەن حکومەتی خودموختاری کوردستانی ئێرانەوە بۆ دابین کردنی پێداویستیی هێزە دیفاعییەکانی سەرزەوینی خودموختار بۆ خوێندن دەنێردرێنە قوتابخانە نیزامییەکان. رێکخراوە پێوەندیدارەکانی حکومەتی ناوەندی لەسەریانە هەموو پێویستییەکانی فێرکردن و پەروەردەی ئەو خوێندکارانە پێک بێنن و پێداویستییەکانی چەکدار کردنی هێزە ئینتزامییەکانی نێوخۆی کوردستان بە شێوەیەکی ماقووڵ و گونجاو دابین بکەن.

ماددەی (٢١)

دەسەڵاتی قەزایی لەسەرزەوینی خودموختاری کوردستاندا بە جیا لە هێزەکانی دیکە بە هۆی دادگای سەربەخۆوە بەکار دەبرێ.

ماددەی (٢٢)

دادگاکانی سەرزەوینی خودموختاری کوردستانی ئێران لە مەسەلە عورفییەکاندا بە پێی قانوونە عورفییەکانی سەرانسەری وڵات و ئەو قانوونانە کە لە لایەن ئەنجوومەنی نەتەوایەتیی کوردستانی خودموختارەوە پەسند کراون و لە چوارچێوەی سەڵاحییەتەکانی ئەو ئەنجوومەنەدا داندراون و لەگەڵ ئەسڵە پەیڕەوی کراوە حقووقییەکان و بەیاننامەی جیهانیی مافی مرۆڤ و پەیماننامەی جیهانیی حقووقی مەدەنی رێک دەکەون، حوکم دەدەن و لەو مەسەلانەشدا کە پێوەندییان بە «احوال شخصیة»وە هەیە بە پێی قانوونە مەزهەبییەکانی هەردوو لای کێشەکە دەجووڵێنەوە.

ماددەی (٢٣)

لقێکی دیوانی بەرزی وڵات لە سەرزەوینی خودموختاری کوردستانی ئێراندا جێگیر دەبێ و داوای پێ ڕاگەیشتنەوە لە حوکمی دادگاکانی سەرزەوینی خودموختاری کوردستانی ئێران لەم لقەدا لێی دەکۆڵرێتەوە.

ڕوونکردنەوە: دادپرسین لە دادگاکانی سەرزەوینی خودموختاری کوردستانی ئێراندا بە هەردوو زمانی کوردی و فارسی جێ بەجێ دەکرێ.

ماددەی (٢٤)

بۆ بەهێز کردنی یەکیەتیی گەلانی ئێران جگە لەوە کە دانیشتووانی سەرزەوینی کوردستان وەک بەشەکانی دیکەی ئێران نوێنەرانی خۆیان دەنێرنە ئەنجوومەنی نیشتمانی، ژمارەیەکی دیاریکراو کە لەگەڵ حەشیمەتی کوردستان ڕێک کەوێ، لە ئۆرگانەکانی حکوومەتی ناوەندیدا (کۆڕی وەزیران و وەزارەتخانەکان) بەشدار دەبن.

ماددەی (٢٥)

بۆ دەستەبەر کردنی بنەڕەتەکانی خودموختاری و پاراستنی مافەکانی هەموو گەلانی ئێران «شوورای بەرزی گەلانی ئێران» لە ناوەندی وڵات پێک دێ و هەرکام لە گەلانی ئێران سێ نوێنەر دەنێرنە «شوورای بەرزی گەلانی ئێران».

ڕوونکردنەوە: سێ کەس نوێنەری سەرزەوینی خودموختاری کوردستانی ئێران لە لایەن ئەنجوومەنی نەتەوایەتیی کوردستانەوە دەست نیشان دەکرێن.

ماددەی (٢٦)

هەموو قانوونەکانی پەسند کراو لە ئەنجوومەنی نیشتمانیی ئێراندا ئەگەر پێوەندییان بە پێوەندی و مافەکانی گەلانی ئێرانەوە هەبێ، دەبێ لە «شوورای بەرزی گەلانی ئێران»دا بێنە گۆڕێ و پەسند بکرێن.

دەستەی نوێنەرایەتیی گەلی کورد

١٣٥٨/١٠/٤

بە دوای ئەوەدا کە لە گەڵاڵەی ٢٦ ماددەیی ناکامێک دەست نەکەوت، حیزب بۆ خۆی کورتەیەکی لە ٢٦ ماددە کە لە شەش ماددەدا ئامادە کرد و بە هەیئەتێکدا ناردی بۆ سەرکۆماری ئەو کات ئەبولحەسەن بەنی سەدر، کە ئەویش بە ڕواڵەت پەسندی کردبوو، بەڵام گوتبووی دەبێ بیباتە شووڕای نگەهبان!، کە ئەوەش دەقەکەیەتی:

شەش نەسڵی پێشنیاری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

١- گەلی کورد لە چوارچێوەی سەربەخۆیی و تەواویەتی خاکی وڵاتی کۆماری ئیسلامیی ئێراندا بە مافی ئیشتمانی کە بە شێوەی خودموختارییە، بگا و ئەو مافە لە «تەواوکەری» یاسای بنەڕەتیدا بگونجێ.

٢- چوارچێوەی جوغرافیایی کوردستان بە سەرنجدان بە وەزعی مێژوویی، جوغرافیایی و ئابووری و ویستی زۆربەی دانیشتووانی هەر ناوچەیەک دیاری دەکرێ.

٣- کوردستانی خودموختار لە جەرەیانی هەڵبژاردنێکی ئازاد، نهێنی و راستەوخۆدا شوورایەکی سەرانسەری هەڵبژێرێ.

٤- شووڕای سەرانسەریی کوردستان هەیئەتێکی بەڕێوەبەری بۆ پێ ڕاگەیشتن بە وەزعی ئابووری، فەرهەنگی، ئیداری و ئینتزامییەکان دیاری بکا.

٥- زمانی کوردی لە ناوچەی خودموختاری کوردستاندا بۆ نامە نووسینی ئیداری و خوێندن لە پاڵ زمانی فارسیدا رەسمییەتی هەیە.

٦- هەموو کاروبارەکانی نێوخۆیی کە بریتییە لە: ئیداری، ئابووری، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و ئینتزامی، بە ئۆرگانەکانی ناوچەی خودموختاری دەسپێردرێ.

وردەکارییەکانی ئەو گەڵاڵەیە لە وتووێژەکانی دواییدا بە شێوەی گەڵاڵەیەکی هەموو لایەنە ئامادە و بە پەسندی ئۆرگانەکانی یاسادانانی کۆماری ئیسلامیی ئێران بگا.

بە ئامانجی لە نێوچوونی هەموو شوێنەواری تێک هەڵچوونەکانی یەک ساڵی رابردووی کوردستان و پێکهێنانی «حوسنی تەفاهوم» ئەو هەنگاوانە هەڵبگیرێ.

١- لێبووردنی گشتی لە پێوەندی لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی کە بە شێوەیەک لە شێوەکان لە رووداوەکانی کوردستاندا بەشدار بوون، دەربچێ.

٢- مووچە بدرێ بە کەس و کاری شەهیدانی تێک هەڵچوونەکانی کوردستان.

٣- بەرپرسانی کارەساتی قارنێ شناسایی و سزا بدرێن.

٤- مووچەی «بازنشستگی» بدرێ بە هەموو ئەو کەسانە کە لە جەرەیانی تێک هەڵچوونەکانی کوردستان بوونە کەم ئەندام.

٥- هەموو زیندانییەکانی هەردوو لا بێ ئەم لاو ئەولا ئازاد بکرێن و هەموو ئەو مووچە خۆرانەی بە «اتهام»ی بەشداری لە رووداوەکانی کوردستان دوور خراونەوە، یان لەسەر کار لاچوون، یان گوێزراونەوە، بێنەوە سەر کاروباری خۆیان. یارمەتیی چەند مانگی

رابردوو بدرێ بەو کەسانەی کە لەسەر کار لابردراون.

٦- خەساراتی نەقدی بدرێ بە هەموو ئەو کەسانەی کە لە تێک هەڵچوونەکانی ئەو دواییەدا زیانیان وێ کەوتووە.

٧- هەموو ئەو ئەفسەر و دەرەجەدارە کوردانەی کە لە پێوەندی لەگەڵ مەسەلەی کوردستان جێگا و ئەرکی خۆیان بەجێ هێشتووە، لە ئۆرگانە ئینتزامییەکانی ناوچەی خودموختاریدا کاریان پێ بسپێردرێ.

٨- ئەو بڕیارنامەی پێوەندیی بە هەڵوەشانی حیزبی دێموکراتی کوردستانەوە هەیە، ڕەد بکرێتەوە.

**١١ی ڕەشەمەی ١٣٥٨**

دوایە بۆ هەینەتیش دەرکەوتبوو کە مەسەلەی وتوویژ لە بنەڕەت را فرت و فێڵە، ئەوانیش سارد بوونەوە و زۆریان خۆ لێ ئەدا و کە گەڕانەوە تاران، ئەهاتنەوە.

زۆر دیاردەی بەکردەوە هەبوون کە حیزب و خەڵک بە مەسەلەی وتوویژ ڕەش بین کەن و ناهومێد بن، بەڵام بۆ ئەوەی ئاڵۆزی ساز نەبێ زۆر شتی ناڕەواش لە کاربەدەستانی ڕێژیم قبووڵ دەکرا. هەبوون هێندێک گێرە شێوێنیش کە هەوڵیان دەدا وەزعەکە بشێوێنن.

سەرەڕای ئەوەی وەزعەکە لە زۆربەی شارەکان بێ ڕێککەوتن لەگەڵ ڕێژیم ناسایی ببووەوە، دەفتەرکانی حیزب بە پێچەوانەی هەڵوەشاوە ڕاگەیاندنیشی لە لایەن خومەینییەوە لە زۆربەی شارەکان داندرابوونەوە، زۆر زیاتر لە جاران تێدەکۆشان، بەڵام هومێد بۆ هەتا سەرمانی ئەم وەزعە کەم بوو. بۆیە ڕێبەریی حیزب بڕیاریدا لەم هەلومەرجە ڕەخساوە کەڵک وەرگرێ و چوارەمین کۆنگرەی حیزب ببەستێ و لەم کۆنگرەدا جگە لە هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندییەکی شیاوی بارستایی بەرپرسایەتی و بارە جۆراوجۆرەکانی کاروباری حیزبی، هەڵسەنگاندنێک لە ڕابردوو بکا و بەرنامەیەکی باش بۆ داهاتوو دابڕێژێ.

بەشی سێیەم

# کۆنگرەی چوارەم و قۆناغێکی نوێی تێکۆشان

کۆنگرەی چوار بەدوای هەڵبژاردنی نوێنەرەکان لەلایەن کۆنفرانسی کۆمیتە شارستانەکانەوە، لە رۆژی ٥٨/١١/٣٠ تا ٥٨/١٢/٥ بە بەشداریی ٣١٠ کەس بە شێوەی ئاشکرا لە سالۆنی سینەما نومێد بەڕێوە چوو. دوای کۆنگرەی یەک و پاش ٣٤ ساڵ ئەوە یەکەم کۆنگرە بوو کە بە ئازادی لە کوردستانی ئێران و لە شاری مەهاباد زێدی حیزبی دیموکرات دەبەسترا.

لەم کۆنگرەدا بە دوای راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی و باس کردن لەسەری، بە لەبەر چاوگرتنی هەلومەرجی تایبەتی و هومێد بە درێژەدانی وتووێژ لەگەڵ رێژیم و گەیشتن بە خودموختاری یەکێک لە خاڵە گرینگەکانی بەرنامەی حیزب کە بۆ هەر حیزبێکی پێشکەوتنخواز و دیموکرات پرینسیپێکی گرینگە، واتە «ئەسڵی جیایی دین لە دەوڵەت» هەڵگیرا.

لەبەر ئەوەی تێکۆشانی حیزب لە ماوەی پێش کۆنگرەدا زۆر بەرچاو بوو، حیزب توانیبووی بەشێکی زۆر لە رۆشنبیران و ئەفرادی زانستگەدیتوو بۆ لای خۆی رابکێشێ.

بۆیە لە راستیدا تەرکیبی کۆمیتەی ناوەندی ئاڵ و گۆڕی بەسەردا هات و ئەو کەسانەی ژێرەوە بە ئەندامەیتی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران: غەنی بلووریان، دوکتور قاسملوو، جلیل گادانی، حەسەن شیوە سەلی، فەوزیە قازی، ئەمیر قازی، مستەفا شەلماشی، دوکتور شەرەفکندی، رەحمان کەریمی، عبداللە حەسەن زادە، جهانگیر ئیسماعیل زادە، فاروق کەیخسرەوی، سەرگورد عەبباسی، ئەوید موعینی، سەنار مامەدی، حسن رەستگار، ئەحمەد عەزیزی، کەمال دەباغی، قادر عەبدی، هاشم کەریمی، رەحیم سەیف قازی، مستەفا هیجری، ئەبوبەکر هیدایەتی، سەید رەسووڵ دیهقان، حسێن مەدەنی.

هەروەها مامۆستا هێمن وەک ئەندامی ئیفتخاریی کۆمیتەی ناوەندی لە لایەن کۆنگرەوە دیاری کرا.

لەم کۆنگرەدا کۆمیتەیەکی یازدەسیش کە بریتی بوون لە: فەتتاح کاویان، سەرهەنگ قادری، قادر شهابی، سەدیق قموی پەنجە، دوکتۆر خوسرەوی، سەعید سولتانیان، سەرهەنگ رەبیعی، سەروان نەفشین، موهەندیس ناریا، عەلی حسنیانی، محەمەد پوور نازر، هەڵبژێردرا.

چەند کەسێکیش لەیەکەم پلینۆمدا وەک ئەندامی موشاور هەڵبژێردران: سەید حەسەن هاشمی، عوسمان نەسراری، فەرەیدون میتران، رەسووڵ پێشنماز، سەید عەلی رەحمانی، رەحمان حاج ئەحمەدی، حسێن ئیبراهیمی، سەلیم بابانزادە، عەزیز ماملێ، شاپوور فیروزی، حسن شەرەفی، رەحمان کازێیی، تەها حمق تەڵەب.

هەر لەو پلینۆمەدا ئەندامانی دەفتەری سیاسی لە نێو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران کە دوکتۆر قاسملوو، وەک سکرتێر، غەنی بلوریان، جەلیل گادانی، مستەفای هیجری، ئەمیر قازی، عبدالله حەسەن زادە و مستەفا شەلماشی بوون.

بۆ ئاگادرایی وردتری خوێنەران لە کۆنگرەی ٤ ، دەقی ئیعلامییەکەی لە ژێرەوە بەرچاوتان دەکەوێ:

## راگەیەندراوێک لەسەر کۆنگرەی چوارەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

لە رۆژەکانی ۳۰ی رێبەندان تا ٥ی رەشەمەی ۱۳٥۸ کۆنگرەی چوارەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە شاری مەهاباد پێکهات. لەم کۆنگرەدا ۳۱۰ کەس لە نوێنەرانی هەموو بەشەکانی کوردستانی ئێران بەشدارییان کرد. ئەو ۳۱۰ کەسە لە نوێنەرایەتیی زیاتر لە ۳۰ هەزار کەس لە ئەندامانی حیزبیان بە ئەستۆوە بوو. لە نێو بەشدارانی کۆنگرەدا زۆربەی ئەندامانی کۆن و دامەزرێنەرانی حیزب و بەشێکی زۆر لە لاوان و ژنان کە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران، ئەندامەتیی حیزبییان وەرگرتبوو، ئامادە بوون. کەم تەمەنترین ئەندامی بەشدار لە کۆنگرەدا ۱۸ ساڵ و بە تەمەنترینیان ٦٥ ساڵ بوو، نێونجی تەمەنی بەشداران دەگەیشتە ۳٥ ساڵ. لە پێوەندی لەگەڵ رادەی خوێندندا ۲/٥ ٪ لە بەشداران خاوەنی پلەی «فوق لیسانس» و دوکتورا، ۱۰ ٪ «فوق دیپلۆم و دیپلۆم»، ۲۹ ٪ کەمتر لە دیپلۆم، علومی دین هەتا شەشەمی سەرەتایی، ۲٥ ٪ خوێندنی سەرەتایی و کەمتر لە شەشەمی سەرەتایی و ۳/٥ ٪ بێ سەواد بوون. بە

سروودی ئەی رەقیب کۆنگرە دەستی بەکار کرد. دوایی بەشداران بۆ رێزگرتن لە گیانی پاکی شەهیدانی رێگای ئازادیی کوردستان و سەرانسەری ئێران، یەک دەقیقە بێ دەنگییان پاراست. ئەوجار هاورێ غەنی بلوریان ئەندامی دەفتەری سیاسی حیزب، خەباتگێری ماندوونەناس کە ٢٥ ساڵ لە ژیانی خۆی لە زیندانەکانی رێژیمی شا تێپەڕ کرد، کۆنگرەی کردەوە هاورێ بلوریان لە قسەکانی خۆیدا ئیشارەی بە گرینگی کۆنگرەی چوارەم کرد و هیواداریی دەربڕی کە کۆنگرە بتوانێ بە باشی لە ئەنجامی ئەو ئەرکانەی کە لە دەستووری کاریدایە بێتە دەرێ. دوایی کۆنگرە کاری خۆی دەست پێکرد.

لە پێشدا شەخسییەتی سیاسی و مەزهەبیی کورد سەید عیزدین حسێنی کە لە کۆبوونەوەی کردنەوەی کۆنگرەدا ئامادە ببوو، دوایی صارم الدین صادق وزیری خەباتگێری دێرین و دۆستی بە وەفای حیزب، پەیامەکانی خۆیان بۆ کۆنگرە نارد و ئارەزووی سەرکەوتنیان بۆ کۆنگرە خواست. ئەوجار پەیامەکانی ئەو رێکخراوانەی ژێرەوە لە کۆنگرە خوێندرایەوە. رێکخراوی موجاهیدینی گەلی ئێران، رێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان (کۆمەڵە)، رێکخراوی چریکە فیداییەکانی گەل، بەرەی دێوکراتیکی نیشتمانی، شوورای هاوپێوەندیی گەلەکان، کۆمەڵەی کوردەکانی جێگیر لە ئاوەند، نوێنەری رێکخراوی حیزبی دێوکراتی کوردستان لە ئورووپا- سەپان، حیزبی کۆمونیستی عێراق، حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستانی عێراق، حیزبی کۆمۆنیستی فەرانسە، حیزبی سۆسیالیستی ئیتالیا، حیزبی کۆمونیستی بلژیک، حیزبی کۆمونیستی بریتانیا، حیزبی کرێکارانی کوردستانی تورکیە و فیدراسیۆنی کۆمەڵەی کرێکارانی کوردستان (کومکار).

دوای خوێندنەوەی پەیامەکان، سکرتێری گشتی حیزب دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو، راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی پێشکەش بە کۆنگرە کرد. دوایی کۆنگرە کۆمیسیۆنەکانی ژێرەوەی هەڵبژارد. کۆمیسیۆنی بەرنامە و ئەساسنامە، کۆمیسیۆنی قەتعنامە و پەیام، کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن و کۆمیسیۆنی ماڵی.

ئەوجا باس سەبارەت بە راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی دەستی پێکرد و بەشێکی زۆر لە نوێنەران لە پێوەندی لەگەڵ ئەو راپۆرتە بیروڕایان دەربڕی. لە کۆتایی باسەکەشدا دوکتور قاسملوو بیروڕا و پێشنیارەکانی کورت کردەوە و وەڵامی بەشێک لە رەخنەکانی داوە، لە پێوەندی لەگەڵ مەسەلە جۆراوجۆرەکان رێنوێنی پێویستی پێشکەش بەکۆنگرە کرد.

کۆنگرە بە لەبەر چاوگرتنی «ئیسلاحات» و پێشنیارەکانی پێویست، ڕاپۆرتی پەسەند کرد. ئەوجا کۆنگرە گوێی دایە ڕاپۆرتی کۆمیسیۆنی بەرنامە و ئەساسنامە، کۆمیسیۆن پێشنیاری ئاڵ و گۆڕێکی زۆری لە بەرنامە و ئەساسنامەدا کردبوو. نوێنەرانی کۆنگرە بە درێژی لە پێوەندیی لەگەڵ ئەو ئاڵ و گۆڕانەدا بیروڕایان دەردبڕی، پاشان بەرنامە و ئەساسنامە لە لایەن کۆنگرەوە پەسند کرا.

کۆنگرە بە پێی بەرنامەی لە پێشدا دارێژراو، کۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژارد و بە ڕای نهێنی ٢٥ کەسی بە ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران هەڵبژارد. هەروەها کۆنگرە ١١ کەسی وەک ئەندامی کۆمیسیۆنی «بازرەسی» دیاری کرد. ئەوجا لە لایەن کۆنگرەوە ئەو پەیامانە نێردران: پەیام بۆ حەزرەتی آیت الله العظمي ئیمام خومەینی، پەیام بۆ سەرکۆمار، دوکتۆر ئەبولحەسەن بەنی سەدر، پەیام بۆ بنەماڵەی شەهیدان و کەم ئەندامانی شەڕ، پەیام بۆ گەلانی ئێران، پەیام بۆ ئەحزاب و ڕێکخراوە نیشتمانی و دێموکراتییەکان لە سەرانسەری ئێران، پەیام بۆ گەلی کورد لە کوردستانی ئێران، پەیام بۆ پێشمەرگەکانی کوردستان. پەیام بۆ ئەندامانی حیزب، پەیام بۆ جوولانەوەی ڕزگاریدەری جیهان، پەیام بۆ گەلی کورد لە دەرەوەی ئێران و پەیام بۆ گەلی فەلەستین.

پێش لە کۆتایی کۆنگرە، هاوڕێ غەنی بلووریان سوپاسی لە نوێنەرانی کۆنگرە، لە کۆمیتەی ئامادەکردن، لەو پێشمەرگانەی کە پاراستنی کۆنگرەیان بە ئەستۆوە بوو، کرد و هەروەها سوپاسی لەو میواندارانە کرد کە ئەرکی پێ ڕاگەیشتن بە نوێنەرانیان لە ئەستۆ بوو.

کۆنگرە هێمنی وەک ئەندامی ئیفتخاریی کۆمیتەی ناوەندی دیاری کرد و «عینوانی» شاعیری نیشتمانیی گەلی دایە. دوکتۆر قاسملوو لە بەشێکی دیکەی قسەکانیدا کە پێوەندیی بە گرینگیی کۆنگرەی چوارەم لە مێژووی حیزبدا بوو، ئاماژەی بۆ خەت و ڕێبازی سیاسی حیزب لە داهاتوودا کرد و، داوای لە هەموو نوێنەران کرد کە یەکیەتیی ڕیزەکانی حیزب بپارێزن و ناکامەکانی بەرچاوی کۆنگرە بۆ هەموو ناوچەکانی کوردستان باس بکەن. بەو جۆرە دوایی بەکاری کۆنگرە هێنا. کۆنگرە لە کەش و هەوایەکی بە تەواوی دێموکراتیدا پێکهات، دەریخست کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بە قووڵی پێبەند بە دێموکراسی و ئەسڵەکانیەتی، لەو چەند ڕۆژەدا کە کۆنگرە پێکهات، خەڵکی

مەهاباد و سەرانسەری کوردستان و تەنانەت بەشەکانی تری ئێران بە دڵخۆشییەکی زۆرەوە چاوەڕوانی کارەکانی کۆنگرە بوون و سەدان پەیامی نووسراوە و تەلیفۆنییان بۆ کۆنگرە نارد. لە ماوەی کۆنگرەدا خەڵکی کوردستان دووبارە پشتیوانیی بێ ئەم لاو ئەولای خۆیان لە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دەربڕی و نیشانیان دا کە لەگەڵ رێبەرایەتی خەباتگێڕی حیزبە خۆشەویستەکەیان پێوەندییەکی نەپچڕاوەیان هەیە.

پاش نیوەڕۆی رۆژی ٥شەممەی مانگی رەشەمە، کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی چوارەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە کۆبوونەوەی خۆیدا دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملووی بە سکرتێر دیاری کرد. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا دەفتەری سیاسی و چەند کەس وەک مشاوری کۆمیتەی ناوەندی دیاری کران. هەموو مەدارکی کۆنگرەکە بریتین لە: راپۆرت، پەیامەکانی گەیشتوو و پەیامەکانی نێردراو،بەرنامە و ئەساسنامەی تازە لە داهاتوویەکی نزیکدا لە لایەن دەبیرخانەی کۆمیتەی ناوەندییەوە بڵاودەکرێنەوە

**دەبیرخانەی کۆمیتەی ناوەندیی**

**حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران**

**١٣٥٨/١٢/٦**

بە دوای کۆنگرەدا هێندێک لەوانە کە دەنگیان نەهێنابووەوە و ئێستاش بە خەیاڵی خۆیان وا دەزانن پیلانێک لە گۆڕێدا بووە، چووبوونە بن پیلی کاک غەنی ئەویش کە لە کۆنگرەدا دەنگی لە دوکتور قاسملوو زیاتر هێنابووەوە لە خۆیایی ببوو، حیزبی توودەش بۆ لاواز کردنی حیزبی دیموکرات و لەسەر بۆچوونی ناڕەوای کۆنی خۆی کە دەبێ حیزبی دیموکرات ببێتە لقی حیزبی توودە، بانگێکی شەیتانییان بە گوێدا دابوو، تووشی نامۆیی هاتبوو، بۆ خۆشی نەیدەزانی چی دەوێ و بۆ کوێ دەچێ.

بۆ نموەی وەزعەکە نەشێوێ وهەر دوای کۆنگرە تووشی کێشە نەبین، بە پێچەوانەی ئەساسنامە، پێشنیار بە کاک غەنی کرا ببێتە سەرۆکی حیزب، قبووڵی نەکرد.

لە یەکەم پلینۆمی دوای کۆنگرەدا کە لە ماڵی پێشەوا گیرا، پێشنیاری سکرتێریشی پێ کرا، قبووڵی نەکرد. هەرچەند کەسانی هەلپەرستیش هەبوون، ویستیان لە ناتەباییەکە بە قازانجی خۆیان و حیزبی توودە کەڵک وەرگرن، بەڵام سەرنەکەوتن.

دوکتور قاسملوو بە سکرتێری حیزب هەڵبژێردراوە، ئەندامانی مەکتەبی سیاسی هەڵبژێردران، کاری لە نێو ئەندامانی رێبەرایەتیدا بەش کرایەوە.

هەر ئۆرگانەی خەریکی کاری خۆی بوو، کۆمیسیۆنێکی تازەش کە پێشتر دامەزرابوو، بەلام شکلی زۆر رەسمیی نەبوو، بۆ کاروباری پێشمەرگە بە سەرپەرستی سەرگورد عەبباسی، رەسمییەتی پەیدا کرد.

لە پلینۆم دا باس لەسەر پێویستیی درێژەدانی پێوەندیی لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی کرا، بەڵکو بتوانن راستییەکانی کوردستانیان لێ حالی کەن و دان بەم مافە رەوایەدا بێنن و بۆ هەمیشە کۆتایی بە شەڕ و کوشتار بێ و بە شێوەی ئاشتی خوازانە چارەسەری گیروگرفتەکان بکەن.

بۆیە لە دەفتەری سیاسی بڕیار درا هەیئەتێکی حیزبی بچێ بۆ تاران، دوکتۆر حەسەن بەنی سەدر، سەرکۆمار ببینێ و وەزعی کوردستان و بۆچوون و پێشنیارەکانی حیزبی پێ رابگەیەنن، بەڵکوو بتوانێ ئاخوندەکانیش بێنێتە سەر ئەو رایە، لە بابەت سەفەری ئەم هەیئەتە لە رێکەوتی ٥٨/١٢/٢١ لە لایەن دەفتەری سیاسی حیزبەوە ئاگاداریەک بلاو بۆتەوە، ئەوەش دەقەکەیەتی:

## سەبارەت بە ناردنی وەفدی نوێنەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستان

**هاونیشتمانانی بەڕێز:**

لەبەر ئەوەی کە دوای یەکەم کۆبوونەوەی رەسمیی وەفدی نوێنەرایەتیی گەلی کورد، لەگەڵ وەفدی تایبەتیی دەوڵەت، وتووێژەکانی ئاشتی کوردستان راوەستابوو، رۆژی ٢ی رێبەندانی مانگی رابردوو حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە نامەیەکدا کە بۆ دوکتور بەنی سەدر سەرکۆماری ئیسلامیی ئێرانی نارد، وێڕای باسی مەسەلەکانی کوردستان و هەروەها هێندێک لە روانگەکانی حیزب، داوای لە سەرکۆمار کرد کە بۆ حەللی گیروگرفتەکانی کوردستان و قسەو باسەکان، وەفدی نوێنەرایەتیی حیزبی دێموکراتی کوردستان سەبارەت بە گیروگرفتەکانی کوردستان قبووڵ بکا.

بە دوای راگەیاندنی موافقەتی ئاغای بەنی سەدر، رۆژی هەشتەمی رەشەمەی ئەم مانگە هەیئەتێکی پێنج نەفەرە بە نوێنەرایەتیی حیزبی دێموکراتی کوردستان بۆ تاران وەڕێ کەوت و بەیانیی هەر ئەو رۆژە لەگەڵ سەرکۆمار چاوپێکەوتن و وتووێژیان کرد. وەفدی حیزبی دێموکرات لەو چاوپێکەوتنەدا روانگەکانی حیزبی سەبارەت بە رێگا حەللی سیاسی و ئاشتیی گیروگرفتی کوردستان لەگەڵ ئاغای بەنی سەدر باس کرد و لایەنەکانی

جۆراوجۆری ئەو پیلانانەی کە بۆ گەلی کورد و شۆڕشی ئێران دەکار دایە، بۆ ئەو باس کرد. هەروەها داوای لەسەرکۆمار کرد هەرچی زووتر بڕیارنامەی پێوەندیدار بە هەڵوەشانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ڕەد بکاتەوە، هەتا حیزبی ئێمە بتوانێ بە شێوەی ڕەسمی و چالاکانە لە هەڵبژاردنی «مەجلیسی شوورا» دا بەشداری بکا. دوای باس و لێکدانەوەی مەسەلەکان بڕیار درا کە وەفد کاکڵی گشتیی ویستەکانی گەلی کورد گەڵاڵە بکا و بەهۆی ئاغای داریوش فرووهەر بیداتە ئاغای بەنی سەدر، هەتا دوای لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە لە لایەن سەرۆک کۆمار و شوورای شۆڕشەوە وەڵامیان پێ بدرێتەوە. ڕۆژی شەممە ۱۱ی ڕەشەممە وەفدی حیزبی دێموکراتی کوردستان ویستە بنەڕەتییەکانی گەلی کوردیان بە شێوەی تەرحێکی شەش بڕگەیی لە ژێر ناوی «رئوس کلی طرح خودمختاری» ئامادە و تەحویلی ئاغایان داریوش فرووهەر و مهندس سەباغیان ئەندامی وەفدی تایبەتیی دەوڵەت بۆ کوردستان دا. ئامادە کردنی ئەو گەڵاڵە ٦ بڕگەییە ڕاست بۆ ئەو ئامانجە بوو کە بە ڕاگەیاندنی ئەو ئەسڵە گشتییانە پێشی ئەندانی«بدخواهان» بگیردرێ و زەمینەیەکی سالم بۆ وتوویژ لە دەوروبەری شتە وردەکانی دیکە پێک بێ. ئەو ئەسڵە شەش ماددەییە بریتییە لە:

١- گەلی کورد لە چوارچێوەی سەربەخۆیی و تەواویەتی خاکی وڵاتی کۆماری ئیسلامیی ئێراندا بە مافی ئیشتمانی کە بە شێوەی خودموختارییە، بگا و ئەو مافە لە تەواوکەری یاسای بنەڕەتی «متمم قانون اساسی»دا بگونجێندرێ.

٢- چوارچێوەی جوغرافیایی کوردستان بە سەرنج دان بە وەزعی مێژوویی جوغرافیایی وئابووری و ویستی زۆربەی دانیشتوانی هەر ناوچەیەک دیاری بکرێ.

٣- کوردستانی خودموختاری شوورایەکی سەرانسەری لە جەرەیانی هەڵبژاردنێکی ئازاد، نهێنی، ڕاستەوخۆ و گشتی هەڵبژێرێ.

٤- شوورای سەرانسەری کوردستان وەفدێکی بەڕێوەبەری بە ئامانجی بەڕێوەبردنی کاروباری ئابووری، فەرهەنگی، ئیداری و ئینتزامی دیاری دەکا.

٥- زمانی کوردی لە مەڵبەندی خودموختاری کوردستاندا بۆ نامە نووسینی ئیداری و خوێندن لە پەنا زمانی فارسیدا بە ڕەسمی بناسرێ.

٦- هەموو کاروباری نێوخۆیی کە بریتییە لە: ئیداری، ئابووری، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و ئینتزامی، بدرێ بە ئۆرگانەکانی ناوچەی خودموختار.

وردەکارییەکانی ئەو گەلاڵەیە لە وتووێژەکانی دواییدا بە شێوەی گەلاڵەیەکی هەمەلایەنە، بە پەسندی ئۆرگانەکانی یاسادانانی کۆماری ئیسلامیی ئێران بگا.
لە کۆتایی گەلاڵەی شەش برگەیی پێشنیار کرابوو کە بە ئامانجی لە نێوبردنی شوێنەواری تێک هەڵچوونەکانی ناخۆشی یەک ساڵی دوایی کوردستان و پێکهێنانی زەمینەیەکی دۆستانە، ئەو هەنگاوانەی ژێرەوە هەڵبگیرێ:
١- لێبووردنی گشتی لە پێوەندی لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی کە بە شێوەیەک لە شێوەکان لە رووداوەکانی کوردستان بەشدار بوون، دەربکرێ.
٢- مووچە بدرێ بە پاشماوەی شەهیدانی تێک هەڵچوونەکانی کوردستان.
٣- بەرپرسانی کارەساتی قارنێ بناسێندرێن و موجازات بکرێن.
٤- یارمەتیی بازنشستەگی بدرێ بە هەموو ئەو کەسانەی کە لە جەرەیانی لێکدانەکانی کوردستاندا بوونە کەم ئەندام.
٥- هەموو زیندانییەکان لە هەردوو لا بێ ئەم لاو ئەولا ئازاد بکرێن و هەموو ئەو کارمەندانەی کە بە «اتهام»ی بەشداری لە رووداوەکانی کوردستاندا دوور خراونەتەوە یا لەسەر کار لابردراون، بگەڕێنەوە سەر کاروباری خۆیان و یارمەتیی چەند مانگی رابردوو بدرێتەوە بەو کەسانەی کە لەسەر کار لابردراون.
٦- خەساراتی نەقدی بدرێ بە هەموو ئەو کەسانەی کە لە جەرەیانی تێک هەڵچوونەکاندا زیانی ماڵییان وێ کەوتووە.
٧- هەموو ئەفسەر و دەرەجەدارانەی کە لە پێوەندی لەگەڵ مەسەلەی کوردستاندا جێگای مەئمووریەتی خۆیان بەجێ هێشتووە، لە رێکخراوە ئینتزامییەکانی ناوچەی خودموختاری کوردستان کاریان پێ بسپێردرێ.
٨- بڕیارنامەی پێوەندیدار بە هەڵوەشانی حیزبی دیموکراتی کوردستان رەد بکرێتەوە.
وەفدی نێردراوی حیزبی دیموکرات دوای چەند رۆژ مانەوە لە تاران، رۆژی هەینی رابردوو گەڕاوە کوردستان، ئەو جۆرە کە دەرکەوتووە، رۆژی شەممەی رابردوو، ئەو گەلاڵە لە لایەن وەفدی تایبەتیی کوردستانەوە درایە سەرکۆمار.
وتووێژی وەفد لەگەڵ سەرۆک کۆمار لە کەش و هەوایەکی برایانە ئەنجامی گرت و ئاغای بەنی سەدر سەبارەت بە حەللی ئاشتییانەی گیروگرفتی کوردستان و پەسند کردنی ویستەکانی بەرحەقی گەلی کورد، رووی خۆشی نیشان دا. ناردنی وەفدی حیزبی

دیموکراتی کوردستان و وتوویژیان لەگەڵ سەرۆک کۆمار لە ڕاگەیەنە گشتییەکاندا دەنگدانەوەیەکی بەربلاوی هەبوو و لە کۆڕ و کۆمەڵە سیاسییەکانی کوردستان باسێکی زۆری لێ دروست بوو. بەشێک لەم تاقم و دەستە سیاسییانەی کەبوونی خۆیان تەنیا لە وەڕێ خستنی هەڵلا و هەنگامەدا دەبینن، تێدەکۆشن خەباتی پڕ لە شانازیی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەکەدار بکەن، بیروڕای سەیریان دەربڕیوە و وەک هەمیشە حیزبی ئێمەیان خستۆتە ژێر بارانەی بوختانەوە. قسەی بنەڕەتی لەو زەمینەیەدا ئەوەیە کە گوایا ناردنی وەفدی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە مانای ڕەدی وەفدی نوێنەرایەتیی گەلی کوردە. لەو بارەوە یەکێک لە ڕۆژنامەکانی پاش نیوەڕۆی تارانیش گەلاڵەی شەش برگەیی(شەش ماددەیی) وەفدی حیزبیان لە جێگای گەلاڵەی ٢٦ برگەیی وەفدی نوێنەرایەتیی گەلی کورد نێو بردووە. جارێ با لەوە بگەڕێین کە جیاوازیی ئەو دوو گەلاڵەیە تەنیا لەو نوکتەدا خولاسە دەبێتەوە کە هی یەکەم مەسەلەکان بە گشتی بەیان دەکا و گەلاڵەی دووهەم، وردەکارییەکانیشی باس کردووە، وا دێتە بەرچاو کە ئەو حەزرەتانە ئەسڵی پێکهێنانی وەفدی نوێنەرایەتییان لەگەڵ هەڵوەشانی ئەندامانی ئەو تێکەڵ و لە ڕێکخراوێکی تازەدا بە هەڵە گرتووە.

بە بڕوای ئێمە خراپی لێ تێگەیشتوون. هەرکام لە ڕێکخراوەکانی ئەندام لە وەفدی نوێنەرایەتیی گەلی کوردا سەربەخۆیی تەواوی سیاسی و ئیدئولوژێکیان هەیە و مافی سروشتی هەرکام لەوانەیە کە جیاواز لەوانی دیکە لە هەر مەوریدێکدا بڕیاری لازم بدەن و یان لەگەڵ کاربەدەستانی وڵات پێوەندی بگرن، بیروڕای خۆیان لەسەر هەر مەسەلەیەک رابگەیەنن.

ئەندامانی وەفدی نێردراویش لە ماوەی مانەوەیان لە تاراندا و لە جەرەیانی وتوویژەکانیاندا رایانگەیاندووە کە ئەوان روانگەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانیان باس کردووە و ئامانج لە سەفەری ئەوان حەرەکەت پێدانی وتوویژەکانی ئاشتیی کوردستانە.

هەروەها تەنییدیان کرد کە لە گەڕانەوەی خۆیاندا وەفدی نوێنەرایەتی گەلی کورد لە جەرەیان بنێن. بێجگە لەوانە، چوون مومکینە کە حیزبی دیموکراتی کوردستان تێ بکۆشێ وەفدەکە لاواز بکا بۆ خۆی بنەڕەتیی ئەو وەفدە پێک دەهێنێ و لەوێدا ئەرکی قسەکەری بە ئەستۆوەیە. ئەو، بوختانە ناڕەوایانە تەنیا دەتوانێ بیروڕای ئەو تاقمانە بێ کە قسەیەکیان بۆ گوتن نییە و بوونی خۆیان لە نەبوونی خەڵکی دیکەدا دەبینن. لە هەمووی

سەیرتر ئەوەیە کە ئەوانە تێ دەکۆشن بوختانی «سازشکاری» لە حیزبی دێموکراتی کوردستان بدەن.ئەوانە بوختانی سازشکاری دەخەنە پاڵ حیزبێک کە ٣٥ ساڵ لە ڕێگای وەدی هێنانی مافی نیشتمانی و کۆمەڵایەتیی گەلی کوردا خەباتی کردووە و زیاتر لە کۆی ئەندامانی زۆربەی ئەو تاقمانە لە ڕێگای ئامانجەکانی خەڵکی کوردستاندا قوربانیی داوە. بوختانی سازشکاری لەو شتانەوە سەرچاوە دەگرێ کە پێش لە دەست پێکردنی تێک هەڵچوونەکانی کوردستان لە حیزبی ئێمەیان دەدا. ئێستا ئیتر پووچی ئەو شتانە بۆ هەموو کەس دەرکەوتووە.

خەڵکی کوردستان زۆر باش لە بیریان ماوە ئەوکات کە هێرشی ئەرتەش و سوپای پاسداران بۆ کوردستان دەستی پێکرد، کام حیزبی سیاسی بوو کە خەڵکی بە تەنیا بەجێ نەهێشت و لەگەڵ ئەوان حەماسەی خوڵقاند، هەروەها لە بیریان ماوە کە کام لەو تاقمانە بوون، کە دوای تێپەڕینی مانگێک لە گرتنەوەی شارەکانی کوردستان بە هۆی ئەرتەش و سوپای پاسداران بە پارێزەوە جورئەتیان بە خۆیان دا کە تەنیا لە چەند جێگا بەرەنگاری هێرشکەران بکەن.

خەڵک لە بیریان نەکردووە کە ئەو تاقمە بە چ شێوەیەک عەمەلیاتی پارتیزانیی پێشمەرگەکانی حیزبی ئێمەیان بە ناوی خۆیان تەواو دەکرد، کۆمەڵانی خەڵک و خودی ئەو حەزرەتانە دەزانن کە نەوەد دەرسەدی شەهید و کەم ئەندامەکان و زیان دیتووەکانی شەڕ سەر بە حیزبی دێموکراتی کوردستانن و ئەوەی کە لەوانە بە بیرەوەری بەجێماوە، دروشمی بێ نێوەڕۆک و بادانی ڕاستییەکانە.

خەڵکی کوردستان باش ئاگادارن کە دەیان ساڵ پێش دروست بوونی ئەو تاقمانە، حیزبی دێموکراتی کوردستان دابین کردنی ویستەکانی نیشتمانی و کۆمەڵایەتیی گەلی کوردی لەسەر دێڕی بەرنامەکانی خۆیدا دیاری کردووە و لەو ڕێگایەدا قوربانیی داوە.

دروشمی «بورژوایییانە»ی خودموختاری کە چەند مانگ دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران بەسەر ڕێژیمی پەهلەویدا لە لایەن خەڵکەوە بەسەر ئەو حەزرەتانەدا داسەپا، ٣٥ ساڵ پێش لە لایەن حیزبی ئێمەوە مەترەح کراوە. ڕاستییەکە ئەوەیە کە ئەو دوو ساڵەی ئاخری وەلا بنێن، لە ٣٥ ساڵی ڕابردوودا هەموو ئەو کەسانەی کە بە تاوانی خەبات لە ڕێگای ڕزگاریی گەلی کورددا زیندانی، جەزرەبە، ئیعدام، دوور خراوە، شەهید یا ئاوارە بوون، بێ ئەم لاو ئەولا، ئەندام و لایەنگری حیزبی دێموکراتی کوردستان بوون. لەو حاڵەتەدایە

کە ئەو کەسانەی ئێستا لە دڵی خۆیاندا ئیمانیان بە خودموختاری نییە، بوختانی سازشکاری لە حیزبی ئێمە دەدەن. بەڵام ئەگەر ئامانجی ئەو حەزرەتانە ئیعترازە بە سیاسەتی ئاشتیخوازانەی ئێمە، ئێمە جارێکی دیکەش رادەگەیەنین کە بەدەرس وەرگرتن لە کۆمەڵانی گەلی کورد لایەنگری توندوتیژی ئاشتییانەی گیروگرفتی کوردستانین و، هەرچەشنە رێگایەکی نیزامی مەحکووم دەکەین. ئێمە لەسەر ئەوە پێ دادەگرین کە تەنانەت کاتێکیش کە بۆ دیفاع لە بوونی ئامانجەکانی خەڵکی کورد دەست بۆ ئەسلەحە دەبەین، تەنیا لە رێگای داسەپاندن و جێگیرکردنی سوڵح بەشەڕ دێین و لە ئەزەر ئێمەوە شەڕ بۆ شەڕ رەد دەکرێتەوە.

لێرەدا بەبێ گرێ و گۆڵ رادەگەیەنین کە ئێمە خوازیاری گەیشتن بە تەوافوقین لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی و باوەڕمان وایە کە تەوافق لەگەڵ دەوڵەت لەسەر وەدی هێنانی ویستەکانی عادلانەی گەلی کورد ئەرکێکی شۆڕشگێرانەیە نەک هەنگاوێکی سازشکارانە. مەگەر ئێمە دەمانهەوێ لەگەڵ دەوڵەتێکی خاریجی تەوافق بکەین، هەتا لە قاودانەکەی بترسین. هەموو لە بیریان ماوە هاوینی رابردوو کە حیزبی ئێمە لە جەرەیانی بەیاننامەیەکدا رایگەیاند کە پاشگەز بوونەوە لە ئیسلاحاتی زەوی و وەزعی ئێستای زەوی تەنیا لە سەلاحییەتی دەوڵەتی ناوەندی دایە و رەوا نییە کە خەڵکی هەر ناوچەیەک بە، کەیفی خۆیان ئیقداماتێکی ئەوتۆ بکەن کە ناوچەکە تووشی ئاڵۆزی ببێ. بەڵام خەڵکی کوردستان دیتیان کە وەختێک تاقمێک لە مڵکداران بە دنەدانی دەست و پێوەندی شەڕ هەڵایسێن دەیانهەویست نیزامی ئاغا و رەعییەتی زیندوو بکەنەوە، تەنیا حیزبی دێموکراتی کوردستان بوو کە بە گەلاڵەیەکی فەوری پیلانەکەی لە ماکەدا کردە بلقی سەرئاو. سەیر ئەوەیە کە ماوەیەک دوای دەرکردنی بەیانییەی حیزب سەبارەت بە مەسەلەی زەوی لە لایەن شێخ عیزەدین حسێنی، ئاگادارییەک بە هەمان شێوە بڵاو بووەوە( کە زۆر بەجێ و جێگای پەسند بوو) بەڵام حەزەراتی زۆر لایەنگری جووتیاران قەت دەنگیان نەهاتەدەر و بچووکترین ئیعترازیان نەگرت، بانێک و دوو هەوا. ئێمە حەقمانە کە بپرسین لە ساڵی ١٣٣١ وەختێک کە حیزبی دێموکراتی کوردستان راپەڕینی جووتیارانی ناوچەی بۆکان و چۆمی مەجیدخانی بەرامبەر بە ئاغاکانی داگیرکەر رێبەری دەکرد، لە کوێ بوون ئەو ئاغازادانەی کە ئێستا عەوام خەڵەتێنانە بەردی پارێزگاری لە جووتیاران لە سینگ دەدەن، ئەگەر بۆ خۆیان ئێستا لاو وسادقن و ئەو رووداوانەیان لەبیر

نییە، دەتوانن لەخزمەکانیان و لە بابیان پرسیار بکەن، هەتا روون بێتەوە کە چ کەسانێک لە مافی جووتیاران پارێزگارییان کردوە. عەجەب شۆڕشگێرانێک، منداڵانی شیرەخۆر و جووتیارانیان بە لانکەوە دەنێودڕاست ناوێ داویشت. نوکتەیەکی جێگای باس ئەوەیە کە هێندێک باسی گفتوگۆی غەیرە رەسمیی وەفدی حیزبی دێوکراتی کوردستان دەکەن. لەو بارەوە دەبێ بڵێین ئێمە بە پێچەوانەی ئەوان دەستوور بە خەڵک نادەین، بەڵکو لە خەڵکی کوردستان فەرمان و ئیلهام وەردەگرین. بە بڕوای ئێمە گرینگ ئەوە نییە کە چ کەسێک دەبێتە هۆی ئەوەی کە مافی ڕەوای گەلی کورد بە رەسمی بناسرێ. گرینگ وەدی هاتنی ویستەکانی مێژوویی خەڵکی کوردستانە، هەر دەستە یان شەخسییەتێک بتوانێ بە تێکۆشانی بەردەوام مافی ڕەوای خەڵک بێنێتەدی، ئێمە نەتەنیا بەربەرەکانیی لەگەڵ ناکەین، بەڵکو هەنگاوەکانی وی پەسندیش دەکەین، رێز بۆ تێکۆشانی بە ناکام گەیشتووی دادەنێین و بەرەسمی دەیناسین. ئەوە خەڵکن کە دەبێ قەزاوەت بکەن، سروشتییە، کە ئەگەر حیزبێک بە پێچەوانەی ویستەکانی ڕەوای گەلی کورد بیهەوێ بسازێ، پێگەی کۆمەڵایەتیی خۆی لە دەست دەدا و لەگەڵ خەڵک ڕووبەڕوو دەبێتەوە. هەر وەختێک خەڵک مافی ڕەوای خۆیان وەدەست بهێنن، هەر دەستەیەک بەرامبەریان راوەستێ، فاتیحای خۆی دەخوێنێ و، لە ریزەکانی دژی خەڵکدا خۆی دەبینێتەوە. مەگەر پێکهاتن و دروست بوونی ئەحزاب و دەستە و کۆمەڵەکان ئامرازێک نین بۆ گەیشتن بە ئامانج؟ لەو حاڵەتەدا کە کاتێک حیزب یان دەستەیەک ناتوانێ یان نایهەوێ لە وەدەست هێنانی ئامانجێکدا ئەرکێک بەڕێوە بەرێ، بۆچی دەبێ پێ دابگرێ کە خەڵکی دیکە مافیان نەبێ لەو رێگایەدا تێبکۆشن و وەختێک کە بەشێکی زۆری ئەو تاقم و دەستانەی رێژیمی ئێستای ئێران بە کۆنەپەرست و دژی گەلی دەزانن و ئەوانە کە لە وەفدی نوێنەرایەتیی گەلی کوردا ئەندامەتییان هەیە، تەنیا بە مەبەستی لە قاودان و ریسواکردنی رێژیمی ئێستا ئامادەی وتووێژن و لە پەنا ئەوەدا هەموو رۆژێ بانگی«هل من مبارز» دەدەن، بۆچی ناڕەحەتن لەوە کە، حیزبێکی ئاشتیخواز یان بە قەولی حەزدرات سازشکار لە رێگای حەللی ئاشتییانەی گیروگرفتی کوردستاندا هەنگاو هەڵبگرێ. ئەو دەستانە کە تا ئەورۆ خەڵکی کوردستان بچووکترین ئاگادارییان لە بەرنامە و مەرامنامەی ئەوان نییە، ئەگەر بێجگە لە دوژمنی لەگەڵ حیزبی دێوکراتی کوردستان شتێکی دیکەیان هەیە، باشتر ئەوەیە کە لەگەڵ خەڵک باسی بکەن، ئێمە دڵنیاتان دەکەین کە گەلی ئێمە رق داگرتنی

ئەوانیان سەبارەت بە حیزبی دیموکرات دەرک کردووە و وەختی ئەوە هاتووە کە ئەگەر کالایەکی تریان هەیە، پێشانی خەڵکی بدەن، بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە دوژمنی لەگەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستان بێجگە لە ناوزڕاوی و ریسوایی ناکامێکی تری ناتوانێ هەبێ. ئەو حیزبە لە نێو دڵی کۆمەڵانی خەڵک رەگی داکوتاوە و دوژمنی لەگەڵ حیزب بە مانای دوژمنی لەگەڵ زۆربەی کۆمەڵانی گەلی کوردە، کەوا بوو هەتا تەپڵی ریسوایی یان لێ نەدراوە، باشتر وایە دەست لەو شێوە کۆن و تاقیکراوانە هەڵبگرن.

لە کۆتاییدا پێویستە ئەوە بڵێین کە حیزبی ئێمە هیچ کاتێک لە رێگای ئەو جۆرە بوختانانەوە هان نادرێ و وەدوای ئەو کردەوە ئانارشیستانەی هێندێک لەو تاقمە بێ مەسئوولییەتانە ناکەوێ، کە لە زەمانی شەڕدا هەڵاتن بەسەر مانەوەدا فەرز دەکەن و لە زەمانی ئاشتیدا دەست دەکەن بە ئاڵۆزی و شەڕسازکردن.

ئێمە بە وشیاری و ئاگاهیی خەڵکی کوردستان ئیمانی پتەومان هەیە و دڵنیاین کە هەموو ئەو تێکۆشانە رەزیلانەیەی کە بۆ تەنیا هێشتنەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان دەکرێ، خەڵک رۆژ لەگەڵ رۆژ زیاتر لە دەوری دروشمەکانی ئەو حیزبە کۆ دەکاتەوە. ئێمە باش دەزانین کە خەڵکی کوردستان هیچ کاتێک شەڕخواز نەبووە و نییە و بە شاهیدی مێژوو تەنیا کەسانێک لە نێو شەڕدا بەربەرەکانییان کردووە کە شەڕخواز و شەڕهەڵایسێن نەبوون، جیاوازی هەیە لە نێوان شەڕکەری خەباتگێڕ و شۆڕشگێڕی لەگەڵ شەڕهەڵایسێنی ئانارشیست. هەرکاتێکیش خودای ناکەردە «بدخواهان» شەڕێکی دیکە بەسەر خەڵکی کوردستاندا داسەپێنن، دڵنیاین کە ئیددیعای ئێمە دەردەکەوێ و جارێکی دیکەش مێژوو دووپات دەبێتەوە.

**دەفتەری سیاسیی**

**حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران**

**١٣٥٨/١٢/٢١**

هەر لە مانگی رەشەمەدا مەسەلەی هەڵبژاردنی سەرانسەری نوێنەرانی خەڵک بۆ مەجلیسی شووڕای میللی هاتبووە گۆڕێ. لەم بوارەدا بۆ ئەوەی حیزبی دیموکرات جارێکی دی نیەت پاکیی خۆی نیشان بدا، ئامادەیی خۆی بۆ بەشداری لە راگەیەندراوێکی رەسمیدا کە لە لایەن ستادی هەڵبژاردنی حیزبەوە چاپ و بڵاوکرایەوە، ئاشکرا کرد و نوێنەرەکانیشی بە بەرنامەیەکی گشتی کاردەوە ناساند. ئەوەش دەقی راگەیەندراوی ژمارە یەک:

گەلی قارەمانی ئێمە لە سەنگەرێکی دیکەوە خەبات درێژە پێ دەدا.

خەباتی بێ وچان و قارەمانانەی گەلەکەمان هەلێکی خولقاندووە تا بتوانین نوێنەرانی راستەقینە و رۆڵە بەشەرەفەکانی گەل بە نوێنەرایەتیی مەجلیسی شورای میللیی ولاتمان هەڵبژێرین.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە شانازییەوە بە ناساندنی پیاوانی شۆڕشگێڕ و هەڵکەوتووی خۆی ئەو جۆرەی کە پێویستە بە ئێوە خوشک و برایانی کوردستانی خزمەت دەکا. ئەوانە ئەو پیاوە بەناوبانگانەن کە تا ئێستا لە سەنگەری ئازادیخوازیدا بە دڵێکی پاک و باوەڕێکی راستەقینە و خۆبەخت کردنێکی بێ وێنە نیشانیان داوە کە چلۆن دەبێ لە مافی گەلان و خەڵکی چەوساوە وەجواب بێن و بە ئەرکی مێژوویی خۆیان راپەڕن.

ئێستا بۆمان هەڵکەوتووە تا خەباتکەرانی ئێمە لە ناو مەجلیسی شورای میللیدا سەنگەرێکی دیکە بۆ دامەزراندنی دیموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان بگرن. لەسەرتانە بە دەنگدان بەو ئینسانە بە شەرەفانە بتوانن ئەرکی نەتەوەیی خۆتان بەجێ بێنن هەنگاوێکی باش لە پێناوی سەندنی مافی ڕەوای گەلان و خەڵکی زەحمەتکێشی کوردستان هەڵێنن. بەرنامەی گشتی کاری دوارۆژی کاندیداکانی حیزبمان لە مەجلیسی شورای میللی دا ئەوانەی خوارەوەن:

١- خەبات لە دژی ئیمپریالیزمی جیهانی بە سەرکردایەتیی ئەمریکا.

٢- هەوڵدان لە ڕێگای دامەزراندنی دیموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستانی ئێران.

٣- خەبات لە دژی کۆنەپەرستانی ئێوخۆ.

٤- دیفاع لە مافی رەنجبەران.

٥- پەرەپێدان و گەشەپێدانی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و باش کردنی ژیانی لادێیەکان.

٦ هەوڵدان بۆ سەنعەتی کردنی کوردستان و بن برکردنی ریشەی چەوسانەوەی ڕێژیی گەندەڵی پێشوو کە بۆتە هۆی دواکەوتوویی ئێمە.

٧- کێشانی ڕێگاوبان بۆ گەشەسەندنی ئابووری بە تایبەتی لە کوردستاندا.

٨- پێشنیاری چارەسەرکردن و هەوڵدان بۆ لە نێوبردنی کەمایەتیی خانوو و ئاوەدان کردنەوەی ولات.

٩- هەوڵدان بۆ لەبەین بردنی بێکاری و پێکهێنانی هەلومەرجی باش بۆ کارکردن.

١٠- پەرەپێدانی لەش ساغی لە هەموو ولات و دابین کردنی داو و دەرمان و حەسانەوەی خەڵک ئەو جۆرەی کە پێویستە.
١١- کردنەوەی مەدرەسە بۆ هەموو دەورەکان لە دێهات و دامەزراندنی زانستگا و مەدرەسەی پێشکەوتوو لە شارەکان.
١٢- هەوڵدان بۆ وەدی هێنانی بەرنامەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کە لە کۆنگرەی چوارەمی حیزب بڕیاری لەسەر دراوە.

ناوی کاندیداکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بۆ مەجلیسی شوورای میللی ئەوانەی خوارەوەن:

١- مەهاباد، غەنی بلوریان.
٢- ورمێ، دوکتۆر رەحیم سەیفی قازی.
٣- سەردەشت و پیرانشار، قادر عەبدی.
٤- بۆکان، ئەبوو بەکر هیدایەتی.
٥- شاهیندژ و تیکاب، یوسف ریزوانی.
٦- سەقز و بانە، موهەندیس فاروق کەیخەسرەوی.
٧- سنە، رەحیم بەغدادی و ئەمیر پاشایی.

هەروەها لەو برایانەی خوارەوە بە ناوی کاندیدای پەسند کراو پشتیوانی دەکا:

١- نەغەدە، مستەفا هیجری.
٢- ماکۆ، قوتبەدین عومەر پوور.
٣- مەریوان، بابا عەلی میهرپەروەر.
٤- پاوە و هەورامان و جوانڕۆ، عین الدین زیایی.
٥- ورمێ عبدالله سەیتقو.

**ستادی ئینتخاباتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران**
**١٣٥٨/١٢/١١**

دیارە چەند راگەیەندراوی دیکەش لەم بارەوە لە لایەن ستادی هەڵبژاردنەوە دەرچووە، بەڵام بە هێنانی دانەی یەکەم قەناعەت دەکەین.

لەو هەڵبژاردنەدا لە ناکامی تێکۆشانی بێ وچانی هاوڕێیانی ستادی هەڵبژاردن، کردەوەی راست و دروست و دیموکراتیک بوونی هەڵبژاردنەکە بە تێکڕا، رادەی بڕوای

گەلی کورد بە حیزبی دیموکرات، کاندیداکانی حیزبی دیموکرات و نموانەی تەئییدی کردبوون لە زۆربەی شوێنەکان زۆرترین دەنگیان وەدەست هێنا کە لەم بەشەدا جەدوەلی بەشێک لە کاندیداکان، ناوی شارەکان و رادەی دەنگەکانتان بەرچاو دەکەوێ:

بەداخەوە بەشی دیکە لەم جەدوەلە بەدەستەوە نییە، بەڵام هەموو خەڵکی شاری

مەهاباد دەزانن کە غەنی بلوریان و کاندیدای حیزب لە ٩٥٪ بۆ سەرەوەی هێنابوو. لە هێندێک شوێنیش کەوتە دەوری دووهەم.

خومەینی لە ترسی ئەم سەرکەوتنە هەڵبژاردنی هێندێک شوێنی باتڵ راگەیاند و بێ ئاکام مایەوە. بۆیە ئەوانەی وەک کاک یوسف ریزوانی بۆ جاری دووهەم مابوونەوە، هەڵبژاردنەکەیان بە ئاکام نەگەیشت.

لە روانگەی حیزبەوە هەموو کات یەکێک لە پێداویستییەکانی بنەڕەتی، بوونی بەرەیەکی یەکگرتوو لە هێزە دێموکرات و خەباتکارەکان بووە، هەوڵدان بۆ ئەم مەسەلەشی بە ئەرکی پیرۆزی خۆی زانیوە و گەلێک جار باسی کردووە.

بەڵام دوای ئەو چەند مانگە کە بۆ حیزب روون ببووەوە، رێژیم خەریکی قایم کردنی جێ پێی خۆیەتی و دەیەوێ بۆ ماوەیەکی درێژ خۆ بەسەر خەڵکدا بسەپێنێ و شەڕ فرۆشییەکەش کە هەر رۆژە لە شوێنێک دیاردەکەی دەردەکەوت، جێگای لێ وردبوونەوە بوو. لەبەر ئەوە حیزبمان گەلاڵەیەک و داخوازی خۆی لەم بابەتەوە ئامادە کرد و بە هەموو هێزە شۆڕشگێڕەکانی راگەیاند: «با هەل لە دەست نەدەین و بەرەیەک پێک بێنین و بتوانین بە هاوکاریی یەکتری پێشی سەرەڕۆیی و سەپاندنی دیکتاتورییەتی درێژخایەن بگرین».

مخابن هەرکەس لە بیری رێکخراوی خۆیدا بوو، وەڵامی ئەم پێشنیارە بەنرخەی حیزبی ئێمەیان قەت نەداوە، دوایە پەنجەی پەشیمانییان دەگەست.

فارسەکان دەڵێن: « سال نیک از بهارش پیداست»، بەڵام وا دیارە ساڵی خراپیش هەروایە، کورد خۆش باوەڕ و دڵسافن، دەنا زۆر نیشانە هەبوون بۆ ئەوەی بزاندرێ رێژیم بە توندی خەریکی خۆسازدان و هێرش کردن بۆ سەر کوردستانە. زۆر جاریش چاوەڕوانی ئەوە بوو کە لە نێوخۆدا لەسەر دەسەڵات کێشە ساز بێ و رێگای هاتنەوەی کوردستان بۆ ئەو خۆشتر بێ، بەڵام بۆی ساز نەبوو. وازیشی نەهێنا و هێدی هێدی رێگەی خۆش دەکرد.

رێژیم لەسەروبەندی بەهاردا لە چەند شوێن شەڕ فرۆشیی کرد، هێرشێکی توندی بۆ کامیاران کرد، لەگەڵ قاسملووی نێوان شنۆ ورمێ هێزێکی زۆری هێنا و هاتە پێش، بەڵام لە بەرامبەر هێزی پێشمەرگەی حیزب و خەڵکدا شکا و بەسەر شۆڕی گەڕاوە. لە بانە شەڕێکی خوێناویی سازکرد و بوو بە هۆی دەربەدەریی خەڵکی بێ دیفاع.

هەر لە خاکەلێوەی ٥٨دا بە لایەنگریی دەرەبەگەکانی باکووری کوردستان لە

ناوچەکانی سۆما، تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ دژی زەحمەتکێشانی ئەم ناوچەیە شەڕێکی خوێناویی سازکرد.

کێشەی نێوخۆییش لە ژێر تەئسیری کۆماری ئیسلامی و حیزبی توودە درێژەی هەبوو. ئەم برینە رۆژ لەگەڵ رۆژ تەشەنەی دەسەند. سەرەڕای ئەوەی جارێک لە پلینۆمی دووهەمی دوای کۆنگرەی چوار کە لە گوندی برایم لە ناوچەی مەنگوڕایەتیی مەهاباد پێکهات، ناڕازییەکان بە شێوەیەکی نادروست هاتبوون و خەریکی چەشنە کوودیتایەک بوون، بەڵام بۆیان نەچووە سەر.

لە مانگی بانەمەڕدا ڕێژیم بە توندی هێرشی کردە سەر سنە و شەڕێکی زۆر خوێناویی سازکرد، هەر چەند فیداکاری و خۆڕاگریی خەڵکی سنە لەم شەڕەدا و هەروەها بەرەنگاریی شێرانەی خەڵک و پێشمەرگەکان لە بەرامبەر تۆپ و خومپارەبارانی بێ بەزەییانەی هێزی ڕێژیم لە پادگان و چەند شوێنی دیکە لە بیر هیچ کوردێک ناچێتەوە، دوای ٢٦ رۆژ پێشمەرگە بۆ بەرگری لە وێرانیی زیاتری شار و کوشتاری خەڵکی بێدیفاع، شاری بەجێهێشت، ئەویش توانی بێتە نێو شار. پێش پەلاماردانی سنە و باشووری کوردستان بوو کە بەنی سەدر فەرمانی بە ئەرتەش دا پۆتینەکانیان دەرنەهێنن تا کوردستان دەگرن و خەلعی سیلاحی دەکەن. بەڵام گومانی ئەوەش دەکرا کە بۆ مەهابادیش لە چەند لاوە هێرش بکەن. بۆیە دەفتەری سیاسیی لە شارەوە چووە شاخ و لە ئەشکەوتانی دۆڵەشێخان جێگیر بوو.

لە گواستنەوەی دەفتەر بۆ دۆڵەشێخان زۆر تێنەپەڕیبوو، بە هۆی هەوڵ و کۆششی موهەندیس خەیاتی، سەید ڕەسووڵی بابی گەورە (دێهقان) و خەلیل گادانی بۆ یەکەم جار رادیۆش لە کوردستانی ڕزگارکراو لە ناوچەی دۆڵەشێخانی مەنگوڕان بە ناوی «دەنگی کوردستانی ئێران» دامەزرا و بۆ چەند رۆژ بەرنامەی تاقیکاریی بڵاوکردەوە. لە رۆژی ١٣٥٩/٣/٢٧ بە پەیامێکی گرینگی کۆمیتەی ناوەندی کە لە لایەن دوکتور قاسملوو خوێندرایەوە، بە شێوەی رەسمی کرایەوە. ئەمەش چەند بەشێک لەو پەیامە گرینگە:

«گوێگرە بەڕێزەکان،
خوشک و برا بەڕێزەکان،
گەلانی بە شەرەفی ئێران،
خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان.

ئەمڕۆ بە ناوی گەلانی شەهیدپەروەری ئێران، بە ناوی شەهیدانی لە خوێن گەوزاوی کوردستان و بە ڕێزگرتن لە شۆڕشی سەرانسەری ئێران قسەکانی خۆمان دەست پێ دەکەین:

هاوولاتیانی بەڕێز! جارێکی دیکە دەسەڵاتی حاکم، نیشتمانی خۆشەویستمان ئێران بە خێرایی بەرەو دیکتاتۆری پاڵ پێوە دەنێ. جارێکی دیکە کەسانێک حوکمی وڵاتیان بەدەستەوەیە کە قەڵەمی نازادیخوازان دەشکێنن، زاری شۆڕشگێڕانی ڕاستەقینە پڕ لە فیشەک دەکەن، زۆربەی گەورە پیاوانی نازادیخوازی وڵاتیان ڕەوانەی زیندان کردووە و ویستی ڕەوای گەلانی ستەم لێکراوی ئێران بە گوللە وەڵام دەدەنەوە.

ڕاگەیەنە گشتییەکان کەوتونەتە بەر دەست جەماعەتێکی دواکەوتوو و بیر تەسک، دەنگ و ڕەنگی ئێران جیا لە تەبلیغاتی ژاراوی و درۆ، شتێکی دیکە بڵاو ناکەنەوە. ڕووناکبیران لە دەربڕینی بیروڕای خۆیان سەبارەت بە وەزعی وڵات بێ بەشکراون.

کرێکاران و زەحمەتکێشان مافی دەربڕینی ویستە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی خۆیان نییە. لاوانی نیشتمان، بێکار و سەرگەردانن و لە سەرەتاییترین ئیمکاناتی تەفریحی و تەنانەت لە بیستنی مۆسیقا بێبەش ماونەتەوە، بۆ ژنانی ئێران تەنیا ئەرکێک دیاری کراوە و ئەویش ئەوەیە کە چارشێو بەسەردا کەن و باسی مافی خۆیان نەکەن. بێکاری پەرەی سەندووە و ئاوسان و گرانیی سەرسوڕهێنەر زەحمەتکێشان بەرەو فەقر و نەداری پاڵ پێوە دەنێ. زۆربەی پێداویستییەکانی ژیان. بە کەمی دەست دەکەون و سەفی دوور و درێژ بۆ کڕینی ئەم پێداویستییانە لە هەموو شارەکانی ئێران پێکهاتووە. دەورانێکی ڕەشی وەک سەدەکانی ئێوەڕاست دەچێ تا بە سەر چارەنووسی ئێمەدا زاڵ بێ. بەڵام لەو هەلومەرجە دژوارەدا، سەنگەرێکی قایم و لە گیران نەهاتوو بۆ دیفاع لە ئازادیی ئێران هەر ماوەتەوە. ئەم سەنگەرە، کوردستانی ئێرانە کە درێژە بە بەرخۆدانی قارەمانانەی خۆی دەدا.

هاوولاتییه بەڕێزەکان! ئێمە لەم سەنگەرەوە قسەتان لەگەڵ دەکەین، لە کوێستانە سەربەرزەکانی کوردستان، لە خاکی شەهیدەکان و پێشمەرگەکان، بە ناوی گەلی کورد و بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران سلاو دەنێرین بۆ هەموو گوێگرە خۆشەویستەکان و رادیۆی دەنگی کوردستانی ئێران دەکەینەوە.

دەنگی کوردستانی ئێران، زمانی راستەقینەی هەموو ئازادیخوازان و شۆڕشگێرانی ئێران و، هەموو زەحمەتکێشان و گەلانی ستەم لێکراوی ئێرانە و لە ئیختیاری تەواوی هێزە دیموکراتیک و خەڵکییەکان دایە. لە هەلومەرجێکدا کە تەواوی راگەیەنە گشتییەکان و چاپەمەنییەکان بە دەست دەسەلاتداری حاکمەوەیە، ئەم مەسەلە گرینگییەکی شایانی هەیە.

هاوولاتییە خۆشەویستەکان! خەڵکی کوردستان شان بە شانی هەموو گەلانی ولات لە شۆڕشی شکۆداری ئێراندا چالاکانە بەشدارییان کرد، شەهیدیان دا، فیداکاریان نواند و سەرئەنجام رێژیمی نەفرەت لێکراو وزۆردار و سەرەڕۆی پاشایەتییان رووخاند.

ئەم شۆڕشە هی هەموو خەڵکی ئێران و تەواوی گەلانی ولاتە خۆشەویستەکەمان و هەموو حیزب و رێکخراوە پێشکەوتووەکانە کەلە بەرەو پێش بردنیدا بەشدارییان کردووە.

ئەوەی کە کەسانێکی وا پەیدا دەبن کە بەرهەمەکانی شۆڕش بە هی خۆیان دەزانن و گەلانی ستەم لێکراوی ئێران و پەیڕەوانی مەزهەبی«تسنن» وەک هاوولاتیی دەرجە دوو سەیر دەکەن و بە تەمان شۆڕش لە رێگای دیموکراتیک و خەڵکیی خۆی بە لاڕێ دا بەرن، دەیزانن کە نێوەڕۆکی گەلی و ئینسانیی شۆڕشی ئێران ناگۆڕی.

... بێ گومان لە بیرتانە کە لە ئاخر و ئوخری مانگی گەلاوێژی ساڵی رابردوودا بە دوای هێرشێکی تەبلیغاتیی بەربلاو لە لایەن راگەیەنە گشتییەکان و دەرکردنی فتوای«جیهاد» دژی خەڵکی کوردستان، لەشکر کێشی بۆ کوردستان دەستی پێکرد و شەڕێکی سێ مانگە بەسەر خەڵکەکەماندا داسەپا. سێ مانگی تەواو شار و گوندەکانی کوردستان کەوتنە بەر هێرشی تۆپ و تانک و هێلکۆپتەر و فانتۆم و سەدان ماڵ وێران کران، هەزاران کەس دەربەدەر بوون و سەدان کەس گیانیان لە دەست دا، بەلام خەڵکی کوردستان یەکپارچە راپەڕین و لەمان و شەرافەتی خۆیان بەرگرییان کرد، بە حەق دەبێ بڵێین: حیزبی ئێمە ئالای بەرگری لە سەرانسەری کوردستاندا هەڵکرد و بە رێبەرایەتیی حیزبی ئێمە، خەڵکی کوردستان ئەرتەش و پاسدارەکان و دەولەتی بە چۆکدا هێنا.

لە رێکەوتی بیست و شەشەمی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٥٨دا کاتێک پەیامی ایت الله خومەینی بۆ خەڵکی کوردستان سەبارەت بە پێویستیی لابردنی ستەمی سیاسی، نابووری و فەرهەنگی لەسەر گەلی کورد بلاو بووەوە، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە خۆشحاڵییەوە پێشوازیی لێکرد و ئەوەی بە سەرەتای چارەسەری ئاشتییانەی مەسەلەی کوردستان هەڵسەنگاند. من رۆژی ٢٩ی خەزەڵوەر لە چیاوە هاتمە مەهاباد و لە لایەن حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە گۆڕەپانی «قازی محەممەد»ی مەهابادەوە «لبیک»م بە پەیامەکەی ایت الله خومەینی گوت... سەبارەت بە دەست پێکردنی شەڕی ئێستا لە کوردستان، دەسەڵاتداری حاکم، راستییەکان لە خەڵک دەشارێتەوە و ئیددیعا دەکا کە گوایە شەڕ لە شاری سنەوە دەستی پێکردووە، ئەمە ئیددیعایەکی بە تەواوی درۆیە.

ئەم جاریش شەڕ بەهۆی هێرشی تەبلیغاتیی بەربلاوی راگەیەنە گشتییەکان دژی رێکخراوە سیاسییەکانی کوردستان دەستی پێکرد. ژمارەیەک لە ناخوندە دەسەلاتدارەکانی وەک مونتەزیری، خەلخالی، خامنەیی هێرشەکەیان توندتر کرد. ئاغای بەنی سەدریش هەروەک پێشتر مل کەچی ئەوان بوو و مەسەلەی چەک بوونی رێکخراوە سیاسییەکانی لە کوردستان هێنایە گۆڕێ. بۆ ئاگاداری هاونیشتمانانی بەرێز دەبێ بڵێم کە یەکەم ئەوەی کە خودموختاری ویستی هەموو خەڵکی کوردستانە، نەک ویستی هێندێک تاقمی تایبەتی، دووهەم ئەوە کە ئەم رێکخراوانە نین کە چەکیان هەڵگرتووە و لە ئاست هێرشی ئەرتەش و پاسدارەکاندا بەربەرەکانی دەکەن، بەڵکو ئەوە هەموو خەڵکی کوردستان و ئەتەوەی کوردە کە چەکدار بووە و ئامادەی بەرگری کردنە لە مافە رەواکانی خۆی..

هاونیشتمانانی خۆشەویست! ئێستاکە شەڕێکی دیکە بەسەر خەڵکی کوردستاندا سەپاوە، دەبێ بزانن کە خەڵکی کوردستان تەنیا بۆ خودموختاری و مافی نەتەوایەتیی خۆی شەڕ ناکا، خەڵکی کوردستان لە پێناوی جێگیر کردنی دیموکراسی لە سەرانسەری ئێران، لە پێناوی دابین کردنی مافەکانی هەموو گەلانی ستەم دیتووی ئێران لە چوارچێوەی ئێرانێکی دیموکراتیک، لە پێناوی وەدەست هێنانی مافە نابووری و کۆمەڵایەتییەکانی زەحمەتکێشان، لە پێناوی بەرەو پێش چوونی عیلم و هونەر، لە پێناوی گەشە کردنی فەرهەنگی میللی، چەکی بە دەستەوە گرتووە. لە خۆڕا نییە کە پەرەسەندنی شەڕ لە کوردستان هاوکات بووە لەگەڵ هێرش بۆ سەر زانستگاکان و ئوستادان و خوێندکارانی

شۆڕشگێڕ و ئازادیخواز و ڕێکخراوەکانیان.

کوردستان مەتەرێزی خەبات لە ڕێگەی ئازادیی سەرانسەری ئێرانە ، لەبەر ئەوەیە کە پێویستە گشت ئازدیخوازانی ئێران، هەموو کەسانی دیموکرات، تەواوی ئەوانەی کە چارەنووسی شۆڕش و ئێرانیان بەلاوە گرینگە ، یارمەتیمان بدەن. ئێمە لە ڕێکخراوە سیاسییە پێشکەوتووەکان و لە کەسایەتییە زانستی و کۆمەلایەتییەکان دەخوازین کە لە هەلومەرجی ئاستەمی ئێستادا دەست لەسەر دەست دانەنێن و سیاسەتی زالمانە و شەڕهەلایسێنانەی ڕێژیم کە دەیهەوێ بزووتنەوەی نەتەوایەتی و دیموکراتیکی گەلەکەمان لە خوێندا نوقم بکا، لە قاو بدەن. ئێوە بە خەلکی ئیران بلێن کە لە کاتی ئاشتنی تەرمی ئەو کەسانەی لە کوردستان کوژراون، نە دژی خەلکی کوردستانن، نە دژی حیزبی ئێمەن، بەلکو دژی سەبەبکارەکانی ڕاستەقینەی ئەم شەڕەن، دروشم بدەن و مەهێلن ئاگری ئەم شەڕە براکوژییە پەرە بستێنێ.

... ئێمە لە کەسانی شۆڕشگێڕ و بە شەرەفی نێو ئەرتەش داوا دەکەین ئەگەر بە زۆر بۆ ئەم شەڕە ڕاکێش کراون، لەوێ لوولەی تفەنگەکانیان بەرەو سینگی ئەو جینایەتکارانە وەرگێڕن کە بوونەتە هۆی شەڕی ئەخوازراوی نێوان ئەرتەش و گەلەکەمان.

ئێمە لە کوژرانی هەریەک لە برایانی ئەرتەشی بەداخین، بەلام برایانی ئەرتەشی دەبێ ئەوە قبوول بکەن کە ئێمە لە شەرافەت و مانی خۆمان و لە ئازادیی ئێران بەرگری دەکەین.

داوا لە پاسدارەکان دەکەین پێش ئەوەی بێنە کوردستان، بیری لێ بکەنەوە و بە، خۆڕایی ژیانی خۆیان فیدای هەوا و هەوەسی ژمارەیەک بە ناوی رووحانی نەکەن. بڕوایان بە درۆی ناخوندەکان نەبێ، لە کوردستان نە سەربەخۆیی ولات لە مەترسی دایە و نە ئایینی ئیسلام، ئەوان بە بلاوکردنەوەی ئەم درۆ و دەلەسانە، ئێوە بەرەو ئەمان دەنێرن. ئەگەر موسولمانن نابێ دژی برایانی موسولمانی کورد چەک بکێشن، ئەگەر ئێرانیشن، نابێ لە شەڕ دژی کوردەکان، ئەم ئێرانییە ڕاستەقینانەدا، بەشداری بکەن. جگە لەمە لەگەل بەربەرەکانیی توندی خەلک و پێشمەرگەکانی کوردستان بەرەو ڕوو دەبنەوە و بەرپرسایەتیی چارەنووسی ناخۆشی بەشداربوون لە شەڕی براکوژی بە ئەستۆی خۆتان دەبێ.

ڕێژیم لە ڕێگەی حیزبی توودەوە هەر خەریک بوو ناتەبایی و ناکۆکییەکە زیاتر بکاو

لەسەر جەماعەتی لە خۆڕا ناڕازی کە سەرۆکیان کاک غەنی بوو، کاری دەکرد. لە ڕۆژی ١٨ی پووشپەڕی ٥٩ ڕۆژنامەی ئیتلاعات هەواڵێکی بێ پایە و درۆی لە ڕۆژنامەی«مردم» ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی توودە هەڵگرتبوو بە خەتی درشت نووسیبووی کە «دوکتور قاسملوو ٩ ملیون دۆلاری لە ناتۆ وەرگرتووە».

دوکتور قاسملوو لە ڕێکەوتی ٢٠/٤/٥٩ نامەیەکی توند و زۆر بەجێی بۆ ئیتلاعات نووسی و بەحەق دوو سێ قسەشی لەسەر ڕۆژنامەی «مردم» تێدا نووسی. ئەمەش دەقی ئەو نامەیە:

«ئیدارەی ڕۆژنامەی ئیتلاعات»

لە ژمارەی چوار شەممە ١٨ی پووشپەڕی ڕۆژنامەی ئێتلاعات بە نەقڵ لە ڕۆژنامەی «مردم» ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی توودەی ئێران هێندێک شتی درۆ و دوور لە ڕاستی چاپ کراوە کە بە پێی یاسای چاپەمەنی و ئوسوولی ئەخلاقیی ڕۆژنامەوانی داوای وەدرۆخستنەوەیان دەکەین.

١- لە ڕۆژنامەی ئیتلاعات بە نەقڵی قەول لە ڕۆژنامەی «مردم» بە خەتی درشت نووسراوە کە دوکتور عەبدوڕڕەحمان قاسملوو ڕادەی ٩ ملیون دۆلاری لە ناتۆ وەرگرتووە.

ئێمە وێڕای وەدرۆخستنەوەی ئەم هەواڵە و درۆکانی دیکە کە لە ڕۆژنامەی «مردم» دا بلاوکراونەتەوە، بەداخین کە حیزبی توودەی ئێران بۆ قەرەبوو کردنەوەی شکستی سیاسەتە ناڕاستەکانی خۆی لە کوردستاندا، تاوی داوەتە سازکردنی ئەم درۆ بێ شەرمانەیە.

٢- سیاسەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەسەر ئەساسی خەباتی بێ وچان دژی ئیمپریالیزم و بە تایبەت ئیمپریالیزمی ئەمریکایە و مەبەستی حیزبی ئێمە بریتییە لە ریشە کێش کردنی بە تەواوەتیی نفووزی سیاسی، ئیزامی، ئابووری و فەرهەنگیی ئیمپریالیزم لە وڵاتەکەماندا. ئەمە سیاسەتێکە کە حیزبی ئێمە ٣٥ ساڵە بێ وچان ڕەچاوی کردووە. بەم شێوە تاوانبارکردنی سکرتێری گشتی حیزبی ئێمە بە هاوکاری کردن لەگەڵ ئیمپریالیزمی ئەمریکا، تەنیا بە مەبەستی خۆش خزمەتی و دەربڕینی نۆکەرایەتی لە لایەن ڕێبەرانی حیزبی توودەیە لە ناست دەسەڵاتداریەتیی حاکمدا و جگە لە تاوانێکی ناڕەوا و بێ شەرمانە شتێکی دیکە نییە، بەڵکو ڕق و قینی ڕێبەرانی حیزبی توودە دەرحەق بە بزووتنەوەی میللی و دیموکراتیکی خەڵکی کوردستان پێشان دەدا و سووکایەتییەکی ڕاستەوخۆیە دەرحەق بە خەباتی ڕەسەنی گەلی کورد.

۳- بە درۆخستنەوەی ئەو تاوانانە پێویست نەبوو، ئەگەر رۆژنامەی ئیتلاعات چاپی نەکردایە و ئەگەر تەنیا لە رۆژنامەی«مردم»دا چاپ دەبوو، لەبەر ئەوەی کە هاندەری بڵاوکردنەوەی ئەم درۆ و دەلەسانە لە لایەن رۆژنامەی «مردم» بۆ ئێمە بە تەواوی ئاشکرایە، هەروەها ژمارەی خوێنەرانی «مردم» لە وڵاتدا زۆر کەمە و لە کوردستان لە ژمارەی قامکان تێناپەڕێ.

لەگەڵ ڕێزماندا

**دەبیرخانەی کۆمیتەی ناوەندیی**

**حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران**

**۱۳۵۹/٤/۲۰**

**ئیمزای دوکتۆر قاسملوو**

**مۆری کۆمیتەی ناوەندی**

ئەو ناڕازییانە کە پێشتریش لە بیانوو بوون و بەیەنێک بوو کاک غەنی دەنگی لە حیزب گۆڕیبوو، بۆ کۆبوونەوەکانی دەفتەری سیاسیش نەدەهات، گومانیش لەوەدا نییە کە دوکتۆر کیانووری کە هەمیشە وەک حیزبی بن دەست لە ڕوانگەی خۆیەوە دەیڕوانییە حیزبی دیموکراتی کوردستان، تووڕەتر ببوو، ئەمری پێویستی پێ کردبوون، بۆیە لە رۆژی ۲۵ ی جۆزەردانی ۵۹دا شەش کەس لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندیی هەڵبژێراوی کۆنگرەی چوار کە بریتی بوون لە: غەنی بلوریان، فەوزیە قازی، فاروق کەیخەسرەوی، ئەحمەد عەزیزی، نەوید موعینی، دوکتۆر رەحیم سەیفی قازی و مامۆستا هێمنیشیان لەگەڵ خۆیان خستبوو، ئیعلامییەکیان دەرکرد، لە حیزب جیا بوونەوە و خۆیان بە ناوی«حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لایەنگرانی کۆنگرەی ٤ » ئێودێر کرد. هێندێک کەسیشیان لە نێو حیزبدا بەجێ هێشتبوو کە کاریان بۆ بکەن و لە وەزعی حیزبیش ئاگاداریان کەن.

ئێستاشی لەگەڵ بێ، بۆ حیزب و گەلی کورد روون نەبووەوە، بۆ ئەوان لایەنگری کۆنگرەی چوارن و، چ شتێکی گرینگ لە بڕیارەکانی کۆنگرەی چوار پێشێل کراوە؟!

لە بەرامبەر هەڵوێستی زیانباری ئەواندا کە دوایە بۆ هەموو کەس روون بووەوە چەند ناحەق بوون و چ رادەیەک گوێ لە مستی حیزبی توودەن، حیزب هەڵوێستێکی زۆر توندی

گرت و له وته و نووسیندا به جاش ناوی بردن. زۆر بەداخەوە دواتر هاوکاریی چالاکانەیان لەگەڵ ڕێژیم کرد، به سیاسەت ڕانەوەستان و له ڕێگەی ئەفرادی نفووزیی خۆیانەوە چەند جاریشیان خیانەت به حیزب کرد و هێندێک شوێنی حەساسی وەک پیرانشار و سەرگردەیان تەحویلی ڕێژیم داوە و ڕاستەوخۆش له هێرشەکانی دوژمندا بەشدارییان کرد.

ئەو کاره لەو هەلومەرجەدا زیانی زۆری به حیزب گەیاند و دوژمنی زیاتر هان دا. سەرەڕای ئەوەی جەماعەتێک له کادر و پێشمەرگەشیان له زۆربەی شارەکان به دوا دا چوو، بەڵام حیزب لەوە بەهێزتر بوو کە نەتوانێ تەحەمولی ئەم زەبره بکا و کار و تێکۆشانی خۆی له باری سیاسی و نیزامییەوە شێلگیرانەتر له پێشوو درێژه نەدا.

هەر لەو مانگەدا حیزب لەگەڵ ڕێکخراوی فیدائیانی خەڵک شاخەی کوردستان ڕێککەوتننامەیەکی دوو قۆڵییان بۆ هاوکاری ئیمزا کرد کەچی بەداخەوە ئەوانیش کەوتنه ژێر تەئسیری زیاتری حیزبی توودە و نەتەنیا هاوکاریی حیزب و گەلی کوردیان نەکرد، بەڵکو بەشێک له چەکەکانیشیان تەحویلی ڕێژیم دا.

له ڕۆژەکانی نێوەڕاستی گەلاوێژدا بۆ باس لەسەر ئەم وەزعەی هاتبووە گۆڕێ سێهەمین پلینۆم له گوندی داغەی ناوچەی مەنگوڕایەتی پێکهات.

لەم کۆبوونەوەدا وێڕای لێکدانەوەی وەزعی سیاسی و هەڵسەنگاندنی کردەوە و هێرشە هەمەلایەنەکانی ڕێژیم و هەروەها باس لەسەر خیانەتی گروهی ۷ کەسی لەو هەلومەرجە ناسکەدا، بڕیار درا کە بۆ ڕوونکردنەوەی زەینی خەڵک به دوای تەواو بوونی پلینۆمدا له مەهاباد میتینگ بدات و چەند هەیئەت به سەرۆکایەتیی ئەندامانی دەفتەری سیاسی و بەشداریی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی دەست به گەشتێکی پان و بەرین له کوردستانی ڕزگارکراودا بکەن.

ئەم کاره ئەنجام درا، جەلیل گادانی لەگەڵ ئەبوبەکر هیدایەتی، سەرهەنگ ڕەبیعی(چیا)، حەسەن شیوە سەلی و تاهیر عەلییار بۆ باکوور،[*] مامۆستا عبداللە

(*) ئەم سەفەرە کە له شنۆوە دەستی پێکرد و تا ئاخرین نوقتەی کوردستانی ئێران واته بناری کێوەکانی ئاگری و چۆمی ئارازی گرتەوە، نزیکەی دوو مانگ و نیوی کێشا. له زۆربەی ناوچەکان جگە له میتینگ بۆ خەڵکی ناوچە و ڕوون کردنەوەیان لەسەر سیاسەتی حیزب، تەرمیمی کۆمیتەکان و هێزەکان، کلاسی سیاسی و نیزامیشیان بۆ داندرابوو. به هۆی بوونی هێندێک بەکرێگیراو هاتوچۆ زۆر سەخت بووە، یەکێک له ئامانجەکانی ئەم سەفەرەش پێوەندی گرتن به سۆڤیەتییەکانەوە بووە، بەڵکو بتوانن به حوکمی دراوسێیەتی و خەباتی پێشکەوتنخوازانەی حیزب بەهۆی وتووێژی نزیکەوە سەرنجیان ڕاکێشن و یارمەتیی حیزب بدەن، بەڵام بەداخەوە هیچ فایدەی نەبووە و لەم بابەتەوە هەیئەت به دەستی بەتاڵ

حەسەن زادە، کەمال دەباغی و چەند کەسی تر بۆ باشوور، مستەفا هیجری، قادر عەبدی و چەند کەسی دی بۆ ناوەند دیاری کران و ئەم تەرکیبە بە جۆرێک داندرابوو کە لە هەموو بوارەکاندا بتوانن ئامادەگیی زیاتر لە نێو پێشمەرگە و کادر و ئەندامانی حیزبدا پێک بێنن.

ئەم ئەرکە ئەنجام درا و لە ماوەی دوو مانگ و نیو تا سێ مانگ کەمتر شوێنێک مابوو کە هاوڕێیان جگە لە تەجدیدی سازمان دانی ئامووزشی سیاسی و نیزامی، بافتی تەشکیلاتییان لێ بەهێزتر نەکردبێ و زۆر مەسەلەیان لە پێوەندی لەگەڵ نێوخۆی حیزب و تاقمی ٧ کەسی و هەروەها لەسەر کارو کردەوەکانی ڕێژیم ڕوون نەکردبێتەوە، ئەم کارە باشە هێزێکی تازەی ماددی و مەعنەویی بە بەشەکانی جیا جیای حیزب بەخشی. بۆیە لە پلینۆمی پاییزدا بە یەکێک لە کارە هەرە بەرچاو و پڕ سوودەکانی حیزب لەم یەک دوو ساڵی دواییدا داندرا.

حیزبی دێوکراتی کوردستان لە هەموو بوارەکاندا تێکۆشانی خۆی درێژە دەدا و بە ڕێنوینی ڕۆژانەی خۆی لە ڕێگەی ڕادیۆی دەنگی کوردستانی ئێرانەوە ڕوحی خۆڕاگری لە بەرامبەر هێرشە دڕندانەکانی دوژمندا بە خەڵک دەبەخشی.

لە ئاخری خەرمانانی ١٣٥٩ شەڕی ئێران و عێراق کە پێشتر لە زۆر شوێنی سنوور دیاردەکەی لە تێک هەڵچوونی هێزە چەکدارەکانی هەردوو لادا خۆی نواندبوو، بە شێوەیەکی ئاشکرا و ڕەسمی ڕاگەیەندرا و دەستی پێکرد. عێراق پەلامارێکی پان و بەرینی زەمینی و هەوایی کردە سەر ئێران و لەم پەلامارە توندەدا، تەنیا لە ماوەی چەند ڕۆژدا توانی بەشێکی بەرچاو لە خاکی ئێران بگرێ.

لەم بابەتەوە زۆر کەس و هێز و ڕێکخراوەکان وایان بیر دەکردەوە و حیزبی ئێمە لە دەربرینی هەڵوێستی ڕوون خۆی دەپارێزێ، بەڵام بە پێچەوانەوە، ئەم هێرشەی بە کارێکی

---

گەڕانەوە هەر لەم فەسڵە و لەم ساڵەدا بوو کە ژێنراڵەکانی تورکیە کوودیتایان کرد و هێرشێکی بەربڵاویان کردە سەر هێزەکانی کوردستانی تورکیە، جەماعەتێکی زۆر لە حیزبی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیە، هەروەها بەشێک لە ئەفرادی حیزبی کرێکارانی کوردستان کە دوایە بە ناوی پ.کا. کا. مەشهوور بوون، هێندێک لە ئەفرادی حیزبی کوک ڕایان کردە کوردستانی ئێران، بە فەرمانی حیزب لە لای بنکە و بونیادەکانی حیزبی لە باکووری کوردستان مانەوە. بە تایبەتی بەشێکی بەرچاو لە ئەفرادی حیزبی سوسیالیست بە لەبەر چاوگرتنی دۆستایەتیی پێشتر لە لایەن حیزبەوە جێگا و ڕێگایان پێ درا و بنکەیان بۆ داندرا. هێندێک لەوانیش چەکیان هەڵگرت و لە شەڕەکانی دژی ڕێژیمی ئاخوندیدا شان بەشانی پێشمەرگەکانی حیزب بەشدار بوون و شەهیدیشیان دا.

خراپ زانی و مەحکوومی کرد و هەر لەو بوارەدا لە بەیانێکدا هەڵوێستی روونی خۆی راگەیاند. ئەوەش کورتەیەک لە بۆچوونی حیزب لەم بابەتەوە:

«ئێمە ئەو هێرشە بۆ سەر خاکی وڵاتەکەمان بە کارێک دەزانین کە لەگەڵ هەموو مەوازینی نێونەتەوەیی دژایەتیی هەیە. ئەگەر ایت الله خومەینی یا سەرۆک کۆمار شەش خاڵی پێشنیاریی ئێمە لە پێوەندی لەگەڵ خودموختاریدا قبووڵ بکەن و بە شێوەی رەسمی رای بگەیەنن، هەروەها ئەرتەش لە کوردستان کە ئێستا بە شارەکاندا بڵاوبۆتەوە، بگەڕێتەوە سەربازخانەکان و جاش و پاسدارەکانی غەریبە لە کوردستان دەرخەن، ئەگەر بە پێچەوانەی تەجرەبە تاڵەکانی پێشوو عەقڵ و لێزانی لە نێو هێزی حاکمدا سەرکەوێ و ئەو پێشنیارانەی ئێمە قبووڵ بکەن، نەتەنیا عەمەلیاتی نیزامی دژی ئەرتەش و پاسداران رادەگرین، بەڵکو شان بە شانی ئەوان بۆ بەرگری لە سنووری وڵاتەکەمان گیانبازی دەکەین.

عەینی ئەم بۆچوونە لە پەیامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب بۆ گەلانی ئێران، رێکخراوە دێموکراتیک و شۆڕشگێڕەکان و بۆ هێز و کەسایەتییە ئازادیخواز و نیشتمانپەروەرەکاندا کە لە رۆژنامەی ژمارە ۷۱ی کوردستانی مانگی سەرماوەزی ۱۳۵۹دا چاپ کراوە، دووپات بۆتەوە.

هەر لەو پایەمەدا حیزب داوایان لێ دەکا و دەڵێ:

«وەرن بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانی شۆڕش و دابەزاندنی ئامانجەکانی ژێردەوە:

١- ریشەکێش کردنی رەخنەی ئیمپریالیزم بە تایبەتی ئیمپریالیزمی ئەمریکا، بەسیجی کۆمەڵانی خەڵک دژی دەست درێژیی بێگانەکان، دامەزراندنی دێموکراسی و ئازادییە دێموکراتیکەکان، دابین کردنی مافی میللی و خودموختاری بۆ گەلانی ستەم لێکراو و بۆ دابین کرانی مافی کۆمەڵایەتیی زەحمەتکێشان لە بەرەیەکی بەرینی دژی ئیمپریالیستیدا کۆبینەوە».

«هاونیشتمانانی بەرێز! دەبێ هەتا کات تێپەڕ نەبووە، بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی دژی ئیمپریالیست هەنگاوی بەکردەوە هەڵگرین. ئەوەکانی داهاتوو، هەروەها مێژوو لەم رێکخراو و کەسایەتییانە خۆش نابێ کە خۆ لەم مەسەلە گرینگە بپارێزن. حیزبی ئێمە بەم شێوە رادەگەیەنێ کە ئامادەگیی تەواوی هەیە بۆ وتووێژ لەگەڵ هەموو رێکخراو و هێزە گەلی و رەسەنەکان، لەسەر ئەم مەسەلە گرینگە».

به خۆڕایی نییه که ساڵێک دواتر پیاوی لێوەشاوە و خەباتکاری کورد «موکری» (سارم خان) له پەیامێکدا که بۆ کۆنگرەی پێنجی حیزبی ناردووه، لەم بابەتەوە دەڵێ:

«هەر له ڕۆژەکانی هەوەڵی شەڕدا حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران رایگەیاند که ئەگەر ڕێژیم ئەسڵەکانی خودموختاری قبووڵ بکا، حیزب ئامادەیه به هەموو ئیمکاناتی خۆیەوە لەشەڕ دژی عێراقدا بەشداری بکا، حیزب ئەو هەڵوێستە به بەراوردکردن لەگەڵ پەیامی هەموو هێزە چەپ و شۆڕشگێڕەکانی دیکە، سیاسی تر و هۆشیارانەتر و واقیع بینانەتر دێتە بەرچاو. ئەوە نیشانی دا که ڕێبەریی حیزب به تەواوی بەرپرسایەتیی گەورەی خۆی له بەرامبەر خەڵکدا هەست پێدەکا.

دیارە گوێی خومەینی و بەرپرسانی ڕێژیم له ئاست پێشنیارەکانی حیزبی دێموکرات کەڕ بوو و هیچ کات وەڵامێکی شیاوی ئەم هەموو دڵسۆزی و نیشتمانپەروەرییە نەدراوە، بەڵکو به پێچەوانە هێرشە دڕندانەکانی خۆی بۆ سەر کوردستان توندوتیژتر کرد تا شکستەکانی خۆی له شەڕ لەگەڵ عێراق بشارێتەوە.

کۆمیتەی ناوەندی له بەیانیەی ١٠/ ٧/ ١٣٥٩ دا رایگەیاند:

«ئێستا ئەوە شەش مانگە بۆ جارێکی دی شەڕ به توندی له کوردستان بەردەوامه، شارەکانی کوردستان یەک به دوای یەکدا وێران دەکرێن و دەیان هەزار کەس له دانیشتوانیان ئاوارە بوون. گەمارۆی ئابووریی کوردستان خەڵکی به تەواوی خستۆتە ژێر فشار و دەواو دەرمانیشیان وەدەست ناکەوێ. لەو ماوەدا هەزاران کەس شەهید بوون. هەر ئێستا شەڕ له زۆر شوێنی کوردستان، بەردەوامه. زیاتر له دوو حەفتەیه شاری مەهاباد له لایەن ئەرتەش و پاسدارانەوە به خومپارە و تۆپ دەکوترێ، هەر ئەو ڕۆژانە زیاتر له ١٥٠ کەسی بێ چەک و بێ تاوانی خەڵکی ئەم شارە به دەستی ئەرتەش و پاسدارەکان شەهید کراون. ئەوە له حاڵێک دایه که چەند ڕۆژە پێشمەرگەکانی ئێمه له شاری مەهاباددا خۆ له شەڕ دەپارێزن.

«ئێستا که ئەرتەشی عێراق دەست درێژیی کردۆتە سەر نیشتمانەکەمان و بەشێک له خاکی وڵاتەکەمانی گرتووە و بەرگری له سنوورەکان ئەرکی گرینگی ئەرتەشە، له حەوت لەشکری ئەرتەشی ئێران، چوار لەشکری له کوردستان ڕاگرتووە و دژی کورد شەڕ دەکەن، زۆربەکانی دیکەش له شوێنەکانی دیکەوە بەرەو کوردستان هاتوون. هەروا بزانە هێزی دەسەڵات به دەست جگە له کورد و بزووتنەوەی میللی دێموکراتیکی خەڵکی کوردستان

دوژمنێکی دیکەی نییە. وا وێدەچێ حاکمانی دانیشتووی تاران بە پێچەوانەی وتەی خۆیان، دوژمنایەتییەکیان لەگەڵ ئەمریکا نەماوە و ئەم دوژمنە گەلانی ئێران و بە تایبەت گەلی کوردە کە دەبێ شەڕی لەگەڵ بکا».

ڕێژیم لە کورت خایەندا ئەم کەڵکە ناپیرۆزانەی لە شەڕ لەگەڵ عێراق وەرگرت:

١- ئەرتەش کە تا پێش ئەو شەڕە بە ناوەندی پیلان دەژمێردرا، پاڵی وە ڕێژیم داوە.

٢- بیانوویەکی بۆ پەیدا بوو تا سەرەڕای هەموو سەروەت و سامانی دەوری شا، یارمەتیی ماڵی لە خەڵک وەرگرێ و ئەوان بڕژێنێتە نێو شەقامەکان و دژی عێراق وەگەڕیان خا و لە نێو ئۆرگانەکانی سوپا و بەسیج و... ڕێکیان بخا.

٣- وەک سەرپۆشێکی باش بۆ شاردنەوەی کارە خراپ و کوشت و کوشتارەکانی کەڵک لەم شەڕە وەرگرێ.

٤- شەڕ بیانوویەکی تازە بوو تا بتوانێ لە ژێر ئەم پەردەیەدا خەباتکاران و ئازادیخوازان ڕاو کا و بیانکوژێ.

٥- لە بواری نێونەتەوەییدا خۆی لەو دوورە پەرێزمانەوەی کە بە دوای هێرشی بۆ سەر سەفارەتی ئەمریکا و بە بارمتەگرتنی کارگێران بۆی هاتبووە گۆڕێ، دەرباز بکا.

٦- دەستێ ناواڵە بوو تا بە بیانووی شەڕەوە هەرچی سەروەت و سامانی گەلانی ئێرانە بە تالانی بەرێ.

٧- لەگەڵ هەموو کوشتارێکی لێی کرا، هێزی تازە نەفەسی ئۆرگانەکانی خۆی لەم شەڕانەدا ڕاهێنا تا لە دوا ڕۆژدا بیپارێزن.

هەر بۆیەش خومەینی شەڕەکەی بەخێر و بەرەکەت بە حیساب دێنا. (*)

لە لایەکی دیکەوە هێزەکانی دیموکرات و ڕەسەن و نیشتمانپەروەریش، وەک جارەکانی پێشوو وەڵامی پێویستیان بۆ پێکهێنانی بەرە بە حیزب نەداوە و هەرکام بە شێوەیەک خۆیان لێ بوارد.

بەڵام لەسەر ئەو بەشە لە داخوازی حیزب، بە مەبەستی پشتگیری کردن لە خەباتی ڕەوای گەلی کورد و تێکۆشانی حیزبی دیموکراتی کوردستان هێندێک لە هێزەکان کەم تا کورت هەڵوێستیان گرت و سازمانی موجاهیدینی خەڵکی ئێران بە تایبەتی بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا لەم بوارەدا نووسی و ڕەوا بوونی خەبات و تێکۆشانی گەلی کوردی سەلماند.

---

(*) وەرگیراو لە پەیامی مووکری بۆ کۆنگرەی پێنج.

حیزبی دیموکرات جگە لە توندوتیژ کردنی خەباتی خۆی بەرامبەر بە هێرشە دڕندانەکانی بەکرێگیراوان، زیاتر ماهییەتی ڕێژیمی لە قاودا و بە تایبەتی لەسەر کوشتاری بە کۆمەڵی شار و گوندەکان کە ڕێژیم بە نێوی داسەپاندنی حاکمییەتی ئیسلام لەم شوێنانە دەیکرد، بۆ دەقیقەیەکیش ڕانەوەستا.

لەم بوارەدا دوو کاری گرینگ جێ بەجێ کرا:

یەکەم، بڵاوکردنەوەی خەبەر و ڕووداوەکانی شەڕ لە ژێر سەردێڕی «جنگ در کردستان» کە لە ڕۆژنامەی «کوردستان» دا چاپ و بڵاو دەکرایەوە و دوایەش هەرچەند مانگ جارێک وەک پەرتووک بڵاو دەبووەوە.

دووهەم، بڵاوکردنەوەی بەرنامەی نیو سەعاتەی ڕۆژانەی ڕادیۆیی بە زمانی ئازەربایجانی لە ڕادیۆ دەنگی کوردستانی ئێرانەوە. ئەم کارە بە مەبەستی هاندانی گەلی قارەمانی ئازەربایجان بۆ درێژەدانی خەبات لە بەرامبەر ڕێژیمی کۆنەپەرستی کۆماری ئیسلامیدا بوو، بە پێی هاوخەباتیی لەمێژینەی ئەو دوو گەلە، دەبوو ئەم بەرنامە تەئسیری زۆر بێ، بەڵام بەداخەوە لەگەڵ هەموو مایەدانانێکی کە لەم پێوەندییەدا حیزب کردی، کەڵکێکی ئەوتۆی نەبوو.

لە ساڵی ١٣٥٩دا، شۆڕشی گەلانی ئێران کە بەنرخی هەزاران شەهید و کەم ئەندام سەرکەوتبوو، بە هۆی پاوانخوازیی ئاخوندەکان لە ڕێگەی ڕاست لادرا و جێگای خۆی دا بە دیکتاتۆریی ڕەشی کۆنەپەرستان.

ئەو ساڵە بە هێرشێکی تازە بۆ سەر کوردستان دەستی پێکرد و ئەو هێرشە بە سەپاندنی شەڕ لە سنە و سەقز و بانە و مەریوان، سەرانسەری کوردستانی گرتەوە.

هیچ شارێکی کوردستان نەما کە بەر بۆمب، ڕاکێت، تۆپ و خۆمپارەی ڕێژیم نەکەوێ.

هیچ گوندێکی کوردستان نییە کە فڕۆکە و هێلیکۆپتەری کۆماری ئیسلامیی بەسەردا تێنەپەڕیبێ.

کوشتاری بە کۆمەڵی ژن و پیاو و پیر و لاو لە «قەڵاتان»ی شنۆ، «ئیندرقاش»ی مەهاباد، «کولیج و سوفیان»ی شنۆ، «سەروکانی» پیرانشار، چەندجار فاجعەی ساڵی ٥٨ی قارنێیان بیر خەڵکی کوردستان خستەوە.

لە ساڵی ١٣٥٩دا هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە لە خاکی ئێران وەدەست ئەرتەشی بێگانە کەوت، چەند ملیۆن لە خەڵکی ناوچەکانی شەڕ لێ دراو، پەڕیوە و دەربەدەر بوون،

دەیان هەزار ماڵی هاونیشتمانان، هەزاران خانووبەرە و بونیادی دەوڵەتی بە بۆمب و مووشەک و تۆپ و خۆمپارەی بێگانە وێران کران، سەدان ملیۆن دۆلار زیان بە ئابووریی ئێران گەیشت. بە پێچەوانەی درۆ و دەلەسەی بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی، دوژمنیش هەر لە جێی خۆی مایەوە. ئەوانەی لە سەرەتای ساڵی ٥٩دا فەرمانیان بە سەرباز و پاسدارەکان دەدا تا کوردستان ئەگرن و پێشمەرگەکان بە تەواوی چەک ئەکەن، نایێ پۆتینەکانیان لە پێ دەرهێنن، لە بەرامبەر دوژمنەکاندا چیان بۆ نەکرا.

دەسکەوتی خەباتکارانی ڕێگەی ئازادیش لەم ساڵەدا ئەوە بوو کە سەفی خەباتگێرانی ڕاستەقینە تا رادەیەک لە سەفی هەلپەرستانی هاوڕێی ڕۆژانی خۆش جیا بوودوە. خۆڕاگران نەچوونە ژێر تەنسیری شەڕ و کوشتاری کۆماری ئیسلامی و ئەوانی تریش پشتیان لە خەڵک و ئامانجە پیرۆزەکانیان کرد.

لە ساڵی ١٣٥٩دا بێدەنگی بەرامبەر بە جینایەتەکانی ڕێژیم شکا، لە زۆر شوێن دەنگی ئیعتراز و ناڕەزایەتی بەرامبەر بە کوشتار و سەرکوتی خەڵک بەرز بوودوە.

لەم بوارەدا ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵک بە لە قاودانی ئازایانەی لارێ بی بەرپرسان و سیاسەتەکانی چەوت و دژی گەلیی کۆماری ئیسلامی هەنگاوی بە کەڵکی هەڵگرت.(*) هەر بۆیەش حیزب پێوەندیی هاوکاریی برایانەی لەگەڵ دەست پێکردن، کە بە تێکڕا ئەو هاوکارییانە دوایە زۆر بەرەو پێش چوون.

لە ساڵی ٥٩دا پێشمەرگەکانی حیزب بە دەیان عەمەلیاتی قارەمانانەیان بەڕێوە برد کە ئێمە بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی لە ئاخری کتێبەکەدا ئامارێکی گشتی لە عەمەلیاتەکان دێنین و ئەوەی پێویستە لەوێدا دەیگونجێنین، بە کورتی بە پێنج عەمەلیات لە پێنج ناوچەدا ئیشارە دەکەین:

**پیرانشار**

٥٩/٨/٧ مۆڵگەی دوژمن لە «چل بزنە» هەڵکەوتوو لە نزیک جلدیان، لە لایەن پێشمەرگەکانی هێزی شەهید ناوارە «پیرانشار» دەستی بەسەردا دەگیرێ. لەو چالاکییەدا ٤٠ کەس لە هێزەکانی دوژمن دەکوژرێن و ١٦ کەسیش بە دیل دەگیرێن. هەموو چەک و چۆلی ئەو مۆڵگەیە دەکەوێتە دەستی هێزی پێشمەرگە.

---

(*) نەقل بە مەفهووم لە پەیامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب، بە بۆنەی نەورۆزی ١٣٦٠ چاپ کراو لە ڕۆژنامەی «کوردستان»دا.

**مەهاباد**

٥٩/٧/٢٨ پێشمەرگەکانی هێزی پێشەوا، لە جادەی مەهاباد- ورمێ دا پەلاماری ستوونێکی نیزامیی دوژمن دەدەن. لەو پەلامارە شێرانەیەدا زیاتر لە ١٥٠ کەس لە هێزەکانی دوژمن دەکوژرێن و، بریندار دەبن. هەروەها ٥ دەزگا تانک و ٥ دەزگا ماشێن لەبەر یەک بلاو دەکرێن.

هەر لەو رۆژەدا دەستەیەکی دیکە لە پێشمەرگەکانی ئەو هێزە، هەر لەسەر جادەی مەهاباد- ورمێ لە نزیک گوندی کۆسەکەرێز، ستوونێکی هێزی چەکداری دوژمن دەخەنە نێو داوی خۆیان. لەو چالاکییەشدا ٧٠ کەس لە هێزەکانی دوژمن دەکوژرێن و یان بریندار دەبن. هەروەها یەک دەزگا تانک و یەک دەزگا ماشێن خراپ دەکرێن. لەو چالاکییەدا ٧ پێشمەرگە شەهید دەبن.

**ورمێ**

٥٩/٤/١٤ پێشمەرگەکانی هێزی نحۆ پەلاماری پادگانی ورمێ و ناوەندی سوپای پاسداران و شارەوانیی ئەم شارە دەدەن. لەو پەلامارەدا ٩ کەس لە هێزەکانی دوژمن دەکوژرێن و ٣٢ کەس بریندار دەکرێن. هەروەها ٥ دەزگا تانک و ٧ دەزگا ماشێن و یەک فەروەند هێلیکۆپتەر لە بەر یەک بلاو دەکرێن.

**سەقز**

٥٩/٧/٢٨ پێشمەرگەکانی هێزی شەهید عەزیز یوسفی، دەچنە نێو شاری سەقز و لەگەڵ هێزەکانی دوژمن دەرگیر دەبن. لەو چالاکییەدا ٥٣ کەس لە هێزەکانی دوژمن دەکوژرێن و زیاتر لە ١٠٠ کەسیش بریندار دەبن و ٦ کەسیش بە دیل دەگیرێن، هەروەها چەندین ماشێن خراپ دەکرێن و چەک و چۆلێکی زۆر بە دەسکەوت دەگیرێ.

**سەردەشت**

لە مانگی ٦ی ٥٩دا پێشمەرگەکانی هێزی شەهید موعینی و هێزی شەهیدانی وێردی بۆ ماوەی ٢٠ رۆژ پێش بە هێزێکی زۆری دوژمن دەگرن کە لە بانەوە دەیهەوێ بچێتە سەردەشت. لە ماوەی ئەو ٢٠ رۆژەدا زیاتر لە ٤٠٠ کەس لە هێزەکانی دوژمن دەکوژرێن و

ژمارەیەکی زۆریش بریندار دەکرێن. هەروەها دەیان فەرمەند تانک و دەیان دەزگا ماشێن و نەفەربەر و دەیان قەبزە چەکی گەورە لە بەریەک بلاو دەکرێن.

لە بەهاری ساڵی ۱۳٦۰دا ژیانی خەڵک و وەزعی کۆمەڵ تووشی قەیرانی هەمەلایەنە هاتبوو. بۆ نموونە رادەی بەرهەم ۳۰٪ دابەزیبوو و زۆر کارگە و کارخانە بەسترابوون و لە ناکامدا زۆر کرێکار بێ کار کرابوون کە ژمارەیان بە تێکڕا لە ٤ ملیۆن تێدەپەڕی. ئەگەر ژمارەی ئەو کەسانەش کە بە ناو کار دەکەن و لە راستیدا خۆیان دەخافڵێنن، لەوە زیادکرابا، کە بە پێی ئامار ۷ تا ۸ ملیۆن کەس بوون، لە ژمارەی گشتیی بێکاران زیاد کرابا، سەرجەم خۆی لە ۱۲ ملیۆن دەدا. جا ئەگەر کەم بوونەوەی ۳۰٪ تەولید لەگەڵ زیادبوونی ۳٪ جەمعییەتیشی لەگەڵ هەڵسەنگێندرایە، ئەو کات دەردەکەوت چ مەترسییەک لەم قەیرانە دایە.

نرخی واریدات شازدە بەرامبەری کەلوپەلی بەرێ کراو بۆ دەرەوە بووە. لە ساڵی ۵۹دا نرخی ناوسانی دراو گەیبووە ٤۰٪، هەر بەم پێیە نرخی ژیانی خەڵکیش ٤۰٪ هاتبووە خوار. رێژیم بۆ ئەوەی کەسری بوودجەی ۱۰۰ میلیارد تمەنیی خۆی قەرەبوو کاتەوە، دەستی دابووە چاپی ئەسکیناسی بێ پشتوانە کە رێگایەکی زۆر پڕ مەترسی بوو.

دوو ملیۆن ئاوارەی شەڕیش بێ راگەیشتن و بەرێچوونی دەویست کە گوێی خۆیان لێ ناخنیبوو و لەسەر ئەم ئەساسە کە زۆر جار بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی هەر لە خومەینییەوە بگرە تا ئەوانی خوارتر، گوتوویانە و هەر دووپاتیشی دەکەنەوە کە «خەڵک بۆ «رفاه» شۆڕشیان نەکردووە و ئابووری هی مالاتە!» هیچ هەنگاوێکیان بۆ ژیانی خەڵک هەڵنەهێنایەوە.

ئاخوندەکان نیشانەیەکیان لە دێموکراتییەت و پێشکەوتنخوازی نەهێشتبوو، هونەر، وەرزش، مۆسیقا و تەنانەت شەترەنجیش قەدەغە کرابوون. زۆربەی دانشگا و مەدرەسەکان بەسترابوون. بەرنامەکانی رادیۆ و تلویزیۆن لەسەر سینەزەنی و بەخۆدادان ساغ ببووەوە.

لەگەڵ حیزبی توودە و چریکی ئەکسەرییەتیش، هەرچەند حەڵقە بە گوێی ئەوان بوون، بەڵام باش نەبوون و زۆرجار پێشی بلاوبوونەوەی چاپەمەنییەکانیشیان دەگرتن.

لەم رێژیەدا حیزبی کۆماری ئیسلامی هەمەکارەیە و هەموو شتە. رێکخراوی وەک سازمانی موجاهیدینی خەباتکار، دەچێتە ژێر پرسیار و ئیوەنهێنی دەبێ و ئەگەر بە زەبر وەشاندنی خۆیان پاشەکشەیان پێ نەکردبان، زۆرتریان لێ دەگرتن و تیربارانیان دەکردن،

که دوایمش بەداخەوە هەروای لێ هات.

سەرەڕای هەموو ئەو قەیرانە ئابووری، کۆمەڵایەتیی و ئیزامییە، دەسەڵاتدارانی حاکم لە نێو خۆشیاندا ناتەبایییان لێ پەیدا ببوو، بە تایبەتی ناتەبایی نێوان بەنی سەدر سەرکۆمار و حیزبی کۆماری ئیسلامی ئەوەندە توند ببوو، کە خومەینیش بۆی چارە نەکرا.

لە ڕۆژەکانی ١٦ تا ٢٠ی خاکەلێوەی ١٣٦٠ پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی پێکهات. پلینوم دوای گوێدان و پەسندکردنی ڕاپۆرتی دەفتەری سیاسی لەسەر ئەم شتە گرینگانەی ژێرەوە بڕیاری دا:

١- سیاسەتی حیزب لە لایەن دەفتەری سیاسییەوە بە باشی بەڕێوە چووە و لەسەر گیروگرفتە بنەڕەتییەکانی وەک دیفاع لە ئازادی و بوونی گەلی کورد، هەڵوێستی لە بەرامبەر ڕێژیم و... هەولی پێوستی داوە.

٢- پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی سەفەری سکرتێری گشتی سەرکەوتوو لە قەڵەمدا، بە تایبەتی لەسەر پێوەندی لەگەڵ ولاتانی سۆسیالیستی، ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین، ڕەزامەندیی تەواوی هەیە وتەئکید لەسەر ئەوە کرا کە بۆ پەرەپێدانی پێوەندی لەگەڵ هێزە پێشکەوتنخوازەکانی جیهانیش هەولی زیاتر بدرێ.

٣- کۆمیتەی ناوەندی بە دەفتەری سیاسیی ئەسپارد تا لەسەر سیاسەتی ئوسوولیی حیزب شێلگیرتر بێ و لە ڕێگەی ئازادیی خەڵکی کوردستان بەردەوام بێ و هەرچەشنە شلەکردن و خۆ بەدەستەوەدانێک مەحکووم بکا.

٤- پلینومی کۆمیتەی ناوەندی لەسەر وەزعی کۆمەڵایەتی، ئابووری و هەروەها لە سەر مەسەلەی پێشمەرگە و کاری ڕێکخراوەیی هێندێک ئامۆژگاری و ڕێنوێنی بە دەفتەری سیاسی دا.

٥- پلینۆم دامەزرانی پێوەندیی دۆستانەی لەگەڵ ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵکی ئێران پێ سەرکەوتنێکی گەورەیە و حەز دەکەن لەگەڵ باقی ڕێکخراوە پێشکەوتنخوازەکانیش پێوەندیی خۆی بەهێزتر بکا.

٦- پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی دوای گوێدان بە ڕاپۆرتی لێژنەی لێپرسینەوە، بە لەبەر چاوگرتنی بەڵگەی مەوجوود بڕیاری دا کە:

ا- ڕەحمان کەریمی بە تاوانی پیلانگێڕی دژی حیزب، خیانەت بە ئامانجەکانی گەلی کورد، جاسووسی بۆ هێزی حاکم وەک بلاوکردنەوەی نهێنییەکانی حیزب، پێوەندی گرتن

لەگەڵ سوپای پاسداران و نەرتەش بەبێ ئیزنی حیزب، ئەنجام و تەواوکردنی عەمەلیاتی پیرانشار بە سوودی دوژمن (لەسەر دەدان پێداهێنانی خۆی بەم تاوانانە بە نووسراوە) پیلانگێری لە نێو حیزبدا بۆ تێکدانی ریزەکانی حیزب بڵاوکردنەوەی دەنگۆ وبوختان هەڵبەستن بۆ رێبەریی حیزب و هاوکاری لەگەڵ سەنار مامەدی ، بە خائین بە حیزب و گەلی کورد ناسرا. لەبەر ئەوەی لە حیزب دەردەکرێ و بۆ سزادان بە دادگای شۆڕش دەسپێردرێ.

ب- سەنار مامەدی بە تاوانی پێکهێنانی پێوەندی لەگەڵ اویسی و داروودەستەی سەڵتەنەتخوازان، وەرگرتنی پوول و چەک لەوان، چەوساندنەوەی زەحمەتکیشانی گوندەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی و دەرکردنیان لەسەر جێگا و رێگای خۆیان، بەکارهێنانی رەفتاری دەربەگانە لە کاروباری حیزبیدا، هەروەها بەشداریی راستەوخۆ لەگەڵ رەحمان کەریی بۆ خیانەت بە حیزب و گەل ، بە خائین ناسرا. هەر بەو دەلیلانە ئەویش لە حیزب وەدەر دەنرێ و بۆ سزادان دەدرێ بە دادگای شۆڕش.

بە لەبەر چاوگرتنی ئەو بڕیارە لە بەرپرسانی حیزبی لە ناوچەی سەلماس داوا دەکەین بۆ خۆیان شوورایەکی سێ کەسی دیاری بکەن و لەگەڵ وەلاتانی خۆبەدەستەوەدەرانی وەک سەنار مامەدی، تا دیاری کردنی بەرپرس لە لایەن حیزبەوە کاروبارەکانی خۆیان بەڕێوە بەرن.

کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لە رێکەوتی ٢٩/١/١٣٦٠ واتە ساڵێک دواتر نامەیەکی سەر ناوالەی بۆ گەلانی خەباتکار، رێکخراوە دیموکراتیکەکان و کەسایەتییە نازادیخوازەکان دەنێرێ کە لەودا وێڕای بیر خستنەوەی نامەیەکی کە راست ساڵێک پێشتر بۆ خومەینی ناردبوو، دەڵێ:

«لەو شەڕەی کوردستاندا زیاتر لە دە هەزار کەس شەهید بوون کە ٨٠٪ یان ژن و منداڵ و پیرە پیاون و، هەروەها هەزاران کەم ئەندامیشی لێ کەوتۆتەوە.

ئەوەی راستی بێ سەرەڕای ئەوەش کە چوار لەشکری ئەرتەش و چل هەزار پاسدار و ژمارەیەکی زۆری لە بەسیج و بەناوی پێشمەرگەی موسولمان (جاش)ی هێناوە و بەگژ گەلی کوردی دا کردوون، لەو ساڵەدا دەوڵەتی ناوەندی بە پێشکەوتووترین کەرستەی شەڕ لە فانتووم و هیلیکۆپتەردەوە بگرە تا تۆپی ١٧٥ و تانکی چیفتین، شارەکانی کوردستانی کوتاوە، بەڵام لە بەرامبەر بەربەرەکانی و خۆڕاگریی خەڵکدا دەسکەوتێکی

ئەوتۆی نەبووە.
دەبێ ئەوەش بگوترێ کە لەم یەک ساڵ شەڕەدا چەندین هەزار کەسیش لەو لاوە هەڵخەڵەتاوانەی بە ناوی سەرباز و بەسیج و پاسدار نێردراونە کوردستان، کوژراون.
ئەو شەڕەش بە خۆڕایی بۆ دەوڵەت ناکرێ و چەند میلیارد تمەنی تێچووە کە لە سەر بناغەی نابووریی وڵات تەئسیری تایبەتی هەیە و نابووریی وڵاتەکەمانی بەرەو نابوودبوون بردووە.
پاش بڵاوبوونەوەی پەیامی ایت الله خومەینی لە ١٣٥٨/٨/٢٦دا، حیزبی ئێمە یەکەم ڕێکخراو بوو کە ئامادەی وتووێژ و دۆزینەوەی ڕێگە حەللی ئاشتیخوازانە بۆ مەسەلەی کوردستان بوو.
ئەو یەک ساڵ شەڕەش ڕاستیی بۆچوونی ئێمەی دەرخست کە دەمانگوت مەسەلەی کوردستان لە ڕێگەی ئیزامییەوە حەل نابێ.
گەلانی خەباتگێڕی ئێران!
ئایا ئێوە دەزانن کە سوپای پاسداران و باقی بە رواڵەت بونیادەکانی، شۆڕش، کاتێک لە شەڕدا کەسانێکی بێ چەکیان وەدەست دەکەوێ و دەیانگرن، هەر لەوێ گوللە بارانیان دەکەن؟ ئایا ئاگادارن کە بەندییە کوردەکان لە بەندیخانەکانی ورمێ، تەورێز، کرماشان و تاران ئەشکەنجە دەکەن؟
هەر لەو کاتە دایە کە ئێمە لە سەرۆک کۆمار، لە مەجلیسی شوورای ئیسلامی و ڕێکخراوە دیموکراتیکەکان داوا دەکەین نوێنەرانی خۆیان بنێرن تا لە نزیکەوە بە چاوی خۆیان ببینن، سەرباز و پاسدارەکان لە بەندیخانەکانی کوردستان لە چ هەلومەرجێکدا دەژین و بەرپرسانی حیزبی چۆنیان لەگەڵ دەجووڵێنەوە.
وەرن ببینن کە هێلکۆپتەرەکان چۆن تەنیا نەخۆشخانەی سەحرایی ئێمە بۆمباران و راکێت باران دەکەن.
دەزگای حاکمی پاوانخواز بە ناڕەوا خۆی بە تەنیا نوێنەری هەموو خەڵکی ئێران دەزانێ، ئەوان لە وجوودی گەلان لە ئێراندا حاشا دەکەن. ئێمە پرسیار دەکەین ئایا گەلی کورد و گەلانی دیکە بە حاشا لێ کردنیان لە لایەن دەزگای دەوڵەتی دەتوێنەوە. جگە لە کورد، بەلووچ، تورکمەن، ئازەری و عەرەبییش وجوودیان هەیە.
دەزگای حاکم لە وەڵامی داخوازە ڕەواکانی گەلی کورددا تەنیا تۆمەت لێ دەدا و

قسەی ناحەز دەکا و گوللە داوێ. دوو ساڵ پێش بەرچەسپی دارەدستی کۆمونیزم و سەهیونیزمیان لێ دەدان، ئەو ساڵ بەوان دەڵێن بەکرێگیراوانی ئەمریکا و عێراقن!

خەباتی چەکدارانەی گەلی کورد لە خەباتی هێمنانە بۆ ئازادی و دابین کردنی مافی مرۆڤ لە بەشەکانی دیکەی ئێران جیا ناکرێتەوە. ئەوانەی زانستگەکانیان گاڵە داوە، رۆژنامەکانیان راگیر کردووە، لە تێکۆشانی رێکخراوەکان و حیزبە سیاسییە پێشکەوتنخوازەکان پێشگیری دەکەن، ئەوانەی ئازادیی ژنانیان بەربەست کردووە، و گوێ نادەنە داخوازە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی کرێکاران و هەر بەرهەڵستییەکی ئەوان بە توندی سەرکوت دەکەن، ئەوانەی لە چۆماغ دار و چەقۆکێشان هێزی زەرپەت پێک دێنن و هێرش دەکەنە سەر خۆپیشاندانی هێمنانەی خەڵک، هەمان ئەو کەسانەن کە کوردستانی خۆشەویستی ئێمەیان لە خوێندا شەلاڵ کردووە، مەبەستی ئەوانەش تەنیا سەپاندنی دیکتاتۆرییەکی سەدەکانی ئێوەڕاستە...

ئێمە لەگەڵ ئەو نامە سەرناوەڵە جارێکی دی ویست و پێشنیارەکانی خۆمان دەخەینە بەر بیروڕای گشتیی خەڵکی ئێران و لێیان دەپرسین ئایا داخوازییەکانی ڕەوای کورد دەبێ بە گوللە وەڵام بدەنەوە؟

هاونیشتمانانی بەڕێز!

گەلانی خەباتگێڕی ئێران!

مەهێڵن لەوە زیاتر خوێنی رۆڵەکانی ئێران لە شەڕی براکوژی دا بڕژێ. ئیزن مەدەن کوردستان بکەنە گۆڕستان.

دەنگی ناڕەزایی خۆتان هەڵبڕن، ئەرکی میللی و مرۆڤانەی خۆتان لە بەرامبەر گەلی کورد و هەموو گەلانی ئێران بەجێ بێنن، پێشی شەڕ فرۆشان بگرن و بەسەریان دا بنەڕێنن و بڵێن:

شەڕی براکوژی بەسە!

شەڕ لە کوردستان راگرن!»

بە پێچەوانەی ئەم داخوازییە ڕەوایانە شەڕ لە کوردستان بەردەوام بوو، رێژیم لەسەر ئەو بڕوایە بوو لە رێگەی کوردستانەوە بگاتە عێراق و لەوێڕا رێگەی قودس بگرێ و بەری نەدا.

لەبەر ئەوەی کە هەردوولا کوردستانیان کردبووە تەوەرەیەک بۆ درێژەدانی شەڕ و بە هەموو توانای خۆیان بە ڕاست و چەپ دا لێیـان دەدا، زۆرجـار خـەسـارەتی گـەورەش وەئێـمـە دەکەوت.

لە ڕۆژی ۱۷ی مانگی بانەمەڕ سەعاتی ۱۰/٥ی سەر لە بەیانی چوار هێلکۆپتەر و دوو فـڕۆکـەی عـێـراقی بە توندی پەلاماریان دایە سـەر بەندیخـانەی حـیـزب لە گـوندی دۆڵەتووی ناوچەی سەردەشت و بۆمبی ناپالمیشـیان بەکارهێنا. لەو بۆمبارانەدا ٤٢ کەس کوژران و نزیک ٥٠ کەسیش بریندار بوون. لەم ڕیزەدا شەش پێشـمەرگەی حیزب شەهید و ژمارەیەکیشیان بە توندی بریندار بوون.

کۆمیتەی ناوەندی حیزب ئەم کردەوەی لە ئاگادارییەکدا بە توندی مەحکووم کردو بە جـینایەتێکی ئاشکرای دژی مـرۆڤـایەتیی ناسـاند و لە قـاویدا. هەر لەم بوارەدا ڕێـژیمی کـۆماری ئیـسـلامی و ڕەجانیی کۆنەپەرست زۆریان هەوڵدا بە ئاشکرایی درۆ بکەن و بە خەڵک بسەلمێنن کە ئەم جینایەتە دەستی حیزبی تێدایە، بەڵام لەو ئاگادارییەدا بە توندی وەلامیان دراوەتەوە.

وەک پێشتر باس کرا لەم یەک دوو ساڵەی ٥٩ و ٦٠دا کاری دیپلۆماسی لە دەرەوەی وڵاتیش خەریکی پەرەسەندن بوو، بە تایبەتی دوکـتۆرەکانی فەرانسەیی وردە وردە دەهاتنە کوردسـتان و هاوکاریی حیزبیان دەست پێکردبوو، دۆستایەتی لەگەڵ دەوڵەت و میللەتی فەرانسەش خۆش ببوو.

لە پێـوەندی لەگەڵ هەڵبـژاردنی فـرانسـوا میـتـران، سیـاسـەتمەداری ناودار و ڕێـبـەری حیزبی سۆسـیالیـست بە سەر کۆماریی فەرانسە، لە لایەن سکرتێری حیزبەوە پەیامێکی پیرۆزبایی گەرمی بۆ لێدرا، ئەوەش دەقەکەیەتی:

هاوڕێی بەڕێز فرانسـو میـتران!

هەڵبژاردنی ئێوە بە سـەرکۆماری فەرانسە لە لایەن حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران و هەموو خەڵکی کوردسـتان بە ئێوە، حیـزبی سۆسـیالیـستی فەرانسـە و بە هەموو خەڵکی فەرانسە بە گەرمی پیرۆزبایی دەڵێم.

هیـواداریـن ئەم هەڵبـژاردنە نەتەنیـا ببـێـتـە هۆی ئاڵ و گـۆڕێکی بەرچاو لە کـۆمـەڵی فـەرانسـەدا بە بەرژەوەندیی زەحـمـەتکێـشـان، ئازادییـە دێموکـراتیکەکـان و پێـشکـەوتنی کۆمەڵ، بەڵکو لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییشدا فەرانسە بخاتە کۆڕی هێزەکانی سۆسیالیست

و دیموکراتیک و خەباتی رزگاریخوازی گەلانی زۆرلێکراوی جیهان.

حیزبی ئێمە وخەڵکی کوردستان زۆر خۆشحاڵن کە حیزبی سوسیالیستی فەرانسە بە رێبەریی ئێوە، لە خەباتی رەوای خەڵکی کوردستان پشتیوانیی کردووە و ئەو بۆچوونەی لە «پرۆژەی سوسیالیست»دا بە ئاشکرا راگەیاندووە.

ئێمە دڵنیاین کە هاوکاریی نێوان حیزبی سۆسیالیست و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لە داهاتوودا بەربلاوتر دەبێ و بە هەڵبژێرانی جەنابتان بە سەرۆک کۆماری فەرانسە، هەم میللەت و هەم دەوڵەتی فەرانسە چالاکانە لە خەباتی خەڵکی کوردستان بۆ دیموکراسی لە ئێران و خودموختاری لە کوردستانی ئێران پشتیوانی دەکەن. سەلامەتی و سەرکەوتنی ئێوە لە پێناوی خزمەت بە خەڵکی فەرانسە، ئاشتیی جیهانی و دۆستی نێوان میللەتان بە ئاوات دەخوازین.

**کۆمیتەی ناوەندیی**
**حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران**
**سکرتێری گشتی عەبدولرەحمان قاسملوو**
**١٣٦٠/٢/٢١ ١٩٨١/٥/١١**

لە مانگی جۆزەردانی ١٣٦٠ ناکۆکی و دژایەتیی بەرێوەبەرانی کۆماری ئیسلامی بەو پەری خۆی گەیشت. ناردزایەتییەکان گەیشتنە جێگایەک کە بەنی- سەدری سەرکۆماریش لێی حاڵی بوو، دەستی کرد بە رەخنەگرتن و لە قاودانی کەم و کوڕییەکانی رێژیمی ئاخوندەکان.

بۆیە زۆری پێ نەچوو بە پێچەوانەی هەموو یاسایەک، سەرۆک کۆمارێکی کە بە کوڕی خومەینی دەژمێردراو لە ژێر پشتیوانیی باوکانەی! ئەودا بە یازدە ملیۆن دەنگەوە سەرکەوتبوو، بە فەرمانی ئیمام و دەنگی مەلاکان، پۆستی سەرکۆماریی لێ ئەستێندرایەوە، ئەگەر زوو خۆی ون نەکردبا و دوایەش موجاهیدین لە فریای نەکەوتنایەو نەیانبردایە بۆ فەرانسە، لەوانە بوو بیگرن و مەحکووم بە ئیعدامی بکەن.

وەزعەکە سەیر گۆڕابوو. بۆیە لە پەیامێکدا کە بە بۆنەی ساڵرۆژی رادیۆی دەنگی

کوردستان له ڕێکەوتی ٢٧/٣/ ١٣٦٠ له لایەن کۆمیتەی ناوەندیی حیزبەوه دەرچوو، لەگەڵ ڕاگەیاندنی بڕیاری مەحکوم کردنی ناڕەوای بەنی سەدر له زەمانی سەرکۆماریدا، داوای لێ کرا بێته کوردستان:

«ئێستا که خەریکن بەنی سەدر لەسەر کۆماری دەخەن، دەبێ به چەند مەسەله سەرنج بدەین:

له پێشدا ئەوەی که ناکۆکیی سەرەکی تەنیا له نێوان بەنی سەدر و حیزبی کۆماری ئیسلامی ایت الله خومەینیدا نییه که بەوەڵانانی ئەو تەواو بێ. ئەو ناکۆکییه له نێوان ملیۆنها خەڵکی زەحمەتکێش و ستەم لێکراوه لەگەڵ کۆماری ئیسلامی. بۆیه وەلانانی ناوبراو نەتەنیا خەباتی دژی ئیستبدادی لاواز ناکا، بەڵکو ئەو گومانەش لادەبا که بیر بکرێتەوه ڕەنگه بتوانن ڕێژیم له نێوخۆدا بەرەو ریفۆرم بەرن. له ئاکامدا خەباتی دژی ئیستبدادیی چەرخەکانی نێوەڕاست پەرەدەستێنێ و بەربلاوتر دەبێ.

دووهەم ئەوەی که به وەلانانی بەنی سەدر له سەرۆک کۆماری که له کەش و هەوایەکی دەستکرددا به ئەنجام دەگا، کارێکی دژی قانوون و نادیمۆکراتیکه و مەحکوومی دەکەین.

سێهەم، بەنی سەدر له کاتی سەرۆک کۆماریدا هەڵەیەکی زۆری کردووە، زۆر کاری دژی خەڵک ئەنجام داوه. ئەو بوو که پارەکه فەرمانی هێرش بۆ کوردستانی دا و له سەربازەکانی داوا کرد تا کاتێک که وڵات پاک نەکەنەوه، پۆتینەکانیان نەکەنەوه. هەر ئەو بوو که هێرشی برده سەر دانشگای تاران و یارمەتیی دا تا زانستگاکان داخرێن. ئەو زۆر کاری دژی دیموکراتیک و دژی خەڵکی تەنیید کردووه و یارمەتیی به کۆنەپەرستی داوه تا وەزعێکی ئاوا بۆ خودی بەنی سەدر پێک بێنن.

بەڵام چەند مانگێک بوو بەنی سەدر لێی حاڵی ببوو که کۆنەپەرستیی ڕەش وڵاتەکەمان بەرەو چ هەڵدێرێک دەبا. دەبێ ئەوەش بڵێین که ناوبراو لەم هەلومەرجه مێژووییەدا به له قاودانی ڕێژیم زۆر له ڕاستییەکانی گوتووه و بۆ ڕوونکردنەوەی خەڵک هەنگاوی به کەڵکی هەڵێناوەتەوه.

حیزبی ئێمه و خەڵکی کوردستان له هەڵبژاردنی سەرۆک کۆماردا بەشدارییان نەکرد و دەنگیان به بەنی سەدر نەدا. به پێچەوانەی درۆ گەورەکانی حیزبی کۆماری ئیسلامی، سکرتێری حیزبمان قەت چاوی به بەنی سەدر نەکەوتووه. بەڵام له هەلومەرجێکدا که ئاغای بەنی سەدر کەوتۆته بەر هێرشی ناجوامێرانەی حیزبی گۆپاڵ بەدەستان، به پێویست

دەزانین بە خاتری بەرگری لە ئازادییە دیموکراتیکەکان و بەرەنگاری لەگەڵ کۆنەپەرستی پشتیوانیی خۆمان لە سیاسەتی ئەو دەربڕین.

ئێستا کە ئاغای بەنی سەدر هەڕەشەی لێ دەکرێ و ئەگەر وەدەست کۆنەپەرستیی حاکم بکەوێ، بێ گومان موحاکەمەی دەکەن و ڕەنگە ئیعدامیش کرێ. بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران پێشنیاری پێ دەکەین بۆ پاراستنی خۆی لە دەستدرێژیی گۆپاڵ بەدەستانی ڕێژیمی کۆنەپەرست بێتە کوردستان. نە ئەو بێ لوتفییانەی پێشتری ناوبراو سەبارەت بە خەڵکی کوردستان و حیزبی ئێمە کردوویەتی و نە ئەو جیاوازییە بیروباوەڕییەی لە بەینماندا هەیە، نابنە هۆی ئەوەی کە ئێمە ئاغای بەنی سەدر بە باوەشی ئاواڵە وەرنەگرین و پارێزگاریی تەواوی لێ نەکەین.

هیواداریــن ئاغای بەنی سەدر دەعوەتی ئێمە قبووڵ بکا، بێتە کوردستان و بە چاوی خۆیان ببینێ ئەوەی کۆنەپەرستی سەبارەت بە خەڵکی کوردستان و حیزبی ئێمە دەیگوت و زۆرجار بێ ئەوەی بەنی سەدر خۆشی بزانێ، دووپاتی دەکردنەوە بە تەواوی درۆن».

لە ٣٠ی مانگی جۆزەردانی ١٣٦٠دا ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵکی ئێران بە مەبەستی ئیعترازی سیاسی دژی ڕێژیم سەدان هەزار کەسی هێنایە شەقامەکانی تاران و دستیان کرد بە دانی دروشمی«بمرێ کۆنەپەرستی، بژی ئازادی».

لەسەر ئەم خۆپیشاندانە بەرینە خومەینی کە فەرماندەی گشتیی هێزە چەکدارەکانی ڕێژیم بوو، فەرمانی دا خۆپیشاندەران بەر گوللەی ڕەشاشان بدەن. لە ئاکام دا دەیان کەس شەهید بوون و سەدان کەس بریندار بوون.

خومەینی ڕێکخراوی موجاهیدینی هەڵوەشاوە ڕاگەیاند و ئەمری کرد لە هەموو شوێنێک و بە هەموو شێوەیەک سەرکوتیان بکەن. ڕێکخراوی موجاهیدینیش دوای ئەو کوشتارە، دژی ڕێژیم دەستی دایە کاری چەکداری و دروشمی«مەرگ و ئەمان بۆ خومەینی و رووخانی ڕێژیمی» هەڵگرت.

بە دوای ئەو پەلاماردی ڕێژیمدا بەشێک لە کادر و ئەندامانی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵک هاتنە کوردستان و لە بنکەی دەفتەری سیاسی وەک میوان مانەوە، کە لە دوایە بوو بە هاوکارییەکی تەواو لە بەینی هەر دوو لا لە دەزگای ڕادیۆی حیزبیش بۆ ماوەیەک کەڵکیان وەرگرت.

هەر لە جۆزەرداندا بوو کە هێزی دوژمن لە شارەکانی سەقز و بانە و بۆکان و مەهاباد

و پیرانشار هێرشی بۆ گوندەکان کرد و بە دڕندەیی خەریکی کوشتاری خەڵک بوون.
لەسەر ئەم ئەساسە دەفتەری سیاسی لە خەڵک و پێشمەرگەکانی کوردستان، ئەندامان و لایەنگرانی حیزب داوا دەکا لە بەرامبەر ئەم هێرشە بەربلاوەی دوژمندا بەربەرەکانی بکەن و ئەم چەند خاڵانەی خوارەوەش بەرچاوبگرن:
١- هەموو هێزی پێشمەرگە لە سەرانسەری کوردستاندا دەبێ لە ئامادەباشی تەواودا بن.
٢- ڕێگە ئەسڵییەکان و شوێنە ستراتیژییەکان دەبێ لە ژێر چاوەدێریی پێشمەرگەکاندا بن.
٣- هێزەکانی بەرگری دەبێ بۆ دیفاع لە ئازادی و بوونی دانیشتوانی گوندەکان بە تەواوی دەنگ درێن و تەیار کرێن و ئەگەر پێویست بوو بچنە یارمەتیی پێشمەرگەکان.
٤- ڕێکخراوەکانی حیزبی دەبێ لە گوندەکان خەڵک لە ئەخشە شەیتانییەکانی دەوڵەت ئاگادار بکەن و وێڕای لە قاودانی ڕێژیم، شان بەشانی زەحمەتکێشان لە بەرەنگاریی چەکدارانە لە بەرامبەر دوژمن دا هاوبەشی بکەن.
٥- ئەوانەی لە شەڕەکاندا تەسلیم دەبن، دەبێ وەک هەموو کات بە شێوەیەکی مرۆڤانە وەرگیرێن و تەحویلی ئۆرگانە خاوەن سەلاحییەتەکانیان بدەن.
هەرچەند هێرشی دوژمن هەر دەهات و زیاتر دەبوو، بەڵام بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە گەمارۆی ئابووری و فەرهەنگی لە لایەن کۆماری ئیسلامییەوە ژیانی خەڵکی تاڵ کردبوو، حیزب دەبوو هەستی زیاتر بە بەرپرسایەتی لە بەرامبەر ئەم وەزعەدا بکا. بە تایبەتی مەسەلەی دابەش کردنی زەوی کە لە هێندێک شوێن کەسانی ئامەسئوول دەستیان تێوەردەدا و هەرکەس بە شێوەیەک و بە پێوانەیەک خەریکی دابەش کردن و دەست بەسەرداگرتن بوو، دەهات وەزع لەوەش ئاڵۆزتر بکا کە هەبوو.
بۆیە پێش پێکهاتنی ئەو پلینۆمەی حیزب کە لە ڕێکەوتی ١٠ تا ١٣ی مانگی پووشپەڕی ١٣٦٠دا گیرا، لەمەڕ باکووری کوردستان کە وەزعەکەی تا ڕادەیەک ئاڵۆز، بوو و هەیئەتێکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوە نێردرابوو، هەروەها لەسەر مەسەلەکانی زەوی و زار و پەروەردە و فێرکردن کارێکی بەرچاو کرابوو، هێندێک گەلاڵە و پێشنیار ئامادە کرابوون، کە لە پلینۆمی ناوبراودا هاتنە بەر باس و بە شێوەی خوارەوە بڕیاریان لەسەر درا:
١- ڕاپۆرتی هەیئەتی باکوور لە لایەن کۆمیتەی ناوەندی پەسند کراو هەوڵ و

تێکۆشانی ئەندامانی لیژنەکە جێی سوپاسە.

٢- پلینۆم گوێی بۆ راپۆرتی سمیناری زەوی وزار راگرت و لەسەر ئەو ئەسڵە ساغ بوونەوە کە دەبێ لەسەر لانی هەرەزۆری ئەو زەوییەی لەهەر ناوچەیەک بۆ خاوەن زەوی دەمێنێتەوە، بڕیار بدرێ. هەروەها قەرار درا گەلاڵەی پێشنیاریی سمینار بدرێ بە دەفتەری سیاسی تا دوای موتالا و دانی ئەزەری خۆیان بیدەن بە تەشکیلات و لە رێگەی ئەوانەوە ئەزەری جووتیارانیش وەربگیرێ. جا دوای وەرگرتنەوەی ئەم راوبۆچوونانە لەسەر گەلاڵەکە ساغ بینەوەو بەرێوە بچێ.

٣- راپۆرتی سمیناری پەروەردە و فێرکردنی سەرانسەری کوردستانیش بە گشتی پەسند کراو بڕیار درا بۆ کردنەوەی قوتابخانەکان و خوێندەوارکردنی مندالان تێکۆشن.

هەر لەو پلینومەدا لەسەر سمیناری لاوانیش دوای خوێندنەوەی راپۆرتەکە باس کراو بڕیار درا یەکیەتیی لاوان زیاتر لە پێشوو بایەخی پێ بدرێ و بۆ پێگەیاندنی لاوەکان هەوڵ بدرێ.

لە پلینۆمدا هەروەها لەسەر گەلاڵەی سەرەتایی شووراکانی شار و دێ قسە کراو بڕیار درا سمینارێک لەم بابەتەوە پێک بێ.

هەر لەو پلینۆمەدا بڕیار درا لە ساڵی ١٣٦٠دا کۆنگرەی پێنجەمی حیزب بگیرێ.

پێویستە بگوترێ کە هەموو ئەو گەلالانە دوای کۆنگرەی پێنج هەروەک باس دەکرێ بە تەواوی لایەنی یاساییان بە خۆوە گرت و بە پێی ئیمکان و توانا بەرێوە چوون.

وەک گوترا بەنی سەدر سەرۆک کۆماری هەڵبژاردەی یازدە ملیۆن دەنگ و پشتیوانیی خومەینی وەلا نرا. رێژیم قەراری دا لە رۆژی ٢ی گەلاوێژدا کە لەگەڵ وەفاتی ئیمامی عەلی یەکیان دەگرتەوە، سەرۆک کۆماری تازە هەڵبژێردرێ.

دەفتەری سیاسی حیزب لە رێکەوتی ١٣٦٠/٤/٢٥ بەیانێکی دەرکرد و بە زۆر دەلیل ئەو هەڵبژاردنەی تەحریم کرد و رایگەیاند:

١- لەو شارانەی لە ژێر دەسەلاتی پاسداران دایە، هەڵبژاردن بە تەواوی تەحریم دەکرێ، رۆژی ٢ی گەلاوێژ با خەڵک لە مالان وەدەر نەکەون و دووکان و بازاریش داخەن.

٢- کۆمەلانی خەڵکی کوردستان و هێزی بەرگریی میللی و پێشمەرگە قارەمانەکان نابێ ئیزن بدەن تەنانەت سندووقێکی هەڵبژاردنیش لە شارەکانەوە بەرەو گوندەکان بچێ».

حیزبی دیموکراتی کوردستان له همر هەلومەرجێکدا به پێی ئیمکان به بەڕێوەبردنی ئەرکی خۆی هەستاوە.

بۆیە دوکتۆر قاسملوو سکرتیری گشتیی حیزب به لەبەر چاوگرتنی ئەم هەلومەرجەی له ئێران هاتبووه پێشێ، له بەشێک له پەیامی خۆیدا که به بۆنەی سی و شەشەمین ساڵڕۆژی دامەزرانی حیزب له رادیۆ خوێندییەوە، گوتی:

«له سێ مانگی رابردوودا رێژیم زیاتر له ٤٠٠ کەسی له رۆڵەکانی ئێران که بۆچوونی سیاسیی خۆیان هەبووه، بێ موحاکەمه به جووخەکانی ئیعدام ئەسپاردووه و شەهیدی کردوون. توندوتیژی و هاریبەکی تایبەتی که رێژیم له ئیعدام کردنی ئازادیخوازاندا له خۆی نیشان دەدا، ڕووی جەللادەکانی رێژیمی شای سپی کردۆتەوه.

ئیعدامی بێ دادگایی کچان و تازه لاوانی کەمتر له چارده ساڵ که بۆته کاری خومەینی نەتەنیا له مێژووی وڵاتی ئێمەدا، بەڵکو له مێژووی هیچ وڵاتێک وێنەی نییه.

له بەشەکانی دیکەی ئێران جگه له کوردستان، ئێستا موجاهیدین له هەموو ان زیاتر کەوتوونه بەر هێرشی دڕندانەی رێژیم و خومەینی خۆی. ئەوش شتێکی ئاساییه، چونکه ئەو رێکخراوه له ئێراندا گەورەترین و رێکوپێک ترین هێزی ئۆپۆزیسیۆنه. ئەو هێزەیه که به ئاشکرا ئاڵای خەباتی چەکداریی دژی رێژیمی خوێنخۆری حیزبی گۆپاڵ بەدەستان هەڵکردووه.

ئێمه بەدن بۆ ئازادیخوازانی ئێران به تایبەتی موجاهیدینی خەڵک سڵاو بنێرین و پشتیوانیی بێ دریخی حیزبی دیموکراتی کوردستان و گەلی کورد له خەباتی ئازایانەی ئەوان له سەرانسەری ئێران دەربڕین.

ئێستا خوێنی شەهیدانی کوردستان لەگەڵ خوێنی شەهیدانی سەرانسەری ئێران تێکەڵ بووه وبه پێکهێنانی یەکگرتوویی به کردەوه له گۆڕەپانی خەبات دژی رێژیمی زۆرویژی خومەینی، زەمینەی پێکهاتنی بەرەیەک له هێزه شۆڕشگێڕەکان ئاماده بووه.

حیزبی دیموکراتی کوردستان زۆر له مێژه له رێگەی پێکهێنانی بەرەیەکی دیموکراتی دژی ئیمپریالیستی به توندی تێدەکۆشێ. نوێنەرانی حیزبی ئێمه چەند مانگ پێش لەسەر پێکهێنانی بەره پێک گەیشتوون.

ئێستا دوای دەرچوونی ئاغای بەنی سەدر و رەجەوی له ئێران زۆر له لایەنگران و ئەندامانی حیزب له ئێمه دەپرسن مەسەلەی پێکهێنانی بەره به کوێ گەیشت؟

رێبەری حیزبی ئێمە چەند ساڵە هاتۆتە سەر ئەو باوەڕەی کە بە روونی مەسەلە گرینگەکان لەگەڵ خەڵک باس بکا. هەرچەندە ئێمە بە تەبلیغاتی دەرەوە و روونکردنەوەی خەڵکی دنیا گرینگییەکی تایبەتیی دەدەین، لەسەر ئەو بڕوایەین کە لە هەلومەرجی عاستەم و چارەنووس سازی ئێستادا رێبەرانی رێکخراوە شۆڕشگێڕەکان دەبێ لە پەنا کۆمەڵانی خەڵک و لە نێوخۆی وڵات دابن.

کاتێک ناوچەیەکی پان و بەرین لە خاکی نیشتمان لە ژێر دەسەڵاتی خەڵک دایە و کوردستان بۆتە سەنگەرێکی لە گیران نەهاتووی ئازادیی ئێران، پێمان وایە ئەگەر ناغایانی بەنی سەدر و رەجەوی بێنە کوردستان، دەتوانن دەوری زۆر کاریگەریان لە خەبات دژی رێژیم و پەرەپێدانی خەباتی سەرانسەریی گەلانی ئێراندا هەبێ و ئەو کارە دەتوانێ هۆیەکی گرینگی پێکهاتنی بەرەی دێموکراتیکی دژی ئیمپریالیستی بێ». [*]

رۆژ نەبوو دەیان کەس بە تۆمەتی درۆ و بێ موحاکەمە نەنێردرێنە بەر دەستی جەللادەکان. رێژیمی خومەینی بە کیژۆڵە و بریندار ونەخۆشانیشی رەحم نەدەکرد.

مێژووی حیزبی ئێمە و رەنگە دنیاش شتی وایان وەبیر نایە.

لە هەمان کاتدا خەباتی چەکدارانە لە بەلووچستان و باکووری ئێران و هێندێک شوێنی تر بەر چاو دەکەوت، دیارە ئەم خەباتە نەگەیبووە رادەی خەباتی چەکداریی پان و بەرینی کوردستان، بەڵام هومێد دەکرا پەرە بستێنێ.

هەرچەند پێش بینی دەکرا بە زۆر دەلیل بەرەی سەرتاسەری پێک بێ، بەڵام بەداخەوە تا نووسینی ئەم پەرتووکە، هەوڵەکانی حیزب لەم بوارەدا بێ ناکام ماوەتەوە.

بەداخەوە لە هەل و مەرجێکی ناوا ناسکدا بەهۆی هێندێک کردەوەی پارتی دێموکراتی کوردستانی عێراق لە کوردستانی ئێران و دەست تێوەردانی برایانی پارتی لە کاروباری کوردستانی ئێراندا، ناکۆکی و ناتەبایی ساز بوو کە بە تێکڕا زیانێکی زۆری بۆ هەردوولا بە تایبەتی بۆ حیزبی ئێمە هەبوو. لەم بابەتەوە زۆر شت بڵاو کراوەتەوە کە هێنان و نووسینیان جارێکی دیش زیانمان پێدەگەیەنێ، بەم هۆیە چاوی لێ دەپۆشین.

ئەوەی زۆر جێگەی داخ بوو برایانی پارتی بە زاهیر لەسەر دەرهێنانەوەی تەرمی سەرۆک بارزانی کە بە ناڕەوا بەسەر حیزبی ئێمەیان داهێنا و ئامادەش نەبوون لێ

(*) بەشێک لە پەیامی رادیۆیی دوکتور قاسملوو بە بۆنەی سی و شەشەمین ساڵرۆژی دامەزرانی ح. د. ک. ئ. وەرگیراو لە ژمارەی ٧٨ی رۆژنامەی «کوردستان».

پرسینمودی هاویمشی لسەر بکرێ، چونکە حیزب دەیتوانی هەر لە لای خۆیان ئەو کەسانە بدۆزێتەوە کە ئەو کارەیان کردبوو، لە پێشدا لە باکووری کوردستان و لە رۆژئاوای ورمێ لە ناوچەکانی شپیران و سەلماس، سۆما، ئەنزەل و برادۆست بە هاوکاریی رێژیمی ئێران هەموو دەربەگەکانی ئەو ناوچەیان پڕ چەک کرد و دوایە بە هاوکاریی پاسدار و ژاندارمەکانی رێژیم لە چەند لاوە پەلاماری پێشمەرگەکانیان دا.

ئەو کارە درێژەی پەیدا کرد و گەیشتە ناوچەی تەرگەوەر و مەرگەوەر و شاری شنۆش. چونکە ئێمە ئەوانمان بە میوانی کوردستانی ئێران دەزانی و پێشتریش دۆستایەتییەکی دوورودرێژی بەینی حیزبی ئێمە و پارتی هەر لە سالی ۱۹٤٥ و ۱۹٤٦ی زەمانی کۆمارەوە بگرە تا کاتی چۆلکردنی بەرەکانی شەڕ لە سالی ۱۹۷٥دا بەرقەرار بووە و زۆر جار چاومان لە راست تاوانەکان نووقاندبوو، لێرەشدا بە دانی چەند ئیتلاعیە قەناعەت کرا و پێشمەرگەی کوردستانی ئێران حەزی نەکرد خوێنی برایانی میوانی خۆی برژێنێ و دلی دوژمنانی کورد خۆش کا. بە داخەوە لەم شەڕە ناڕەوایەدا نزیکەی پەنجا پێشمەرگەمان شەهید کران. ئەو شەڕە جگە لە زیانی گیانی، دوژمنی بەدکارمان واتە کۆماری ئیسلامیشی هان دا هێرشە ناجوامێرانەکانی بۆ سەر کوردستان توندوتیژتر بکا و بازاڕی جاشەکانی کوردستانی ئێرانی گەرمتر کرد.

هەر لە مانگی خەرمانانی ۱۳٦۰دا هاوکات لەگەل شەڕی باکوور لە باشووری کوردستان و ناوچەی کامیاران، کۆمەلە و پەیکار ستادی هاوبەشیان پێکهێنا و دەیانویست پێشگیری حیزب لە بەرەو جاشیەتی چوونی هێندێک لە پاشماوەی هێزی بەکرێگیراوی رزگاری لە لایەن حیزبەوە بە تاوان دابنێن!

مەبەستی دیکەیان لەم کارە بە قەولی خۆیان ئەوە بوو کارنامەی حیزب لە روانگەی خەلکەوە خراپ بنوێنن. ئەم بۆچوونە نالەبارە و شەڕ فرۆشانە بوو بە هۆی تێکهەلچوونی نیزامی و شەڕێکی خوێناوی کە ۷ پێشمەرگەی حیزبی تێدا شەهید و ژمارەیەکیش بریندار بوون، بەلام بە خۆشییەوە بەرپرسانی هەردوولا بە رێنوێنی رێبەرایەتی بەیەکەوە دانیشتن و کۆتاییان بە شەڕەکە هێنا.

دوکتۆر قاسملوو لە مانگی رەزبەر لە وتارێکی رادیۆییدا بە توندی باسی ئەم کارەی قیادەی لە باکوور و ئیقدامی کۆمەلەی لە باشوور کرد و زیانی ئەو کارانەی راگەیاند.

هەر لەم وتارەدا گوتی:

«لەمێژە ئاشکرا بووە کە حیزبی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵک هاوکاری دەکا. ئەو هاوکاری و هاوئاهەنگییە شتێکی تاکتیکی و سیاسەتی ڕۆژ نییە، بەڵکو هاوپەیمانێکی ستراتیژیک و درێژخایەنە و لە ڕۆژێکدا پێک نەهاتووە، بەڵکو چەند ساڵە لە نێوان ئەو دوو ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەدا هەوڵ دەدرێ.

لە چەند حەوتووی دواییدا، پێوەندیی ئێمە بە یەکجارە ڕێکوپێکتر بووە و هیچ کۆسپێک بۆ دامەزرانی بەرەیەکی هاوبەش لە گۆڕێدا نەماوە. هەردوو لەسەر ئەو بڕوایەین کە دەبێ ڕێژیمی خومەینی بڕووخێ و لە جێگای ئەو ڕێژیمێکی دیموکراتیک بێتە سەرکار...

دوای هەڵبژاردنێکی ئازاد، دەبێ مەجلیسی «موئەسسان» پێک بێ و لەسەر ماهییەتی کۆماری داهاتوو ساغ بێتەوە. ئەوانە هەموو لەگەڵ بەشی یەکەمی دروشمی بنەڕەتیی ئێمە کە داوای دیموکراسی بۆ ئێران دەکا، دەخوێنێتەوە.

هەروەها هەر دوو ڕێکخراو لەسەر ئەو باوەڕەن کە گەلانی زۆر لێکراوی ئێران بە تایبەتی گەلی کورد دەبێ خودموختاریی هەبێ. ئەوەش لەگەڵ بەشی دووهەمی دروشمەکەمان کە بریتییە لە خودموختاری بۆ کوردستان، یەک دەگرێتەوە.

هەموو ئەو داخوازییانە لە بەرنامەی دوڵەتی کاتیی داهاتوودا کە لە لایەن کاک مەسعوود ڕەجەوی بە ڕەسمی ڕاگەیەندراوە، گونجاوە...

هەر بەو دەلیلە زۆر بەختەوەرم ڕابگەیەنم کە حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ئیعلامی حکوومەتی کاتی بە سەرۆکایەتیی برا کاک مەسعوود ڕەجەوی پێشوازی دەکا و پشتیوانیی خۆی لە بەرنامەی ئەو دەوڵەتە کاتییە ڕادەگەیەنێ. هێندێک گیروگرفت لە بواری پێکهێنانی بەرەی هاوبەش دەگۆڕێ دایە کە نوێنەرانی حیزبی ئێمە لە پێوەندیی نزیک لەگەڵ ڕێبەرایەتیی ڕێکخراوی موجاهیدین خەریکی جێ بەجێ کردنیانن. ئێمە هیوادارین بە نەرمشی شۆڕشگێڕانەی هەردوولا ئەم گیروگرفتانە لە نێو بچن و بەرەی هاوبەش ڕاگەیەندرێ...». (*)

دوای ئەو دۆستایەتییە نزیکەی بەینی حیزب و موجاهیدین لە کوردستان و دەرەوەی وڵات پێکهاتبوو، وتووێژی ڕاستەوخۆی بەینی شوورای نیشتمانیی بەرگری و دوکتور قاسملوو دەستی پێکرد بوو، ئاڵوگۆڕی نامەش بەینی سکرتێری حیزب و بەرپرسی شوورا هاتبووە گۆڕێ.

---

(*) وەرگیراوە لە ڕۆژنامەی «کوردستان» ژمارەی ٨٠ی فارسی.

کاک مەسعوود ڕەجەوی ڕۆژی ١٣٦٠/٨/٣ نامەیەک بۆ دوکتور قاسملوو دەنێرێ

بسم الله الرحمن الرحيم

کاک عەبدولڕەحمان، برایان و دۆستانی ئازیزی ڕێبەرایەتیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بە سڵاوی شۆڕشگێڕانە و ئاواتی سەرکەوتنی خۆڕاگریی دادپەروەرانەی گەل، ئەوا نوسخەیەکتان لە بەرنامەی شوورای میللی بەرگری و حکوومەتیی کاتیی کۆماری دیموکراتیکی ئیسلامیی ئێران لەگەڵ ئەم نامەدا بە مەبەستی ئاگاداریی هاونیشتمانانی خۆشەویستی کورد بۆ دەنێرم. ڕەجایە بە باس کردن لەسەر خاڵەکانی بەرنامە، کوردستانی خۆشەویست لە وەدەست هێنانی مافی مێژوویی خۆی لە چوارچێوەی ئەو بەرنامەدا ئاگادار بفەرموون. مەبەست قبووڵ کردنی ئەسڵی پیرۆزی خودموختارییە بۆ کوردستان لە چوارچێوەی سنووری پارێزراوی نیشتمانی ئازیزماندا.

هەروەها ئاگادارت دەکەم مەبەست لە هێنانی وشەی داخلی (ئێوخۆیی) کە هێندێک جار بە دوای وشەی خودموختاریدا دێ، ڕاست بۆ تەئکید لەسەر پاراستنی ئێرانە بە تەواوی و هەروەها لە ئاودان وبەربەرچ دانەوەی تەبلیغاتی بێ شەرمانەی خومەینی لە دژی خۆڕاگریی ڕەوای خەڵکی کوردستانە، تا چیتر نەتوانێ ئەم خۆڕاگرییە شۆڕشگێڕانەیە بە جیاوازیی خوازی لە قەڵەم بدا. بەم هۆیە مەئموورییەت بە ئێوە دەدرێ تا بە دڵپاکیی تەواو ئەوپەری زەحمەتی خۆتان بۆ یەکگرتوویی هەموو هێزەکان و کەسایەتییە نەتەوەیی و گەلییەکان لە دەوری شوورابکێشن.

بە ئاواتی رووخانی هەرچی زووتری ڕێژیمی دژی گەلیی ئاخوندەکان و، بە هیوای هاوکاریی هەموو هێز و کەسایەتیی یە پێشکەوتنخواز و خەباتکارەکان

**بەرپرسی شوورای نیشتمانیی بەرگری بۆ**
**ڕزگاری و سەربەخۆیی کۆماری دیموکراتیکی ئیسلامی**
**مەسعوود ڕەجەوی**
**١٣٦٠/٨/٣**

بە دوای ئەو نامەیەدا دوکتۆر قاسملوو وەڵامێک بە کاک مەسعوود ڕەجەوی دەداتەوە ئەوەش دەقەکەی:

برای موجاهید مسعوود رەجەوی، بەرپرسی شوورای نیشتمانیی بەرگریی بۆ سەربەستی و ئازادی و بەرقەراریی کۆماری دێموکراتیکی ئیسلامیی ئێران!

بە سلاوێکی شۆڕشگێڕانە،

بە دوای وتووێژێکی لەمەڕ شوورا و ئامانجەکانی و چلۆنایەتیی ئەو، بە لەبەر چاوگرتنی بەرنامەی شوورا و دەوڵەتی کاتیی کۆماری دێموکراتیکی ئیسلامی ئێران کە بە ئیمزای هاوبەشی ئێوە و بەنی سەدر بلاو کراوەتەوە، وێڕای موافقەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لەگەڵ خاڵە سەرەکی و گشتییەکانی راگەیەندراو و تەئکید لەسەر ئەسلی پیرۆزی خودموختاریی کوردستان، بەم شێوە هاتنە ناو شوورای میللی موقاوەمەت بە شێوەی رەسمی رادەگەیەنین. دیارە نوێنەری حیزبیش بۆ ئامادە بوون لە شوورادا بە جیاواز دەناسێنین.

بەجێی دەزانم سلاوی گەرم و شۆڕشگێڕانەی برایانی پێشمەرگە و ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران پێشکەش بە موجاهیدە قارەمانەکان بکەن کە هەموو رۆژێ و هەموو سەعاتێک بە دانی خوێن حەماسە دەخوڵقێنن و مێژووی خەباتی شۆڕشگێڕانەی نیشتمانی ئازیز زیاتر لە پێشوو دەوڵەمەند دەکەن.

بە دڵنیابوون لە سەرکەوتن

**سکرتێری**
**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**
**عەبدولڕەحمان قاسملوو**
**١٣٦٠/٨/٥**

پاش وتووێژێکی زۆری دوکتور قاسملوو و دوکتۆر سادق لە پاریس لەسەر ئەم باسە، هەروەها ئاڵوگۆڕی چەند نامە بەر لە پێکهاتنی کۆنگرە، ئاگادارییەک لە رێکەوتی ١٣٦٠/٨/٢٦دا بە ناوی دەفتەری سیاسیی حیزبەوە بلاوبۆتەوە کە ئەم دوو سێ حەوتوو مەودایەی نێوان راگەیاندنی چوونە ناو شوورا لە لایەن دوکتۆرەوە و راگەیەندراوی دەفتەری سیاسی لەم رێکەوتەدا نیشانەی روونی ئەخستنە بەر باسی مەسەلەکە لە

کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسییە.(*)

ئەوەش دەقی ئاگادارییەکە:

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران و ڕێکخراوی موجاهدینی خەڵک لەسەر ئوسوولی گشتیی پێکەوە هاوکاری کردن و پێکگەیشتن. حیزبی ئێمە بە شێوەی ڕەسمی چووە نێو شوورای میللی بەرگری بۆ سەربەخۆیی و ئازادیی کۆماری دیموکراتیکی ئیسلامی.

دیارە نامەکانی نێوان دوکتۆر قاسملوو و کاک مەسعوود ڕەجەوی کە ئاڵوگۆڕ کراوە، بە جیاواز بڵاو دەکرێنەوە.

بێگومان ئەو یەکگرتنە بۆ حیزبی ئێمە و گەلی کورد و ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵک و، هەموو شۆڕشگێڕان و گەلانی سەرانسەری ئیران سەرکەوتنێکی مەزنە.

ئەم یەکگرتنە، هەلومەرجی ڕووخانی ڕێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی باشتر ئامادە دەکا، ئەو بەرنامە سیاسییە ڕوونەی لە لایەن دەوڵەتی کاتیی کۆماری دیموکراتیکی ئیسلامی پێشنیار کراوە، وەڵامدەری داخوازەکانی ئێستای جەماوەری ملیۆنیی خەڵکی ئێرانە.

هاونیشتمانان!

دەفتەری سیاسی خۆی بە بەختەوەر دەزانێ کە مزگێنی ئەم ڕێککەوتنە بدا بە گەلی کورد و هەموو گەلانی ئێران. هەروەها ئاگادارتان دەکەین کە تا چەند ڕۆژی دی ئەم ڕێککەوتنە بە درێژی بە ئاگاداریی گەلانی ئێران دەگا.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

دەفتەری سیاسی

١٣٦٠/٨/٢٦

(*) هیچ کات بەر لەچوونی حیزب بۆ نێو شوورا لە پلینۆمەکاندا باسی ئەم مەسەلە نەکراوە و بە جیاوازیش لەگەڵ ئەندامانی ڕێبەری نەهاتۆتە گۆڕێ. دوای چوونی حیزب بۆ نێو شوورا، بۆ یەکەم جار لە ڕادیۆی موجاهید بیستراوە.

بەشی یەکەم

# کۆنگرەی پێنج
# (کۆنگرەی شەهیدان)

پاش ئەو بڕیاردەی لە پلینۆمی پووشپەڕدا درابوو، وردە وردە کۆنفرانسی ناوچەکان و شارۆچکە و شارستانەکان گیران و نوێنەرانی ئەو ڕێکخراوانە لە هەموو بەشەکانی کوردستان هەڵبژێردران.

کۆنگرەی پێنج کە بە کۆنگرەی شەهیدان ناودێر کراوە، لە ڕێکەوتی پازدە تا هەژدەی مانگی سەرماوەزی ١٣٦٠ لە گوندی شیوەجۆی ناوچەی ڕەبەت بە بەشداریی ئەندامانی ڕێبەرایەتی و نوێنەرانی هەڵبژێردراوی کۆنفرانسەکان و ئامادەبوونی چەندین میوان پێکهات.

ئەو کۆنگرە کە لە هەلومەرجی دژواری شەڕ لە کوردستاندا و لە چیا و لە دنیای خەباتی چەکداری- سیاسیدا گیرا، تایبەتمەندیی خۆی هەبوو.

ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرە لە ڕاپۆرتی کۆنگرەکانی دیکە گەلێک جامع تر و پڕ نێوەڕۆک تر بوو، ئاخر خەبات خۆی فێر دەکا، دەرس دەدا و دەبێتە کانگای تەجرەبە. تێکۆشانی حیزبیش لە هەموو بوارەکاندا زۆر زیاتر لە دوو ساڵی نێوان کۆنگرەی ٤ و کۆنگرەی ٥ بوود، بە تایبەتی لە پێوەندی لەگەڵ هەوڵ و تێکۆشان بۆ دیتنەوەی دۆستان و پێکهێنانی بەرە، هەروەها لە پێوەندی لەگەڵ کاری دیپلۆماسی لە دەرەوەی وڵات.

لە بەینی ئەم دوو کۆنگرەدا حیزب بۆ یەکەم جار دەفتەرێکی کاری لە پاریس دانابوو، یەکەم نوێنەریش کاک عەزیز مامڵێ ئەندامی مشاوری کۆمیتەی ناوەندی لەوێ کاری کردبوو، کە تێکڕای کارەکانی دەرەوە سەرنج ڕاکێش بوون، هەر ئەوەش بوو بە هۆی ئەوە

ناوبراو ژمارەی یەکەم لە دەنگەکان بۆ ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندی وەربگرێ.

لەم کـۆنگرەدا جگە لە باس لەســەر راپۆرت و پەسند کـران، چاوێک بە بەرنامــە و پێڕەودا خشـێندراوەو ناڵ و گۆڕی پێویستی تێدا کرا. بۆ یەکەم جار حیـزب دروشـمی رووخانی کۆماری ئیسلامی هەڵگرت.

هەروەها رێبەریەکی تازە هەڵبـژێردرا کە بە تەرتیبی دەنگەکان پێیـان درابوو، بریتی بوون لە:

عەزیز ماملێ، دوکتۆر قاسملوو، جەلیل گادانی، تەیفوور بەتحانی، ئەحمەد جاویدفەر، مامۆستا عەبدوللا حەسەن زادە، هاشم کەریمی، حەسەن شەرەفی، مستەفا شەڵماشی، حوسێن مەددەنی، دوکتۆر شەرەفکەندی، حەسەن رەستگار، فەتاح کاویان، عەلی کاشف پوور، بابا عەلی مێهر پەروەر، کەمال دەبباغی، مستەفا هیجری، رەحیم محەممەد زادە، سەعید کوێستانی، حەکیم رەزائی، موهەندیس ناریانی، ئەمیر قازی، سەید رەسووڵ دیهقان، عبداللە بەهرامی، نەبی قادری.

جێگرەکانیش بریتی بوون لە:

سەید حەسەن هاشمی، تاهر عەلیار، رەحیم بەغدادی، شاپوور فیروزی، عەلی کتابی، عبداللە ئیبراهیمی، غەنی غەنی پوور، بهروز کورد ئەحمەدی.

لە یەکەم پلینۆمی دوای کۆنگرەش ئەم کەسانە بۆ مشاوری هەڵبژێردران:

رەحمان کاژەیی، عەزیم ئەفسەر. جەعفەر حەمیدی، حەسەن شیوەسەلی، غەفوور حەمزەیی، هومایون ئەردەلان، عەزیز لەحیمی.

زۆر بەداخەوە رۆژی ۲۲ی سەرماوەز هاوڕێ ئەحمەد جاویدفەر«کاک هەژار» ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و یەکێک لە فەرماندە ئەمەگناسەکانی پێشمەرگە لە شەڕێکی خوێناویی ناوچەکانی بەینی بانە و سەردەشت گیانی فیدای گەل کرد و شەهید بوو.

بە دوای کـۆنگرەی پێنجـدا بە هەڵســەنگاندنی وەزعی کـۆمەڵایەتی و چاوەڕوانیی خەڵک بۆ پێ ڕاگەیشتنی زیاتری گیروگرفتەکانیان جگە لە کۆمیسیۆنەکانی تەشکیلات بە بەرپرسایەتیی دوکتۆر سادق، ماڵی بە بەرپرسایەتیی کاک مستەفا هیجری، رادیۆ و چاپەمەنی بەبەرپرسایەتی مامۆستا عبداللە حەسەن زادە، پێوەندییەکان و دەبیرخانە بە بەرپرسایەتیی دوکتۆر قاسملوو، کۆمیسیۆنێکی تازە بە ناوی کۆمیسیۆنی کاروباری کۆمەڵایەتی بە بەرپرسایەتیی جەلیل گادانی، ئەندامی دەفتەری سیاسی دامەزرا، کە

بەتێکرا دەبوو حەوت بەش بەڕێوەبەرێ و بە پێی ئایین نامەی خۆی کە دوای کۆنگرە بە پەسندی دەفتەری سیاسی گەیشت، ئەرکەکانی خۆی بەڕێوە دەبرد.

ئەم کۆمیسیۆنە پەروەردە و فێرکردنی کوردستان، بەشی قەزایی، بەشی شەهیدان، بەشی دەرمانی، بەشی شووراکان و بەشی ڕێگەوبان و بەشی زەوی وزاری دەگرتەوە.

بە شاهیدی خەڵکی کوردستان لە ماوەیەکی یەک دوو ساڵیدا بە باشترین شێوەی گونجاو گیروگرفتەکانی کۆمەڵی لە ناوچە جۆراوجۆرەکان حەل دەکرد. ئەم کۆمیسیۆنە و کارەکانی بە ئەندازەیەک جێگەی ڕەزامەندیی خەڵک بوون کە خەڵک لە هێندێک لە شوێنەکانی ژێر دەسەڵاتی ڕێژیمیش، ڕێگەچارەی ناکۆکییەکانی خۆیان لەم بەشەی حیزب داوا دەکرد.

بۆ هەموو ئەم بەشانە لە ماوەی چەند مانگدا سمیناری بەرین گیرا و بۆ هەر کام لە پێشنیارەکان و راوبۆچوونی بەشداران بە لەبەر چاوگرتنی قانوونەکانی پێشووی وڵات و هەڵسەنگاندنی هەلومەرج و هەروەها بە سەرنج دان بە بەرنامەی پێشکەوتنخوازانەی حیزب گەڵاڵەیەک ئامادە کرا، کە دوای پێداچوونەوەی دەفتەری سیاسی و پڕکردنەوەی کەم و کوورییەکان لایەنی یاسایی و ئایین نامەیی پەیدا دەکرد و بەڕێوە دەچوو.

گەڵاڵەی پەسندکراوی قەزایی، زەوی و زار، پەروەردە، شووراکان، شەهیدان و دەرمانی بە شێوەیەک تەنزیم کرابوون و بەڕێوە دەچوون کە ئێستاش لە زۆر شوێن وەک خۆی ماوەتەوە، خەڵک بۆ بەرژەوەندیی جەماوەر کەڵکیان لێ وەردەگرن.

بۆ ئەوەی بە پێچەوانەی گەمارۆی هەمەلایەنەی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی و خۆدزینەوەی لە دانی بوودجەی دیاریکراوی کوردستان و دابین کردنی ئیمکاناتی پێویست کارەکان لە لایەن حیزبەوە هەرچی باشتر بەڕێوە بچن، لە هەرکام لە بەشەکانی کە باس کران، دەورەی درێژخایەن لە لایەن پسپۆرانەوە بۆ ئامادەکردنی کادری پسپۆر دادەندرا و تێکۆشەرانی بە ئیمان بە تایبەتی لاوە دڵگەرم ودەرس خوێن وکورد پەروەرەکانی کوردستان بە هەستی خاوێن و ئیستعداد و ئیمانی خۆیان بە باشی لە هەموو بوارەکان دا پاش تەواو کردنی سەرکەوتووانەی دەورە ئەرکی خۆیان بەڕێوە دەبرد.

بۆ وێنە لە ماوەی یەک دوو ساڵدا لە بەشی هەرە زۆری کوردستان شوورای شار و گوند دامەزرا، زیاتر لە ٧٠٠ مامۆستا بۆ دەرس گوتنەوەی زمانی کوردی و باقی دەرسەکان بۆ پێ ڕاگەیشتنی نزیکەی ١٢٠٠٠ قوتابی بە تایبەتی لە گوندەکاندا پەروەردە کران.

دەیان کادری دەرمانی لە ژێر دەستی دوکتۆرەکانی کورد و چەند کەسێکی خاریجی بۆ پێ ڕاگەیشتنی دوو سێ نەخۆشخانە و هەژدە دەرمانگای شۆڕش، دەیان کادری قەزایی خاوەن هەستی بەرپرسایەتیی پەروەردە کران.

کێشەی زەوی و زار کە لە سەرەتای شۆڕشدا وەزعێکی نالەباری پەیدا کردبوو، خرایە نێو چوارچێوەیەکی ئوسوولی و قانوونی ولە بەشی زۆری کوردستان بە پێی وەزعییەتی تایبەتی هەر ناوچەیەک زەوی زیاتر لە حەدی نیساب بە نێو ڕەشایی و جووت بەندە کەم زەوییەکاندا بەش کرا.

بەڕێوەچوونی یاسای گشتیی و قانوونی سزا لە بەندیخانەکانی حیزبی بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ ڕێژیمەکانی پاشایەتی و کۆماری ئیسلامیدا بەراورد ناکرێ.

پێوەندیی مرۆڤانە و جوامێرانە لەگەڵ بەندییەکان بە شێوەیەک بوو کە بە دەیان کەس دوای ئازاد بوونیش، لە سەفی پێشمەرگایەتی و شۆڕشدا جێی خۆیان دەکردەوە.

کەم نین ئەو کەسانەی کە بەم شێوە هاتوونە ریزی شۆڕش و گیانیشیان بەخت کردوە.

بە سەدان کیلۆمەتر ڕێگا لە ناوچە شاخاوییەکان لە لایەن شۆڕشەوە بۆ ئاسان بوونی هاتوچۆی گوندەکان لە ناوچە جۆراوجۆرەکان کێشراوە و چەند پردی گرینگ دروستکران یان چاک کراونەوە وەک پردی قەڵاتاسیان و...

بە دوای چوونی حیزب بۆ نێو شووڕای میللی بەرگری لە ماوەی دوو مانگی ڕێبەندان و ڕەشەمەی ١٣٦٠دا، شوورا جەلسە ڕەسمییەکانی خۆی بە بەشداریی هەموو حیزب و ڕێکخراو و کەسایەتییەکانی ئەندامی شوورا دەست پێکرد. شوورا لە ماوەیەکی کورتدا توانی سێ سەنەدی گرینگ پەسند بکا»

یەکەمیان سەبارەت بە ئەرکەکانی دەورەی ئاڵ و گۆڕی پێویستی دەوڵەتی کاتی بوو.

دووهەمیان بەڵگەی پێڕەوی شوورا بوو.

سێهەمیان ئەرکە سەرەکییەکانی دەوڵەتی کاتی بوو.

پەسند کرانی ئەم سێ سەنەدە هەنگاوێکی گرینگ و ئاشکرای شوورا بوون کە بڕوای خەڵکی بە شوورا و هەروەها بڕوای حیزبی دێموکراتی کە تازە ببووە ئەندامی شوورا، زیاترکرد ئەم سێ سەنەدە بە تەواوی لە ڕۆژنامەی ژمارە ٨٣ی «کوردستان» دا چاپ کراون.

لەم ماوەدا و هەروەها دواتر بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەکانی شووڕادا بۆ ماوەی چەند مانگ یا دوکتۆر قاسملوو یا دوکتۆر سادق بەشدار دەبوون. جگە لەوان کاک صارم الدین صادق وەزیری وەک کوردێکی دڵسۆز لە تەسویبی ئەم بەڵگانە و بەڵگەی تایبەتیی پرۆژەی خودموختاریی کوردستاندا تێکۆشانی بەرچاوی هەبوو. لەم بوارەدا دوایەش هاوکاریی باشی کاک عەزیز ماملێ نوێنەری حیزبی کرد کە ماوەیەکی زۆر بە ناوی پەرویز لە لایەن حیزبەوە بەرپرسی دەفتەری حیزب لە پاریس و لە کۆبوونەوەکانی شووڕادا بوو.

پاشانیش هەتا حیزب لە شووڕادا ما، بڕیار درابوو نوێنەری حیزب لە ئورووپا کە کاری دەفتەری حیزبی لە پاریس بەڕێوە دەبرد وەک نوێنەری حیزب لە کۆبوونەوەکانی شووڕاشدا بەشداری بکا.

قارەمانەتیی پێشمەرگەکان لە ساڵی ۱۳٦۰دا بە گوێرەی پێویست لە زۆر شوێن دەرکەوت و کۆڵنەدەرانە دژی هێرشکەران شەڕیان کرد. ئەوەش چەند نموونە لە عەمەلیاتەکانی ساڵی ۱۳٦۰:

**هەوشار**

۱۳٦۰/۸/۱۱ پێشمەرگەکانی هێزی شەهیدانی هەوشار، تەقەیان لە هێلیکۆپتەرێکی دوژمن کرد و خستیانە خوارەوە. لە ئاکامدا ٦ کەس لە سەرنشینەکانی کوژران.

هەر لەو ڕۆژەدا ماشینێکی ئەرتەشی کەوتە سەرمین و ۹ کەس لە هێزەکانی دوژمن کوژران. دیسان هەر لەو ڕۆژەدا دەستەیەکی دیکە لە پێشمەرگەکانی ئەو هێزە دەچنە نێو شاری شاهیندژ و پەلاماری ناوەندی سوپای پاسداران لەو شارەیان دا، کە لە ئاکامدا دوو دەزگا ماشێنی دوژمن خراپ کرا و ۲۲ بەکرێگیراویش کوژران.

**کرماشان**

۱۳٦۰/۷/۲٦ پێشمەرگەکانی هێزی بێستوون و هێزی زرێوار، مۆڵگەکانی دوژمنیان لە گوندی لۆن و دەوروبەر دایە بەر پەلاماری شێرانە، لە ئاکامدا ٤۰ کەس لە هێزەکانی دوژمن کوژران و ژمارەیەکیش بریندار بوون.

بۆکان ۱۳٦۰/۸/۳ پێشمەرگەکانی هێزی بەیان و هیزی پێشەوا لە چالاکییەکدا

مۆڵگەی دوژمنیان لە بەرزاییەکانی گوندی حوسێن مامە دایە بەر پەلامار و دوای شەڕێکی قارەمانانە ئەو مۆڵگەیان دەست بەسەردا گرت. لە ئاکامدا ۲۷ کەس لە ئەفرادی مۆڵگەکە کوژران و هەموو کەل و پەلی مۆڵگەکەش کەوتە دەست پێشمەرگەکان. ٦ سەربازیش بە دیل گیران. لەو شەڕە قارەمانانەیەدا ٥ پێشمەرگەی حیزب شەهید بوون.

**مەریوان**

۱۳٦۰/۸/۱۲ پێشمەرگەکانی هێزەکانی زرێوار، شەریف زادە و شاهۆ لە چالاکییەکی هاوئاهەنگدا ۲ مۆڵگەی دوژمنیان لە مارانی و دەرگاگا دەست بەسەردا گرت. لەو چالاکییەدا ۳٥ کەس لە هێزەکانی دوژمن کوژران، ئەفەرێکیش بە دیل گیرا.

**سنە**

۱۳٦۰/۸/۱٦ پێشمەرگەکانی هێزی شەریف زادە پردی نێوان قروە- دەهگلان- یان لە قورنج تەقاندەوە. هەر لەو ڕۆژەدا پێشمەرگەکان لە عەمەلیاتێکی دلێرانەدا بە گەڕەکی کەلکە جاری نێو شاری سنە و بە کوشتنی دوو نیگابانی مۆڵگەی ئەو شوێنە، توانیان دەست بەسەر مۆڵگەکەدا بگرن و ۱۳ کەس بە دیل بگرن و هەموو چەک و چۆڵەکانیان کەوتە دەست پێشمەرگەکان.

لە یازدە تا حەڤدەی مانگی جۆزەردانی ۱۳٦۱ دووهەم پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی گیرا، لەم کۆبوونەوەدا بە داخەوە سێ هاوڕێی کۆمیتەی ناوەندی جێگایان خاڵی بوو، یەکیان، شەهید هەژار(ئەحمەد جاویدفەر) بوو کە هەر لە سەرماوەزی ساڵی ۱۳٦۰دا لە شەڕەکانی ناوچەی بانە شەهید بوو، لەم پلینۆمەدا کاک بهروز کورد ئەحمەدی کە پێشتر جێگر بوو، لە جێگەی کاک هەژار بە زۆربەی دەنگ بوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. دووهەم کاک کەمال دەبباغی بوو کە لە کرماشان لە لایەن دوژمنانی گەل و بەکرێگیراوانی ڕێژیم گیرابوو. سێهەم کاک تەها حەق تەڵەب ئەندامی مشاوری کۆمیتەی ناوەندی بوو کە لە تاران دەستگیر کرابوو.(*)

لەم پلینۆمەدا کە قەرار بوو باسێکی بە کەڵکی سیاسی بکرێ، بە شێوەیەکی دیکە لە

(*) بەداخەوە دووساڵ دواتر هەردووکیان لە سێدارەدران.

لایەن دوکتۆر قاسملووەوە هاتە گۆڕێ. هەر ئەم باسە کە لەوێ هاتە گۆڕ، بوو بە بناغەی کورتە باس لەسەر سوسیالیزم کە بە راستی لە ڕوانگەی حیزبێکی دیموکراتەوە شتێکی زیادی بوو، چەند ساڵ دواتریش بە دوای کۆنگرەی شەشدا زیانێکی زۆری بە حیزب گەیاند کە لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین.

لە ڕێکەوتی ١٩٨٢/٧/٢ واتە لە مانگی پووشپەڕی ١٣٦٠دا پاش ئەوەی ڕێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین لە لوبنان کەوتە ژێر زەختێکی گرانی ئیسرائیلەوە و قەرار درا فەلەستینییەکان لوبنان چۆڵ کەن، لە لایەن کۆمیتەی ناوەندیی حیزبەوە، نامەیەک بۆ یاسر عەرەفات نووسرا و بە پێی ئەم نامە لە سازمانی رزگاریخوازی فەلەستین گێردرایەوە کە ئەگەر لەسەر ٢٢ دەوڵەتی عەرەب هیچیان نامادەنین جێگە و شوێن بدەن بە سازمانی رزگاریدەری فەلەستین، دەتوانن بێنە کوردستان.

ئەو پاڕەگرافەی ژێرەوەش بەشێک لەم نامە گەرم و گوڕەی حیزبە:

«بەڵام ئەگەر خوای نەخواستە پێویستی بەوە هەبوو کە هێزەکانی شۆڕشی فەلەستین خاکی لوبنان بەجێ بێڵن، ئێمە بە جیددی لە ئێوە داوا دەکەین چەک کران قبووڵ مەکەن، ئێمە هەر لە ئێستاوە ئامادەیی خۆمان و گەلی کورد لە کوردستانی ئێران بۆ پێشوازی لە خەباتگێرانی فەلەستین دەردەبرین. بۆ ئاگاداریشتان ناوچەی رزگارکراو لە کوردستانی ئێران شەش قاتی تەواوی ئاخی لوبنانە. ئەو بەشە لە خاکی کوردستان و گەل و حیزبەکەمان ئامادەی لە باوەش گرتنی ئەم خەباتکارانەن، تا کاتێک بە سەرکەوتوویی دەگەڕێنەوە سەرزەمینی فەلەستینی ئازیز».

هەر لە مانگی پووشپەڕی ١٣٦١دا بە دوای دانیشتنێکی دوو قۆڵیی ڕێبەرایەتیی حیزب لەگەڵ ئەندامانی ڕێبەریی ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران(کۆمەڵە) قەراردادێکی هاوکاریی دوو قۆڵی ئیمزا کرا کە دەقی ئیعلامیە هاوبەشەکە لە ژمارە ٨٥ی «کوردستان» دا چاپ کراوە.

لە مانگی خەرمانانی ١٣٦١دا دوژمن گەڵاڵەیەکی هێرشی بەرین و هەمەلایەنەی ئامادە کردبوو، لە نیوەی دووهەمی مانگدا خەریکی پیادە کردنی ئەم گەڵاڵەیە بوو، بە ئیمکاناتی زۆرو زەوەند و چەکی مودێرنی هەمە چەشنە پەلاماری کوردستانی دا.

ڕێبەریی حیزب کە ئاگاداری ئەم بڕیارەی ڕێژیم بوو، هاوڕێیانی دەفتەری سیاسی و ئەندامانی ئامادەی ڕێبەرایەتیی بۆ بەڕێوەبردنی میتینگی سیاسی بەسەر ناوچەکان،

دابەش کرد، هەر کام لەوان لە ناوچەکاندا بە دانی میتینگ و بەیانی راستییەکان، نیەتی چەپەڵی رێژیمیان لێک دەداوە و خەڵکیان بەسیج دەکرد و زەمینەی خۆسازدانی تازەی خەڵک و پێشمەرگەیان ئامادە دەکرد.

بە بۆنەی ئەم هێرشە درندانە، سکرتێری حیزب پەیامێکی بۆ خەڵکی کوردستان لە رادیۆی دەنگی کوردستانی ئێران خوێندەوە، لەم پەیامەدا وێڕای لەقاودانی بەرنامە و گەلاڵە و نییەتە خراپەکانی رێژیم، گوتی:

«خومەینی بەرامبەر بە گەلی کورد کینەی لە دڵدایە، چونکە دێموکراسی و ئازادییان دەوێ. خومەینی بە قەدەر ترسانی جنۆکە لە بسم الله، لە ئازادی دەترسێ.

لەبەر ئەوەی دەزانێ بەر قەرار بوونی ئازادی لە ئێران لە حوکمی ئەمانی رێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی دایە. خومەینی دەزانێ کە وەدی هاتنی خودموختاری یانی ئەمانی زۆرداریی ویلایەتی«فقیە» و لە نێوچوونی کۆڵەکەی رێژیمی خومەینی. بۆیە خومەینی خوازیاری نابوودیی گەلی کوردە. هەر بۆیەش شەڕی خومەینی لەگەڵ گەلی کورد شەڕی مان و نەمانە.

لە بەرامبەر ئەم هێرشە درندانەیەدا تەنیا رێگایەک هەیە، ئەویش راوەستان لە بەرامبەریاندا و خۆڕاگرییە و هێرشە لە بەرامبەر هێرشەکانیاندا.

هەر لەبەر ئەوەی کە دەفتەری سیاسی حیزبی دێموکراتی کوردستان بڕیاری دا لە رۆژی بیستەمی خەرمانان تا بیستی رەزبەری ۱۳٦۱ وەک مانگی دیفاع لە ئازادی و هەرمانی گەلی کورد رابگەیەنێ. هەروەها دەفتەری سیاسیی حیزب بڕیاری دا ستادی فەرماندەیی هێزی پێشمەرگە پێک بێنێ تا بەڕێوەبەری کاروباری بەرگری لە کوردستان وەئەستۆ گرێ.

هەروەها بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن پێویستە ئەم دە خاڵانەی خوارەوە بەڕێوە بەرن، کە ئێمە کورتەیەک لە هەر کام دێنین:

١- هەموو خەڵکی کوردستان لە گشت ناوچەکاندا بۆ دیفاع لە ئازادی و شەرەفی خۆیان بەسیج بکرێن، کچ وکوڕ، ژن و پیاو، گەنج و پیر هەموو پێکەوە دەبێ لەم دیفاعەدا بەشدار بن.

٢- هەر ئینسانێکی بە شەرەف و ئازادیخواز کە چەکی پێ هەڵدەگیرێ، دەبێ دەست بداتە چەک و دیفاع لە نامووس و شەرەفی خۆی و ئازادیی ولاتەکەی بکا.

٣- مەسئوولان و ئەندامانی حیزب دەبێ هەموو کاتێک لە نزیک سەنگەری پێشمەرگە و

مەیدانی شەڕدا بن و پشتی جەبهە لە باری تەداروکاتەوە دابین بکەن.
٤- کادرەکانی حیزبی لەهەر بەشێک کار دەکەن، چ کۆمەلایەتی بێ، چ تەشکیلاتی و هی دیکە، دەبێ هێز و ئیمکانی خۆیان بۆ جەبهە و بەهێزترکردنی جەبهە تەرخان بکەن.
٥- ئەندامانی هێزی بەرگریی میللی، دەبێ بە شێوەیەکی رێکوپێک و لە ژێر ئەمری فەرماندەرەکانی خۆیاندا لەگەڵ هێزی پێشمەرگە هاوکاری بکەن و ئەو ئەرکەی بۆیان دیاری دەکرێ، دەبێ بەجێی بگەیەنن.
٦- هێزی پێشمەرگە دەبێ تاکتیکی پەلامار بردن بەکار بێنێ و رێگا و مۆڵەت نەدا کە دوژمن هێزی خۆی کۆ بکاتەوە و پێشڕەوی بکا.
٧- خەڵکی هەموو گوندەکانی کوردستان دەبێ شەوانە کێشکی گوندی خۆیان بکێشن و ئەوپەڕی وریایی بەرامبەر بە جاسووسەکان و بە کرێگیراوانی دوژمن نیشان بدەن.
شووراکانی دێ دەبێ سەرپەرستی ئەم کارە بکەن.
٨- ئەندامانی یەکیەتیی لاوان، دەبێ وەک جاران لە ریزی پێشەوەی دیفاع لە ئازادیدا بن و لە هەموو بارێکەوە یار و یاریدەدەری رێکخراوی حیزب و هێزی پێشمەرگە بن.
٩- مامۆستایانی ئایینی دەبێ خەڵکی تێ بگەیەنن کە خومەینی بە ناوی ئیسلام کارێک دەکا کە هیچ کافرێک نەیکردووە. پێویستە جینایەتەکانی رێژیمی خومەینی بۆ هەموو خەڵک روون بکەنەوە.
١٠- مامۆستایانی شۆڕش لە مانگی دیفاع لە ئازادیدا دەبێ کاری کادرێکی شۆڕشگێڕ بکەن، لە باری فیکرییەوە خەڵکی رێنوێنی بکەن و بەکردەوە لەگەڵ کۆمەلانی خەڵکی زەحمەتکێشدا بن.
هاونیشتمانانی خۆشەویست!
جەماوەری کوردستان دەبێ هەموو توانا و ئیمکاناتی خۆیان بنێنە ئیختیار بەرەکانی شەڕ. هەموو شت بۆ بەرە و هەموو ئیمکانات بۆ سەنگەرەکان، دروشمی ئەمڕۆی سەرانسەری کوردستانە.
هەر بەم بۆنەوە لە کۆمەڵەش داوا دەکەین کە لە بەڕێوەبردنی ئەرکی پیرۆزی بەرگری لە ئازادیی کوردستاندا بەشداری بکا و لەم هەلومەرجە ناسەمەدا بەشی خۆی لەم بەرپرسایەتییە مێژووییە باوێ.

لە هەموو ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکانی ئێرانی، لە ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵکی ئێران و ڕێکخراو و کەسایەتییەکانی ئەندامی شووڕای میللی بەرگری و هەموو هێزە میللییەکان داوا دەکەین کە ئەرکی شۆڕشگێڕیی خۆیان سەبارەت بە گەلی زۆر لێکراوی کورد بەجێ بگەیەنن.

هاونیشتمانانی بەڕێز!

وەرن هەمووومان بەیەکەوە بە خوێنی ڕۆڵەکانی شەهیدی گەل کە گیانی خۆیان بەخت کردووە، سوێند بخۆین کە تا سەرکەوتنی یەکجاری ڕێگەیان درێژە بدەین». (*)

با وەبیر بێنینەوە کە بەداخەوە ماوەیەک پێش ئەو شەڕە ڕۆژێک سەید ڕەسووڵ دێهقان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و فەرماندەری ئەو کاتی هێزی ناوارە، چۆتە دەفتەری سیاسیی حیزب، لەگەڵ دوکتور قاسملوو و جەلیل گادانی دانیشتووە و گوتوویەتی حەسۆ میرخان دەڵێ حەز دەکەین میحوەری پیرانشار سەردەشتمان بۆ چۆڵ کەن و ئێمە بێینە ناوی، ئەگەریش بۆمان چۆڵ نەکەن، ئێمە بە زۆر دەیگرین!

بڕوای خۆشی بە لەبەر چاوگرتنی وەزع و ئەو بوختانانەی ساڵی پێشتر بۆی هەڵبەسترابوو، دەربڕیوە و گوتوویە ئەگەر بیاندەینێ و خوێن نەڕژێ، باشترە. بەڵام دوو هاوڕێی ئامادە نیرادی لێ دەگرن و دەڵێن شتی وا نابێ و ئێمە لە خاکی خۆمان دیفاع دەکەین و چیدی مەجال نادەین لە خاکی خۆشماندا شەڕمان پێ بفرۆشن.

بە ڕاستی ئەوکات کە هێرشەکەش کرابوو، سەید ڕەسووڵ سەرەڕای ئەوەی پیاوێکی ئازا بووە وێدەچێ بە خاتری حورمەتێکی تایبەتی کە بۆ سەرۆک بارزانی بەتایبەتیی دوای فەوتی و هەروەها بۆ بنەماڵەی بارزانی هەیبووە، ئەو جۆرەی کە پێویست بووە لە جەبهەکەدا شەڕی نەکردووە. (**)

زۆر بەداخەوە لەم بەرەیەشدا وەک باکووری کوردستان و مەریوان، ئەفرادی پارتی بە بەربڵاوی بەشدارییان لە شەڕدا کردووە، دوایەش لە چەند شوێنی ئەو ناوچەیە پایگایان داناوە.

---

(*) وەرگیراوە لە ڕۆژنامەی «کوردستان» ژمارە ٨٦.

(**) لەو پلینۆدکەیدا لەمانگی سەرماوەرزدا دوای شەڕەکە لە ئالان گیرا نووسەری ئەم دێڕانە جەلیل گادانی کە بەرپرسی ئەو بەرەیەی شەڕ لە مانگی دیفاع و هێرش بوو بەتوندی ڕەخنەی لە کاک حوسێن مەددەنی بەرپرسی کۆمیتەو ڕێکخراوی پیرانشارو خوالێخۆشبوو سەید ڕەسوولی گرت کە بەهیچ شێوەیەک خۆیان نەگرت و بەدرێژایی شەڕەکە لە ڕیزی پێشەوەی هەڵاتووان بوون.

هەر لە گەلاوێژ و خەرمانانەدا لەگەڵ ئەم هێرشە بەربلاوەی ڕێژیم و هاودەستەکانی، بە سەدان بنەماڵەی کوردپەروەر، بە تایبەتی بنەماڵەکانی کادر و پێشمەرگەکانی حیزب دەکەونە بەر زەخت و زۆر، بۆ شارەکانی باشووری ئێران دوور دەخرێنەوە، بە هەزاران ئەندام و لایەنگری حیزب و ڕێکخراوەکانی دیکە لە کوردستان دەگیرێن و ڕەوانەی بەندیخانەکان دەکرێن.

لەم پێوەندییەدا بەیاننامەیەک بە ناوی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لە ڕێکەوتی ١٣٦١/٦/٣ دەردەچێ کە لەوێدا لە هەموو ڕێکخراوە دێموکراتیکەکانی ئێران و جیهان، ڕێکخراوی دیفاع لە مافی مرۆڤ و لە کەسایەتییە ئازادیخواز و مرۆڤ دۆستەکان داوا دەکرێ پێشی ئەم جینایەتانەی ڕێژیم کە گەیشتوتە رادەی ژینوساید و تواندنەوەی گەلی کورد، بگرن و لە بەرامبەر ئەم هەموو تاوانانەی ڕێژیم بێدەنگ نەبن و ئەم ڕێژیمەی سەدەکانی نێوڕاست و کردەوە دژی ئینسانییەکانی لە قاو بدەن.

سەرەڕای ئەم هەموو زەخت و شەڕ و هێرشانەی کەوتبووە سەر گەلی کورد و حیزبی دێموکرات، دیاردەیەکی ڕووناکی دەر بۆ یەکەم جار لە خەباتی نیو سەدەی رابردووی گەلی کورددا هاتە گۆڕێ. ئەویش ئەوە بوو کە لەسەر بنەمای دۆستایەتییەکی گەرم کە بە زەحمەتێکی زۆری هێندێک لە هاوڕێیانی دوو لایەنی یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستان و حیزبی دێموکرات لە نێوان ئەم دوو هێزە سەرەکییەدا پێک هاتبوو، لەسەر داوای حیزب، یەکیەتیی نیشتمانی هێزێکی زۆری لە پێشمەرگەکانی خۆی بە مەبەستی دیفاع لە بەرامبەر ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی و هاوکاری و هاوخەباتی لەگەڵ حیزب هێنایە مەیدانەوە، تەنانەت مام جەلال خۆشی هاتە ناوچەی سوێسنایەتی، لە گوندی مەزرا لە لایەن دوکتۆر قاسملوو سکرتێری حیزب و جەلیل گادانی ئەندامی مەکتەبی سیاسی و بەرپرسی ئەم بەرە لە شەڕی داسەپاوەوە پێشوازیی لێکرا. دوایەش بۆ ماوەی دوو سێ مانگ بۆ سەرپەرستی و ڕێنوێنیی فەرماندەکانی پێشمەرگە لە دەشتی ساوان مایەوە.

ئەم کارە گرینگە و تێکەڵ بوونی خوێنی زیاتر لە بیست پێشمەرگەی شەهیدی یەکیەتی لەگەڵ خوێنی پێشمەرگەکانی دێموکرات وبریندار بوونی دەیان کەسی ئەم هێزە کە بە هێزی پشتیوان ناسراوە، دۆستایەتییەکەی زۆر بەهێزتر کردو بۆ ڕۆژانی دوایی هیوا بەخش بوو.

لە مانگی سەرماوەزی ١٣٦١دا سێهەمین پلینۆمی دوای کۆنگرەی پێنج لە گوندی

مەزرێی ئالانی سەردەشت گیرا. ئەم پلینۆمە هەم لە مەر باسەکانەوە، هەم لە بواری بڕیاردان دا بە تایبەتی دوای ئەم هەموو شەڕە قارەمانانەی لە وەلامی هێرشی دوژمندا کرابوون، یەکێک لە گرینگترین پلینۆمەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی بووە.

لە راستیدا بەتینتر کردنی ئاگری شۆڕش و گرینگی دان بە کاری نیزامی و رێکخراوەیی و سازماندانەوەی نوێی وەزع لە قوولایی کوردستاندا و درێژەدان بە بەربەرەکانی دژی رێژیم لەم پلینۆمەدا بە جیددی هاتنە گۆڕ.

دابەش کردنەوەی کارەکان و لەم پێوەندییەدا بەش کردنی دەفتەری سیاسی بە ژمارە ۱ و ژمارە ۲ بۆ ماوەی نزیک بە ساڵێک، دەفتەری سیاسیی ژمارە یەک بەرپرسایەتیی جەلیل گادانی ئەرکی بەڕێوەبردنی کارەکانی لە ناوەند و باکووری کوردستان بە ئەستۆوە گرت و دەفتەری ژمارەی ۲ بە سەرۆکایەتیی دوکتور قاسملوو، سەردەشت و بانە و باشووری کوردستانی لە ئەستۆ بوو.

هەلومەرجی خەبات بە رادەیەک توند بوو هێرشی دوژمن لە هەموو لایەکەوە ئەوەندە بە تەوژم بوو کە دەفتەری سیاسیی ژمارە ۱ حاڵەتێکی گەڕۆکی پەیدا کردبوو و لە ماوەی ئەم یەک ساڵەدا چەندین جار جێگای گۆڕی، هەروەها دەفتەری سیاسیی ژمارە ۲ پاش ۷-۸ مانگ لە ئالان کۆچی کرد و چووە گەلاڵەی کوردستانی گەرمیان لە ناوچەی شینکایەتی.

لە پلینۆمی سێهەمدا لەسەر وەزعی سیاسی و نیزامی کوردستان بە درێژی باس کراو هێرشەکەی چەند مانگی پێش پلینۆم و، بەشداریی هێزی پشتیوان هاتە بەر باس و لە خاڵە لاواز و بەهێزەکان کۆڵدرایەوە.

لە باسە سیاسییەکەدا رێژیمی خومەینی بە رێژیمێکی پڕ قەیران و شەڕ خواز ناسرایەوە کە تۆوی قەیرانی هەمەلایەنەی لە هەموو شوێنی ئێراندا چاندووە و هیچ بەرنامەیەکیشی بۆ رزگاری لەم قەیرانانە نییە و ئەم کاردەشی لە تواناد نییە.

پلینۆم رێگەی دەرچوونی وڵاتی لەم قەیرانانە لە ئالترناتیوێک دا دەدی کە شوورای میللی بەرگری دابمەزراندنی ئەوی وەئەستۆ گرتبوو. پلینۆم پێشی وابوو شوورا بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم بەرنامە دەبێ تووەدەی خەڵک و جەماوەر هان بدا.

لەسەردتای مانگی رێبەندان بە بۆنەی رۆژی دامەزرانی یەکەم کۆماری کوردستان پێشمەرگەکانی هێزی پێشەوا بە دارشتنی گەلاڵەیەکی رێکوپێک زەبری کاریگەریان لە

دوژمن دابوو، به کرێگیراوانی ڕێژیم که له وەڵام دانەوە بە پێشمەرگەکان عاجز بوون، لە ڕۆژی شەشی ڕێبەندان پەلامارێکی دڕندانەیان بردە سەر خەڵکی بێ دیفاعی گوندەکانی قەردگۆل، سەوزی و سەرچنار و بەو پەڕی دڵڕەقی و دڵڕەشی بە شێوەیەکی دڕندانە خەڵکی ئەم ئاوایییانەیان قەلاچۆکرد و ماڵ و منداڵ و تەنانەت مالات و تفاقیشیان ئاور تێ بەردا.

لە قەرەگۆل ١٨ کەس، لە سەوزی ٩ کەس بەهۆی پاسدارانی خومەینی کوژران و زۆر کەسیش بێ سەروشوێن چوون. بەم شێوە جارێکی دی کوشتاری بە کۆمەڵی ژن و منداڵ و بەساڵ داچووانی قارنێ، قەلاتان، ئیندرقاش، سەروکانی، کانی مام سەیدە و دەیان گوندی دیکە و ئیعدام و کوشتارە بە کۆمەڵەکانی شارەکانی سنە، سەقز، بانە، و مەهابادا وەبیر خەڵک هێنایەوە.

ئاخر ڕێژیم بۆ پاراستنی دەسەلاتی خۆی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زەختی زیاتری دەخستە سەر خەڵک، گرتن و ئەشکەنجەدان و کوشتنی بە کۆمەڵ، ئیعدام، تەبلیغاتی پڕ لە درۆ و دەلەسە، ریاکاری، کەڵکی خراپ وەرگرتن لە هەستی ئایینی خەڵک، تەماع وەبەرنان و، خەرج کردنی پارە بۆ بەکرێ گرتن و زۆر کردنی جاش لە بەرنامەی ڕۆژانەیدا بوو.

گیانبازیی پێشمەرگە فیداکارەکان زیاتر و زیاتر دەبوو، ئەوەش چەند نموونە لە عەمەلیاتی ئەو ڕۆڵە گیان لەسەر دەستانە لە ساڵی ١٣٦١دا:

**پیرانشار**

١٣٦١/٨/١٣ پێشمەرگەکانی حیزب بە هاوکاریی هێزی پشتیوان پەلاماری مۆڵگەی دوژمن لە قەبری حوسێن یان دا کە ژمارەیەک لە ئەفرادی دوژمن لە نێو مۆڵگەکەدا کوژران. دوای ماوەیەک هێزێکی زۆری دوژمن لە ژێر ئاوری تۆپخانەدا بۆ پشتیوانی کردن لەو مۆڵگەیە دێتە مەیدانی شەڕ، کە پێشمەرگەکان زۆر ئازایانە لێیان رادەپەڕن و تەلەفاتێکی قورسیان لێ دەدەن. لەو شەڕە دلێرانەیەدا زیاتر لە ٢٠٠ کەس لە هێزەکانی دوژمن کوژران یان بریندار بوون. هەروەها یەک فەروەند تانک و ١٣ دەزگا ماشینی دوژمن لە لایەن پێشمەرگەکانەوە لەبەریەک بلاو کران و چەک و چۆلێکی بەرچاویش کەوتە دەست پێشمەرگەکان. لەو شەڕەدا ٢ پێشمەرگەی تێکۆشەر شەهید بوون.

## کرماشان

۱۳٦۱/۸/۳ هێـزە داگیـرکـەرەکـانی ڕێژیم لە ژێر ناوری توندی تۆپخـانەدا، بەرزاییەکانی «شیرین سوار» داگیر دەکەن پێشمەرگەکانی هێزی بێستوون بۆ ڕاونانی ئەو هێزەی دوژمن دەست بەکـار دەبن. دوای ۱۸ سـەعـات شـەڕی قـارەمانانە، سەرەنجام ئەو بەرزاییانە لە هێزەکانی دوژمن دەستێننەوە. لەو شەڕە سەختەدا سەرجەم ۷۰ کەس لە ئەفـرادی دوژمن دەکـوژرێن و زیاتر لە ۱۵۰ کـەسـیش بریندار دەبن. کـەلاکی ۳۰ کـەس دەکـەوێتـە دەسـتی پێشـمـەرگـەکـان. لە گـەرمـەی ئەو شـەڕەدا دەزگـایەک تویوتـای پڕ لە تەقـەمـەنی دەکەوێتە سەر مین و دەتەقێتەوە، لەو تەقـینەوەیەش دا ۱۰ کـەس لە ئەفـرادی ڕێژیم دەکوژرێن، هەروەها چەک و چۆڵێکی زۆر دەکەوێتە دەست هێزی پێشمەرگە.

لەو شەڕەدا دوو پێشمەرگەی حیزب بە ناوەکانی محەممەد گودەرزی و تەیب حەیاتی شەهید دەبن.

## بۆکان

۱۳٦۱/۱۱/٥ پێشـمـەرگـەکـانی حیـزب لە چالاکیـیـەکی کـەم وێنەدا لە ژێر ناوی «تۆڵەی گەورە» لەسەر جادەی میاندواو- بۆکان، کوردانی نموونەی ۸۰۱ی شیراز، کە ٥۳ دەزگـا ماشێن بوو، وەبەر پەلاماری شێرانەی خۆیان دەدەن و لە ماوەی ۳/۳۰ سـەعـاتدا ئاداری بەسەر پادارەوە ناهێڵن. لەو چالاکییەدا ٤۲ دەزگـا مـاشێن لەبەر یەک بڵاو کران، زیاتر لە ۱۰۰ کـەس لە ئەفـرادی دوژمن کـوژران کـە لاشـەی ٤۷ کـەس کـەوتـە دەسـتی پێشـمەرگەکان و ٦ کەسیش بە دیل گیران. ٦ دەزگا ماشێنی مینیبوسیش کەوتنە دەست پێشمەرگەکان کە لەگەڵ ئەسیرەکان ئازادیان کردن.

لەو شەڕە دلێرانەیەدا چەک وچۆڵێکی زۆر کەوتە دەست هێـزی پێشـمـەرگـە کە تـەنیـا وەک نموونە ئیشارە بە بەشێکیان دەکەین:

پەدافەندی هەوایی، ۱ قەبزە- ناربی جی۷، ۱٤ قەبزە تفەنگی ۱۰۰ م م، ۱ قەبزە- تفـەنگی ۸۱ م م، ۱ قـەبزە تفـەنگی ٥۷ م م، ۲ قـەبزە- خـومپـارەی ۸۱ م م، ۲ قـەبزە- کالیبر ٥۰، ٥ قەبزە- مووشەکی تاو، ٥ قەبزە- ئەنواعی تفەنگ، ٤٥ قەبزە- تیرباری ژ ۳، ۱۸ قەبزە- دەمانچە، ۱٥ قەبزە- بێ سیم، ۸ دەزگا- دووربین، ۷ دەزگا.

**باکووری کوردستان**

١٣٦١/٦/٦ پێشمەرگەکانی هێزی شەهید حاتەم دەست بەسەر «شرکت سهامی زراعی» ڕێژێمدا دەگرن و ئەو کەل و پەلانەی کە بایی زیاتر لە ٥ ملیۆن تمەن بوون، ئاور تێ بەر دەدەن.

٣٠ هەزار لیتر ڕۆن- ١٠ تۆن گەنم- ٢ دەزگا کومباین- ٥ دەزگا خەرمەنکووب- ٧ دەزگا تراکتۆر- ١ دەزگا موتۆری شیمیایی- یەک مەنبەعی گازۆئیل- ٤٠٠ تۆن کوودی شیمیایی- یەک دەزگا ماتۆری ئاو.

لە ڕێکەوتی ٢٤ی خاکە لێوەی ١٣٦٢، سکرتێری گشتی حیزب پەیامێک بۆ ڕێکخراو و کەسایەتی و هاونیشتمانانی ئێرانی دانیشتووی دەرەوە دەنێرێ. پاش باسێکی کورت لەسەر وەزعی ئێران و کوردستان داوا دەکا:

«لە هەر شوێنێک کە بۆتان دەلوێ، کۆمیتەیەک بۆ دیفاع لە خەڵکی کوردستان ساز کەن».

ڕێژیمی ڕیسوای خومەینی زیاتر بە بیرووڕای جیهانی بناسێنن و پەردە لەسەر جینایەتەکانی ئەو ڕێژیمە دژی گەلی کورد و بەتایبەتی ئیقدامەکانی بۆ ژێنۆساید لادەن.

مەهێڵن ڕێژیم ئەم شەڕە خوێناوییەی لە کوردستان وەڕێی خستووە دوو سێ هەزار کەسی بۆ بەسیج کردووە، هەروا بە بێدەنگی لە بیر خەڵک بەرێتەوە.

ڕۆژێک بۆ هاودەردی و پشتیوانی لەگەڵ کوردستان دیاری کەن و لەم ڕۆژەدا بە هەر شێوەیەک دەکونجێ، هاودەنگیی خۆتان لەگەڵ کورد لەسەر داخوازە ڕەواکانی دەربڕن».

بە دوای ئەم داخوازییانە، هاودەنگیی هەمەلایەن لە زۆر شوێن دەستی پێکرد، بە تایبەتی لە لایەن شوورای میللی بەرگرییەوە ڕۆژی حەوتی جۆزەردان بە ناوی ڕۆژی پشتیوانی لە کوردستان دیاری کرا و هەتا حیزب لە شوورادا بوو، هەموو ساڵێ لە چەند وڵات بە ڕێ و ڕەسمێکی پڕ شکۆ بە وتاری بەرپرسی شوورا و نوێنەری حیزبی دێموکرات لەسەر هەلومەرجی کوردستان و هەروەها وتاری نوێنەری شوورا و بەرنامەی هونەری بەڕێوە دەچوو، کە تەئسیرێکی زۆر باشی هەم لەسەر هاوڕێیانی حیزبی و باقی کوردەکان لەم وڵاتانەدا دانا، هەم بیروبۆچوونی ئێرانییە پێشکەوتنخوازەکانی زیاتر بۆ لای خەباتی ڕەوای کورد ڕادەکێشا.

ڕێژیم کە لە ساڵەکانی پێشوودا بە تایبەتی لە ساڵی ١٣٦١دا هێزە ڕەسمی و

خەباتگێرەکانی سەرانسەری لە مەیدان دەرکردبوو . لە بەهاری ١٣٦٢ دا هەڵی کوتایە سەر حیزبی توودەی هاوکار و هاوپەیمانی خۆی کە ماوەی چوار ساڵ بە هەموو شێوەیەک هەڵە و خیانەتەکانی رێژیمی نەتەنیا دەشاردەوە، بەڵکو بۆشی پاساو دەدا. لەم هێرشەدا زۆربەی ئەندام و رێبەرانیان گیران.

لەم پێوەندییەدا دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکرات لە رێکەوتی ٦٢/٢/١٨ بەیانێکی دەرکرد کە چەند بەشی دەخەینە بەر چاوی خوێنەران:

هاونیشتمانانی بەرێز!

خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان!

گەلانی بە شەرەفی ئێران!

هەروەک ئاگادارن رێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی لە ماوەیەک لەمەو پێشەوە هێرشێکی بەربلاوی دژی کادری رێبەری و ئەندام و لایەنگرانی حیزبی توودەی ئێرانی لە سەرانسەری وڵات دەست پێکردووە. بە دوای ئەو پەلامارەدا کە چەند مانگە درێژەی هەیە، زۆر لە ئەندامان و زۆربەی کادری رێبەریی ئەو حیزبە گیراون و زیندانی کراون. لە حەوتووی رابردوودا چەند کەس لە رێبەران لەوانە سکرتێری یەکەمی ئەو حیزبە زەعفێکی بێ وێنەیان لە خۆ نیشاندا. ئەوان لە وتووێژی تلویزیۆنیدا ئیعترافاتی زۆر سەرسوڕهێنەریان کرد و ئەو تاوانانەیان تەئیید کرد کە لە لایەن رێژیمی خومەینییەوە حیزبی توودەی پێ تاوانبار کرابوو.

لەرۆژی چاردەی بانەمەڕی١٣٦٢دا دادستانی کۆماری ئیسلامی، حیزبی توودەی ئێرانی هەڵوەشاوە راگەیاند و داوای لە هەموو ئەندامانی ئەو حیزبە کرد کە خۆیان بە سوپای پاسداران بناسێنن و هەڕەشەی کرد کە ئەگەر خۆیان نەناسێنن، بە ناوی«محارب» دەناسرێن و تەسلیمی دادگاکانی شۆڕش دەکرێن.

حیزبی دێوکراتی کوردستانی ئێران یەکەم قوربانیی رێبازی کۆنەپەرستانەی رێژیمی خومەینی بوو. نزیک بە چوار ساڵ لەمەو پێش هەڵوەشاوە راگەیەندرا. حیزبی توودەی ئێران ئاخرین قوربانیی تورک تازیی رێژیمی ئاخوندەکانە، شەخسی خومەینی لە پەیامی ئەو دواییەیدا لە پێوەندی لەگەڵ گیرانی رێبەرانی حیزبی توودەدا لە سەر ئەو راستییە تەئکیدی کرد ودێۆکراتەکانی بە ناوی یەکەم و توودەییەکانی بە ناوی دوا دەستە ناوبرد کە لە لایەن رێژیمەوە تاقیب کراون...

شک لەوەدا نییە کە کارنامەی تێکۆشانی رێبەرایەتیی حیزبی توودەی ئێران لە

ساڵەکانی پاش شۆڕشدا ڕەشە و سیاسەتێک کە لەو ماوەیەدا پەیڕەوییان لێ دەکرد، لە لایەن خەڵکی ئێرانەوە مەحکوومە. پشتیوانیی بێ ئەم لاو ئەولا لە تەواوی کردەوەکانی کۆنەپەرستانە و دژی گەلیی ڕێژیمی خومەینی، دەنگدان بە ئیزامی چەرخەکانی ئێوەراستی ویلایەتی فەقیهی، پەسندکردنی جینایەتەکانی ڕێژیم دژی تەواوی خەباتگێرانی ڕێگای ئازادی، هەوڵدان بۆ دروست کردنی دوو بەرەکی لە نێوان هێزە شۆڕشگێڕەکاندا، هەوڵدان بۆ لێک بڵاوکردنی ڕێکخراوە دێموکراتەکان و لادانی بیروڕای لاوانی وڵات، بەشێک لە کارنامەی تێکۆشانی ڕێبەرایەتیی حیزبی توودەی ئێرانە.

هاندانی ڕێژیمی خوێنمژی خومەینی بۆ درێژەپێدانی شەڕ لە کوردستاندا، هەوڵی سەرنەکەوتوو بۆ پێکهێنانی دوو دەستەیی «انشعاب» لە نێو حیزبی دێموکراتی کوردستاندا ، پاڵدانی تۆمەتی ناڕەوا بە ڕێبەرانی حیزبی ئێمە، جاسووسی کردنی ئەندامان و هەوادارانی حیزبی توودە دژی تێکۆشەرانی حیزب و پێشمەرگە قارەمانەکان و لە نێو شارەکانیشدا، بەشێک لە کارنامەی رەشی ڕێبەرانی حیزبی توودە بە حیساب دێ.

لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو کە تەواوی ئەو کردەوانەی لە ژێر سەرپۆشی خەبات دژی ئێمپریالیزمی ئەمریکادا دەکرا.

ڕێبەرانی حیزبی توودە بەو هەموو تاقی کردنەوە و رابردووی سیاسییەوە ئەو ڕاستییە سادەیان دەرک نەکرد کە حیزبێک کە بە نرخی ڕۆژ نان دەخوا، ئوسووڵ فیدای تاکتیک دەکا، ئۆپۆرتونیسم و هەلپەرستی دەکاتە بناغەی سیاسەتی خۆی و ماکیاوێلیزم تا رادەی سیاسەتی ڕەسمی خۆی بەرز دەکاتەوە، داهاتوویەکی بێجگە لە تێشکان و لە دەستدانی نفووز و ئیعتباری خۆی لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا نابێ.

ڕێبەرانی حیزبی توودە بۆ خۆیان هەر لەو داوە کەوتوون کە بۆ خەڵکی دیکەیان دانابووەوە و ئێستا بەرامبەر بە مێژوو، گەلانی ئێران و ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی خۆیان مەحکووم و سەر شۆڕن.

گوتنی ئەو ڕاستییە پێویستە کە ڕێبەرانی حیزبی توودە، نەک تەنیا نیسبەت بە خەڵکی ئێران، بەڵکو نیسبەت بە ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی خۆشیان خیانەتیان کرد و لەم بارەوە مەسئولیەتێکی گەورەیان بەرامبەر بەوان لەسەر شانە.

چونکە ئەندامانی حیزبیان بەرەو لارێ کێشا و پاشان بە دەستی بەستراو تەسلیمی ڕێژیمی خومەینیان کردن.

ئێستا کە دام و دەزگای شەیتانیی ڕێژیمی ناخوندەکان دژی توودەییەکان بەسیج بوو،

حیزبی ئێمە بە پەیڕەوی لە سیاسەتی نوسوولی و دیموکراتی خۆی، تاقیب، گرتن و ئازار و ئەشکەنجەی ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی توودە بە توندی مەحکووم دەکا و ئیقداماتی پۆلیسی ڕێژیمی خومەینی بە هەنگاوێکی دیکەی دژی ئازادییە فەردی و سیاسییەکان دەزانێ. شک لەوە دا نییە کە هێندێک لە ئەندامانی حیزبی توودەی ئێران، پاش پەلاماری ئەم دواییەی ڕێژیم دژی توودەییەکان و ئاگادار بوون لە ئیعترافاتی ڕێبەرانی خۆیان، وەخۆ هاتوونەوە و لەو ڕاستییە تاڵانە گەیشتوون، بێ شک حاڵی بوون کە هەم سیاسەتی حیزبی توودەی ئێران پاش شۆڕش هەلپەرستانە و غەیرە خەڵکی بووە و هەم ڕێژیمی خومەینی هەر لە سەرەتاوە ئێوەڕۆکێکی کۆنەپەرستانە و دژی گەلیی هەبووە. ئەم جۆرە ئەفرادە وەکو زۆر لە هاووڵاتیان لە ساڵەکانی ڕابردوودا دەتوانن بە خۆ ڕزگارکردن لە دەستی پاسدارە دژی گەلییەکانی خومەینی پەنا بێنن بۆ کوردستان.

حیزبی دیموکراتی کوردستان و ئەندامەکانی بە بوونی تێگەیشتنی بەرزی سیاسی و هەستکردن بە مەسئوولییەت بەرامبەر بەو ئەرکە قورسەی کە لەسەر شانیانە، بێ ئەوەی هەستی تۆڵە کردنەوەیان هەبێ، ئەو توودەییانەی کە پەنا بۆ سەنگەری ئازادی کوردستان بێنن، پەنا دەدەن و لە ئەمنییەتی ئەوان پارێزگاری دەکەن».

لە ڕێکەوتی ١٣٦٢/٣/١٢ لە بەندیخانەی ورمێ ٥٩ بەندیی مەهابادی کە زۆربەیان لاو وتازە لاو بوون، بە شێوەیەکی ناجوامێرانە و بە کۆمەڵ ئیعدام کران. ئەم مەسەلە لە کوردستان و جیهاندا دەنگی دایەوە. لە لایەن حیزب و کۆمەڵەوە داوا لە خەڵکی کوردستان کرا کە ڕۆژی ١٧ی جۆزەردان بە نیشانەی دژایەتیی لەگەڵ ڕێژیم و مەحکووم کردنی ئەم کردەوە دڕندانە کار و دووکان و بازاڕ تەعتیل کەن.

بە خۆشییەوە ئەم بانگەوازە بە گەرمی لە لایەن خەڵک پێشوازیی لێکراو و لە بەشی هەرە زۆری شارەکان بەشێوەیەک بەڕێوە چوو کە وەڵامی ڕاستەوخۆی کردەوە پڕ لە جینایەتەکانی ڕێژیم بوو، بۆ جارێکی دیکەش تەنانەت لە ژێر زۆری سەردنێزەی بەکرێگیراوانیش خەڵکی کوردستان یەکیەتیی خۆیان نیشان دا و بێزاری لە ڕێژیمیان بە کردەوە دەربڕی.

لە لایەکی دیکەوە هێزی بێستون بە فەرماندەریی ڕۆڵەی دلێری گەل و ئەندامی جێگری کۆمیتەی ناوەندی کاک شاپوور فیروزی بڕیاریدا بە تۆڵەی ئەم جینایەتەی ڕێژیم بە ژمارەی شەهیدەکانی بە کۆمەڵ ئیعدام کراو، دژی هێزەکانی ڕێژیم عەمەلیات بکا، ئەم بەرنامەش زۆر قارەمانانە بەڕێوە چوو.

له ڕۆژەکانی ۲۵ تا سی جۆزەردان چوارەمین پلینۆمی حیزب هەر له مەزرێی ئالان گیراوە. لەوێدا وێڕای لێکۆلینەوەی سیاسی و باس لەسەر وەزعی ئێران گوتراوە:

«ئێستا وەزعی سیاسی لە کوردستانی ئێران ڕوونتر بۆتەوە. کۆمەلانی ملیۆنیی خەلکی کوردستان لە لایەکن و ڕێژیمی خومەینی لە لایەکی دیکە. پاش ئیعدامی ۵۹ نەفەر لە ڕۆلە بە شەرەفەکانی خەلکی مەهاباد، مانگرتنی چەند ڕۆژەی خەلکی شارەکانی کوردستان بە ڕێژیمی نیشاندا کە جوولانەوەی میللی- دێموکراتی چەند بەهێز و چەند نفووزی کردۆتە نێو کۆمەلانی خەلکی سەرانسەری کوردستان».

هەر لەو پلینۆمەدا بە پێی پێڕەوی نێوخۆی حیزب بڕیار دراوە تا ئاخری سالی ۱۳٦۲ واتە دوو سال دوای کۆنگرەی پێنج، کۆنگرەی شەشەم بگیرێ و هەر لەوێ کۆمیتەی ئامادە کردنی کۆنگرەی شەشەم دیاری کراوە تا لە هەموو کوردستاندا کۆنفرانسەکان بەڕێوە بەرن و نوێنەرانی کۆنگرە لەم کۆنفرانسەدا هەلبژێردرێن.

هەر لەو پلینۆمەدا گەلالەی کاروباری پێشمەرگایەتی پەسند کراوە کە دوایە بۆتە پەرتووکێک و بەکردەوە لە زۆربەی شوێنەکانی کوردستان بەڕێوە چووە.

لە هەودلی مانگی پووشپەڕی ۱۳٦۲دا بە بۆنەی تەواو بوونی پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی پەیامێکی ڕادیۆیی لە لایەن سکرتێری حیزبەوە لە ڕادیۆ بلاوبووەوە کە لەوێدا زۆر بە ڕوونی لەگەل خەلک قسە دەکا و وەزعی ئێران و کوردستان و کاروباری حیزبیان لە بوارەکانی جۆراوجۆردا بۆ شی دەکاتەوە و دەلێ:

«ڕاپۆرتی سیاسی دەفتەری سیاسی بۆ کۆمیتەی ناوەندی دەری خست کە وەزعی نێونەتەوەیی ئالۆز و لە زۆر مەلبەندی جیهان شەڕی ناوچەیی ساز بووە و هەر درێژەی هەیە. ئێران یەکێک لە ناوچە هەرە ئالۆزەکانی جیهان و ڕۆژهەلاتی نێوراستە. لەم ناوچەیەدا ئیمپریالیزمی ئەمریکا هێرشێکی توندی سیاسی و نیزامی دەست پێکردووە. هێرشی ئیسرائیل بۆ سەر لوبنان و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین کە بە پشتیوانیی ئەمریکا پێکهات، هێشتا هەر بەردەوامە. ڕاستی ئەوەیە کە هەم دەست درێژیی ئیسرائیل بۆ سەر لوبنان و هەم شەڕی نێوان ئێران و عێراق هەلومەرجێکی لەباریان بۆ جێ بەجێ کردنی ئەخشەکانی ئەمریکا لە ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست بە تایبەتی لە ناوچەی خەلیجدا پێکهێناوە. ڕێژیمی خومەینی بە درێژەپێدانی شەڕ لەگەل عێراق و گیرانی ئەخشی گیرەشێوێن لە نێو ڕێکخراوی نوێیکدا واتە ڕێکخراوی ئەو ولاتانە کە ئەوت سادر دەکەن، گەورەترین خزمەتی بە ئیمپریالیزمی ئەمریکا کرد. لە لایەکەوە بە خەریک کردنی

ولاتەکانی عەرەبی لە کەنداوی فارسدا ڕێگای بۆ ئیسرائیل خۆش کرد کە ئامانجەکانی خۆی لە لوبنان جێ بەجێ بکا و لە لایەکی دیکەشەوە بە قازانجی شیرکەتە نەوتییەکانی چەند ئەتەودیی نرخی نەوتی هێنایە خوارێ و ملیاردها دۆلار سوودی خالسی پێگەیاند».

هەر لەو پەیامەدا بە لەبەر چاوگرتنی هاوکارییەکی ئیسبی کە لە وەلام دانەوە و بەربەرەکانی دژی ڕێژیم لە هێرشەکانی پاییزدا لە بەینی هێزی پێشمەرگەی حیزب و کۆمەڵەدا بووە، داوا لە پێشمەرگەکانی حیزب دەکا و دەڵێ:

«هەروەها لە پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکرات داوا دەکەم لەگەڵ پێشمەرگەکانی کۆمەڵە لە شەڕی دژی ڕیژیمی خومەینیدا هاوکاری بکەن. ئەم هاوکارییە لە زۆر جێگا کە پێشمەرگەی حیزب و کۆمەڵە لە یەک سەنگەردان پێکهاتووە، بەلام پێویستە پەرەی پێبدرێ. دەبێ پێشمەرگەی هەردوولا ئەو ڕاستییەیان لە بیر بێ کە دوژمنی هاوبەشمان ڕێژیمی خومەینییە».

لە پێوەندی لەگەڵ ئامادەیی خەڵکدا دەڵێ:

«پاش ئیعدامی ٥٩ ڕۆڵەی گەل لە مەهاباد، مانگرتنی چەند ڕۆژەی شارەکانی کوردستان جارێکی دیکە یەکگرتوویی، یەک پارچەیی و خەباتگێڕیی خەڵکی کوردستانی ئیسپات کرد. نە هەڕەشە و نە خەفەقان، نە زیندان و نە تەبعید و ئیعدام هیچیان نەیانتوانی پێش بە ئیعترازی شارە ئەبەزەکانی کوردستان بگرن. ڕێگام بدەن بە دڵەوە سوپاسی دانیشتوانی شارەکانی کوردستان بکەم کە بە بەشداریی خۆیان لە مانگرتنی ١٧ی مانگی جۆزەرداندا زەبرێکی توندیان لە بناغەی کۆماری ئیسلامی لە کوردستان وەشاند».

هەر لەم پەیامەدا لە پێوەندی لەگەڵ بانگەوازێکی کە پێشتر درابوو، بە ئاگاداری خەڵک دەگەیەنێ:

«لە مانگی جۆزەرداندا ڕۆژەکانی هاودەردی و هاودەنگی لەگەڵ خەباتی خەڵکی کوردستان لە زۆر شاری ئورووپا پێکهات. سەدان ڕێکخراو لە دەیان ولات دەنگی ئیعترازی خۆیان دژی ڕێژیمی خوێنمژی خومەینی بەرز کردەوە، زۆر کۆبوونەوەی گەورە بە بەشداریی نوێنەرانی ڕێکخراوە سیاسی و بەشەردۆستەکان و شەخسیەتی ناسراو گیرا. زۆر فیلمی باش لەسەر وەزعی ئێستای کوردستان نیشان دراو زۆر نمایشگای ڕەسم ساز بوو. ڕێژیمی خومەینی پتر لە جاران ڕیسوا کراو گەلانی جیهان پشتیوانیی خۆیان لە خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران دەربڕی.

ڕۆژەکانی هاودەردی لەگەڵ خەڵکی کوردستان ئەوەندە تەئسیریان بووە کە خومەینی تووڕە بوو وناڕەزایەتیی خۆی لەوە دەربڕی کە لە دەرەوە باسی کوردی ئێران دەکرێ.

دوکتور قاسملوو وەک سکرتێری حیزب لە ڕێکەوتی ١٣٦٢/٤/٩ بە بۆنەی دووهەمین ساڵڕۆژی دامەزرانی شوورا پەیامێکی ناردووە، لەو پەیامەدا زۆر بە ڕوونی لەسەر بیروبڕوا بە شوورا قسە دەکا و دەڵێ:

«پێکهاتنی شوورای نیشتمانیی بەرگری، دوو ساڵ لەوەمەبەر بێگومان لە مێژووی سەردەمی وڵاتی ئێمەدا بە دیاردەیەکی نوێ دەژمێردرێ، چونکە بۆ یەکەم جارە چەند ڕێکخراو و کەسایەتیی سیاسی لێک کۆ دەبنەوە و بە دیلێکی دێموکراتیک بۆ دوارۆژ پێک دێن...

پێ داگرتن لەسەر ئەوە کە شوورا تاقە بەدیلی دێموکراتییە، دروشم نییە، واقعییەتە، چونکە پاش دوو ساڵ هیچ بەدیلێکی دیکە نایەتە بەرچاو...

گرینگی شوورا لە سەرەتای دامەزرانییەوە لەم واقعییەتەدا دەردەکەوت کە هێزی بنچینەیی ئەو ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵک بوو. ڕێکخراوێک کە نازایانە دژی ڕێژیمی خومەینی ڕاپەڕیبوو، ڕێکخراوێکی ڕەسەن کە لە ناخی کۆمەڵ هەڵقوڵابوو، ڕابردوویەکی شۆڕشگێڕی هەبوو، ڕێکخراوێک کە تێگەیشتبوو ڕووخانی ڕێژیمی خومەینی بێجگە لە ڕێگای خەباتی چەکدارانە وەک شێوەی بنچینەیی خەبات دەرەتانی نییە.

بەشێک لە گیروگرفتەکانی شوورا بەرهەمی یەکتر نەناسینی ئەندامانی شوورا بوو. لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوودا تا ڕادەیەکی زۆر ئەندامانی شوورا یەکتریان ناسیوە. ئێستا ئەندامانی شوورا لە کردەوە و شێوەی بیرکردنەوەی یەکتر پتر شارەزا بوون و لە ئەنجامدا تێگەیشتوون کە دەتوانن چاوەڕوانی چییان لە یەکتر هەبێ...

ئێمە پێمان وایە ئەوە یەکێک لە ئەتیجە لەبارەکانی تێکۆشانی شوورا لە دوو ساڵی ڕابردوودایە. واقع بینییەکی کە لە یەکتر ناسینەوە پەیدا بووە، جێگای فکر و خەیاڵی گرتۆتەوە و دەرەتانی پێکهاتنی تێگەیشتنی نالەباریان بە تەواوی لە بەین چووە یا بەو پەڕی کەم بوون گەیشتووە. ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵک حیزبی دێموکراتی باشتر ناسیوە و حیزبی دێموکراتیش لە شێوەی بیرکردنەوەی موجاهیدین باشتر شارەزا بووە. هەر دووکیشیان لە ویست و بۆچوونی ڕێکخراو و شەخسییەتەکانی تری ئەندامی شوورا هەڵسەنگاندنێکی ڕاست تریان وەدەست هێناوە.

ئێمە لە کوردستان لە حاڵێکدا کە هێرشی بەربڵاوی دژی ناوچە ئازادکراوەکان، هەروا

درێژەی هەیە و پێشمەرگەکان نەک هەر قارەمانانە بەرگری لە سەنگەرەکانی خۆیان دەکەن، بەڵکو هەموو رۆژێ بە پەلاماری پەیتا پەیتا زەبری سامدار لە رێژیمی خومەینی دەوەشێنن، بە خۆشبینییەوە دەڕوانینە دوارۆژی ئێران و ئەخشی شوورای ئیشتمانیی بەرگری.

ئێمە تێدەگەین کە هەر ئێستا لە کوردستانی خوێناوی، لە مەتەرێزی لە گیران نەهاتووی ئازادی ئێران، هەم لە بوونی گەلی کورد و هەم لە ئازادی و سەربەخۆیی ئێران دیفاع دەکەین.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران وەک ئەندامێکی تێکۆشەر لە شوورای ئیشتمانیی بەرگریدا شارەزای ئەرکی خۆیەتی و لە بەجێ گەیاندنیدا هەمیشە تێکۆشاوە و درێغی نەکردووە. ئێمە هیوادارین کە شوورا و تەواوی ئەندامەکانیشی بە ئۆرەی خۆیان لە ئاست خەڵکی کوردستان و حیزبی ئێمەدا سەبارەت بە قەول و قەرارە وەئەستۆ گرتووەکانیان وەفادار بمێننەوە. بێگومان رازی سەرکەوتن لە رێزگرتنی قەول و قەراری بەرامبەر وەفاداری بەم ئوسوولەیە کە لەلایەن شووراوە قبووڵ کراوە».

بە بۆنەی جێژنی ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٦٢ کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لە پەیامێکی پیرۆزباییدا باسی چەند مانگ شەڕی نێوخۆیی کوردستان دەکا و دەڵێ بە پێچەوانەی فروفیشالی رێژیم کە تا ئەو کات چەند جار رایگەیاندوە کوردستانی لە وجوودی پێشمەرگە و حیزب و لایەنەکان پاک کردۆتەوە، بەشێکی بەرچاوی کوردستان ئێستا هەر لە دەست پێشمەرگەدایە و شەڕەکانی یەک مانگ زستانی ٦١و ٤/٥ مانگی ساڵی ١٣٦٢ و ئاماری کوژراو و بریندارەکانی دوژمن نیشان دەدەن کە زەبری زۆر کاریگەر و قورستر لە پێشوویان وێکەوتووە.

هەرچەند جەدوەلی گشتیی کاروتێکۆشانی پێشمەرگە و ئەم بەڵگە زیندوو و حاشا هەڵنەگرەش لە شوێنی خۆیدا لە ئاخری کتێبەکەدا بەرچاوی خوێنەران دەخرێ، بەڵام دیسانیش سەرنجی خوێنەرانی بەرێز بۆ چەند رستە رەقەمی ژێرەوە لەو پەیامە رادەکێشین:

«رێژیم لە ماوەی یەک ساڵی رابردوودا هەزاران تۆن بۆمب و راکێت و تۆپ و خومپارە و بارووتی بەسەر خەڵکی بێ تاوان و بێدیفاع و ئازادیخوازی کوردستاندا رشاندووە، هەزاران کەسی بێدیفاعی شەهید کردووە و سەدان ماڵی وێران کردووە، زیندانەکانیش زیاتر لە رۆڵە فیداکارەکانی کوردستان و ئێران ئاخنراون. کردەوە پڕ لە جینایەتەکانی رێژیم بە تیرباران کردنی بە کۆمەڵی ٥٩ کەس لە لاو و تێکۆشەرانی مەهابادی قارەمان بەویەری خۆی گەیشت.

بەڵام دەبێ هاونیشتمانان لەوەش ئاگادار بن کە دوژمن لە هێرشی بەهارەی خۆیدا کە نزیک بە شەش مانگی لێ تێدەپەڕێ لە بەرامبەر هێندێک دەسکەوتی گچکەدا تەلەفاتێکی قورس و گرانی وێکەوتووە.

لە هەوەڵی مانگی رەشەمەی ٦١ تا ١٥ی گەلاوێژی ١٣٦٢ واتە لە ماوەی پێنج مانگ و نیودا هێزەکانی خومەینی ٦٣٣٩ کوژرا و ٢١٢٧ بریندارییان داوە و ٣٢٨ کەسیشیان لێ بەدیل گیراوە. لەم ماوەدا ئێمەش ٢٤٩ پێشمەرگەمان شەهید بووە. ئەو رەقەمە ئەوە دەگەیەنێ کە لەگەڵ ئەوەشدا شەڕەکە نابەرامبەرە و ئەوان بە هەموو کەرەستەیەکی مودێرن تەیار کراون، دیسان لە بەرامبەر ٢٥ کوژراوی دوژمندا ئێمە یەک پێشمەرگەمان شەهید بووە.

لەم ماوەدا کە لە سەرەوە باس کرا، ١٧٩ عەمەلیاتی کەمین هەبووە و چوار پایگای گەورەی دوژمن گیراوە.

دەسکەوتی پێشمەرگەکان ١٢٥ هەزار فیشەک، ٨٥٦ تفەنگ، ٢٩ ئاریی جی و بازووکاو چل و یەک دەزگا بێ سیم بووە.

هەر لەم ماوەدا پێشمەرگەکان سێ هێلیکۆپتەریان خستۆتە خوارەوە و ٣٦ تۆپ و چەکی قورسی دوژمنیان لە ناوبردووە. لەم پێنج مانگ و نیوەدا دوژمن ٣٣٧ کەسی بێ دیفاعی شەهید کردووە کە بەشی هەرە زۆریان ژن و منداڵ بوون. هەروەها ١٥٤ کەسیشی لە رۆڵە بە شەرەفەکانی خەڵکی کوردستان گوللەباران کردووە و چاردە ئاوایی ئاور تێبەرداوە.

بە پێچەوانەی کردەوەی دڕندانەی رێژیم، حیزب لەم ماوەدا ٣٥٠ بەندیی لە بەندیخانەکانی ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستان ئازاد کردووە.

ئەم ئامارانە ئەوە نیشان دەدەن کە پێشمەرگەکانی حیزب زۆر باشتر لە پێشوو شەڕیان کردووە و تاکتیکەکانیان نوێ تر و لە شەڕەکاندا بەسوودتر بوون».

## بەشی دووهەم

# کۆنگرەی شەشەم، توند و تیژتر بوونی شەڕ لە کوردستان و دەست پێکردنەوەی ناکۆکییەکان

لە هەلومەرجێکدا کە نزیکەی دوو ساڵ بەسەر کۆنگرەی پێنجەمدا تێدەپەری هێزەکانی دوژمن بە هیوای جێگیر کردنی دەسەڵاتی ڕێژیمی کۆنەپەرستی بە تەحەممول کردنی تەلەفاتێکی یەکجار زۆر توانیبوویان بە دانانی ژمارەیەکی زۆر پایگای نیزامی، کونترۆلی بەشی زۆری جادە نەسلییەکان لانی کەم لەم ڕۆژەدا بەدەستەوە بگرن. لە ماوەی یەک دوو مانگی پاییز و زستاندا کۆنفرانسەکان لەسەر تاسەری کوردستان بەڕێوە چوون. هەرچەند لە زۆر شوێنی وەک بانە و سەردەشت، هەوڵیان دا بە تۆپ باران و خومپارە و کاتیو شاباران پێش بە گرتنی کۆنفرانسەکان بگرن و تەنانەت لەم پێناوەدا جگە لە چەند جار گۆڕینی شوێنی کۆنفرانس لە جێگایەک بۆ جێگایەکی تر لە بانە چەند کەسیش لە کادر و پێشمەرگە قارەمانەکان لەم پێناوەدا شەهید بوون کە یەکیان شەهید عومەر ڕەحیمی ئەندامی هەیئەتی ئیجرایی کۆمیتەی شارستانی بانە بوو.

مەسەلەی هێنانەگۆری کورتە باس بۆ یەکەم جار لەم کۆنفرانسانەدا وەک ڕاستییەک بووە هۆی ئاڵۆز بوونی کۆنفرانسەکان و باسی زیاتر لەسەر ئەم نامیلکەیە و لە زۆر شوێنیش بە ئاشکرا ڕەد کرابووەوە و موخالفەتی لەگەڵ کرابوو. ڕێژیم بە ئیمکاناتی مادی و هێزی زۆریشەوە هەر لەو کاتەوە کە لە ڕادیۆ بیستبووی کۆنگرە دەبەسترێ، خەریکی پیلان و پێشگری لە پێکهاتنی کۆنگرە بوو، تەنانەت بۆ ئەم مەبەستە تۆپ و کاتیوشابارانی شوێنی کۆنگرە و دەوروبەریشی کرد و فڕۆکەکانی ڕێژیمیش بە بۆمب باران کردنی یەک دوو شوێنی دەوروبەر، ئیقدامیان بۆ تێکدانی کۆنگرە کرد، بەڵام بە خۆشییەوە

له گـوندی گـەلاڵەی ناوچەی شـینکایەتی لە ڕۆژی پیـرۆزی دووی ڕێبـەندانی ١٣٦٢ی هەتاوی کۆنگرەی شەش بە شێوەیەکی ئاسایی دەستی بە کاری خۆی کرد و لە ڕێکەوتی شەشی ڕێبەندان کۆتایی پێهات.

لەم کـۆنگرەدا کە بێگومان تا ئەو کات پڕ کێشـەترین کـۆنگرەی حیـزب بوو، ٢٣٠ نوێنەر لە هەموو ڕێکخراوەکانی حیزب لە سەرانسەری کوردستان بەشدار بوون و لە ڕێ و ڕەسمی کردنەوەی کۆنگرەدا نوێنەری هێندێک هێزی ئێرانی و کوردستانیشی تێدا بوو، دەتوانین لە ئامادەبووانی ئەو کۆبوونەوە بە وەفدی یەکیەتی نیشتمانی بە سەرۆکایەتیی مام جەلال و هەروەها بە وەفدی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵکی ئێران ئیشارە بکەین.

هەرچەند لەسەر ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی و باقی مەسەلەکان کێشەیەکی زۆر نەکرا، بەڵام مـەسـەلەی کـورتە باسـێک لەسـەر سـۆسـیـالیـزم و سـۆسـیـالیـزمی دیموکـراتیـک قەرقەشەیەکی دوورودرێژی ساز کرد. ئەم دوو مەسەلە کە لە لایەن دوکـتۆر قاسملووەوە هێندرابوونە کۆنگرە، دوای باسێکی زۆر کە لە سەریان کرا، لە پێشدا بە زۆربەی دەنگ لە لایەن بەشدارانەوە ڕەد کرانەوە، بەڵام بە دوای ئەوەدا دوکـتۆر قاسملوو زویر بوو، بەینێک کۆبوونەوەکان ڕاگیران تا دوکتۆر قاسملوو بگەڕێتەوە نێو کۆبوونەوەکان و بە پێچەوانەی ئوسووڵ دەنگ وەرگیرێتەوە. لە دەنگدانەوەی دواییدا هێندێک هەڕەشە، تەماع وەبەرنان، ڕێککەوتن و نفـووزی دوکـتـۆر، بوونە هۆی ئەوەی کـە هەر دوو بابەت زۆربەی دەنگیـان هێنایەوە. ئەم شتە دوایی نەتەنیا نوکتەی لەسـەر ساز بوون، بەڵکو بوو بە هۆی ڕۆیشتن و دەرکردنی ژمارەیەکی بەرچاو لە کادر و پێشـمەرگە دڵسـۆزەکانی حیزب. دوکتۆر کە وەزعی ئاوا دی، بۆ یەکـەم جار مەسەلەی لیسـتـەی فـیکسـیـشی هێنایە گۆڕێ، بەڵام چونکە بە شێوەی نهێنی و ڕاستەوخۆ دەنگ وەرگیرا، تەنیا یەک دەنگی درابوویە.

دەبێ بۆ مێـژوو بگوترێ ئەم مل ڕاکێـشـانەی کـۆنگرە بۆ ویـسـتـی دوکـتـۆر قـاسـملوو ناوبراوی بەرەو ئەوە هاندا کە هەرچی زیاتر بۆ کـۆکـردنەوەی دەسەڵات لە دەسـتی خۆیدا، هەوڵ بدات و تووشی تەکرەوی بێ.

لە ڕاپۆرتی کـۆمـیـتـەی ناوەندی بۆ کـۆنگرەی شـەشـدا باسی وەزعی سـیـاسـی لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست کراوە و ئیشـارە بە نیەتی ئەمریکا و ئیـسـرائیل دەکرێ و لەسـەر دابەش کـردنی لوبنان کـە وا وێدەچێ سـووریـیەش ببێـتـە خاوەنی بەشـێک لە خـاکی ئەم وڵاتە، بۆیە لەگەڵیان هاودەنگە. ڕاپۆرت هەروەها دەڵێ:

«ئێمه هەروەک رابردوو له مافی دیاری کردنی چارەنووسی گەلی فەلەستین و مافی پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی ئەوان بە تەواوی پشتیوانی دەکەین و رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین بە دۆست و هاوپەیمانی خۆمان دەزانین.

لەسەر شەڕی ئێران و عێراق دەڵێ:

«ئاخوندەکان بە درێژەپێدانی شەڕ، سەرپۆش لەسەر گیروگرفتەکانی وڵات دادەنێن و بە راگەیاندن و بڵاوکردنەوەی ئەم بۆچوونە کە مەسەلەی ئەسلیی شەڕە، داخوازەکانی زەحمەتکێشان، گەلانی زۆرلێکراو و ئازادیخوازان بە زەبروزەنگ و زۆر جاریش بە گوللە وەڵام دەدەنەوە.

خومەینی دەیهەوێ بە درێژەپێدانی شەڕ، یەکیەتیی ریزەکانی دەسەڵاتی فەرمانڕەواش بپارێزێ. زۆرجار بە سەراحەت دەڵێ: «چونکە شەڕ هەیە دەبێ یەکگرتوو بین، دەنا لە نێو دەچین!» شەڕ بەرهەمی رێژیمی خومەینییە، بەڵام ئیدامەی ئەو رێژیمەشە، شەڕ و رێژیمی خومەینی لێک جیا ناکرێنەوە. لەسەر پیلانی عەمەلیاتی پێشمەرگە لە راپۆرتدا هاتووە:

« لە سەرەتای ساڵی ١٣٦١ەوە تا ئاخری مانگی سەرماوەزی ١٣٦٢، ٧٣٥ پێشمەرگەمان شەهید بووە، ٥٥٤ پێشمەرگەمان بریندار بووە، ژمارەی شەهیدانمان لە کادر و پێشمەرگە گەیشتۆتە ١٩٢٩ کەس. ژمارەی شەهیدانی بێدیفاعی شار و گوندەکان لەم پێنج ساڵەدا لە دە بەرابەری ئەم رەقەمە زیاترە و سەر لە ٢٥٠٠٠ ئەفەر دەدا.

فیداکاری و قارەمانیەتیی پێشمەرگە سەرکەوتنی بێ وێنەی لەگەڵ بووە. لە سەرەتای ساڵی ١٣٦١ تا ئاخری سەرماوەزی ١٣٦٢ واتە لە ماوەی ٢١ مانگدا لەشکری خومەینی لە کوردستان ١٨٨٢٠ کوشتەی بەجێ هێشتووە، بە واتایەکی دیکە لە بەرامبەر هەر پێشمەرگەیەک ٢٥ کەس لە دوژمن کوژراوە. بەو حیسابە ئەو وتەیە بەراست دەرچوو کە دەمانگوت کوردستان دەکەینە گۆڕستانی دوژمنانی گەلی کورد.

هەر لەم ماوەیەدا ٩٧٨ ئەفەر لە لەشکریانی خومەینی بە دیل گیراون. هەشت هێلیکۆپتەر خراوەتە خوار، ٥٩٤ ترومبێل سووتێندراوە، ٩٥ تورمبێل بە ساغی کەوتۆتە دەستی پێشمەرگە.

دەسکەوتی پێشمەرگە لەم ماوەیەدا ٢٥٩٤ تفەنگ کە لەوانە ١٦١٤ قەبزەی هی ٩ مانگی ئەمساڵە، ١٧ ئاریی جی، ١١٢ بێ سیمی گرووهی و ٦٥٤٥٢٨ فیشەکی جۆراوجۆر بووە.

لەم کۆنگرەدا هەروەها بە دوورودرێژی باس لەسەر گەڵاڵەی پێشنیار کراوی شووراى میللى بەرگرى کە لە رێکەوتی ١٣٦٢/٨/١٧ لە سەرەتایەک و ١٢ مادەدا لە لایەن شووراوە پەسند کرابوو، باس کراو و لە لایەن کۆنگرەوە پەسند کرا. ئەوەش دەقی وەرگێڕدراوی گەڵاڵەکە لە فارسییەوە:

**گەڵاڵەی شوورای میللی بەرگری بۆ خودموختاریی کوردستانی ئێران**

لەبەر ئەوەی خەڵکی ئێران بە شۆڕشی خۆیان ئازادی و سەربەستییان وەک دوو ئەسڵی گشتی و لێک جیانەبووەوە هێناوەتە گۆڕێ.

لەبەر ئەوەی شووراى میللی بەرگری رووخانی رێژیمی خومەینی و هێنانە سەرکاری سیستمێکی سیاسیی بەند بە حاکمییەتی گەلییان خستۆتە بەرچاو و تێکۆشانی خۆیان لەسەر ئەم ئەساسە داناوە.

لەبەر ئەوە دامەزرانی حکوومەتێک کە لەسەر ویست و بۆچوونی خەڵک بێ پێویستی بە دابین کردنی هۆیەکانیەتی و گەورەترینی ئەوانیش هاوبەشی خەڵکە لە بڕیاردان و بەڕێوە بردنی دا.

لەبەر ئەوە بەشداربوونی خەڵک لە بڕیاردانی سیاسی، ئابووری، فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی مەرجێکی هەرە پێویستی بەڕێوەچوونی دێموکراسی لە وڵات دایە.

شوورای نیشتمانیی بەرگری بە مەبەستی دابین کردن و هەرچی بەهێزتر کردنی حاکمییەتی گەل و پاراستنی یەک پارچەیی وڵات، یەک پارچەیی یەکیەتیی نەتەوەیی، هەروەها بە لەبەر چاوگرتنی خەباتی عادڵانەی گەلی کورد لە کوردستان بۆ دابین کردنی دێموکراسی لە ئێران و خودموختاری لە کوردستاندا، هەروەها بۆ هەڵگرتنی ستەمی دووقات لەسەر گەلی زۆرلێکراوی کورد، ئەو گەڵاڵەی بۆ خودموختاریی کوردستان ئامادەکراوە رادەگەیەنین. ئەو گەڵاڵەیە لە چوارچێوەی بەرنامەی شوورای میللی بەرگری، دەوڵەتی کاتیی کۆماری دێموکراتیکی ئیسلامیی ئێران و ئەرکەکانی بێ ئەم لاو ئەو لای دەوڵەتی کاتیدا بەڕێوە دەچێ و راستەوخۆ لەسەر بنەمای ماددەی ٣ی ئەرکە راستەوخۆکانی دەوڵەتی کاتی لەسەر ئەساسی «کۆتایی هێنان بە شەڕی دژی گەلی بە دژی خەڵکی کوردستان» بە راگەیاندنی خودموختاری لە چوارچێوەی تەواوییەتی ئەرزی ئێران، تێکۆشان بۆ لە نێوبردنی ئاسەواری شەڕ، ئامادە و پەسند کراوە و رێنوێنی کارو کردەوەی داهاتووی دەوڵەتی کاتی لە مەڕ خودموختاری کوردستان دەبێ. چلۆنایەتی و شێوەی

بەڕێوەچوونی گەلاڵەی حازر لە لایەن دەوڵەتی کاتیی کۆماری دیوکراتیکی ئیسلامییەوە دیاری دەکرێ.

ئەرکی سەر شانی دەوڵەتی کاتییە کە بۆ دابمزاندنی ئەو گەلاڵە کۆششی پێویست بکا.

١- ناوچەی خودموختار هەموو کوردستانی ئێران دەگرێتەوە. چوارچێوەی جوغرافیایی ئەم ناوچەیە لە ڕێگەی دەنگی گشتیی خەڵکی ناوچەی کوردنشین دیاری دەکرێ.

٢- ئۆرگانی قانوون دانان لە کاروباری نێوخۆی ناوچەی خودموختاردا شووڕای بەرزی کوردستانە کە نوێنەرەکانی لە ڕێگەی هەڵبژاردنی گشتی، ئازاد و بە دەنگی ڕاستەوخۆ و نهێنی هەڵدەبژێردرێن. یاسای گشتیی کۆمار لە ناوچەی خودموختارییش دا بەڕێوە دەچی. شتە پەسندکراوەکانی شووڕای بەرزی کوردستان نابێ دژی قانوونە گشتییەکانی کۆمار بن

٣- بەڕێوەبردنی هەموو کاروباری ناوچەی خودموختاری کوردستان جگە لەم دوو سێ خاڵەی لە ژێرەوە باسیان دەکەین کە مافی دەوڵەتی ناوەندییە، لە عودەی ئۆرگانەکانی خودموختاری دایە.

دیاری کردنی بەرزترین ئۆرگانەکان بۆ بەڕێوەبردنی کاروبار و چاوەدێری بەسەر تێکۆشانی ئەواندا لە عودەی شووڕای بەرزی کوردستانە.

٤- پارێزگاریی ئەزمی نێوخۆی ناوچەی خودموختار بە عۆدەی ئۆرگانەکانی خودموختارییە تا هێزی لێوەشاوە بە لەبەر چاوگرتنی خاڵی ٣ی ئەو گەلاڵە ڕێک بخا و پەروەردە بکا.

٥- کاروباری سیاسەتی دەرەوە و پێوەندییەکان، ئەمنییەتی سەرانسەری کۆمار و دیفاعی گشتی کە (بریتییە لە پاراستنی سنوورەکان، پاراستنی تەواوییەتی ئەرزی ئێران و یەکیەتیی کۆمار) لە سەلاحییەتی دەوڵەتی ناوەندی دایە، ئەرتەش لە ناوچەی خودموختاری کوردستانیش وەک شوێنەکانی دیکەی ئێران مافی دەست تێوەردانی لە کاوریاری ئەزمی نێوخۆییدا نییە.

٦- کاروباری بازرگانیی دەرەوە و گومرکات، دیاری کردنی ڕەوتی پوول و ماڵیی وڵات، ئەنجامی ئەرکەکانی بانکی ناوەندی، دیاری کردنی بوودجەی گشتی و بەرنامەکانی، کە گرینگیی تایبەتی و سەرانسەرییان هەیە و یا پێویستییان بە سەرمایە دانانی

گەورە هەیە، لە سەلاحییەتی دەوڵەتی ناوەندی دایە.
بەڕێوەبردنی باقی کارەکانی ئابووریی ناوچەی خودموختار لە سەلاحییەتی ئۆرگانەکانی خودموختاری دایە. بەهرە وەرگرتن لە سەرچاوە سروشتییەکان و سامانی گشتیی وڵات کە گرینگییەکی تایبەتی و سەرانسەرییان هەیە، لە ئیختیاری دەوڵەتی ناوەندی دایە تا بە سوودی هەموو خەڵکی ئێران کەڵکیان لێ وەرگری. لە ناوچەی خودموختاردا ئۆرگانەکانی خودموختاری بۆ مەبەستی سەرەوە هاوکاریی حکوومەتی ناوەندی بکەن.
٧- زمانی کوردی، زمانی رەسمیی خوێندن و نووسینە لە هەموو ناوچەی خودموختاردا، لە هەموو ناوچەی خودموختار و بۆ هەموو دەرجەیەک خوێندن بە کوردی رەسمییەتی دەبێ.
زمانی فارسی، لە ناوچەی خودموختاردا وەک باقی ناوچەکانی ئێران، زمانی رەسمییە و لە قوتابخانەکان لەگەڵ زمانی کوردی دەخوێندرێ. نامە نووسینی ناوچەی خودموختار لەگەڵ ناوەندی حکوومەت و باقی ناوچەکانی دیکەی ئێران، هەروەها لەگەڵ ئیدارەکانی سەر بە حکوومەتی ناوەندی لە ناوچەی خودموختاردا بە زمانی فارسی دەبێ. هەموو دانیشتوانی غەیرە کورد لە کوردستانی خودموختاردا مافی ئەوەیان هەیە، پەرەپێدانی فەرهەنگ و خوێندن بە زمانی خۆیانیان هەبێ.
٨- هەموو ماف و ئازادییەکان لە ئیعلامیەی جیهانی مافی مرۆڤ و پەیماننامەکانی نێونەتەوەییدا باسیان لێکراوە، وەک ئازادیی بیروڕا، ئازادی بەیان، ئازادیی چاپەمەنی، ئازادیی پێکهاتن و تێکۆشانی حیزب و ڕێکخراوی سیاسی، یەکیەتی شوراکانی کرێکاری، جووتیاری و سینفی، ئەنجوومەنە دیمۆکراتیکەکان، ئازادی هەڵبژاردنی کار، جێگای دانیشتن، ئازادیی ئایینی لە کوردستانی خودموختار دا وەک باقی شوێنەکانی دیکەی ئێران دەستەبەر دەکرێ.
هەموو دانیشتوانی کوردستان، ژن و پیاو، هەروەک هەموو دانیشتوانی باقی جێگاکانی ئێران دوور لە هەر چەشنە جیاوازییەکی جینسی، قەومی، نژادی، مەزهەبی بە شێوەیەکی یەکسان لە مافی کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی و فەرهەنگی کەڵک وەردەگرن.
٩- شێوەی قەزایی کۆمار یەکە و لە ناوچەی خودموختار دادگاکان بە پێی یاسای کۆمار و هەروەها یاساکانی پەسندکراوی شورای بەرزی کوردستان دادی خەڵک دەپرسن.

هێزەکانی پارێزەری ئاسایش لە کوردستانی خودموختاردا، وەک هێزەکانی باقی شوێنەکانی دیکەی وڵات وەک ئەفسەری داد بە حیساب دێن و دەبێ حوکم و فەرمان و بڕیارەکانی مەحکەمەیی و بەرپرسانی قەزایی بەڕێوە بەرن.

١٠- ئۆرگانەکانی خودموختاری دەبێ خۆ لەو کاروبارانە هەڵنەقورتێنن کە لە سەڵاحییەتی دیاری کراوی دەوڵەتی ناوەندی دایە، هەروەها دەبێ بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیان لە ناوچە هاوکاریشیان بکەن. هەر بەم شێوە ئۆرگانەکانی ناوەندی دەبێ لە دەست تێوەردانی کاروباری تایبەتیی ناوچەی خودموختار خۆ بپارێزن و بۆ باشتر بەڕێوەبردنی ئەرکی ئۆرگانەکانی ناوچەی خودموختار هاوکارییان بکەن.

١١- ئەرکی سەرشانی دەوڵەتی ناوەندییە، بۆ باشتر بەڕێوەبردنی ئەرکی خۆی لەسەر بنەڕەتی دابین بوونی هەرچی زووتری پێشرەفت و بەرەو پێش بردنی ناوچە دواکەوتووەکان، لە داهاتی گشتی بەشێکی زیاتر بە مەبەستی قەرەبوو کردنەوەی پاش کەوتوویی ناوچەکەبۆ خودموختاری کوردستانیش تەرخان بکا.

١٢- خەڵکی ناوچەی خودموختاری کوردستانیش وەک باقی هاونیشتمانانی خۆیان لە سەرانسەری ئێران، لە ڕێگەی قانوونییەوە بێ هیچ فەرق و جیاوازییەک لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا بەشدار دەبن.

ئەو گەڵاڵە لە سەرەتایەک و ١٢ ماددەدا لە ڕێکەوتی ١٧ی خەزەڵوەری ١٣٦٢ بە تێکڕای دەنگ لە شوورا پەسند کرا.(*)

بەرپرسی شوورا، مەسعوود ڕەجەوی

لە ڕاپۆرت بۆ کۆنگرەی ٦دا لەسەر ئالترناتیو دەڵێ:

«زیندووکردنەوەی پاشایەتی مانای لە دەست دانی سەربەخۆیی ئێرانە.

لە بڕیارنامەکەی کۆنگرەی شەشدا هاتووە:

«کۆنگرەی شەشەم لەسەر ئەم بڕوایە پێی داگرت کە هێزی یەکگرتووی کۆمەڵانی خەڵک دەتوانێ و دەبێ ڕێژیمی کۆنەپەرستی ئاخوندی سەرەونخوون بکا و لە جێگای ئەو ڕێژیمێکی دێموکراتیی ئەوتۆ دابمەزرێنێ کە مافەکانی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتیی چین و توێژە گەلییەکان و مافی نەتەوایەتیی گەلانی ستەم لێکراوی ئێران دابین بکا. کۆنگرە

(*) لە کتێبی ڕاپۆرتی بەرپرسی شوورا بە خەڵکی ئێران، لاپەڕە ٤٤٤ وەرگیراوە و وەرگێڕدراوەتە سەر کوردی.

داوای لە رێبەرایەتیی حیزب کرد کە لە داهاتوودا بۆ گرێدانی خەباتی خەڵکی کوردستان لەگەڵ خەباتی ئازادیخوازانەی هەموو گەلانی ئێران پتر لە پێشوو تێبکۆشێ.

هەروەها کۆنگرەی شەشەم بە راگەیاندنی پشتیوانیی خۆی لە شوورای نیشتمانیی بەرگری وەک تەنیا ئالتەرناتیوی دێموکراتی، هیوای دەربڕی کە شوورا بۆ یەکگرتنی ریزەکانی گەلانی ئێران دژ بە رێژیمی خومەینی هەنگاوی کاریگەری دیکەش هەڵێنێتەوە و بە نیشاندانی نێوەرۆکی تایبەتی وەک کۆگای هێزە ئازادیخوازە راستەقینە و رەسەنەکانی ئێران، باقی ئەو هێزە نیشتمانپەروەرانەش کە تا ئێستا لە دەرەوەی شوورا ماونەوە بۆ لای خۆی راکێشێ...

کۆنگرەی پەسندکرانی گەلاڵەی خودموختاری لە لایەن شوورای نیشتمانیی بەرگرییەوە بە سەرکەوتنێکی سیاسی بۆ شوورا دادەنێ و ئەو گەلاڵەیە بە نموونەیەکی باش بۆ چارەسەری مەسەلەی میللی کە یەکێک لە گیروگرفتە ئەساسییەکانی جووڵانەوەی شۆڕشگێڕی گەلانی ئێرانە، دەزانێ. پەسندکرانی گەلاڵەی خودموختاری، لە راستیدا بە دەسکەوتی خەباتی لەمێژینە و خوێناویی گەلی کورد دەژمێردرێ.

کۆنگرە لەسەر ئەوە ئەزەری دا کە حیزبی دێموکرات بە مافی خۆی دەزانێ لە پێناو پیادەکردنی بەرنامەی تایبەتیی خۆی بۆ خودموختاری، خەباتی خۆی هەروا درێژە بدا، هەروەها دەربڕینی ئەم بڕوایەشی بە پێویست زانی کە حیزبی دێموکرات و خەڵکی کوردستان بەرامبەر بەو شتانەی لە دەوروبەری گەلاڵەی خودموختاریدا لە لایەن هێندێک لە ئەندامانی شووراوە بڵاوکراوەتەوە بە هیچ جۆر خۆیان بە متعهد نازانن.

کۆنگرەی شەشەم پاش لێکۆڵینەوە لە ئامیلکەی کورتە باسێک لەسەر سۆسیالیزم کە بۆ وەڵام دانەوە بە ٣ پرسیاری گرینگ: بۆچی سۆسیالیزم بە ئامانجی دوارۆژی خۆمان دەزانین؟ بە مەبەستی دامەزراندنی چ کۆمەڵێکی سوسیالیستی خەبات دەکەین؟ و پێوەندیی ئێمە لەگەڵ وڵاتانی سوسیالیستی لەسەر بناغەی چ ئەسڵێک دەبێ دابمەزرێ؟ ئامادە کرابوو. لەسەر ئوسووڵی گشتیی نێوەرۆکی ئەم ئامیلکەیە بە تایبەتی هەوڵدان بۆ دامەزراندنی کۆمەڵێکی دێموکراتیکی سۆسیالیستی پێی داگرت و لە بەرنامەدا جێگەی کۆمەڵێکی سۆسیالیستی گرتەوە.

کۆنگرەی شەشەم بە سەرنج دان بەوەی کە حیزبی دێموکرات و سازمانی موجاهیدین هەرکام خاوەنی رابردوو و تایبەتمەندیی خۆیانن، پێی لەسەر یەکسان بوونی ئەزەری

هەردوو ڕێکخراو لەسەر مەسائیلی ئەساسیی وڵات وەک پێویستی ڕووخاندنی ڕێژیم، شێوەی سەرەکیی خەبات بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، هێنانە سەرکاری ڕێژیمێکی دیموکراتیک، دابین کردنی ئازادییە دیموکراتییەکان لە وڵات و مافی خودموختاری بۆ کوردستان و زۆر شتی دیکە، داگرت و داوای کرد کە هەروەک رابردوو بە هاوکاری و نیاز پاکیی هەردوولا، ئەو مەسەلانەی جیاوازیی بیروبڕوایان لەسەر هەیە، جێبەجێ بکرێن.

لەم کۆنگرەدا ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بە پێی دەنگی وەرگیراو بە شێوەی خوارەوە هەڵبژێردران:

حەسەن رەستگار، دوکتور قاسملوو، جەلیل گادانی، تاهیر عەلیار، هاشم کەریمی، دوکتۆر سادق شەرەفکەندی، مستەفا هیجری، مامۆستا عبداللە حەسەن زادە، حەسەن شەرەفی، مستەفا شەلماشی، هومایون ئەردەلان، حوسێن مەدەنی، فەتاح کاویان، حەسەن شیوە سەلی، عەلی کاشف پوور، دوکتۆر خەلیقی، سەرگورد عەلیار، رەحیم محەممەد زادە، شاپوور فیروزی، بابا عەلی مێهر پەروەر، غەفوور هەمزەیی، ئەبی قادری، حەکیم رەزائی، جیهانگیر ئیسماعیل زادە، عبداللە بەهرامی.

جێگرەکانیش بریتی بوون لە : ئەبوبەکر راد، محەمەد ئەمین مەجیدیان، موراد قادری، چەکۆ (رەحمان رەحیمی)، جەعفەر حامیدی، سدیق فەروخیان، فەتاح عەبدولی.

لە یەکەم پلینۆمی دوای کۆنگرەدا دوکتۆر قاسملوو بە سکرتێری حیزب هەڵبژێردراو لە کۆبوونەوەی دووهەمدا دوکتۆر سادق وەک جێگری سکرتێر، مامۆستا عبداللە حەسەن زادە، هاشم کەریمی، جەلیل گادانی، حەسەن شەرەفی و حەسەن رەستگار بوونە ئەندامی دەفتەری سیاسی و بەرپرسایەتییەکەیان بەم شێوەیە بوو: دوکتۆر سادق بەرپرسی کۆمیسیونی تەبلیغات، جەلیل گادانی نوێنەر لە دەرەوەی وڵات کە پێش کۆنگرە بڕیاری لەسەر درابوو، دوای گەڕانەوە لە ئورووپا بوو بەر بەرپرسی کۆمیسیۆنی بازرەسی کە لە کۆنگرەدا قەراری دامەزرانەوەی درابوو، حەسەن شەرەفی بەرپرسی دەبیرخانە، حەسەن رەستگار بەرپرسی تەشکیلات.

لەم پلینۆمەدا ئەو کەسانەش وەک موشاویر هەڵبژێردران: سەنار مامەدی، مامۆستا گۆران، سدیق بابائی، عبداللە عیزەت پوور.

لە پلینۆمدا بڕیار لەسەر هێندێک ئاڵوگۆڕ لە سازماندەهیی تەشکیلاتی و پێشمەرگە درا، دوای پلینۆم ناوچەی تێکۆشانی دەفتەری سیاسی ژمارەیەکی ناوەندی کوردستان و

باکوور بوونە دوو ناوەندی سپی سەنگ و ناگری، بەشی یەکەم کاک حوسێن مەددنی و بەشی دووهەم کاک عەلی کاشف پووریان لێ بوو بە بەرپرس.

لە رێکەوتی ١٣٦١/١٢/٢٠ بە پێی راگەیەندراوی دەفتەری سیاسی دەورەی دووهەمی هەڵبژاردنی مەجلیسی شوورا کە بە پێچەوانەی قانوونی ئەساسی ناوی لێ گۆڕابوو و کردبوویانە مەجلیسی شوورای ئیسلامی، تەحریم کراو بە خەڵک گوترا ئەگەر ناچار بوون بچنە سەر سندووقەکان، لە جیاتی ناوی نوێنەر دەنگ بدەن بە خودموختاری.

دوایەش بە کردەوە هەڵبژاردن کە لە مانگی بانەمەڕدا بەڕێوەچوو، لە لایەن خەڵکەوە تەحریم کراو لە زۆر شوێن سندووقەکان لە پادگان نەچوونەدەر و لەوێش دا بۆ نموونە لە پادگانی سەردەشت ١٦٠٠ دەنگ بە خودموختاری درابوو، لە بانە تەواوی سندووقەکان لە لایەن پێشمەرگەوە دەستیان بەسەردا گیرا.

چالاکیی پێشمەرگە نە لەم پێوەندییەدا، بەڵکو بە شێوەیەکی شێلگیر بە درێژایی ساڵ و لەزۆربەی هەرە زۆری ناوچەکان درێژەی هەبوو و زەبری گورچووبڕ لە دوژمن وشێندرا و ئەوەش چەند نموونە لە عەمەلیاتەکانی ساڵی ١٣٦٢:

**رەبەت**

١٣٦٢/٩/٥ سێ قافڵە لە هێزەکانی دوژمن لە کاتی گەڕانەوەیان لە گوندەکانی سیسێر و نستان، لە نزیک گەردەنەی زمزیران دەکەونە نێو کەمینی هێزی پێشمەرگەی حیزب و دوای ٧ سەعات شەڕی سەخت نزیک بە ١٥٠ کەس لە ئەفرادی دوژمن دەکوژرێن، یان بریندار دەبن. کەلاکی ٥٠ کەسیان لە مەیدانی شەڕدا بەجێ دەمێنێ کە ٢٧ کەسیان بۆ پێشمەرگەکان شناسایی دەکرێن. لەو چالاکییە دلێرانەیەدا چەک و چۆڵ و کەل و پەلێکی زۆری نیزامی دەکەوێتە دەستی پێشمەرگەکان.

**بانە**

١٣٦٢/٦/٣١ هێزێکی دوژمن لە نزیک پایگای گاکر دەکەوێتە نێو کەمینی پێشمەرگەکانی هێزی شەهیدانی وێردی و لە ناکامدا ئەو هێزە لێک بڵاو دەکرێ. سەرجەم زیاتر لە ٧٠ کەس لە ئەفرادی دوژمن دەکوژرێن کە کەلاکی ٣٠ کەسیان تا کۆتایی شەڕ، لە دەست پێشمەرگەدا بوود. لەو شەڕدا ١٤ کەسیش بە دیل دەگیرێن. هەروەها چەک و چۆڵ و کەل و پەلێکی زۆر لەگەڵ چەند دەزگا ماشین دەکەوێتە ژێر دەستی پێشمەرگەکان.

**دیواندەرە**

١٣٦٢/٦/٨ هێزەکانی ڕێژیم لە شاری بیجار و شارۆچکەی تکالووجەرا ناوچە ڕزگار کراوەکانی دەوروبەر دەدەنە بەر پەلاماری خۆیان، پێشمەرگەکانی حیزب بەرپەرچی پەلامارەکە دەدەنەوە و دوای شەڕێکی توند، نزیک بە ١٠٠ کەس لە ئەفرادی دوژمن دەکوژرێ و چەندین دەزگا ماشێن لەبەر یەک بڵاو دەکرێن. لەو شەڕەدا ٤ تێکۆشەری حیزب شەهید دەبن.

**هێزی شەهید هەژار**

١٣٦٢/٨/١٥ پێشمەرگەکانی هێزی شەهید هەژار و هێزی موعینی لە ناوچەی ئالانی سەردەشت، لە پەلامارێکی قارەمانانەدا توانیان بەشێکی زۆر لە مۆڵگەی نۆڕێ دەست بەسەردا بگرن و عەمباری تەقەمەنیی ئەو مۆڵگەیەش ئاگر تێبەر دەدەن. لەو شەڕەدا لانی کەم ١٥٠ کەس لە ئەفرادی دوژمن دەکوژرێن و چەک و چۆڵێکی بەرچاویش دەکەوێتە دەستی پێشمەرگەکان. لەو چالاکییەدا ٥ پێشمەرگەی حیزب شەهید دەبن.

**هەورامان**

١٣٦٢/١٢/١٣ هێزێکی زۆری دوژمن پەلاماری شاری نەوسوود دەدا کە لەگەڵ بەرەنگاریی پێشمەرگەکانی هێزی شاهۆ ڕووبەڕوو دەبێ. ئەو هێزەی دوژمن دوای ئەوەی لانی کەم ٥٠ کەسی لێ دەکوژرێ، ناچار بە پاشەکشە دەکرێ. لەو شەڕەدا هێزی پێشمەرگەی حیزب دەستکەوتی بەرچاوی هەبوود.

**شنۆ**

١٣٦٢/٧/٧ دوو دەزگا ماشینی دوژمن لە نێوان بایزاوێ و شاودلێ دەکەونە نێو کەمینی پێشمەرگەکانی هێزی سمکۆ، لە ئاکامی تەقە و لێکدانێکدا هەردوو ماشێنەکە خراپ دەکرێن و ١٩ کەس لەسەرنیشنەکانیان دەکوژرێن. هاوکات لەگەڵ ئەو چالاکییە، دەستەیەکی دیکە لە پێشمەرگەکان لە پەلامارێکی دلێرانەدا مۆڵگەی دوژمن لە گوندی شاودلێ، دەست بەسەردا دەگرن. لەو پەلامارەدا هەموو ئەفرادی دوژمن جێگیر لەو مۆڵگەدا یان کوژران یان بریندار بوون. کەلاکی ٣٥ کەس لە مەیدانی شەڕدا دەکەوێ و

١٤ کەسیش بە دیل دەگیرین، تەواوی کەل و پەل و چەک و چۆلی ئەو مۆلگەیە و هی ناو دوو ماشێنەکە، دەکەوێتە دەست هێزی پێشمەرگە.

چەند رۆژی بۆ نەورۆز مابوو، جەلیل گادانی چوو بۆ بەغدا کە لەوێوە بچێتە فەڕانسە. نامەیەکی سەرناوالەی دوکتۆر قاسملووی پێ بوو بۆ مەسعوود رەجەوی، دوکتۆر زۆری تەئکید کردبوو کە بیخوێنێتەوە، دوایە بیدا بە کاک مەسعوود رەجەوی. لە نامەکەدا لەسەر تەوسیەی پلینۆم نووسیبووی تەکلیفی ئێمە لەگەڵ بەنی سەدر روون کەوە، ئەو کە خودموختاری بە بالکانیزاسیون دادەنێ وا دیارە باوەڕی بە شوورا و بڕیارەکانی نییە.

لە پاریس را هاوڕێیانی بەرپرسی حیزبی و بەشدار لە کۆبوونەوەکانی شوورادا تەلیفونیان کردبوو بۆ بەغدا، لەگەڵ جەلیل گادانی قسەیان کردبوو، گوتبوویان شوورا هاتۆتە سەر ئەو باوەڕەی بەنی سەدر لە شوورا وەلا بنێ، لەسەر ئەزدەری حیزب راوەستاون.[*] ئەگەر ڤێتۆی نەکا و موافقی وەلانانی بێ، تەواوە، ئێمەش وەک بەرپرسانی پاریس موافقین. جەلیل گادانی بە هەوڵێن هۆی مومکین لەسەر ئەم مەسەلە پێوەندیی بە هاوڕێیانی دەفتەری سیاسییەوە دەگرێ و داوای وەڵام و ئەزدەری ئەوان دەکا، بەداخەوە یا ساغ نابنەوە، یا تا دوو سێ رۆژیش وەڵام نادەنەوە. شووراش مەحتەلی وەڵام دەبێ و هاوڕێیانی پاریسیش لێکدا لێکدا تەلیفون دەکەن. سەری چوار رۆژەکە هەر وەڵام نایێ، جەلیل گادانی پێیان دەڵێ ئێستا کە هەموو خەڵکی کوردستان لە بووغان لەگەڵ بەنی سەدر نارازین و لە شووراش وەزع ناوایە و لە پلینۆمیشدا وەک کۆمیتەی ناوەندی لە قسە و نووسینەکانی بەنی سەدر ناڕەحەت و نارازی بوون، بە بەرپرسایەتیی خۆم وەک نوێنەری حیزب لە دەرەوەی وڵات موافقی ئیخراجی بەنی سەدر لە شوورام و بڕۆن رابگەیەنن و بۆ خۆشم بۆ شەوی نەورۆز دەگەمە لاتان.

بەنی سەدر لەبەر ئەوەی ئەو کات کچەکەی کە هەر خێزانی ئاغای رەجەوی بوو، بە پێی بەیانییەیەکی موحتەرەمانە کە لە رێکەوتی ١٤/١/١٣٦٣ لە لایەن شووورای نیشتمانیی بەرگرییەوە دەرچوو، لە شوورا وەلا نرا.

لە مانگی جۆزەردانی ١٣٦٣دا لە سەر پێشنیاری حیزبی ئێمە بە شووورای نیشتمانیی بەرگری رۆژی ٢٨ی مانگی مای بەرامبەر ٧ی جۆزەردان بە رۆژی «رێزگرتن لە بەرگریی کوردستان» دیاری کرا.

---

(*) ئەو نامەی دوکتۆر جارێ هەر لای من مابوو کە بەغدا مابوومەوەو بەرەو پاریس رێنەکەوتبووم.

ئەم ساڵیش بەم بۆنەوە بەرنامە لە پاریس بە پەیامی بەرپرسی شووڕای نیشتمانیی بەرگری و پەیامی جەلیل گادانی نوێنەری حیزب دەستی پێکرد و دوایەش لە زۆربەی وڵاتەکانی ئورووپا بە بەشداریی نوێنەرانی شوورا و حیزب کە لە بەشی هەرە زۆریان جەلیل گادانی بەشدار بوو، ئەم ڕێ و ڕەسمە بەڕێوە چووە.

بە دوای وەلانانی بەنی سەدر لە شوورا، ڕۆژێک کاک مەسعوود رەجەوی لەگەڵ یەک دوو ئەفسەر لە ئەندامانی هەیئەتی ئیجرائی، نوێنەری حیزب جەلیل گادانی بۆ دەفتەری شوورا بانگ دەکەن و وێ دەچوو شتێکیان بیستبێ. دەڵێن: «ئەوە بەنی سەدر لە شووڕادا نەما، ئەگەر بەڕاستی حیزب نیەتێکی وای هەیە لە شووڕادا نەمێنێ، ئێمە هیچ موشکیلەیەکمان نییە با زووتر ئیقدام بکا و ڕەنگە لەو حاڵەتەشدا بتوانین بە ڕاحەتی لەگەڵ حیزبی دیموکرات بەرە تەشکیل بدەین. ئەگەر بەڕاستیش لەگەڵمان دەمێنێتەوە حەز دەکەین» .

جەلیل گادانی وەڵام دەداتەوە و دەڵێ: « بەڕاستی ئەو پرسیارەم پێ سەیرە! ئاخر ئێمە هەر یەک دوو مانگ پێش لە کۆنگرەدا تەئکیدمان لەسەر مانەوە لە شووڕادا وەک تەنیا ئالترناتیوی دیموکراتیک کردووە، لە گەڵاڵەی پێشنیاری خودموختاریی کوردستانی ئێوە بە گەرمی پێشوازی کراوە، نامەی دوکتور قاسملووشم لەسەر بەنی سەدر بۆ هێناون و ئەوەش ڕوونە کە هەموو ئەندامانی شوورا لەو ناڕەحەت بوون، جا ئێستا کە ئەویش لێرە نەماوە، چ دەلیلێک هەیە کە ئێمە بمانەوێ لە شوورا بچینە دەر؟

وەزعی شوورا بە ڕۆیشتنی بەنی سەدر ڕێکوپێک تر ببوو، هەموو ئەندامانی شوورا زۆر بە جیددی تێدەکۆشان و کارەکان باشتر دەچوونە پێش، نەتەنیا لە شووڕادا نوێنەری حیزب و هێندێک جار هەیئەتی بەشدار لە کۆبوونەوەکاندا زۆر جیددی بوون و لەسەر پێشنیاری ئەوان ژن بۆ بەشداری لە جەلەسات بانگ کران، شوورا هاتە سەر ئەو باوەڕە لە هەوڵی دانانی ڕادیۆ لە بەغدادا بن. گۆڤاری شووراش هەر بە ئیسراری هاوڕێیانی حیزبی زووتر وەڕێ کەوت و بڵاوبووەوە.

بە گشتی لە ئورووپا تێکۆشانی حیزبی زۆر جیددی تر بوو، وەزعی کۆمیتەکان بووژانەوە و هەوڵێکی دیپلۆماسیی زۆر زیاتر لە جاران درا.

بەداخەوە لە بەهار و هاوینی ١٣٦٣دا لە ناکامی هێرشی توندوتیژی دوژمن هاوڕێی زۆر بە نرخی وەک عەبدوڵڵا بەهرامی، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، ڕەحمان سۆفی زادە،

بەرپرسی کۆمیتەی شارستانی رەبەت، فەقێ عەوڵا فەرماندەی لێوەشاوەی هێزی زمزیران، حوسێن شەمامی، محەمەد ئەمین بارام میرزا ناسراو بە چرچە فەرماندەی هێزی بەیان و چەندین کادر و پێشمەرگە شەهید بوون.

لە رۆژی ١٥ی جۆزەردانەدا فڕۆکەکانی عێراق شاری بانە بۆمباران دەکەن و دەیان ماڵ وێران و سەدان کەس دەکوژن. دەفتەری سیاسی بە دەرکردنی بەیانییەیەک وێڕای مەحکووم کردنی ئەم کارە دژی ئینسانییە، کەسەری خۆی دەربڕی و سەرەخۆشیی لە خەڵکی کوردستان بە گشتی و بانە و بنەماڵەی شەهیدەکان بە تایبەتی کرد.

لە رۆژەکانی ١٧، ١٨ و ١٩ی پووشپەر کۆنفرانسێک بە بەشداری حیزبە سیاسییەکان، وەک حیزبە کۆمونیستەکانی زۆربەی وڵاتانی سۆسیالیستی، حیزبە کۆمونیستەکانی وڵاتانی رۆژئاوا، حیزبە سوسیالیستەکان، سەندیکا کرێکارییەکان، یەکیەتییەکانی رۆژنامە نووسی و یەکیەتییەکانی ژنان و نوێنەرانی جووڵانەوەکانی رزگاریخوازی لە ٥ قارەی جیهان، لە شاری بەغدا پێکهات. مەبەست لە پێکهاتنی ئەم کۆنفرانسە لێکۆڵینەوەی شوێنەوار و زیان و زەرەری شەڕی ئێران و عێراق، لەسەر ئاشتی و هێمنی جیهان بوو. دەستەی نوێنەرایەتیی حیزبی بریتی بوون لە مامۆستا عبداللە حەسەن زادە و کاک فەتاح کاویان کە بەشدارییان کردووە و پەیامی تایبەتیی خۆیان هەبووە کە پێشوازییەکی گەرمی لێکراوە.

لە پلینۆمی دووهەمی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێراوی کۆنگرەی شەش کە لە ١٥ تا ٢٤ی گەلاوێژی ١٣٦٣ گیراوە، بڕیار دراوە رۆژی ٢٦ی سەرماوەز بە رۆژی پێشمەرگە دیاری بکرێ بۆ ئەوەی دەرفەتێک بێ کە هەموو ساڵێ لەو رۆژەدا کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان ئەمەگداریی خۆیان بەرامبەر بە فیداکاریی پێشمەرگە دەربڕن. هەر لە ٢٦ی سەرماوەزی ئەو ساڵەوە کە بە شکۆیەکی تەواو و بەشداریی نوێنەرانی زۆربەی هێزەکانی ئێرانی و کوردستانی بەڕێوەچوو، تا ئێستاش هەموو ساڵێ لەم رۆژەدا رێز لە پێشمەرگە و فیداکارییەکانی دەگیرێ.

هەر لە مانگی گەلاوێژی ١٣٦٣دا بوو کە رێژیم لەسەر گوندەکانی ناوچەی ئالان، گەورک و سوێسنایەتی سەر بە کۆمیتەی شارستانی سەردەشتی کردبوو کە کۆچ بکەن و شوێنی باب و باپیرانی خۆیان بەجێ بێڵن و لەسەر خەرجی خۆیان بەرەو شوێنێکی نادیاری دیکە بڕۆن.

لەسەر ئەم حوکمەی رێژیم، دەفتەری سیاسی لە رێکەوتی ١٣٦٣/٥/٣٠ لە

بانگموازێکی رەسمی بۆ بیرورای گشتی لە کوردستان و ئێران و سەرانسەری جیهان ڕایگەیاند کەوا کۆماری کۆنەپەرستی خومەینی خەریکە ٥٦٣ بنەماڵەی دانیشتووی ٦٦ ناوایی کە سەرجەم ٩٥٥٢ نەفەرن، لە سەرما و سۆڵی پاییزدا دەربەدەر بکا. بە خۆشییەوە بە هۆی تێکۆشانی زۆری هاوڕێیان لە دەرەوە، لە لایەن هێندێک کۆڕ و کۆمەڵی نێونەتەوەیی بە ڕێژیم ڕاگەیەندرا ئەو کارە نەکا. هەر ئەوە بوو بە هۆی بەرگری لەم ڕاگواستنە و لانی کەم بۆ ماوەی چەند ساڵ لە شوێنی خۆیان مانەوە.

لە پلینۆمی مانگی گەلاوێژی ١٣٦٣دا لەسەر مەسەلەکانی نێوخۆیی حیزب دوو باسی گرینگ کرابوو، یەکیان لە پێوەندی لەگەڵ دەرکردنی بەشێک لە کادر و پێشمەرگەکانی حیزب و «توجیه» کردنی ئەم مەسەلە، دووهەم مەسەلەی وتووێژ لەگەڵ ڕێژیم و هێنانە گۆڕێی ئەم عیبارەتە «وتووێژیش خۆی شێوەیەک لە خەباتە، دەتوانین لەم شێوە خەباتەش بە قازانجی جووڵانەوە کەڵک وەربگرین. بۆیە ئێمە ئامادەین لەم مەیدانەشدا لەگەڵ ڕێژیمی خومەینی بەربەرەکانی بکەین و...».

هاوڕێیان لەسەر وتووێژەکە ئەوەندە سوور بوون کە دەڵێن:« لە ڕابردوودا حیزب و گەلی کورد زیانیان لەوە دیتووە کە نەیانتوانیوە وتووێژ بە ڕێکوپێکی و بە شێوەیەکی ئوسوولی بەڕێوە بەرن.

بۆ ئەوەی شتی وا بۆ جارێکی دیکە دووپات نەکرێتەوە، بڕیار دراوە کە بەرپرسی وتووێژ تەنیا دەفتەری سیاسی بێ و هیچ کەس لە بەرپرسانی حیزبی یان فەرماندرانی پێشمەرگە هیچ جۆرە وتووێژێک لەگەڵ نوێنەرانی ڕێژیم نەکەن و هەموو وتووێژێک حەواڵەی دەفتەری سیاسی بکەن، کە بۆ ئەم مەبەستە ئەفراد یان هەیئەتی خاوەن سەلاحییەت دیاری دەکا.(*)

ئەمەش لەودرا سەرچاوەی دەگرت کە ئێمە سەرەڕای ئەوەی ئەندامی شووراین و بە پێی ئوسووڵ قەرار لەسەر ئەوە درابوو کە پێکەوە، وەک شوورا ڕێژیم بڕووخێنین و حکوومەتێکی دێموکراتیک لە ڕێگای ئەم تەنیا ئالترناتیوە دێموکراتیکە دابمەزرێنین، بەڵام وتووێژێکی هەڵخەڵەتێنەر بوو هیچی تێدا بەستە نەبوو جگە لە ئابڕوچوون. سەیرتر لەوەش ئەوە بوو کە ئەم وتووێژانە و ئەم ئیدیعایەی حیزب بە هەموو کەس گوترا بوو، بەڵام بە

(*) ئەوەی ڕوونە هیچ بەرپرسێکی نیزامی یا سیاسی بە پێچەوانەی ئەوەی لە بەیانیەی کۆمیتەی ناوەندیدا باس کرابوو، پێشتریش مافی وتووێژی ڕەسمی نەبوو و یا هەر نەکراوە یا ئەگەر کرابێش چوارچێوەی لە لایەن دەفتەری سیاسییەوە بۆ دیاری کراوە.

نوێنەری حیزب لە پاریس لەگەڵ ئەوەش بە دایم تەلیفۆن هەبوو، ئەگوترابوو.

دوایە ئەم قسە و باسە لە ڕۆژنامەی ٩٩ی «کوردستان»دا بە درێژی بڵاو بووەوە و وەزعی حیزبی لە ڕوانگەی شووراى نیشتمانیی بەرگری بەرەو خراپی برد و گەیشتە جێگایەک کە چەند مانگ دواتر لە شوورا وەلا نراین.

لە مانگی ڕەزبەری ١٣٦٣دا ڕۆژنامەی «کوردستان» بە شێوەیەکی بەرینتر لە هەموو کات و لە قەوارەیەکی گەورەتر و دەوڵەمەندتر لە ساڵەکانی پێشوودا بەشداریی جێژنی ڕۆژنامەی «ئومانیتە»ی لە پاریس کرد و ئەو بەشدارییە جگە لە هەموو هێزەکانی ئێرانی سەرنجی زۆربەی خاریجییەکانیشی ڕاکێشا. دۆستایەتییەکی زۆر گەرم لەگەڵ بەشێکی بەرچاو لە ئەحزاب کرایەوە. وەفدی حیزب بە سەرۆکایەتیی جەلیل گادانی لەم دوو ڕۆژەی مەراسیمەکەدا سەردانی ڕەسمیی ١٤ وەفدی وڵاتە پێشکەوتنخوازەکانی کرد و لەگەڵ هەیئەتی نوێنەرایەتییان دانیشت و پێوەندیی حیزبییان بەهێزتر کرد کە بۆ دوایەش تەئسیری باشی بوو.

دەفتەری سیاسی لە مانگی سەرماوەزی ١٣٦٣ بۆ یەکەم جار بە بۆنەی ٢٦ی سەرماوەز ڕۆژی پێشمەرگە پەیامیدا، وەک لە پێشدا ئیشارەی پێکرا، بەم بۆنەوە ڕێ و ڕەسمێکی بەرین لە بنکەی دەفتەری حیزب لە گوندی گەورە دێی کوردستانی گەرمیان بە بەشداریی زۆربەی هێزە کوردستانی و ئێرانییەکان بەڕێوە چوو، هەرکام لە هێزەکان وێڕای پیرۆزبایی لە حیزب بۆ دانانی ڕۆژێکی ئاوا بۆ قەدر زانین لە پێشمەرگە هەستی خاوێنی خۆیان دەربڕی. بەم جۆرە ٢٦ی سەرماوەز ڕۆژی پێشمەرگەی کوردستان جێگای خۆی لە مێژووی کوردستان و خەباتی پڕ لە شانازیی گەلی کورددا کردەوە.

ئەوەش چەند چالاکیی بەرچاوی پێشمەرگەی حیزب لە ساڵی ١٣٦٣دا:

**ورمێ:**

١٣٦٣ /٣/٣١ هێزە دژی گەلییەکانی کۆماری ئیسلامی هێرشێکی بەربڵاویان کردە سەر ناوچەی گەلی بەردەڕەش لە باکووری کوردستان و لە ئاکامدا لە جەبهەیەک بە درێژایی ٥٠ کیلۆمەتردا، پێشمەرگەکانی هێزەکانی شەهید ئەحۆ- شەهید حاتەم- شەهید سەرگورد عەبباسی و هێزی بەرگریی میللی بەرەنگاری هێرشی دوژمن بوون. لە شەڕێکی ١٩ سەعاتەدا زیاتر لە ١٥٠ کەس لە ئەفرادی دوژمن کوژران و ژمارەیەکی زۆریش بریندار بوون. لەو شەڕەدا چەک و چۆڵێکی بەرچاو کەوتە دەست پێشمەرگەکانی حیزب. بەداخەوە لەم شەڕە حەماسی و خوێناوییەدا ٧ پێشمەرگەی فیداکاری هێزی شەهید ئەحۆ و پێشمەرگەیەکی هێزی بەرگری شەهید بوون.

**مەهاباد**

۱۳۶۳/۱۰/۲۳ هێزەکانی دوژمن هێرشێکی بەربلاویان کردە سەر ناوچەکانی شامات. پێشمەرگەکانی هێزی پێشموا دەست بەجێ بەرەنگاری دوژمن بوون و لە نزیک گوندەکانی گەوج ناوا و گەزەڵێن، هێرشکەرانیان خستە نێو کەمینی خۆیان و زەبرێکی باشیان لێدان و ڕاویان نان. پاش ماوەیەک هێزە بەزیوەکە لەسەر را خۆی سازمان داوەتەوە و پەلاماری دەست پێکردەوە، بەڵام ئەمجارەش پێشمەرگەکان زۆر نازایانە تێکیان شکاندن. لەو شەڕەدا کە زیاتر لە ٦ سەعاتی خایاند، لانی کەم ۱۲۰ کەس لە ئەفرادی دوژمن کوژران، کە کەلاکی ۳۵ کەسیان لە مەیدانی شەڕدا بەجێ مابوو. لەو شەڕەدا هێندێک کەلو پەلی نیزامی کەوتە دەست هێزی پێشمەرگە. بەداخەوە لەو بەرەنگارییەدا ٥ ڕۆڵەی فیداکاری حیزبەکەمان شەهید بوون.

**نەغەدە**

۱۳۶۳/٥/۱۸ پێشمەرگەکانی هێزی ئەفشین لە نێوان مۆڵگەکانی هومام و قەڵاتە سوور ماشینێکی هەڵگری ئەفەراتی دوژمن دەخەنە نێو داوی خۆیان و ئاگر بارانی دەکەن. لە ئاکامدا ماشینەکە لەبەر یەک بڵاو دەبێ و ئەفەراتەکەش دەکوژرێن. هاوکات لەگەڵ ئەم شەڕەدا، دەستەیەکی دیکە لە پێشمەرگەکان دوو مۆڵگەی ناوبراو دەدەنە بەر ئاگری چەکەکانیان و خەسارەتێکی ماڵی و گیانی بە دوژمن دەگەیەنن. هەر لەو کاتەدا دەستەیەکی دیکە لە پێشمەرگەکان بەرەنگاری هێزی کۆمەکیی دوژمن دەبن و ناچار بە پاشەکشەیان دەکەن. لەو شەڕەدا زیاتر لە ۲۰ کەس لە ئەفرادی دوژمن کوژران و ژمارەیەکی زۆریش بریندار بوون.

**سەقز**

۱۳۶۳/٤/٤ هێزەکانی دوژمن هێرشێکی بەربلاویان کردە سەر گوندەکانی قامیشەڵە، قەرەبوغرە و سونجاخ. پێشمەرگەکان بەرەنگاری هێزی دوژمن بوون و لە شەڕێکی سەخت و نابەرامبەردا زیاتر لە ۲٥ کەس لە ئەفەراتی دوژمن کوژراو ژمارەیەکیش بریندار بوون.

**مەهاباد-ڕەبەت- پیرانشار- سەرشاخان**

١٣٦٣/٥/٢٦ دوژمن هێرشێکی بەربلاو و وەحشیانەی لە چوار جەبهە لە ژێر ئاگری توندی تۆپخانەدا کردە سەر ناوچەکانی مەهاباد- ڕەبەت- پیرانشار و نەغەدە، کە پێشمەرگەکانی هێزەکانی شەهید پێشەوا، ئاوارە، مینەشەم و نەفشین زۆر ئازایانە بەرەنگاری دوژمن بوون. لە پیرانشار دوژمن لە ١٦ لاوە پەلاماریدا، لە پیرەسەنان، دەروازە، پشتی کونەکێچ، کانی سواران، پشتی کانی نۆبەتییان، زیندووی بناوان، گردشینان، هولەمار، پێ لێرییە، مەلا مەحموود، باسنینە، چاکی چەقالان، تووژەڵێ، شیوەرەز، بەردە زەرد، تیلەکە ڕەش. لە مەهاباد لە بەرەکانی مەزرا، داغە، زێوە و سەرتان شەڕ گەرم بوو. لە سەرشاخان لە هەموو شوێنێک شەڕ بە توندی بەردەوام بوو. لە ناوچەی ڕەبەت لە ٦ لاوە دوژمن هێرشی کرد: هەمواری چوار بەردە، برایم جەلال، چۆمەڵ، پشتی کۆخی خلەی، سوورخاو و کیسەلان. لەو شەڕە حەماسی و کەم وێنەیەدا کە ٤ ڕۆژی خایاند، لەسەر یەک لانی کەم ٥٠٠ کەس لە هێزەکانی دوژمن کوژران. بە دەیان قەبزە تفەنگ کەوتە دەست پێشمەرگەکان. بە داخەوە لەو شەڕانەدا ٦ تێکۆشەری حیزبەکەمان شەهید بوون کە کاک ڕەحمان سۆفی زادە بەرپرسی کۆمیتەی ڕەبەت سەرقافڵەی ئەم پۆلە شەهیدە بوو.

ئەو کات کە لە پاییزی ١٣٦٣دا ڕێژیمی تورکیە جم و جۆڵێکی توندی بە مەبەستی سەرکوت کردنی بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلی کورد دەست پێکردبوو، ڕێبەرایەتیی حیزب لە ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندی، ڕۆژنامەی ژمارە ١٠١ی «کوردستان» زۆر بە جیددی واقعییەتەکان دێنێتە بەرچاو و دەنووسێ:

«دیارە لە حکوومەتی فاشیستی تورکیە کە بە نزیکەی ١٢ ملیۆن کوردەوە، هێشتا بە ڕەسمی ئیقرار بە وجوودی «کورد» لە تورکیەدا ناکا و کوردەکان بە «تورکی کێوی» ناو دەبا و هەروەها لە ڕێژیمی کۆنەپەرست و سەرەڕۆی خومەینی غەیری ئەوەش چاوەڕوان ناکرێ.

حیزبی ئێمە هەوڵی داوە دەخالەت لە کاروباری وڵاتانی دراوسێدا نەکا، هەر بۆیەش دەخالەتی هیچ وڵاتێکی دیکەش لە کاروباری نێوخۆی ئێراندا قبووڵ ناکا و بە هەموو توانا و هێزی خۆیەوە بەرامبەر بە هەر جۆرە دەخالەتێکی ئەوتۆ ڕادەوەستێ».

ئەوەی جێگای داخ و کەسەر بوو و دەکرێ بڵێین بوو بە هۆی گەیاندنی زیانێکی زۆر

به شۆڕش و گەلی کورد، شەڕ لە نێوان کۆمەڵە و حیزبدا بووکە بەم شێوە ڕاگەیەندرا:

«پێش نیوەڕۆی ڕۆژی بیست و پێنجەمی خەزەڵوەری ١٣٦٣ لە لایەن کۆمیتەی حیزبی لە هەورامانەوە بە دەبیرخانەی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران خەبەر درا کە لە بەرەبەیانی ئەم ڕۆژە تێک هەڵچوونێکی خوێناوی لە نێوان پێشمەرگەکانی حیزب و کۆمەڵە دەستی پێکردووە.

دوایی دەرکەوت لە یەکەم شەڕدا ٣ پێشمەرگەی حیزب و ١٣ پێشمەرگەی کۆمەڵە شەهید و چەند کەسیش بریندار بوون.

هەرچەند لە لایەن حیزبەوە دەستوور درا بە فەوری شەڕ ڕاگیرێ و بە دوای ئەوەدا هەیئەتی دوو قۆڵیش لەگەڵ چاوەدێرێکی یەکیەتیی نیشتمانیی «مامۆستا نازم» چوون بۆ لێکۆڵینەوە، بە داخەوە نەتیجەکەی ئاشتی نەبوو.

بە دوای ئەوەدا کە شەڕێکی تەبلیغاتیی زۆر توندی لە لایەن کۆمەڵەوە بەدوادا هات، تەنانەت کاک عەبدالله موهتەدی سکرتێری حیزبی کۆمونیستی ئێران خۆشی بە چاپی مەقالەیەک لە ژمارەی١٥ی گۆڤاری «کمۆنیست»دا دەستی کردبوو بە تەحریک و بەم چەشنە ئیعلامی شەڕی کردبوو، زۆربەی هەوڵی خێرخوازان بە فیرۆ چوو، شەڕێکی خوێناوی و چەند ساڵەی نێوخۆیی هەڵایسا و ژمارەیەکی چەند سەد کەسی لە هەر دوولا شەهید بوون و لە هەردوولا ڕۆڵەی زۆر دڵسۆزی گرتەوە. شەهیدانی وەک میرزا عەولا نیشکۆلان، قاسم باقی و سەدیق فەروخیان لە فەرماندە و ئەندامانی ڕێبەرایەتیی حیزبیش لەم پێناوەدا فیدا بوون. ئەوەی ڕاست بێ، تەنیا دوژمنانی گەلی کورد سوودیان لێ وەرگرت. ئەم شەڕە ناڕەوایە ئەوەندەی کێشا تا لە ڕێکەوتی ١٣٦٦/٣/٥دا شەش لایەنی دیکەش بە ناوی شەش جەردیان کە بریتی بوون لە شێخ عیزەددین حوسێنی،چریکە فیداییەکانی خەڵکی ئێران، چریکە فیداییەکانی خەڵک «ارتش رهانیبخش» سازمانی چریکە فیداییەکانی خەڵکی ئێران، دەفتەری سیاسیی ڕاهی کارگەر، کۆمەڵەی یەکسانیی کوردستان- ئێران، بڕیارنامەیەکیان لە سێ خاڵدا نووسی:

١- ڕاگرتنی فەوریی شەڕ.

٢- حەلکردنی ناکۆکییەکان لە ڕێگای سیاسی.

٣- بوونی ئازادیی تەبلیغ و مافی تێکۆشانی سیاسی- نیزامی.

دیارە ئەم کارە لەبەر ئەوەی یەک لایەنە نووسرابوو، فایدەی نەبوو، پەرتووکێکی ٤٦

لاپەڕەییش لە خەرمانانی ١٣٦٦ کە لە وتارەکانی رادیۆ وەرگیرابوو، لە لایەن کۆمیسیۆنی چاپەمەنیی حیزب لەسەر ئەم مەوزووعە دەرچوو.

هەوڵەکانی دواییش بۆ ئەم کارە بە ناکام نەگەیشت و تا ساڵی ٦٧ بە گەرمی درێژەی هەبوو. لەم ساڵەدا وەک لە جێگای خۆیدا دێ، بە هۆی ئاگر بەسی یەک لایەنەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران- رێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ لە رێکەوتی ١٣٦٧/١/٣١و، قبووڵ کردنی لە لایەن کۆمەڵەوە پاش ماوەیەک تا رادەیەک بەرەو تەواو بوون رۆیشت، بەڵام دوو سێ ساڵ دواتریش ئەو شەڕە بە پێچەوانەی داخوازی کۆمەڵە بۆ ئاگربەس لە لایەن ئەو بەشەی دیکەی حیزبەوە هەر درێژەی هەبوو.

بمانەوێ و نەمانەوێ ئەم کارەساتە یەکێک لە خاڵە رەشەکانی خەباتی پڕ لە شانازیی شازدە ساڵەی گەلی کورد دژی کۆماری ئیسلامییە و زۆرجار لە لایەن جەماوەریش مەحکووم کراوە.

لە مانگی رەزبەری ١٣٦٣دا دوکتور قاسملوو بۆ سەفەری ساڵیانەی خۆی دەگاتە پاریس، لە لایەن نوێنەری حیزب لە ئورووپا کە تا ئەو کاتیش هەر جەلیل گادانی بووە، پێی رادەگەیەندرێ کە برایانی موجاهید و شوورا زۆر لە بابەتی ئەم مەسەلەی وتوویژخوازی نارەحەتن و دڵیان پاک نابێتەوە.

پاش چەند رۆژ هەردوو بە یەکەوە لەگەڵ کاک مەسعوود رەجەوی وەک بەرپرسی شوورا، مەهدی ئەبریشم چی و ئیبراهیم زاکری، نوێنەرانی موجاهید لە ناوەندی شوورا لە دەوروبەری پاریس کۆبوونەوەیەک دەکەن و بە دوورو درێژی قسە دەکرێ.

لە لای شوورا و موجاهیدەکان، ئەم بۆچوونە بە بێ باوەڕیی حیزب بە شوورا و بڕوا بە وتوویژ لەگەڵ رژیم دادەندرێ، بەڵام دوکتور قاسملوو بە بەڵگە هێنانەوە لە بڕیارەکانی کۆنگرەی ٦ و نامەکانی خۆی هەوڵ دەدا و ئەو شتانە رەد کاتەوە و وەفاداریی حیزب بە بڕیارەکانی شوورا جارێکی دیکە رادەگەیەنێتەوە.

لە عەینی کاتدا لە کارو کردەوەکانی ئەو دەمی دوکتور را دەرکەوتووە کە زۆری بڕوا بە قسەکانی خۆی نییە و زیاتر وەیدەچوو لە لایەکەوە سەبارەت بە وتوویژ و ناکامەکەی دڵخۆش کرابێ.

لەوێ بۆ خۆی بۆ جەلیل گادانی باس کردبوو کە مەقالەیەک لەم پێوەندییەدا نووسراوە، ئەگەر بڵاو نەبێتەوە باشە. جەلیل گادانی دەڵێ: ئێستا خۆت وەزعەکەت

هەڵسەنگاندووە و حەساسیەتیی ئەو برایانەت سەبارەت بە وتوویژ دیوە. پێویستە هەر ئێستا تەلیفۆن بکەی ئەو مقالە بڵاو نەکەنەوە.

دوکتور قاسملوو قەولیشی پێدەدا ئەم کارە بکا، بەڵام سەرەڕای چەندجار وەبیر هێنانەوەش هەر نەیکرد تا «کوردستان» چاپ کرا و مەقالەکەشی تێدا بوو.

دوای چاپ بوونی مەقالەکە و بە پێچەوانەی قسەکانی دوکتور قاسملوو کە لە کۆبوونەوە دوو قۆلییەکەدا کردبووی و راگەیاندنی هەڵوێستی ئاشکرا و رەسمی لەسەر وتوویژخوازی، ئەندامانی شوورا و موجاهیدین بە تەواوی دڵیان رەش بوو.

دوای ئاشکرا بوونی ئەم هەڵوێستە لە کۆبوونەوەی شوورادا باسەکە هاتە گۆڕێ و ئەم بۆچوونە بە توندی مەحکووم کراو داوایان لە حیزب کرد لەسەر بەڵێنییە هاوبەشەکان بمێنێتەوە. جارێکی دیش لە کۆبوونەوەی شوورا لە ١٧ی بەفرانباری ١٣٦٣ مەسەلەکە هاتەوە گۆڕێ، وتوویژ لەگەڵ رێژیم بە پێچەوانەی بەڵێن و بڕیاری ئیمزاکراوی شوورا ناسرا، تەنانەت بە دوکتور قاسملوو گوترا ئەگەر کەم و کوڕییەکتان لە باری چەک و چۆڵ و ئیمکاناتی ماددی هەیە، موجاهیدین ئامادەن هەموو ئەوانە پڕ کەنەوە و هێندێک شتیش هەر لەوێ پێشکەش بە حیزب کراون، بەڵام هیچ شوێنەوارێکی لەسەر بۆچوونی دوکتور دانەنا.

لە رێکەوتی ٣٠ی بەفرانباری ١٣٦٣ لە لایەن دەبیرخانەی کۆمیتەی ناوەندییەوە راگەیەندراوێک بەم شێوەیە بڵاوبووەوە:

«لەبەر ئەوەی بەشێک لە راپۆرتی دەفتەری سیاسی بۆ کۆمیتەی ناوەندیی حیزب، چاپ کراو لە «کوردستان»ی ژمارە ٩٢دا کە باسی وتوویژ لەگەڵ رێژیمی خومەینی کردبوو، لە لایەن ژمارەیەک لە سازمانەکانەوە بە شێوەی جۆراوجۆر و هێندێک جار بە هەڵە مانای لێ دراوەتەوە، دەبیرخانەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بە پێداگرتن لەسەر ئەوەی کە لە راپۆرتی ناوبراودا هاتووە، رادەگەیەنێ کە چاوپێکەوتنی نوێنەرانی حیزبی ئێمە لەگەڵ نوێنەرانی رێژیمی خومەینی جارێکی دیکەش راستی و دروستیی ئەزەری حیزبی ئێمەی سەبارەت بەوە کە هیچ کام لە داخوازە ئەساسییەکانی خەڵکی کوردستان لە چوارچێوەی ئەو رێژیمەدا ناتوانێ وەدی بێ، بە ئیسبات گەیاند.

هەر بۆیە لە هەل و مەرجی ئێستادا، حیزبی ئێمە هەر جۆرە وتوویژێکی سیاسی لەگەڵ نوێنەرانی رێژیمی خومەینی بە کارێکی بێ فایدە دەزانێ و سەر لە نوێ تەئکید دەکاتەوە

که دروشمی خەباتی چەکدارانە هەتا رووخانی رێژیمی خومەینی کە لە لایەن کۆنگرەی پێنجەمی حیزبەوە بڕیاری لەسەر دراوە و کۆنگرەی شەشەمیش تەئکیدی لەسەر کردۆتەوە، هەروا دروشمی نەسلی حیزبی ئێمە و جوولانەوەی دێموکراتی خەڵکی کوردستانە.

شەڕەکانی قارەمانانەی پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە ماوەی شەش مانگی رابردوودا و ئەو زەبرە کاریگەرانەی لە رێژیمی خومەینییان وەشاندووە و هەروەها شەهید بوونی دەیان ئەفەر لە باشترین رۆڵەکانی حیزبی ئێمە لەو ماوەیەدا، باشترین بەڵگەیە بۆ ئەم ئیددیعایە». (*)

**دەبیرخانەی کۆمیتەی ناوەندیی**
**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**
**٣٠ی بەفرانباری ١٣٦٣**

دوای ئەوەش بەرپرسی شوورا لە پەیامی ٢٢ی رێبەندانی ١٣٦٣دا گوتی:

«پڕ بە دڵ لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران داوا دەکەم بە حورمەتی خوێنی شەهیدانی گەل، بە تایبەتی پێشمەرگە دلێرەکانی کوردستان کە لە لایەن رێژیمی خومەینییەوە شەهید کراون، بە روونی تازە نەکردنەوەی وتووێژێکی سیاسی لەگەڵ رێژیم لە حاڵ و داهاتوودا رابگەیەنن.

هەروەها گوتی: «بە دڵەوە ئاواتە خوازی ئەوەم حیزبی هاوپەیمانمان، حیزبی دێموکرات بە تەحریمی لێبڕاوانەی وتووێژی سیاسی لەگەڵ رێژیمی ناشەرعی خومەینی، هۆی تەواو کردنی ناتەباییەکان پێک بێنێ».

دوکتۆر قاسملوو کە پێی وابوو دەتوانێ هەم لە شوورادا بمێنێتەوە و هەم هەر کات هەل و مەرج لە روانگەی ئەوەوە هەڵیگرت، بتوانێ لەگەڵ رێژیم وتووێژ بکا، لە رێکەوتی ١٣٦٥/١٢/٢٢ بە ناوی دەفتەری سیاسییەوە نامەی کورتی ژێرەوەی بۆ موجاهیدین ناردووە:

«تاریخ ١٣٦٥/١٢/٢٢
شمارە ٥١٧

---

(*) وەرگیراوە لە رۆژنامەی «کوردستان» ژمارە ١٠١

**دەفتەری سیاسیی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵکی ئێران**

دوای پێشکەش کردنی سڵاو،

ئەو هەل و مەرجە زۆر ناسکەی کە نیشتمانی خۆشەویستمان ئێران تێی دایە، زیاتر لە پێشوو پێویستی بە هاوکاریی تەواوی ئەو ڕێکخراوانە هەیە کە کۆمارخوازن و لە ڕێگەی ڕووخانی ڕژێمی خومەینیدا خەبات دەکەن.

بۆیە پێشنهاد دەکەین نوێنەرانی هەردوو لامان لەمستەوای ڕێبەریدا بۆ باس و ئاڵ و گۆڕی بیروڕا لەسەر پێوەندیی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵک و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران پێکەوە دانیشن چاوەڕوانی پێشنیاری ئێوەین بۆ دیاری کردنی کات و شوێن.

به سڵاوی شۆڕشگێڕانەوە

**دەفتەری سیاسیی**

**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**

**ع- ق**

بەڵام ڕێکخراوی موجاهیدین کە لەسەر داخوازی خۆیان کە لە بڕیارنامەی ناوریلی ۸۵ی شووراداهاتبوو و بریتی بوو لەوەی«حیزبی دێوکرات دەبوایە پێوەندی و وتوێژ لەگەڵ ڕژێم مەحکووم بکا»، ئەو داخوازییەی قبووڵ نەکرد.

جارێکی دیش دەبیرخانەی حیزب لە وەڵامدا ڕاگەیەندراوێکی لە ڕێکەوتی ۱۹ی ڕەشمەمەدا دەرکرد کە لە خاڵی ۲و ۳و ٤ دا دەڵێ:

«۲- نەزەری حیزبی دێوکراتی کوردستانی ئێران لە بارەی وتوێژ لەگەڵ ڕژێمی خومەینی هەر ئەوەیە کە لە ڕاگەیەندراوی ۳ی بەفرانباری ئەمساڵی دەبیرخانەی حیزبدا گوتراوە کە حیزب لە هەل و مەرجی ئێستادا وتووێژی سیاسی لەگەڵ نوێنەرانی ڕژێمی خومەینی بە کارێکی بێ فایدە دەزانێ».

۳- حیزبی دێوکرات بە هیچ جۆر تەمای هاتنەدەر لە شوورای نیشتمانیی بەرگری نییە، مەگەر ئەوە کە بە پێی ئایین نامەی شوورا هەموو ئەندامانی شوورا بێجگە لە حیزبی دێوکراتی کوردستان بە دەرکردنی حیزب لە شوورا دەنگ بدەن. کە دیارە لە عەقڵ بە دوور بە نەزەر دەگا، ڕێکخراو و شەخسییەتەکانی ئەندامی شوورا ئەو کارە بکەن، چونکە هەموویان لە نەقشی بەرچاوی حیزبی دێوکراتی کوردستانی ئێران لە خەبات بۆ

رووخاندنی ڕێژیمی خومەینی بە باشی ئاگادارن.

٤- حیزبی دێموکرات ئەددیهەوێ لە شوورای نیشتمانیی بەرگری ماڵ ئاوایی بکا و نە لە ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵک، ئێمە بەش بە حاڵی خۆمان هیواداریین کە ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵکیش چ لە نێو شوورا و چ لە دەرەوەی شوورا هاوپەیمانی ئێمە بمێنێتەوە». [*]

بەڵام نە کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسیی حیزب هاتنە سەر ئەو باوەڕە بۆ هەمیشە واز لە وتوویژ بێنن و لەم بابەتەوە ویستی شوورا بەجێ بێنن، نە شووراش وازی لە داخوازی ڕەوای خۆی هێنا.

لە ئاکامدا پاش شەش مانگ هەوڵ و تێکۆشان کار گەیشتە ئەو جێگایە کە لە کۆبوونەوەی خاکە لێوەی ٦٤دا بەبێ ئەوەی نوێنەری حیزب بانگهێشتن بکەن، ئەندامانی شوورا بە تێکڕایی دەنگ بە دەلیلی وتوویژ لەگەڵ ڕێژیمی خومەینی کە ئەم کارە لەگەڵ خاڵی یەکی پێڕەوی نێوخۆی شوورا دژایەتیی هەبوو، کۆتایی بە ئەندامەتیی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە شوورا هێنا و وەلای نا.

دەفتەری سیاسیی حیزبیش بە بڵاوکردنەوەی ئاگادارییەک لە ڕێکەوتی ٦٤/٢/١ بە باس کردنی هێندێک شت کە تا ئەو دەم باس نەکرابوو، لانی کەم بۆ ئەندامانی حیزبیش بڵاو نەکرابووەوە، ئەم بڕیارەی بە کردەوە قبووڵ کرد.

بەڵام بە دوای ئەودا جارێکی دی نامەیەکی دوو لاپەڕەیی بۆ داخوازی حیزب و ئامادەیی بۆ درێژەدانی هاوکاری لەگەڵ ڕێکخراوی موجاهیدین نووسراو بۆ بەغدا بەڕێ کرا، ئێستاش روون نەبووەوە گەیاندنی ئەم نامە بۆ زیاتر لە مانگێک وەدوا کەوت. کە گەیشتیش وەڵامی نامەکە مەنفی بوو و ئامادەییان بۆ هیچ چەشنە هاوکارییەک لەگەڵ حیزب نەبوو.

سەرەڕای ئەوەش بڕیار وابوو دژیان قسە نەکەین و دوژمنایەتییان نەکەین و لەم بابەتەوە هیچ کات دەست پێشخەر نەبین.

ڕێژیم کە هەستی بەوە دەکرد لە لایەک حیزب لە شووراەدا نەماوە و لە لایەکی دیکەوە شەڕی کۆمەڵە و حیزب لە گۆڕێ دایە، حەزی دەکرد وەزعی حیزب بە شپرزەیی نیشان بدا. لە کاتێکدا هەر لە مانگی پووشپەڕی ساڵی ٦٤دا پێشمەرگە لە زۆربەی شوێنەکان زەبری

(*) وەرگیراوە لە ڕۆژنامەی «کوردستان» ژمارە ١٠٢

زۆر کاریگەری لە دوژمن وەشاند. بۆ توندکردنی ناکۆکیی نێوخۆیی هێزە کوردستانییەکان لە لایەک و داپۆشینی وەزعی شڕ و شپرزەی خۆی لە لایەکی دیکەوە بە تایبەتی کە دەیزانی حیزب بەرەو بەڕێوەبردنی جێژنی چلەمین سالی دامەزرانی خۆی بە شێوەیەکی بەربلاو دەچێ، رۆژی ٥ /٤/ ٦٤ سەعات ٢ی پاش نیوەڕۆ رایگەیاند:

«لەسەر راپۆرتی هەوالدەری کۆماری ئیسلامی، عەمەلیاتی سەرکەوتووی «انصار الله» کە لە حەوتووی رابردوودا بە مەبەستی لە نێوبردنی باقی هێزەکانی دژی ئیسلام و شۆڕش و بەدەستەوە گرتنی دەسەلاتی تەواو لە شوێنە سنوورییەکان و بڕینی پێوەندیی تەداروکاتیی گرووهەکان لەگەل رێژیمی بەغدا بە کوشتن و بریندارکردنی سەد کەس لە کادر و ئەندامانی حیزبی هەلوەشاوەی دێموکرات و هەلاتنی هێزی ئەم گرووهانە بۆ ئەو دیوی سنوور، هەروا درێژەی هەیە».

ئەوە لە کاتێکدا بوو کە پێشمەرگە بە دلگەرمیی تەواو لە هەموو شوێنێکی کوردستان هێرشی دەکردە سەر بنکەکانی دوژمن و بۆ نموونە لە تێک هەلچوونی گوندی تەخت لە تیلەکۆی سەقز لە لایەن پێشمەرگەکانی هێزەکانی هەوشار و شەهیدانی دیواندەرە و عەزیز یوسفی، زیاتر لە ٥٠٠ کەس لە دوژمن کوژرا بوون و بریندار ببوون.

رێژیمیش بە توندی خەریکی زۆرکردنی هێز، بە تایبەتی جاش راگرتن لە کوردستان و پەرەپێدانی شەڕی کورد لەگەل کورد بوو.

بەداخەوە لە رێکەوتی ١٠ /٤/ ١٣٦٤ سەرگورد کەریمی عەلیار ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و جێگری بەرپرسی کۆمیسیۆنی تەشکیلات لە ناوچەی بانە لە شەڕێکی قارەمانانەدا لەگەل سێ پێشمەرگەی هێزی شەهید موعینی شەهید بوون.

لە مانگی پووشپەڕی ١٣٦٤دا دەعوەتنامەی حیزبی سوسیالیستی فەڕانسە بۆ بەشداری لە کۆنگرەدا دەعوەتنامەی حیزبی کۆمۆنیستی فەڕانسە بۆبەشداری لە جێژنی ئومانیتە بۆ حیزب هاتبوو کە لە هەردووکیان دا بەشداریی کردووە.

لە سەرەتای هاوینی ١٣٦٤ بۆ بەڕێوەبردنی بەرنامەی چلەمین سالی دامەزرانی حیزب کۆمیتەیەکی تایبەت بە بەرپرسایەتیی جەلیل گادانی و هاوکاریی کاک فەتاح کاویان، کاک بەهرۆز کورد ئەحمەدی و مامۆستا عاشق پێکهات.

ئەم کۆمیتە لە ماوەی مانگ و نیوێک دا بە هاوکاریی کادر و پێشمەرگەکانی حیزب لە هەموو بوارەکاندا زەمینەی بۆ بەڕێوەبردنی ڕێ و رەسمێکی بە شکۆ پێکهێنا.

لەم رێ و رەسمەدا کە بەر لە ٢٥ی گەلاوێژ بەڕێوە چوو، مام جەلال، مامۆستا شێخ

عیزەدین و هێندێک کەسایەتیی ناسراوی دیکە و نوێنەری زۆربەی هێزەکانی ئێرانی و کوردستانی بەشداربیان کرد.

بەم بۆنەوە بەیاننامەیەکی شیاوی چل ساڵ خەبات لە لایەن کۆمیتەی ناوەندی بڵاو بووەوە. هەروەها کورتە مێژوویەکی حیزبیش بە ناوی چل ساڵ خەبات لەسەر هەل و مەرجی پێکهاتنی حیزب و دەورەی یەکەمی کۆماری کوردستان لە لایەن دوکتور قاسملووەوە نووسرا. هەروەها چەند جۆر پۆستەری پێشەوا و دروشمێکی زۆر ئامادە کرابوو کە لە هەموو شار و گوندەکان نووسران و بڵاوبوونەوە.

بە بۆنەی ئەم جێژنەوە دەیان پەیامی پیرۆزبایی لە نێوخۆ و دەرەوە را هاتبوون.

لە هەموویاندا هاودەردی لەگەڵ گەلی کورد و پشتیوانی لە خەباتەکەی کرابوو. ڕۆژنامەی ژمارە ١٠٧ی «کوردستان» بە تایبەتی و بەم بۆنەیەوە چاپ و بڵاوکرایەوە. لەم ژمارەدا کە هەموو شتەکانی لەسەر حیزب و کاروتێکۆشانی حیزب بوو، بە بۆنەی چل ساڵ خەبات بە کورتی چل ڕووداوی گرینگ لە مێژووی حیزب چاپ کرابوو.

لە سەرەتاکانی مانگی ڕەزبەری ١٣٦٤را بۆ ماوەی چەند ڕۆژ پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب بەڕێوەچووە، لەم پلینۆمەدا دوو باسی گرینگ لە گۆڕێ دابوو، یەکیان لەسەر ڕێژیم کە پلینۆم لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە لە چوارچێوەی کۆماری ئیسلامیدا دروشمی حیزب کە بریتی لە دیموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستانە، جێ بەجێ نابێ و لەبەر ئەوە حیزب لەسەر دروشمی ڕووخانی کۆماری ئیسلامی پێ دادەگرێ. دووهەم سەبارەت بە شوورا و کۆمەڵە:

لەمەڕ کۆمەڵە واهاتووە: «ئەگەر ڕێبەرانی کۆمەڵە ئەم ڕاستییە حاشا هەڵنەگرە کە هەموو خەڵکی کوردستان و هەموو ڕێکخراوە پێشکەوتنخوازەکانی ئێرانی و کوردستانی زۆر لەمێژە قبووڵیان کردووە، قبووڵ بکەن، کە حیزبی دیموکرات حیزبێکی شۆڕشگێڕە» ڕێگا بۆ ئاگربەس و وتوویژ و تەنانەت بۆ هاوکاریش خۆش دەبێ.

بۆیە درێژەدان یا ڕاگرتنی شەڕ هەردوو لە دەست ڕێبەرانی حیزبی کۆمونیستی کۆمەڵە دایە!!»

پلینۆم هەروەها بەجێهێشتنی شوورای نیشتمانیی بەرگریی لە لایەن حیزبەوە بە ئیقدامێکی باش و موناسب دانا و تەئییدی کرد.!(*)

هەروەها لەم پلینۆمەدا کادر و پێشمەرگەکانی ناوەندی ئاژوان لە لایەن کۆمیتەی

(*) وەرگیراوە لە ڕۆژنامەی «کوردستان» ژمارە ١٠٨

ناوەندییەوە تەشویق کران کە دەقی تەشویق نامەکەش لە لاپەڕە ۱۳ی ڕۆژنامەی ژمارە ۱۰۸ی «کوردستان»دا چاپ کراوە.

لە ڕۆژەکانی ۱۵ و۱٦ی مانگی ڕەزبەردا زۆر بە داخەوە دوو هاوڕێی تێکۆشەری ڕێبەرایەتیی کەمال دەبباغی و تەها حەق تاڵەب کە بەڕێز لە ساڵی ٦۱ و ٦۲دا گیرابوون، یەکەمیان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و بەرپرسی ناوەندی ئاژوان و دووهەمیان موشاوری کۆمیتەی ناوەندی و بەرپرسی ڕێکخراوی حیزب لە تاران بوو، پاش تەحەمولی سێ چوار ساڵ ئەشکەنجە لە بەندیخانەکانی کرماشان و تاران و تەورێز و ورمێ، تەنانەت بە دوای ئەوەدا بەندیشیان بۆ بڕابووەوە، بە پێچەوانەی هەموو یاسای جیهانی گوللە باران کران.

لە ڕێکەوتی ٤ی سەرماوەزی ۱۳٦٤ بە بۆنەی شەهید بوونی ئەم دوو هاوڕێ قارەمان و تێکۆشەرە، لە لایەن دەفتەری سیاسیی حیزب ئاگادارییەک بڵاوبووەوە، دەقەکەی لە ڕۆژنامەی ژمارە ۱۰۹ی «کوردستان»دا چاپ کراوە.

# کۆنگرەی حەوتەم

بە پێی پێڕەوی نێوخۆی حیزب کە دەبوو هەر دوو ساڵ جارێک کۆنگرە بگیرێ، لە ڕۆژی ٢٦ی سەرماوەزی ١٣٦٤ لە بیرەوەریی ڕۆژی پێشمەرگەدا لەگوندی کانی مێوی کوردستانی گەرمیان کۆنگرەی حەوتەمی حیزب دەستی بە کار کرد کە سەرجەم چوار ڕۆژی خایاند. ئەم کۆنگرە کە لە چلەمین ساڵی دامەزرانی حیزب بەسترا، بە ناوی کۆنگرەی چل ساڵ خەبات نێودێر کرا.

بە شێوەی ئاسایی دوای خوێندنەوەی سروودی ئەی ڕەقیب و ڕاگرتنی دەقیقەیەک بێ دەنگی بە یادی شەهیدانی حیزب و گەل سکرتێری گشتی ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندیی پێشکەش بە کۆنگرە کرد.

لەم ڕاپۆرتەدا کە دواتر بە جیا چاپ و بڵاوکرایەوە، باسی قەیرانی ئابووری و تێکچوونی سیستمی دراوی سەرمایەداریی جیهانی دەکرێ. لەسەر سیستمی دیفاعی ڕیگان کەبە شەڕی ئەستێرەکان ناوبانگی دەرکردبوو، هەروەها لە سەرمەسەلەی ئاشتی جیهانی وگرینگی چاوپێکەوتنی سەرۆکی دوو دەوڵەتی هەرە گەورەو بەهێزی جیهانی «ریگان وگورباچۆف» وبایەخی ئەم چاوپێکەوتنە لەئاشتی جیهانی داوڕۆژدا دەدوێ.

لەسەر وەزعی ئێران لەم ڕاپۆرتەدا باسی قەیران لەهەموو بوارەکانی سیاسی، ئیزامی کۆمەڵایەتی وفەرهەنگی دەکرێ و دەگوترێ کە ڕێژیم بەرنامەیەکی بۆ چارەسەری ئەم وەزعە نییە و ناشتوانێ هەیبێ. بۆیە بێ لەسەر وەزعی شپرزەی ئابووری دادەگرێ. بە پێی ئامار لەم ڕاپۆرتەدا ڕوون دەکرێتەوە کە لە ماوەی حەوت ساڵ دەسەڵاتی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامیدا نرخەکان چوار پێنج بەرامبەر زیاد بوون بۆ نموونە دەڵێ:

«لە ساڵی ١٣٥٨دا داهاتی مانگانەی نێونجی خێزانێکی شاری ٤٢٩٠ تمەن بوود کە

له ساڵی ١٣٦٢دا بۆته ٥٧٨٠ تمەن و له ساڵی ١٣٦٤ دا دەبێته ٦٤٣٠ واته بۆته یەک بەرابەر و نیوی ساڵی ١٣٥٨. له کاتێکدا که خەرجی ئەم جۆره خێزانه له ساڵی ١٣٥٨دا ٤٤٠٠ تمەن بووه، ساڵی ١٣٦٢ گەیوەته ٩٣٨٠ تمەن و له ساڵی ١٣٦٤ دا دەگاته ١٣٤٤٠، واته له سێ بەرابەر زیاتر بووه».

راپۆرت له بارەی شەڕەوه دەڵێ:

«به پێی بەراوردی پسپۆرەکانی ئیزامیی رۆژئاوا خەرجی شەڕ لەگەڵ عێراق و دژی خەڵکی کوردستان له ساڵی ١٩٨٤ی زایینیدا سێزده میلیارد و ٣٠٠ ملیۆن دۆلاربووه، له ساڵی ١٣٦٤دا که ٩ مانگی ساڵی ١٩٨٥یش دەگرێتەوه، بێ گومان ئەم رەقەمه زیاتره. بەم پێیه ئەگەر کاربەدەستانی رژێمی خومەینی هەموو داهاتی ئەوتیش بۆ شەڕ خەرج بکەن، دیسان لانی کەم سێ میلیارد و سەد ملیۆن دۆلار بێ جێن. تازه مووسەوی سەرۆک وەزیر دەڵێ: «خەرجی شەڕ له ساڵی ١٣٦٥دا ١٢/٥ له سەد دەچێته سەرێ، بەم حیسابه ئەگەر خەرجی شەڕ لەو ساڵەشدا هەر بەقەد ساڵی ١٩٨٤ بێ خەرجییەکه بۆ شەڕ دەگاته پازده میلیارد دۆلار که دابین کردنی به هیچ شێوەیەک له توانای رژێمدا نییه».

له بابەت هێزه سیاسییەکانی ئۆپۆزیسیۆنەوه دەڵێ:

«حیزبی ئێمه ئامادەیه لەگەڵ هەموو هێزەکان هاوکاری بکا، بەشەرتێک دژی رژێمی خومەینی خەبات بکەن و بۆ گەڕانەوەی رژێمی پاشایەتی تێ نەکۆشن.

لەم پێوەندییەدا پێویسته بگوترێ که هەرچەند حیزبی ئێمه شووورای نیشتمانی بەرگریی بەجێ هێشتووه! بەڵام ئێستاش ئامادەیه لەگەڵ سازمانی موجاهیدین هاوکاریی عەمەلی هەبێ... هەروەها ئەو رێکخراوه ئێرانییانەش که له کوردستان تێکۆشانیان هەیه، دەتوانن ئەگەر بیانەوێ هاوکاری لەگەڵ حیزب بکەن».

حیزب بۆ پێکهێنانی بەرەش لەم راپۆرتەدا ئامادەیی خۆی دەربڕیوه و مەرجەکانی بەشدار بوون لەبەرەدا بریتین له : بڕوا به رووخانی کۆماری ئیسلامی و هێنانه سەرکاری رژێمێکی دیموکراتی بۆ وەدی هێنانی ئامانجەکانی سەربەخۆیی ئێران و بەڕێوەبردنی سیاسەتی خۆنەبەستنەوه، دیموکراسی و ئازادییه دیموکراتییەکان، دابین کردنی مافی نەتەوایەتیی گەلانی زۆرلێکراوی ئێران به شێوەی خودموختاری یا فیدرالی و جێ بەجێ کردنی داخوازه ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی زەحمەتکێشان.

له کۆنگرەی ٧دا ئەم کەسانەی ژێرەوه وەک ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و جێگر

هەڵبژێردران: دوکتۆر قاسملوو، هاشم کەریمی، دوکتۆر شەرەفکەندی، مستەفا هیجری، حسێن مەدەنی، جەلیل گادانی، فەتاح کاویان، سدیق بابانی، عەلی کاشف پوور، حەسەن رەستگار، مامۆستا عەبدوللا حەسەن زادە، محەممەد ئەمین مەجیدیان، حەسەن شیوە سەلی، حەکیم رەزایی، نەبی قادری، حەسەن شەرەفی، عوسمان رەحیمی، عبدالله قادری، جەعفەر حامیدی، ئەبوبەکر راد، عبدالله عیزەت پوور، سەلام عەزیزی، دوکتۆر حسێن خەلیقی، فەتاح عەبدولی، بابا عەلی مێهرپەروەر.

جێگرەکان:

سەروان رەحیمی (چەکۆ)، سەعدوون عەباسی، برایم لاجانی، کەمال کەریمی، حەسەن ئەیووب زادە، عیسمەت عەبدی، سەرهەنگ قادری، مەحموود دەشتی، شاپور فیروزی لە دەورەی دووهەمدا، محەممەد ئەزیف قادری لە دەورەی سێهەمی هەڵبژاردندا.

بە داخەوە لە کۆنگرەکانی حیزبی دیموکراتدا هیچ کات مەسەلەی ماڵی نەهاتۆتە گۆڕێ و ئەم کارە هەموو کات بۆتە هۆی نارەزایەتیی ئەندامانی کۆنگرە. لە راستیدا ئەگەر وەک لە پێرەودا دەڵێین، کۆنگرە گرینگترین و بەرپرسترین ئۆرگانی حیزبە و هەموو مەسەلەکان باس کردنیان لەوێدا دەلوێ، بە تایبەتی مەسەلەی ماڵی کە وەک راستییەکی حاشا هەڵنەگر هەمیشە گلەیی و گازندە دێنێتە گۆڕێ.

لەم کۆنگرەدا باسی یارمەتیی دەرەوە کرا بەداخەوە دوکتۆر قاسملوو لە وەڵامی پرسیاری سەلامی عەزیزی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هێندێکیش خۆی توورە کرد و راستییەکەی کە زۆر کەسیش دەیانزانی و بەڵگەی زیندوو هەبوو، نەگوت.

ئەحمەد ئەستانی یەکێک لە فەرماندە ناسراوەکانی حیزبیش پرسیاری لە دوکتۆر قاسملوو کرد و گوتی: «ئەرێ کاک دوکتۆر وەختی ئەوە نەهاتووە لانی کەم ئەم کۆنگرە بزانێ وەزعی ماڵیمان چۆنە، چۆن دەژین و چمان هەیە؟»

دوکتۆر زۆر بێ پەروایانە وەڵامی داوە: «هەتا ئەمن سکرتێری حیزب بم، جگە لە خۆم، کەس نابێ بزانێ چمان هەیە و چمان نییە!»

لە رێکەوتی ۱۳٦٤/۹/۲۹ واتە لە رۆژی ئاخری کۆنگرەدا بڕیارنامەیەک لە دوازدە خاڵدا بە شێوەی خوارەوە دەرچوو:

**بڕیارنامەی کۆنگرەی حەوتەمی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران:**

کۆنگرەی حەوتەمی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە لە ڕۆژی ٢٦ی سەرماوەز، ڕۆژی پێشمەرگەی کوردستاندا کاروباری خۆی دەست پێکرد، لە کۆبوونەوەی پێش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٣٦٤/٩/٢٩ واتە لە دوارۆژی کاری کۆنگرەدا، ئەم بڕیارنامەی خوارەوەی بە تێکڕای دەنگ پەسند کرد:

١- کۆنگرەی حەوتەم ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی کە بۆ ماوەی ٢ ڕۆژ کەوتە بەر باس و لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و ڕەخنەگرانە و کارساز، پەسند دەکا.

٢- لەبەر ئەوەی لە چوارچێوەی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامیدا هیچ کام لە داخوازە بنەڕەتییەکانی خەڵکی کوردستان «دێموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان» وەدی نایە، کۆنگرە دروشمی «برووخێ کۆماری ئیسلامیی ئێران» پەسند دەکاتەوە.

٣- کۆنگرە هاتنە دەریی حیزب لە شووورای نیشتمانی بەرگری بە کارێکی دروست و بەجێ دەزانێ و هەڵوێستی کۆمیتەی ناوەندی بەرامبەر بە «سازمان مجاهدین خلق ایران» پەسند دەکا و لەسەر پاراستنی سەربەخۆیی و سەربەخۆیی بڕیاردان لە هەموو هەل و مەرجێک و لە بەرامبەر هەموو حیزب و ڕێکخراوێک بە توندی پێ دادەگرێ.

٤- کۆنگرە سیاسەتی ناژاوەگێڕانەی ڕێبەرانی سەر لێ شێواوی کۆمەڵە، بە هۆی سەرەکیی شەڕی نێوان کۆمەڵە و حیزب دەزانێ و هەڵوێستەکانی ڕێبەرایەتی حیزب بەرامبەر بە کۆمەڵە بەتەواوی پەسەند دەکاو داوای لە ڕێبەرایەتی هەڵبژێراوی کۆنگرەی حەوتەمیش ئەوەیە لەسەر چەسپاندنی ئەو ئەسڵانە کە بۆ پێکهاتنی ئاشتییەکی بەردەوام لە نێو حیزب و کۆمەڵەدا دیاری کراون، پێ دابگرێ تا قبووڵ کردنی واقعییەتی کوردستان لە لایەن کۆمەڵەوە، بەرامبەر بە ناژاوەگێڕیەکانی کۆمەڵە بە توندی ڕابوەستێ.

٥- کۆنگرە هەڵوێستی مەسئوولانەی کۆمیتەی ناوەندی بەرامبەر بە ڕێکخراوە سیاسییەکانی ئێران بە تەواوی بە دروست دەزانێ و هەر لەو کاتەدا بە ئەرکی ڕێبەرایەتیی تازەی حیزب دادەنێ کە بۆ پتەوکردنی دۆستایەتیی و هاوکاری لەگەڵ هێزە نیشتمانپەروەرەکان درێژە بە تێکۆشانی خۆی بدا.

٦- کۆنگرەی حەوتەم پێکهێنانی بەرەی دێموکراتی دژی ئیمپریالیستی لە نێو ڕێکخراوە پێشکەوتووەکانی ئێراندا بە پێویستییەکی مێژوویی دەزانێ و داوا لە ڕێبەرایەتیی

حیزب دەکا لەو ڕێگایەدا هەوڵ بدا دەست پێشخەر بێ.
٧- بە لەبەر چاوگرتنی ئەو ڕاستییە کە ژنان نیوەی کۆمەڵن، کۆنگرە داوا لە ڕێبەرایەتی حیزب دەکا بەرنامەی باش و گونجاو بۆ چالاکتر کردنی نەخشی ژنان لە بزووتنەوەی حەق خوازانەی خەڵکی کوردستاندا دابنێ.
٨- کۆنگرە ڕاکێشانی هەرچی بەربلاوتری لاوان بۆ نێو ڕیزەکانی حیزب و هێزی پێشمەرگە بە ئەرکی هەموو کادر و ئەندامانی حیزب دادەنێ و بە ڕێبەرایەتیی دەسپێرێ کە ڕێ و شوێن و بەرنامەی پێویست بۆ بە جێ گەیاندنی ئەم ئەرکە دیاری بکا.
٩- کۆنگرە بە ئەرکی سەرشانی ڕێبەرایەتیی حیزب دادەنێ کە بۆ پەرەپێدانی کاری تەبلیغاتی زیاتر تێ بکۆشێ و لەو ڕێگایەدا بۆ بەهێزتر کردنی ڕادیۆی دەنگی کوردستانی ئێران و بەربلاوتر کردنی چاپەمەنی و دانانی شێوەیەکی ڕێکوپێکی بلاو کردنەوەی چاپەمەنی هەوڵ بدا.
١٠- کۆنگرە داوا لە ڕێبەرایەتی دەکا بۆ بەرگری لە پیلانی کۆچی زۆرەملی و کاول کردنی گوندەکانی کوردستان و لە قاودانی ئەو جینایەتەی ڕێژیمی خومەینی و بۆ ڕاکێشانی پشتیوانیی بیروڕای گشتیی جیهانی بەرەو مەحکووم کردنی ئەو نەخشە دژی ئینسانییە هەنگاو هەڵێنێتەوە.
١١- کۆنگرە سیاسەتی دەرەوەی ڕێبەرایەتیی حیزب بە تەواوی پەسەند دەکا و لە سەرهەوڵدان بۆ پتەوکردنی پێوەندی دۆستانە لەگەڵ حیزب و ڕێکخراوە پێشکەوتووەکانی جیهان و بزووتنەوەکانی ڕزگاریخوازی و بە تایبەتی لەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی پێ دادەگرێ.
١٢- کۆنگرە هەوڵدان بۆ باشتر ناساندنی ژیان و خەباتی خەڵکی کوردستان بە گەلانی دنیا بە ئەرکێکی گرینگی ڕێبەرایەتیی دادەنێ و داوا دەکا ، کە بەشی پێوەندییەکانی دەرەوەی بە هێزتر بکرێ.
بێگومان بڕیارەکانی کۆنگرە شتی باشیان تێدابوو، بەلام یەکێک لە خراپترین خاڵەکان تازەکردنەوەی بڕیاری شەڕ لەگەڵ کۆمەڵە بوو، چونکە ئەو خاڵەی لەم پێوەندییەدا پەسەند کراوە، جگە لەوە مەعنایەکی دیکە نادا.
هەرچەند لە ماوەی ئەو پێنج شەش ساڵ خەباتەدا زۆر هاوڕێی تێکۆشەر شەهید

کرابوون، بەڵام دیسان تەرکیبی نوێنەرانی کۆنگرە نیشاندەری بەرزبوونی موستەوای زانست و زانیاریی حیزبە، کە بریتی بوو لە:

١- دوکتۆر لە سەدا ١/٩٨.
٢- فۆق لیسانس لە سەدا ١/٩٨
٣- لیسانس لە سەدا ١٠/٥٩
٤- دانشجوو لە سەدا ٥/٩٦
٥- فۆق دیپلۆم لە سەدا٩/٩٣
٦- دیپلۆم لە سەدا ٣٠/٤٦
٧- دیپلۆمی ناقص لە سەدا ٥/٢٩
٨- چواری متوسط لە سەدا ١/٩٨
٩- سێهەمی نەزەری لە سەدا ٣/٩٧
١٠- دووهەمی نەزەری لە سەدا ٤/٦٣
١١- هەوەڵی نەزەری لە سەدا ١/٣٢
١٢- سیکل لە سەدا ٧/٩٤
١٣- دووهەمی راهنمانی لە سەدا ٠/٦٦
١٤- هەوەڵی راهنمانی لە سەدا ٠/٦٦
١٥- شەشی سەرەتایی لە سەدا ١/٦٢
١٦- پێنجی سەرەتایی لە سەدا ١/٩٨
١٧- چواری سەرەتایی لە سەدا ٠/٦٦
١٨- دووهەمی سەرەتایی لە سەدا٠/٦٦
١٩- خوێندەواری ئایینی لە سەدا ١/٩٨
١٠- نەخوێندەوار لە سەدا ٠/٦٦ .

بە بەراوردێکی سادەی رەقەمی نەخوێندەوار کە لە کۆنگرەکانی دیکەدا هیچ کات لە ٤٠٪ کەمتر نەبوود، پێشکەوتنی حیزب لەم بابەتەشەوە دەردەکەوێ.

بە تەمەنترین کەس ٥٥ساڵ و لاوترین کەس لەم کۆنگرەدا ١٨ ساڵ بوود کە تەمەنی نێونجی دەبێتە سی و یەک ساڵ و پێنج مانگ.

بە دوای کۆنگرەدا لە یەکەم کۆبوونەوەی کورتی کۆمیتەی ناوەندیدا دوکتۆر قاسملوو

وەک سکرتێر هەڵبژێردراوە، بەڵام بە پێچەوانەی رابردوو بە مەبەستی تایبەتی کە سەرەتای فراکسیۆن بازیی ئاشکرا و دەستەبەندی بوو، زیاتر لە دە رۆژ گرتنی پلینۆمی رەسمییان وەدوا خست و بە پێچەوانەی ئیددیعای ئینسجام کە دوای کۆنگرە دەکرا، کرمی چەند بەرەکی لە نێو رێبەرانی حیزبدا بەم شێوەکارە پەروەردە کرا کە بۆ کۆنگرەی دواتر بوو بە خۆرەیەکی گەورە و لە چوارچێوەی غورووری و خۆ بەزل زانیدا گەورەترین زیانی لە حیزبی دیموکرات دا.

لەم پلینۆمەدا کە لانی کەم ١٠ رۆژ دوای کۆنگرە گیرا، ئەوانەی حەزیان لە دەستەبەندی دەکرد، سەرەڕای هەموو هەوڵێکیان بۆ پێکهێنانی دەستەبەندی، نەیانتوانی بە تەواوی سەرکەون.

هەر لەم پلینۆمەدا دوکتۆر سادق، حەسەن شەرەفی، هاشم کەریمی و حەسەن رەستگار بە ئەندامەتیی دەفتەری سیاسی هەڵبژێردران و باقی هاوڕێیانیش لە کۆمیسیون و باقی ئۆرگانەکاندا کاریان پێ سپێردرا. هەروەها ئەو ساڵە بناغەی ناکۆکی و ناتەبایی لە نێو حیزب و بە تایبەت لە ریزی رێبەرایەتیدا بە شێوەیەکی نادیار خۆی نواند.

ساڵی نوێی زایینی واتە ساڵی ١٩٨٦، بە تایبەتی دوای چاوپێکەوتنی «سەرۆک کۆماری ئەمریکا و سۆڤیەت» و باس لەسەر ئاشتیی جیهانی و تێز و بەرنامەی گۆرباچۆف بۆ کەم کردنەوەی کەرەستەی ئەتۆمی و کەم کردنەوەی بوودجەی نیزامی، لە لایەن رێکخراوی ئەتەوە یەکگرتووەکانەوە بە ساڵی نێونەتەوەیی ئاشتی داندرا.

لەم بوارەدا حیزب وتارێکی لە رۆژنامەی ژمارە ١١١ی «کوردستان» دا لە ژێر سەردێری «ساڵی ١٩٨٦، ساڵی نێونەتەوەیی ئاشتی» بڵاوکردۆتەوە کە سیاسەتی راستەقینەی حیزب لەم بوارەدا دەگەیەنێ و دەنووسێ:

«حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران وەک حیزبێکی شۆڕشگێڕ، دیموکرات و ئاشتیخواز لە راگەیاندنی ئەم ساڵە بە ناوی ساڵی جیهانیی ئاشتی پێشوازی دەکا و لە هەوڵ و تەقەللا و دەست پێشخەریی وڵاتانی سوسیالیستی و لە پێش هەموویاندا کۆششی یەکیەتیی سۆڤیەتی بۆ جێگیربوونی ئاشتییەکی بەردەوام پشتیوانی دەردەبڕێ و هیوادارە کە هەوڵ و تەقەللای هەموو ئەو ئینسانە مەسئوولەکان لە ساڵی ١٩٨٦دا جارێک بۆ هەمیشە پێشبڕکەی خۆ چەکدار کردن لە نێو دەوڵەتاندا لە نێو بەرێ و مرۆڤایەتی لە مەترسیی شەڕێکی جیهانی رزگار بێ.

حیزبی ئێمە خەباتی چەکدارانەی خۆی دژی ڕێژیمی شەڕخواز و ئاژاوەگێڕی کۆماری ئیسلامیش بە هەنگاوێک لە پێناوی جێگیربوونی ئاشتی و ئازادی و دیموکراسی دەزانێ. چونکە گومان لەوەدا نییە کە سیاسەتی قانوون شکێنانەی کۆماری ئیسلامی، ڕێژیمێک کە ڕێز بۆ هیچ کام لە بڕیارەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دانانێ، یەکێک لە هۆیەکانی لە مەترسی کەوتنی ئاشتی لە ناوچە و لە سەرتاسەری جیهان دایە. هەر لەو کاتەش دا رووخانی ڕێژیمی ئێستای ئێران کۆسپێکی گەورە لەسەر ڕێگای ئاشتی و ئازادی و عەدالەتی کۆمەڵایەتی لە ئێراندا وەلا دەبا و مەترسییەک لەسەر ئاشتیی جیهانی کەم دەکاتەوە.

بەو هیوایە کە ئەقڵی سەلیم بەپشتیوانیی خەباتی گەلان لە رادەی جیهاندا بە سەر هەستی مەزنی خوازی و دەسەڵات ویستیدا سەرکەوێ و بە ڕێککەوتنێکی ئێونەتەوەیی لەسەر لە نێوبردنی چەکە مەترسیدارەکان بۆ هەمیشە مرۆڤایەتی لە دڵە خورپەی بەرپابوونی شەڕێکی جیهانیی رزگار بێ».

لە رۆژەکانی ١٦ و ١٧ی مانگی خاکەلێوەدا دووهەمین پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێراوی کۆنگرەی ٧ پێکهات. لەم پلینۆمەدا لە پێوەندی لەگەڵ وەزعی ڕێژیمدا، باسی شپرزەیی بە هۆی شەڕ لەگەڵ عێراق و شەڕ لە کوردستاندا کرا.

پاشان بەرنامەی کاری ساڵیانە لە باری تەشکیلاتی ونیزامییەوە دارێژرا. کۆمیتەی ناوەندی لەم پلینۆمەدا بە بۆنەی ئەوەی شەهیدەکان زۆرن و ناو لەسەر دانانی هێزەکان بە ناوی شەهیدان وەڵامدەر نابێ، جگە لە ناوی هێزی پێشەوا کە وەک خۆی مایەوە، ناوی هێزەکانی دیکەی حیزبی بە شێوەی خوارەوە گۆڕی:

هێزی دالاهۆ، هێزی شاهۆی هەورامان، هێزی زاگرۆس بۆ مەڵبەندی ژمارە یەکی باشوور، هێزی ٢ی ڕێبەندان بۆ مەڵبەندی ژمارە دووی باشوور، هێزی ئاربەبای بانە، هێزی بەیان لە بۆکان، هێزی زمزیران لە رەبەت، هێزی قەندیل لە پیرانشار، هێزی دمدم لە نەغەدە، هێزی کێلەشین لە شنۆ، هێزی ئاگری لە مەڵبەندی باکوور، هێزی گیارەنگ لە سەردەشت و هێزی سامرەند لە بنکەکانی دەفتەری سیاسی.

هەروەها قەرار درا لک و پەلی هەر هێزێک بە ژمارەی تایبەتیی خۆیان بناسرێنەوە.

ئەوەش چەند نموونە لە چالاکی بەرچاوی پێشمەرگە لە ساڵی ١٣٦٤دا:

**بانه**

۱۳٦٤/۳/۲۰ هێزەکانی دوژمن بە مەبەستی دانانەوەی پایگا، خۆیان دەگەیەننە کۆنە پایگای تاژەبان. بەڵام پێشمەرگەکانی هێزەکانی وێردی و شاهۆ لەگەڵ ژمارەیەک پێشمەرگەی «راه کارگر» و «ارتش رهائیبخش»، بەرەنگاری هێزەکانی دوژمن بوون و لە سێ لاوە پەلاماریان دان. هەرچەندە دوژمن لە پایگاکانی دەوروبەر را سەنگەری پێشمەرگەکانی تۆپ باران دەکرد، بەڵام سەرەنجام دوای ۳/۳۰ سەعات شەڕی قارەمانانە، پایگای تاژەبان کەوتە بەر دەستی هێزی پێشمەرگە. لەو چالاکییەدا لە سەر یەک زیاتر لە ۱۳۰ کەس لە نەفرادی دوژمن کوژراو کەلاکی ۸۱ کەس لە مەیدانی شەڕ بەجێ ماو ۱۲ کەسیش بە دیل گیران. هەروەها ئەم کەلوپەل و چەک و چۆڵانە بە دەستکەوت گیران: کالیبر ٦۷ یەک قەبزە، خومپارەهاوێژی ٦۰ م م۲ قەبزە، تویوتا یەک دەزگا، ئارپی جی ۹ قەبزە، تفەنگی ژ- ۳، ۳۲ قەبزە، بێ سیمی پی ئارسی یەک دەزگا، دووربینی چاو ٤ دەزگا.

**سنە**

۱۳٦٤/٤/۹ هێزەکانی دوژمن بەرەو بەرزاییەکانی کوڕەمیانە، هەڵکەوتوو لە سەر جادەی سنە- مەریوان دەکەونە رێ، بەڵام پێشتر پێشمەرگەکانی هێزەکانی بێستوون- شەریف زادە و زرێبار لەم پیلانەی دوژمن ئاگادار دەبن و لەو شوێنانە کەمین دادەنێن. بەم شێوەیە هێزی دوژمن دەکەوێتە نێو بۆسەی رۆڵەکانی حیزب و گەل و دوای شەڕێکی سەختی ۱۵ سەعاتە، لانی کەم ۸۰ کەس لە هێزەکانی پەلاماردەر دەکوژێن و ژمارەیەکیش بریندار دەکەن. کەلاکی ۵۰ کەس لە مەیدانی شەڕ دەکەوێ کە ۲۵ کەسیان شناسایی دەکرێن، ۳ کەسیش بە دیل دەگیرێن. هەروەها ئەو چەک و چۆڵانەش دەست پێشمەرگەکان دەکەون: ئارپی جی ۷سێ قەبزە، تیربار کلاشینکۆف ٤ قەبزە، تیربار ژ- ۳ یەک قەبزە، تیرباری دوور هاوێژ یەک قەبزە، تفەنگی دوور هاوێژ یەک قەبزە، کلاشینکۆف ۱۵ قەبزە، ژ-۳ ۳۰ قەبزە و ژمارەیەکی زۆر خەشاب و فیشەک.

ورمێ

۱۳٦٤/۷/۳۰ پێشمەرگەکانی هێزی شەهید نەحۆ لەسەر جادەی ورمێ- شنۆ بە درێژایی ٦ کیلۆمەتر لە پردی محەممەد ئاغا را تا بەرزاییەکانی کەورمەندەک بە ناو

پارێزەرانی جادەکەیان دایە بەر پەلاماری شێرانەی خۆیان و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن، هاوکات لەگەڵ ئەو چالاکییە ٣ دەستە پێشمەرگەی دیکە مۆڵگەکانی دوژمنیان لە گردەشێن، سیلان و گەلی خان دایە بەر هێرش و زەبرێکی قورسیان لێ دان. هەر لەو کاتەدا هێزی فریاکەوتنی دوژمن کەوتە نێو کەمینی پێشمەرگەکان و ئەویش تارومار کرا. لە درێژەی ئەو شەڕەدا پایگای گردەشێن کەوتە ژێر دەستی پێشمەرگەکان. لەو شەڕە ٤ سەعاتییەدا جگە لە ئەفرادی کوژراوی نێو دوو مۆڵگەکەی دیکە، لانی کەم ٤٠ کەس لە هێزەکانی دوژمن کوژران و ٩ کەسیش بە دیل گیران. کەلاکی ٣٢ کەس لە مەیدانی شەڕدا بووە کە کەلاکی ٢٣ کەس شناسایی کراوە.

وەزعی رێژیمی کۆماری ئیسلامی لە ساڵی ٦٥دا لە باری ئابوورییەوە زۆر شڕتر بوو، ژمارەی کوژراو و بریندارەکانی شەڕی دوو لایەنەی ئێران و عێراقیش خەڵکی زۆر ناڕازی کردبوو، خەڵک کەمتر بە دەنگیانەوە دەچوون، بۆ ئەوەی بە شێوەیەک خۆیان راگرن، خومەینی و هەموو سەرۆکەکانی کۆمار وەک خامنەیی و رەفسەنجانی و مووسەوی سەرۆک وەزیریش تەبلیغاتێکی بە هێزیان لە رادیۆ و رۆژنامەکاندا وەڕێ خستبوو، بە هەڵگرتنی دروشمی «ساڵی دوایی هاتنی شەڕ» هات و هاوارێکی زۆریان وەڕێ خست و بەشێوەی ساڵەکانی هەوەڵی شەڕ، خەڵکیان خڕ دەکردەوە و بە گوتنی قسە کۆنەکەی «شەڕ شەڕ تا سەرکەوتن»، بەرەو کەربەلا وەڕێ کەوتن، ئەم جارەش جەماعەتێکی ساویلکەیان لە مەیدانەکانی شەڕ کرد.

ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە تەنیا لە ماوەی دوو مانگدا بە وتەی بەرپرسانی رێژیم لەبەر نەبوونی ئەرز، سەدان کارخانە بەسترابوون، زیاتر لە نیو ملیۆن خەڵکی دیکە بێ کار ببوون و رادەی بێکاران خۆی لە ٦ ملیۆن دەدا. فەساد زیاتر پەردی دەستاند، بە هۆی کاری نالەباری بەرپرسان بەشێک لە داروودەستەی خۆشیان لێیان بێزار ببوون. خەڵک لە زۆر شوێن بە ئاشکرا گلەیی و گازندەیان لە وەزع، دەکرد و بێزاریی خۆیان لە شەڕ دەردەبڕی، ئاخر سامانی لەم پێناوەدا بە با دابوون و زۆر لە جگەرگۆشەکانیان لە دەست دابوو.

لە قسەکانی موحسن رەزایی دەم راستی سوپای پاسداران دەردەکەوت کە رێژیم توانای قەرەبووکردنەوەی چەک و چۆڵی فەوتاو و شکاو و لە نێوچووی نییە.

سەرەڕای ئەوەش لە راگرتنی شەڕ کە ویستی هەموو دنیاو خەڵکی ئێرانیش بوو،

خۆیان دەپاراست و بە هیوای موعجیزە بوون. بە هات و هاواری تەبلیغاتی سەری خۆیان راگرتبوو.

لەگەڵ ئەوەش پێشمەرگەکانی حیزب کە وەک ساڵانی پێشوو لە زۆر شوێن شەڕی قارەمانانەیان دەکرد، رێژیم لەسەر ئەمانی پێشمەرگە و حیزب تەبلیغاتی خۆی هەر دەکرد و دەستی لە درۆ و دەلەسە نەدەکێشاوە. هەرچەندە زستانی ساڵی پێشتر گەلێک سارد و پڕ بەفر بوو، ماوەیەکیش لە بەهار چووبوو، بە سەختی حەرکەت دەکرا، بەڵام کە پێشمەرگە دەستی بە عەمەلیات کردەوە، زەبری زۆر گورچووبڕی لە دوژمن وەشاند و لە باشوورەوە تا باکوور سەدان عەمەلیاتیان بەڕێوەبرد و زیاتر لە ٣٠ پایگای گەورەی دوژمنیان گرت و بە سەدان بەکرێگیراوی دوژمن کوژران و بریندار بوون یا بە دیل گیران. سەدان پارچە چەکی سووک و نیوە قورس دەست پێشمەرگە کەوت و دەیان ملیۆن دۆلار زیان بە بنکە و بنیاتەکانی رێژیی خومەینی کەوت.

بەداخەوە کاک حەکیم رەزایی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و بەرپرسی مەڵبەندی ٢ی باشووری کوردستان لە رۆژی هەینی نۆی مانگی خەزەڵوەری ١٣٦٥ لە شەڕێکی نابەرابەر لەگەڵ هێزە بەکرێگیراوەکانی کۆماری ئیسلامی لە ناوچەی سەرشیوی سەقز لەگەڵ سێ هاوڕێی پێشمەرگە شەهید بوون.

دوکتۆر قاسملوو کە بۆ ماوەی پێنج شەش مانگ سەفەری دەرەوەی کردبوو توانیبووی بۆ یەکەم جار وەک چاوەدێر لە کۆنگرەی ئەنترناسیۆنالی سۆسیالیست دا کە لە لیمای پایتەختی پێرۆ لە ئەمریکای باشوور گیرابوو، بەشداری بکا. ئەم مەسەلەش خۆی تەئسیری زۆری لەسەر بیروبۆچوونی فکریی سکرتێری حیزب و دواتریش لەسەر بۆچوونی حیزب بەرەو راست ئاڵۆزییەکی ئاشکرا کرد.

لە بیستی مانگی سەرماوەزی ١٣٦٥ سێهەمین پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی حیزب پێکهات. لەم پلینۆمەدا بە دوای یادی شەهیدان و دوایین شەهیدی کۆمیتەی ناوەندی حیزب حەکیم رەزایی، لەسەر وەزعی ئێران، رووداوی ئێران گیت کە پێوەندیی ئەمریکا و کۆماری ئیسلامیی بە ناوی دژی « ئیمپریالیست»ی تێدا ئاشکرا بوو! راپۆرتی سەفەری دوکتۆر قاسملوو، کاروتێکۆشان و وەزعی ماڵیی مەڵبەندەکان باس کرا و سێ کەسیش بە هۆی کارامەیی و زەحمەتێکی زۆر کە لە پێناوی حیزبدا کێشابوویان، بە ئەندامی موشاوری کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران کە بریتی بوون لە:

غەفوور هەمزەیی، رەحیم محەممەد زادە، عبداللە شەریفی.

لە رۆژەکانی ٦ تا ٩ی ڕێبەندانی ١٣٦٥دا پێنجەمین کۆنفرانسی وڵاتانی ئیسلامی لە کوێت پێکهات، کۆماری ئیسلامی کە لە وەزعەکە نیگەران بوو، زۆری هەوڵدا پێشی گیرانی ئەم کۆنفرانسە بگرێ یا وەدرەنگی بخا، بەڵام بۆی نەچووە سەر.

کۆمیتەی ناوەندی حیزب پەیامێکی بۆ ئەم کۆنفرانسە ناردووە کە چەند بڕگەیەکی لێ دێنین:

«بەڕێزان، سەرۆک و ئەندامانی کۆنفرانسی بەرزی ئیسلامی!

کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران سڵاوێکی گەرمتان پێشکەش دەکاو سەرکەوتنی ئەم کۆنفرانسە مێژوویەتان بە ئاوات دەخوازێ.

کۆنفرانسی ئەم جارەی سەرۆکایەتیی وڵاتانی ئیسلامی لە حاڵێکدا دەبەسترێ کە جیهانی ئیسلام لەگەڵ زۆر گیروگرفتی سیاسی و ئابووری و ئیزامی بەرەوروو بووە. ئێمە هیواداریین کۆنفرانس تەواوی ئەو گیروگرفتانە باس بکا و بۆ هەر کامیان چارەسەرێکی لەبار بدۆزێتەوە.

بەڕێزان! یەکێک لەم مەسەلە گرینگانە کە ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی و بە تایبەتی ناوچەی خەلیج لەگەڵیان بەرەو روویە، مەسەلەی شەڕی حەوت ساڵەی نێوان دوو وڵاتی دراوسێ و موسوڵمان، ئێران و عێراقە. ئەم شەڕە نەک هەر ئەمنییەتی ناوچەی خەلیج و یەکیەتیی ریزەکانی وڵاتانی موسوڵمانی خستۆتە مەترسییەوە، بەڵکو هەڕەشە لە ئاشتیی جیهانیش دەکا.

کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران هیواداره کۆنفرانسی ئیسلامی مەسەلەی شەڕی ئێران و عێراق لە دەستووری کاری خۆیدا دابنێ و بڕیارێکی ئەوتۆی لەسەر بدا کە لە داهاتوویەکی نزیکدا کۆتایی هاتنی ئەو شەڕە دەستەبەر بکا.

سەرۆکی بەرێز و ئەندامانی کۆنفرانسی ئیسلامی!

نزیک بە هەشت ساڵە رێژیمی کۆماری ئیسلامی!! لە ئێراندا شەڕێکی ناڕەوا و دژی ئیسلامی بەسەر گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا سەپاندووە، کە بەداخەوە لەبەر ئەوەی حکوومەت سیاسەتی پەردە پێدادانی رەچاو کردووە، دنیای دەرەوەش شتێکی زۆر کەمی لێ دەزانێ. لە ئێرانی فرە نەتەوەییدا زیاتر لە هەشت ملیۆن کورد دەژین کە لە هەموو مافێکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بێ بەش کراون. خەڵکی

کوردستانی ئێران دەیان ساڵە بۆ وەدەست هێنانی مافە نەتەوایەتییەکانی خۆیان خەبات دەکەن و ئەو خەباتە بە قیمەتی گیانی هەزاران تێکۆشەری کورد تەواو بووە.

خومەینی لە مانگی گەلاوێژی ۱۳۵۸ی هەتاویدا فتوای جیهادی دژی میللەتی موسوڵمان و ئاشتیخوازی کورد دەرکرد و لەو کاتەوە ئاگری شەڕێکی دژی ئینسانی و دژی ئیسلامی لە سەرتاسەری کوردستان بە دژی گەلی موسوڵمانی کورد هەڵگیرساندووە.

ئەوان بە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام شیعە بەسەر سوننیدا تەرجیح دەدەن و ئەم مەسەلەش بە دژایەتی لەگەڵ کوردەکان کە زۆربەیان سوننین، لە قانوونی ئەساسیی کۆماری ئیسلامیدا گونجاوە.

کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران هیوادارە کۆنفرانسی سەرۆکانی وڵاتانی ئیسلامی سەرنج بداتە دژواریی گەلی موسوڵمانی کورد لە کوردستانی ئێران، شەڕی زاڵمانەی رێژیمی خومەینی بە دژی خەڵکی کوردستان مەحکووم بکا و ئەو رێژیمە بۆ کۆتایی پێهێنانی شەڕ دژی گەلی کورد و بەرەسمی ناسینی مافە رەواکانی بخاتە ژێر فشار».

**کۆمیتەی ناوەندیی**
**حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران**
**۳۰ی بەفرانباری ۱۳٦٥**

لە رێکەوتی ۷ و ۸ و ۹ی مانگی رێبەندانی ۱۳٦٥ کۆنفرانسێکی گرینگ بە ناوی «یەکەم کۆنفرانسی نێونەتەوەیی مافی مرۆڤ و ئەخلاقی بەشەر دۆستانە» بە بەشداریی ٤۰۰ کەس لە پسپۆڕان و بەشەر دۆستانی ناوداری جیهان لە پاریس پێکهات کە بە وتارێک لە لایەن فرانسوا میتران سەرکۆماری فەرانسە کرایەوە.

حیزبی ئێمە بۆ ئەم کۆنفرانسە دەعوەت کرابوو، بەڵام سکرتێری گشتی بە هۆی کار لە کوردستان نەیتوانی بچێ. پەیامێکی نارد کە لەم کۆنفرانسەدا خوێندراوەتەوە و زۆر لە راستییەکانی بۆ بەشداران روون کردۆتەوە کە پێشوازییەکی گەرمی لێ کراوە.

ساڵی ۱۳٦٥ وەک ساڵەکانی پێشوو پێوەندیی تەواوی بە ژیان و خەباتی گەلەکەمانەوە هەبوو و سەرەڕای ئەوە هێندێک رۆڵەی ئەمەگناس و تێکۆشەری کورد لە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی را بگرە، هەتا پێشمەرگەی سادە لە شەڕ و بەربەرەکانیی

قارەمانانەدا شەهید بوون، پێشمەرگەش زەبری زۆر توندی لە ڕێژیم وەشاندووە کە بە هێنانی ناوی چەند عەمەلیات و ڕادەی دەسکەوتەکان لە ناوچە جۆراوجۆرەکان لە ژێرەوە قەناعەت دەکەین:

**پیرانشار**

۱۳٦٥/۳/۲۷ پێشمەرگەکانی هێزی شەهید ناوارە بە پێی بەرنامەیەکی ڕێکوپێک پەلامارێکی شێرانەیان بردە سەر دوو مۆڵگەی دوژمن لە چاکی لاسان و پشتی بندرێ.

لە ماوەیەکی زۆر کورتدا توانیان هەر دوو مۆڵگەکە بگرن و تەواوی نەفەراتی ئەو دوو مۆڵگەیە یان کوژران یا بەدیل گیران. لەو شەڕە قارەمانانەیەدا زیاتر لە ۸۰ کەس لە نەفەرادی دوژمن کوژران و ۱۳ کەسیش بە دیل گیران. جگە لەوانەش ژمارەیەکی زۆر بریندار هەر لەوێ ئازاد کران. هەروەها ئەم دەسکەوتانەش لەبەر نەبوونی ئیمکانی ڕاگواستن ئاگریان تێ بەردرا. یەک دەزگا جیپی هەڵگری تفەنگی ۱۰٦ م م، یەک دەزگا ماشێنی ئیفا، یەک دەزگا لەندرووێر، یەک دەزگا نیسان، دوو دەزگا کومپرێسی، دوو تانکر بەنزین، دوو دەزگا جێپی فەرماندەیی، یەک دەزگا ماتۆری کارەبا، دەیان سندووق فیشەک و گوللە خومپارە و کاتیوشا.

ئەم چەک و چۆڵەش بە دەسکەوت گیران: ئارپی جی۷-۸ قەبزە، تفەنگی ژ۳ ۵۷ قەبزە کلاشینکۆف ۳ قەبزە، دەمانچە یەک قەبزە، تیربارى ام ژ ۳ یەک قەبزە و ژمارەیەکی زۆر فیشەک و کیسە خەو و مووشەکی ئارپی جی.

**شنۆ**

۱۳٦٥/٤/۲۳ پێشمەرگەکانی هێزی کێلەشین لە بەرنامەیەکی ڕێکوپێک و لە پێشدا داڕێژرا و هاوئاهەنگ لە سەعات ۵/۱۰ دەقیقەی بەیانی ۷ پایگای دوژمنیان لە بەرزاییەکانی گردە سوور لە ناوچەی گەلی گادەران، دایە بەر هێرشی شێرانەیان و لە شەڕێکی حەماسی و کەم وێنەدا کە یەک سەعاتی خایاند، هەر حەوت پایگایان گرت و تەواوی نەفەراتەکەیان یان کوژران یان بریندار بوون. هێزی کۆمەکیی دوژمن کە دەیهەویست بە فریای تێک شکاوەکانی دیکە بکەوێ، کەوتە کەمینی دەستەیەک لە پێشمەرگەکان کە بە مەبەستی بەرگری لە هێرشی دوژمن لەو ناوە لە کەمیندا بوون.

ئەو هێزەش دوای ئەوەی ماشینێکی لێ خراپ کراو ژمارەیەکی لێ کوژرا و، بە سەر شۆڕی پاشەکشەی کرد. لەو شەڕە حەماسییەدا زیاتر لە ٦٠ کەس لە هێزەکانی دوژمن کوژران کە کەلاکی ٥٥ کەسیان لەبەر دەست پێشمەرگەکاندا بوو. ژمارەیەکی زۆریش بریندار بوون. ئەم چەک وچۆلانەش دەست پێشمەرگەکان کەوتن: تیربارێ بی کەی سی یەک قەبزە، تیربارێ ام ژ٣/ ٤ قەبزە، خومپارەهاوێژی ٦٠ م م ٢ قەبزە، ئارپی جی٧ سێ قەبزە، کلاشینکۆف ٢٩ قەبزە، بی سیمی پی ئارسی ٧٧-٢ دەزگا و کەل و پەلێکی زۆری دیکەی نیزامی. هەروەها ١٠ دەزگا بۆلدزێر و ماشین لەگەڵ ژمارەیەکی زۆ چادر و بەتانی و فیشەک و مووشەکی ئارپی جی ئاگریان تێ بەردرا.

لەو بەرەنگارییەدا دوو رۆڵەی تێکۆشەری حیزبەکەمان شەهید بوون.

**سەردەشت**

١٣٦٥/٧/٤ پێشمەرگەکانی هێزی گیارەنگ بە پێی گەلاڵە و بەرنامەیەکی رێکوپێک لەسەر جادەی پیرانشار- سەردەشت لە نێوان گوندەکانی گرژاڵ و عەلی ئاوادا بە درێژایی ١٠ کیلۆمەتر لە دەوروبەری جادەکە دامەزران و جگە لەوەش بە مەبەستی پشتیوانی کردن لەو کەمینە لە ٩ بەرزایی ئەو ناوچەیەدا ٩ تیم سەنگەریان گرت. هەروەها لە چەندین جێگەش بۆ پشتگیری لە هێرشی چاوەڕوان نەکراو، چەند دەستە پێشمەرگە سەنگەریان گرت.

سەعات ١ی نیوەڕۆ بە دەستووری فەرماندەی عەمەلیات لە سێ بەرەدا شەڕ دەستی پێکرد. لەگەڵ بەرزبوونەوەی دەنگی تەقە، سەرانسەری ئەو ناوە بۆ داگیرکەران بوو بە جەهەننەم و لە هەموو لایەکەوە ئاگرباران کران، بە چەشنێک کە ئەفەراتی بە ناو تەنمینی رێگا، ئەفەراتی نێو پایگاکانی دەوروبەر، ئەو ستوونانەی کە لەو کاتەدا لە رێگەدا بوون، بەڵایەکیان بەسەر هات کە با بە دەواری شەڕی نەکردبێ. هەر ماشێن بوو دەسووتا و پایگا بوو کە تێکوپێک دەدرا و بەکرێگیراو بوو لاشەی دەکەوتە سەر زەوی.

لە درێژەی ئەم زنجیرە شەڕەدا کە لە سەعات ١ی نیوەڕۆ تا ٥ی ئێوارەی خایاند، زیاتر لە ٦٠ کەس لە ئەفەراتی دوژمن کوژرا کە کەلاکی ٣١ ئەفەریان بۆ پێشمەرگەکان ناسرا. ٣ کەسیش بە دیل گیران. لەو شەڕەدا چەک و چۆڵێکی بەرچاو کەوتە دەست پێشمەرگەکان. هەروەها ئەم کەل و پەلانەش ئاگریان تێ بەردرا: ماشێنی جۆراوجۆر لە

جێبی فەرماندەییەوە تا ترێلی ۱۸ چەرخ ۱۷ دەزگا، خومپارەی ٦۰ م م یەک قەبزە، تیرباری ام ژ۳ دوو قەبزە.

ئەو ساڵە بۆ رێژێمی کۆماری ئیسلامی ساڵێکی پڕ لە شکان و سەرشۆڕی و ناکامیی ئابووری و ئیزامی و سیاسی بوو. لە باری ئابوورییەوە بە هۆی درێژەدانی سیاسەتی شەڕخوازانە و لە ناکامی بۆمبارانی پەیتا پەیتای چاڵە نەوتییەکان لە لایەن فڕۆکەکانی عێراقەوە داهاتی نەوت ڕۆژ بە ڕۆژ هاتە خوار و گەییە ۱/ ٤ی ئەوەی لە بوودجەبەندیی ساڵیانەدا خرابووە بەرچاو هەر ئەوە ڕێژێمی لەسەر پەیدا کردن و کڕینی خواردەمەنی و کەرەستەی شەڕ زۆر خستە ژێر زەختەوە.

لە باری ئیزامیشەوە، ڕێژیم توانی لە والفجری هەشت دا بە دانی تەلەفاتێکی زۆر قورس، فاو بگرێ، بەڵام کاتێک هەر لەم ساڵەدا پێشی لێگیراو و نەیتوانیی پێشڕەویی زیاتر بکا، لە باکوور واتە لە کوردستان و والفجری نۆی سازدا و توانی لە ئوستانی سلێمانی هێندێک لە بەرزاییەکانیش بگرێ، بەڵام دژ کردەوەی پەلاماری عێراق هێزەکانی خومەینییان وا لێکرد کە بەرپرسان حەزیان نەدەکرد والفجری ۹ هەر ناوی بێ.

لە باری سیاسیشەوە بە هۆی ئاشکرا بوونی ئێران گیت و چەک کڕینی ئاخوندەکان لە ئەمریکا ئەویش لە ڕێگای ئیسرائیلەوە ئابڕووی بۆ نەهێشتن و لە حاڵێکدا ڕێژیم بە ناو ئیدیعای دەکرد شەڕ لەگەڵ عێراق بۆ ئازادیی قودسە و بەرێی کەربەلادا جێ بەجێ دەبێ، ئیتر ئەو ڕێژێمە بۆ خەڵک وەک ڕێژێمێکی بێ پرنسیپ و ریاکار و دوو ڕوو ناسرا.

بۆ حیزبی ئێمە بە پێچەوانەوە، ئیعتیبارێکی زیاتر لە نێوخۆدا پێکهات و بە تایبەتی بەربلاوتر بوونی پێوەندییەکانی دەرەوەی حیزبی ئێمە و ناسرانی خەباتە ڕەواکەی لە لایەن بەشێکی زۆرتر لە حیزب و ڕێکخراوە دێموکرات و پێشکەوتووەکانی جیهانەوە و بانگهێشتنی نوێنەرانی حیزب بۆ بەشدار بوون لە زۆر کۆنگرە و کۆنفرانسی نێو نەتەوەییدا بە تایبەت بەشداریی سکرتێری حیزب لە کۆنگرەی پێنجەمی ئەنترناسیۆنال سۆسیالیستدا کە لە لیما پایتەختی وڵاتی پیرۆ هەڵکەوتوو و لە ئەمریکای لاتین گیرا، پێوەندیی زیاتر لەگەڵ چاپەمەنی و ئەحزاب و ئاژانسە هەواڵدەرییەکان و زۆر سەرکەوتنی دیکە ئیعتیباری حیزبی لە باری نێو نەتەوەییەوە بردبووە سەرتر.

وەی ئێستاش بۆ ئەوە دەبێ بۆی بە داخ بین، بەردەوامیی شەڕی کۆمەڵە و حیزبە کە بە پێچەوانەی ویستی زۆربەی خەڵک و حیزبە کوردستانی و ئێرانییەکان هەر درێژەی هەبوو.

هەلومەرجی خەبات بە چەشنێک بوو کە دەبوو هاوڕێیانی ڕێبەری زۆرتری کاتیان لە ناوچەکانی دوور و قووڵایی کوردستاندا بن. بۆیە پێویست بوو پلینۆمەکان لە کاتی موناسبدا بگیرێن.

بە پێی ئەم بۆچوونە، پلینۆمی چوارەمی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێراوی کۆنگرەی حەوت لە ڕۆژەکانی ١٥ و ١٦ و ١٧ی ڕەشەمەدا پێکهات و دوای باس و ڕاوێژ لەسەر وەزع ئەم بڕیارەی ژێرەوەی دا:

١- بۆ یارمەتیدان بە زووتر ڕووخانی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی و بۆ جێگیر کردنی ڕێژیمێکی دێموکراتی لە ئێراندا ئەرکی ئەساسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە قوناغی تازە و بە تایبەتی لە ساڵی نوێ، ساڵی ١٣٦٦دا بریتییە لە:

الف- توندوتیژ کردنی خەباتی چەکدارانە دژی دام و دەزگاکانی ڕێژیم لە کوردستاندا، هەوڵدان بۆ هەرچی ڕێکوپێکتر کردنی ڕێکخراوەکانی حیزب و پێکهێنانی پێوەندییەکی بەرینتر لەگەڵ چین و توێژە دێموکراتییەکانی خەڵکی کوردستان بە مەبەستی بەشدار کردنی زیاتریان لە شێوە جۆراوجۆرەکانی خەبات دژی دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی.

ب- پێکهێنانی پێوەندییەکی نزیکتری هاوکاری لەگەڵ حیزب و ڕێکخراوە خەباتگێرەکانی ئێران بۆ خەباتی هاوبەش لە پێناوی ڕووخاندنی ڕێژیمی خومەینی و دامەزراندنی حکوومەتێکی گەلی و دێموکراتدا کە وەڵامی موسبەت بە داخوازە ڕەواکانی گەلانی ئێران بداتەوە. لەو بارەیەوە هەوڵدان بۆ پێکهێنانی بەرەی دێموکراتی- دژی ئیمپریالیستی دەبێ جێگایەکی تایبەتیی لە تێکۆشانی حیزبەکەماندا بۆ دابنرێ.

ج- تەقەللایەکی ئێوتەتەوەیی زیاتر بۆ ناساندنی ئێوەڕۆکی ڕێژیمی کۆنەپەرستی کۆماری ئیسلامی و هەر لەو کاتەدا ناساندنی خەباتی ڕەوای گەلی کورد و هەموو گەلانی ئێران لە پێناوی وەدەست هێنانی ئازادی و دێموکراسیدا[*].

لە ڕۆژەکانی ٣و ٤و ٥ی ئاوریلی ٨٧دا هەیئەتی نوێنەرایەتیی حیزبمان بە سەرۆکایەتیی سکرتێری گشتی لە شاری «لیل» بەشداریی لە کۆنگرەی حیزبی سوسیالیستی فەرانسەدا کرد. جگە لە ئەندامانی کۆنگرە، زیاتر لە هەشتا دەستەی نوێنەرایەتی دەرەوەش لە لایەن حیزبە سوسیالیست، کۆمونیست و دێموکراتەکانەوە

(*) وەرگیراوە لە ڕاگەیەندراوی دەفتەری سیاسی لە ڕۆژنامەی «کوردستان» ژمارە ١٢٥

بەشدارییان کردبوو. نوێنەرانی حیزب لە جەرەیانی کۆنگرەدا چاویان بە رێبەرانی حیزبی سۆسیالیستی فەرانسە و هەروەها زۆر دەستەی نوێنەرایەتیی بیانی(خارجی) کەوت و وتوویژیان لەگەڵ کردن.

لە رۆژەکانی ۲ تا ٦ی بانەمەریش هەیئەتێکی حیزبی بە سەرۆکایەتیی کاک عبدالله قادری ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی لە کۆنگرەی حیزبی کۆمونیستی داخلی یونان لە ئاتینی پایتەختدا بەشدارییان کرد، لەم کۆنگرەشدا کە جگە لە نوێنەرانی حیزبەکان لە سەرتاسەری یۆنان، هەیئەتی نوێنەریی سێ لایەنی دیکەشی لێ بوو، هاوڕێیانی حیزب لەگەڵ زۆر لەم لیژنانە چاوپێکەوتن و وتوویژیان هەبوو، لەسەر وەزعی کوردستان قسەیان بۆ کردن.

هەر لەو ساڵەدا دوکتور قاسملوو بۆ یەکەم جار سەفەرێکی سیاسیی ئیسپانیای کردبوو، سەرەڕای دەربڕینی رەزامەندیی خۆی لەم سەفەرە، ئەوێی وەک دەروازەی ئەمریکای باشووریش دانابوو کە دەبێ کەڵکی لێ وەربگیرێ.

بەشداریی هەیئەتی نوێنەرایەتیی حیزب لە کۆنگرەی حیزبی کۆمونیستی فەرانسە لە پاریس کە کاک هاشم کەریمی و چەند هاوڕێی دیکە بوون، هەروەها بەشداری لە جێژنی «فولکس شتیمە» رۆژنامەی «دەنگی گەل» لە وییەن پایتەختی نوتریش لە مانگی خەرمانانندا لە لایەن کۆمیتەی حیزب لە نوتریش، یەکێک لە کارە بەرچاوەکانی دیپلوماسی و تەبلیغاتی بووە. چونکە لە هەر کام لەم دوو رێ و رەسمەدا بۆ هەزاران کەس لەسەر کوردستان و خەباتە رەواکەی قسە کراوە.

رێژیمی ئێران کە وەزعی خۆی زۆر خراپ بوو، بۆ شاردنەوەی ناتەواوی و گیروگرفتەکانی نێوخۆی لە رێکەوتی ٦ی بانەمەری ۱۳٦٦دا درۆیەکی گەورەی لە رۆژنامەی «کیهان»دا بڵاو کردەوە و بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵکی زیاتر بۆ راکێشێ وشەی «محرمانە» شی لەسەر دابوو:

«بە پێی راپۆرتی گەیشتوو، لە شوێنی جێی متمانەوە، قاسملوو بە نووسینی نامەیەک بۆ جەلال تالەبانی، سکالای لە تێکەڵ و پێکەڵی وەزعی نێوخۆ و لاوازیی حیزبی هەڵوەشاوەی دیموکرات دەربڕیوە و داوای لێ کردووە تا نێوبژی بکا و بۆ قاسملوو و ئەندامانی حیزبەکەی لە کۆماری ئیسلامی داوای ئەمان نامە بکا. قاسملوو هەروەها گوتوویەتی: ئێمە ئامادەین چەکەکانمان دابنێین و خۆ تەسلیم کەین».

حیزب له وه‌ڵامی ئه‌و درۆیه له رۆژنامه‌ی ژماره ١٢٧ی «کوردستان»دا ئه‌م شته‌ی به ته‌واوی وه‌درۆ خستوه و هه‌موو هاونیشتمانانی دڵنیا کرد که وه‌ڵامی ئه‌م فروفیشاڵ و درۆ و ده‌له‌سانه له مه‌یدانی شه‌ری رزگاریخوازیی نه‌ته‌وایه‌تیدا به کۆنه‌په‌رستان ده‌ده‌نه‌وه.

هێندێک له ئه‌ندامانی رێبه‌ری هه‌ر له هه‌وه‌ڵه‌وه به دوای شکست خواردنی وتووێژی ساڵی ١٣٥٨ له‌گه‌ڵ رێژیم، ده‌کری بڵێین به داخه‌وه له جه‌نگه‌ی شه‌ری توندیشدا چاویان هه‌ر له‌وه بوو به‌ڵکو رۆژێک مه‌لایه‌ک په‌یدا بێ و خه‌به‌رێکی خۆش له‌سه‌ر وتووێژ و ئاماده بوونی دوژمن بۆ ئه‌م کاره بێنێ.

ئه‌وه‌ی راستی بێ، چه‌ند جارێکیش له‌م ماوه‌دا که‌سانێکیان ناردووه که دڵخۆشییه‌ک بده‌ن و خه‌به‌رێکیش وه‌رگرن، بۆ نموونه ئه‌وه‌ی ئاشکرا بێ، جارێک له‌سه‌ر پێشنیاری ده‌فته‌ری سیاسی یا شه‌خسی دوکتور قاسملوو له رێگای جه‌لیل گادانی له چۆمه‌ڵ، یه‌ک دوو جار له رێگه‌ی کاک تاهیر عه‌لیار له ناوچه‌ی بۆکان و مه‌هاباد، چه‌ند جارێک له رێگه‌ی کاک حسێن مه‌ده‌نی له ناوچه‌ی ژێر ده‌سه‌ڵاتی ناوه‌ندی سپی سه‌نگ و ساڵی ٦٣ش راسته‌وخۆ له رێگه‌ی مامۆستا عه‌بدوڵلا حه‌سه‌ن زاده و مامۆستا گۆران له ناوچه‌ی ئالانی سه‌رده‌شت چاوپێکه‌وتن له‌گه‌ڵ نێردراوانی رێژیم هه‌بووه. ئه‌م بۆچوونه به کرده‌وه سه‌لمێندراوه، له هه‌موو ئه‌و جارانه‌شدا دوکتور بۆ خۆی ئاگادار بووه و موافقه‌تی کردووه، ئه‌وه‌ش به ته‌واوی ده‌رکه‌وتبوو که عیشقه‌که یه‌ک لایه‌نه‌یه و نێردراوانی دوژمن مه‌به‌ستی تایبه‌تییان هه‌یه و رێژیمیش زۆرجار به‌توندی و به سه‌راحه‌ت وه‌ڵامی ئه‌م چه‌شنه بۆ چوونه‌ی دابۆوه وه‌دری خستبوو که سه‌ری سازانی له‌گه‌ڵ کورد نییه. هه‌ر ئه‌م قسانه‌ی بن لێو بوون که هێندێک جار بۆ خۆ زل کردنه‌وه ده‌درکان و به گوێی ئه‌م هێز و ئه‌و هێز ده‌گه‌یشته‌وه و ئه‌وعێک قه‌ڵسه‌یان له حیزب ده‌گیرا و له سه‌ریان ده‌نووسی.

له رۆژنامه‌ی ژماره ١٢٧ی «کوردستان» وه‌ڵامێک له ژێر سه‌ردێری «سازشکاری!» له جۆزه‌ردانی ١٣٦٦ به‌م شێوه درایه‌وه:

«مه‌سه‌له‌ی چاوپێکه‌وتنێک که هاوینی ساڵی ١٣٦٣ له نێوان نوێنه‌رانی حیزبی دیموکرات و رێژیمی خومه‌ینیدا روویدا و کاتی خۆی له «کوردستان»ی ژماره ٩٩دا بڵاو کرایه‌وه، تا ئێستاش بنێشته‌خۆشه‌ی سه‌ر زمانی هێندێ له‌و حیزب و سازمانانه‌یه که خۆیان به موخالیفی حکوومه‌تی ئاخوندی ده‌زانن. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی له‌و چاوپێکه‌وتنه دا هیچ وتووێژێکی سیاسی له گۆرێدا نه‌بووه و حیزبی ئێمه چه‌ندین جاری راگه‌یاندوه وتووێژ

لەگەڵ ڕێژیی خومەینی کارێکی بێ هوودەیە، سەرەڕای ئەوەش هێندێک لەم ڕێکخراوانە ئێستاش دەست هەڵناگرن و حیزب بە سازشکار لە قەڵەم دەدەن.

لێرەدا بۆ ئەوەی روون بێتەوە کە حیزبی ئێمە لە خەبات دژی کۆماری ئیسلامیدا شێلگیرترە، ئامارێک لە ئاکامی عەمەلیاتی پێشمەرگەکانی حیزب لە ئاخری هاوینی ١٣٦٣ هەتا هەوەڵی زستانی ١٣٦٥ بڵاو دەکەینەوە:

زیانی دوژمن لە ماوەی ئەم ٢٥ مانگەدا

١- کوژراو ١٠٧٥٨ کەس

٢- بریندار ٨٩١٣ کەس

٣- دیل ١١٥٤ کەس

٤- ماشینی لە نێوچوو ١٤٢١ دەزگا

٥- چەکی قورسی لە نێوچوو ٨٧ قەبزە

٦- مۆڵگەی گیراو ٣٢ جار

٧- مۆڵگەی وێران کراو ٣ جار

دەسکەوتی پێشمەرگەکان لەم ماوەیەدا

١- خومپارەی جۆراوجۆر ١٩ قەبزە

٢- ئارپی جی ٧/ ١٠٤ قەبزە

٣- تفەنگی دوورهاوێژ ١٠ قەبزە

٤- تفەنگی جۆراوجۆر ٢٧٣٨ قەبزە

٥- گوللەی چەکی قورس ٣١٨ دانە

٦- مووشەکی ئارپی جی ٧٠١ دانە

٧- «مسلسل»ی قورس ١٩ قەبزە

٨- نارنجۆکی دەستی ١٦٩٠ دانە

٩-دووربینی چاو ٥٦ دەزگا

١٠ رەشاش٩٦ قەبزە

١١- بێ سیم ١٦٦ دەزگا

١٢- فیشەک ٣٩٦٨٢١ دانە

١٣- نارنجۆک ئەنداز ١٤ قەبزە

١٤- خمشاب ٨٦١٢ دانه

١٥- دەمانچه ٤٦ قەبزە

١٦- ماشێن ٥ دەزگا

١٧- تفەنگی ١٠٦ میلی یەک قەبزە

١٨- مووشەک ئەندازی سام٣ / ٥ قەبزە

پێویستە بگوترێ کە لە ١١٨٣ عەمەلیاتدا پێشمەرگەکان زیانی دوژمنیان بۆ مەعلووم نەبووە و لێرەدا نەنووسراون.

هەروەها جگە لەوانەی گوتران، ٦٤٠ کەسیش لە دوژمن خۆی بە هەموو کەرەستەوە تەحویلی حیزب داوە کە لێرەدا نەهاتۆتە حیساب.

لەم ماوەیەدا بەداخەوە ١٠٠٨ پێشمەرگە و ٥٥٥کەس لە خەڵکی بێ دیفاع شەهید بوون و ١٠٤٤ کەسیش بریندار بوون.

جێی خۆیەتی بڵێین بریا هەموو رێکخراوەکانی ئۆپوزیسیونی ئێران ئاوا سازشکار بن!!

ئەنجوومەنی ئاسایشی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان پاش چەند مانگ باس و وتووێژ و راوتەگبیر رۆژی ٢٠ی ژوونییەی ١٩٨٧ واتە ١٩ی پووشپەڕی ١٣٦٦ بە تێکڕای دەنگ بڕیارنامەیەکی لە باردی شەڕی ئێران و عێراقەوە دەرکرد کە لە راستیدا بەڵگەی مەحکووم کردنی کۆماری ئیسلامی بوو.

خومەینی لە رێکەوتی شەشی گەلاوێژ واتە حەوتوویەک دوای پەسەند کردنی ئەم بڕیارنامە لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایشەوە، لە وتارێکیدا هەر مەرجەکانی پێشووی خۆی تێکرار کردەوە و بڕیارنامەی ئەنجوومەنی پاساو داوە. بە پێچەوانەی عێراق کە بە تێکڕا قبوولی کرد.

لە لایەک لەم بڕیارنامەدا خومەینی وەک درێژەدەری شەڕ ناسراوە و مەحکووم کراوە و لە لایەکی دیکەوە مەحکووم کردنی بۆمبارانی شارەکان و درێژەدانانی بەکارهێنانی چەکی شیمیایی بە یەکێک لە بارە موسبەتەکانی ئەم بڕیارنامەیە دەژمێردرا.

بەڵام مەسەلەیەکی بنەڕەتی لە ڕوانگەی ئێمەی کوردەوە ئەخرابووە بەرچاو، ئەویش کۆتایی پێ هێنانی شەڕ لە کوردستان و دابین کردنی مافە نەتەوایەتییەکانی گەلی کوردە کە لەم ماوەدا بە تایبەتی کوردستان کرابووە مەیدانی ئەسڵیی شەڕ و بێ گومان ئەگەر

مەسەلەی کورد حەل نەکرێ، ئەو ماددە کە دابین کردنی هێمنی و ئاسایش لە ناوچەکەدایە، هەرگیز نایەتە دی.

سەرەڕای ئەوەش حیزبی ئێمە پشتیوانیی خۆی لە نێوەڕۆکی ئەم بڕیارنامە دەردەبڕێ و ئاواتە خوازی ئەوەیە کە بە شێلگیرییەوە بۆ جێ بەجێ کردنی هەوڵ بدەن و ڕێگا نەدەن ئەم بڕیارنامەیەش وەک زۆر پەسەند کراوی دیکەی ئەنجوومەنی ئاسایش تەنیا لەسەر کاغەز بمێنێتەوە.(*)

ڕێژیمی ئێران زۆرجار هەوڵی داوە بە بۆمباران و تۆپ و کاتیوشا باران، بنکە و پێگەکانی پێشمەرگە لە ناوچە جۆراوجۆرەکان بشێوێنێ و زیانی گیانی و ماڵی بگەیەنێ. پیلانی ساڵی ٦٤ی بە بۆمبارانی دەفتەری سیاسی بە چەند بریندار تەواو بوو، بەڵام بۆ ٢٥ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٦٦ تەدارەکێکی زۆری دیبوو و دەیان تۆپ و کاتیوشای لە ناوچەکانی سنووری سەردەشت و بانە کۆکردبووەوە تا زەبرێک لێدا و ڕێبەرایەتیی حیزب تووشی زیانێکی قەرەبوو نەکراوە بکا.

لە سەعات یەکی بەیانیی ڕۆژی ٢٥ی گەلاوێژ، بارانی تۆپ و کاتیوشا لەسەر دەفتەری سیاسی دەستی پێکرد و چەند سەعاتی خایاند. لە پێش نیوەڕۆی هەر ئەو ڕۆژەش جارێکی دی زۆر خەستتر لە جاری پێشوو بارانی ئاسن و ئاوری نوێ کردەوە، بەڵام بە خۆشییەوە هیچ چەشنە زیانێکی گیانیی نەبوو. ئەوەش بۆ ڕێژیم کە ئیددیعای دەکرد ٧٥٪ تەنسیساتی حیزبی لە نێو بردووە، شکستێکی گەورە بوو.

پاشان دەرکەوت بەشێکی زۆر لەو کارانەی ڕێژیم بۆ مەسرەفی داخلی بووە و ویستوویەتی ئەو کەلێنە گەورانەی لە باری ئابووری و نیزامییەوە لێی پەیدا بووە پڕیان کاتەوە.

بۆ نموونە قسەکەرانی ڕێژیم چەند جار ڕایانگەیاندبوو کە هێرشە هەواییەکانی عێراق کاریان نەکردۆتە سەر ڕادەی ئەو نەوتەی بۆ دەرەوە دەچێ، نەوت هەروەک پێشوو نار دراوەتە دەرەوە. لە حاڵێکدا سەرچاوە ئابوورییەکانی باوەڕپێکراوی جیهانی ڕایانگەیاندبوو کە بەرهەمی نەوتی ئێران کە لە ساڵی ١٣٦٢، ٢٠٠٩٠٠٠ بۆشکە لە ڕۆژدا بووە، لە ساڵی ١٣٦٥ هاتۆتە سەر ١٣٠٠٠٠٠ بۆشکە لە ڕۆژدا. هەڵدانی ئابووری لە خوارەوەی سفرە و هیچ ئاسۆیەکی ڕوونی نییە. لە کاتێکدا لە ساڵی ١٣٦١دا

(*) وەرگیراوە لە ڕۆژنامەی «کوردستان» ژمارە ١٢٩

«صادرات»ی ئێران حەوت ملیارد دۆلار لە «واردات» زیاتر بووە. لە ساڵی ۱۳٦٥دا دوو ملیارد دۆلار کەسری هێناوە. بە تایبەتی ئەگەر ئەوە بخەینە بەرچاو کە واردات لە ساڵی ۱۳٦۱دا ۱٥ ملیارد دۆلار بووە و لە ساڵی ۱۳٦٥ هاتۆتە سەر دە ملیارد یانی پێنج ملیارد کەم بۆتەوە، دەردەکەوێ چ قەیرانێک رێژیمی داگرتووە.

«صادرات»ی ولات کە یەک لەوان نەوتە، لە ساڵی ۱۳٦۱دا ۲٦ ملیارد دۆلار بووە، کەچی ئەم رەقەمە لە ۱۳٦٥ گەیوەتە سەر هەشت ملیارد دۆلار.

هەر لەبەر ئەم قەیرانە قووڵە و ئاڵ و گۆڕی ئەژمێرەکانە کە کەمیی بوودجەی رێژیم لە ساڵی ۱۳٦۲ لە رادەی ٤۸٥ ملیارد ریال دابووە، لە ساڵی ۱۳٦٦ ئەم کەسرییە گەیوەتە ۱۳٤٤ ملیارد ریال.

بۆ هێندێک تاجر و دەست و پێوەندی ئاخوندەکان داهاتی ساڵیانە گەیبووە دە ملیۆن تمەن، لە حاڵێکدا حەق دەستی بەشێکی زۆر لە زەحمەتکێشان بە بەراورد کردن لەگەڵ نرخەکان لە ساڵی ۱۳٥۸ را تا ساڵی ۱۳٦٦ بۆتە نیوە.

رێژیم لەو حاڵەشدا دەستی لە شەڕ و ئازاری خەڵک و وێران کردنی کوردستان هەڵ نەدەگرت و هیچ کات وازی لە هێرش بۆ سەر خەڵکی بێ دیفاع، بۆمباران و تۆپ بارانی شار و دێهاتی کوردستان و رووخاندنی خانوو بەسەر دانیشتوانیاندا، بە کۆمەڵ کوشتنی ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتەی کورد و ئەشکەنجە و ئازار و ئیعدامی رۆڵەکانی شۆڕشگێڕی کورد نەدەهێنا.

سەیرتر لەوەش ئەوە بوو کە پاییزان کە سەرما دەستی پێدەکرد فشاری بۆ خەڵکی ناوچەکان دێنا کە گوندەکانیان چۆڵ کەن. هەر لە پاییزی ۱۳٦٦دا ئەو داوا ناڕەوایەیان لە ۲٤ گوندی ناوچەی سۆێسنایەتیی سەردەشت لە نزیک سنووری عێراق کرد و حوکمیان کرد دێیەکان چۆڵ کەن و بۆ کوێ دەچن با بچن. ئەو دێیانە لەسەر یەک ۷۷۹ ماڵیان لێ بوود، بە چەشنێکی نێونجی ژمارەی دانیشتوانی دەگەیشتە ۳۸۹٥ کەس.

بە خۆشییەوە خەڵکەکە بۆ پێشگری لە چۆڵ و وێران بوونی ئەم شوێنە سەر سەوز و پڕ هێز و پێزە راوەستان و نەچوونە ژێر زەختی ناجوامێرانەی رێژیم.

بەلام هەر لە هاوینی ئەو ساڵیدا بەکرێگیراوانی رێژیم دە گوندی ناوچەی وەک بەهەشتی ئالانی سەردەشتیان ئاور تێبەردا و خەڵکەکەیان ئاوارە کرد.

ئەوەی زۆر جێگەی داخ و کەسەر بوو، سەرەڕای هەوڵی زۆری حیزب بۆ راچڵەکاندنی

